ابو داود سليمان بن الاشعث السجستاني

هەزار فەرموودە لە فەرموودەکانی

# سوننەنی ئەبوداود




وەرگێڕانی

ناصح ابراهيم سازانی

بەرگی دووەم



# هەزار فەرموده
# لە فەرمودەکانی
# سونەنی ئەبو داود

## بەرگی دووەم

### لە فەرمودەی هەزارەوە هەتا دووهەزاروچل وپێنج

نوسینی

أبو داود سليمان بن الأشعث السجستاني

وعليها أحكام العلامة المحدث محمد بن ناصرالدين الألباني

علق عليه وخرج أحاديثه أبو عبيدة مشهور بن حسن آل سلمان

وەرگێرانی

ناصح ئیبراهیم سازانی



| | |
|---|---|
| ناوی کتێب بەکوردی: | هەزار فەرموودە لە فەرموودەکانی سوننەنی ئەبو داود بەرگی دووەم |
| نوسینـــــــــــی: | ابو داود سليمان بن الأشعث السجستانی |
| وەرگێڕانــــــــــی: | ناصح ئیبراهیم سازانی |
| بلاوکردنـــــــەوەی: | نوســـینگەی تەفســـیر بـــۆ بلاوکردنـــەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر |
| نەخشەسازی نـاوەوە: | جمعە صدیق کاکە |
| خـــــــــــەت: | نەوزاد کۆیی |
| بــــــــەرگ : | أمین مخلص |
| نـۆرە و سـاڵی چـاپ: | یەکەم ١٤٣٤ك – ٢٠١٣ز |
| تـــــــــــیراژ: | ١٥٠٠ دانە |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - ژمارەی سپاردن ( ١٨٥٠ ) ساڵی ( ٢٠١٢ ) پێدراوە





نوسینگەی تەفسیر
بۆ بلاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
Mob:00964 750 460 51 22
Tel: 0964 750 25 18 138
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com




﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ
وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ
إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٧ ﴾

**الحشر: ٧**

# پێشەکی وەرگێڕ

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ ونَعُوذُ باللهِ مِن شُرُورِ أنفُسِنَا وسَيِّئَاتِ أعْمَالِنَا مَن يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ ومَن يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ، وأشْهَدُ أن لاَّ إلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

لەدوايي دا:

خوای گەورەو پەروەردگار دەفەرموویێت: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْ ۝٧﴾ الحشر: ٧. واتە: ئەوەی کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێ ی دان وەریبگرن، وە ئەوەی لێتانی قەدەغەکرد وازی لێ بێنن.

هەروەها پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموویێت: (مَنْ أحْدَثَ فِي أمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ)[1]. واتە: هەر کەسێك شتێك لەم دین و شەرعەی ئێمە زیاد بکات کە تیایدا نەبێت، ئەوە لێی قبوڵ ناکرێت و دەدرێتەدواوە.

پێشەوای فەرموودەناس ئەبو داود ناوی سولەیمانی کوڕی ئەشعەسی کوڕی بەشیری کوڕی شەددادی کوڕی عەمری ئەلئەزدی ئەسسەجەستانییە لە ساڵی (٢٠٢)ی کۆچی لەدایك بووەو لەساڵی (٢٧٥) لە بەسرە کۆچی دوایی کردووە.

خاوەنی سونەنی ئەبو داودە کە زۆر لە زانایان مەتحیان کردووەو پێیان وایە کە لەدوای فەرموودە (صحيح)ەکانی پێشەوایان بوخاری و موسلیمەوە دێت.

---

[1] - متفقٌ عليه. أخرجه البخاري ٢٤١/٣ ( ٢٦٩٧ ) ، ومسلم ١٣٢/٥ ( ١٧١٨ ) ( ١٧ ) و( ١٨ ).

ئـەم پەرتوكـە بەنرخـەش تـا ئێستا وەرنەگێڕراوەتـە سـەر زمـانی شیرینی كوردی، هەرچەندە ئێمەش كوڕی ئەو مەیدانە نین بـەڵام بـە پشتیوانی خـوای گەورە بە باشمان زانی شان بدەینە بـەر ئـەو ئەركە قورسـەو وەریگێـڕین، دەق لەسەر كتێبی (سنن أبي داود حكم على أحاديثه وأثاره وعلق عليه العلامة المحدث محمد ناصرالدين الألباني، أعتنى به أبو عبيدة مشهور بن حسن آل سلمان). چـاپی دووهـەمی سـاڵی ١٤٢٧ی كۆچـی بەرامبـەر بـە ٢٠٠٧ی زایینـی (مكتبة المعارف).

بۆ وەرگێڕانیشی سودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە.

١- (عون المعبود شرح سنن أبي داود لمحمد آبادي علق عليه وخرج أحاديثه أبو عبيدة مشهور بن حسن آل سلمان).

٢- (بذل المجهود في حل أبي داود لعلامة المحدث الكبير شيخ خليل أحمد سهارنفوري.

٣- شرح سنن أبي داود لعبدالمحسن العباد.

٤- تفسير سنن أبي داود (معالم السنن ) لأبي سليمان الخطابي.

٥ – مختصر سن أبى داود للحافظ عبدالعظيم المنذرى.

٦ – ئەو فەرمودانەی كە بەڕێز مامۆستا نوری فارس وەریگێڕاون.

لـە پـەروەردگاری باڵادەسـت دەپاڕێمـەوە لێمـان وەربگرێـت بـە (صـەدەقەی جاريە)و (زانستی سوود لێ وەرگیراو).

إنه نِعمَ المَولى ونِعمَ النَصير.

وەرگێڕ

ناصح ئیبراهیم سازانی .

سلێمانی ساڵی ١٤٣٢ هـ - ٢٠١١ی ز.

## باسی وەڵامدانەوەی سەلامی پێشنوێژ.

## ١٩٠ - باب الرَّدِّ عَلَى الإِمَامِ.

١٠٠١ - (ضعيف) عَنْ سَمُرَةَ، قَالَ: أَمَرَنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نَرُدَّ عَلَى الإِمَامِ، وَأَنْ نَتَحَابَّ، وَأَنْ يُسَلِّمَ بَعْضُنَا عَلَى بَعْضٍ.

واتە: لە سەمورەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ کردین کە وەڵامی سەلامی پێشنوێژ بدەینەوە – واتە کاتێ کە پێشنوێژ سەلامی دایەوە وتی: (السَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، السَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحمَةَ اللَّهِ). ئێوەش سەلام بدەنەوە بڵێن: (السَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، السَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ) - وە یەکترمان خۆشبوێت، هەروەها هەندێکمان سەلام لە هەندێکی ترمان بکەین.

## باسی (الله أكبر) کردن لەدوای نوێژ.

## ١٩١ - باب التَّكْبِيرِ بَعْدَ الصَّلاَةِ.

١٠٠٢ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: كَانَ يُعْلَمُ انْقِضَاءُ صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالتَّكْبِيرِ.

واته: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: بە خوێندنی زیکر و یادەکانی دوای نوێژدا دەزانرا کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەنوێژ بۆتەوە واتە سەلامی داوەتەوە کە (الله اکبر) و غەیری (الله اکبر)یش دەگرێتەوە — لەو زیکرانەش وتنی: (أستغفرُ اللهَ) سێ جار، لەپاشدا وتنی: (اللَّهُمَّ أنْتَ السَّلامُ، وَمِنْكَ السَّلامُ، تَبارَكْتَ يَا ذَا الْجَلالِ وَالإِكْرَامِ). لەگەڵ وتنی: (سُبْحَانَ الله) سی و سێ جار، وتنی: (الْحَمْدُ لِلَّه) سی و سێ جار، وتنی: (اللهُ أكْبَر) سی و سێ جار، (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) یەکجار.

١٠٠٣ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: أَنَّ رَفْعَ الصَّوْتِ لِلذِّكْرِ حِينَ يَنْصَرِفُ النَّاسُ مِنَ الْمَكْتُوبَةِ، كَانَ ذَلِكَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ قَالَ: كُنْتُ أَعْلَمُ إِذَا انْصَرَفُوا بِذَلِكَ وَأَسْمَعُهُ.

واته: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: خوێندنی زیکر و یادەکان بە دەنگی بەرز لەدوای نوێژە فەرزەکانەوە لەکاتێکدا کە خەڵك لە جەماعەت دەبوونەوە، لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم کراوە، بێگومان ئیبنو عەباس وتی: من بەو دەنگ بەرزکردنەوەدا دەمزانی کە لەنوێژ بوونەتەوەو گوێم لێی دەبوو.

## باسی درێژنەکردنەوەی سەلامدانەوە.

## ١٩٢ – باب حَذْفِ التَّسْلِيمِ.

١٠٠٤ - (ضعيف) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (حَذْفُ السَّلاَمِ سُنَّةٌ). قَالَ عِيسَى: نَهَانِي ابْنُ الْمُبَارَكِ عَنْ رَفْعِ هَذَا الْحَدِيثِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: سَمِعْتُ أَبَا عُمَيْرٍ عِيسَى بْنَ يُونُسَ الْفَاخُورِيَّ الرَّمْلِيَّ قَالَ: لَمَّا رَجَعَ الْفِرْيَابِيُّ مِنْ مَكَّةَ تَرَكَ رَفْعَ هَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: نَهَاهُ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ عَنْ رَفْعِهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (کورتکردنەوە و درێژنەکردنەوەی سەلام لە سونتەوەیە). واتە سەلامدانەوە (السَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، السَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ) درێژنەکرێتەوە. عیسا وتی: ئیبنو موبارەك رێگری ئەوەی لێ کردم کە ئەم فەرمودە بەرزکەمەوە. ئەبو داود دەڵێت: لە ئەبا عومەیری عیسای کوڕی یونوسی فاخوری رەملیم بیستوە دەیوت: کاتێ کە فەریابی لە مەکە گەڕایەوە لەبەرزکردنەوەی ئەم فەرمودە وازی هێنا، راوی وتی: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل رێگری لێ کرد لەبەرزکردنەوەی.

# باسی كەسێ لەنوێژەكەیدا دەستنوێژی شكا با دەستنوێژ بگرێتەوە.

## ١٩٣- بابٌ إِذَا أَحْدَثَ فِي صَلاَتِهِ يَسْتَقْبِلُ.

١٠٠٥ - (ضعيف) عَنْ عَلِيِّ بْنِ طَلْقٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا فَسَا أَحَدُكُمْ فِي الصَّلاَةِ فَلْيَنْصَرِفْ فَلْيَتَوَضَّأْ وَلْيُعِدِ الصَّلاَةَ) ﴿ضعيف الجامع الصغير: ٦٠٧﴾.

واتە: لە عەلی كوڕی (طلق)ەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر كەسێ لەئێوە لەنوێژدا بایەكی لێ بوویەوە با نوێژەكەی بپڕێت و بڕوات دەستنوێژ بگرێتەوە ئینجا نوێژەكەی بكاتەوە).

## باسی کەسیّ لەو شویّنەدا کە نویّژە فەرزەکەی کردووە هەر لەو شویّنەدا نویّژی سوننەت بکات.

## ١٩٤ – باب فِي الرَّجُلِ يَتَطَوَّعُ فِي مَكَانِهِ الَّذِي صَلَّى فِيهِ الْمَكْتُوبَةَ.

١٠٠٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ) قَالَ عَنْ عَبْدِ الْوَارِثِ: (أَنْ يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ أَوْ عَنْ يَمِينِهِ أَوْ عَنْ شِمَالِهِ) - زَادَ فِي حَدِيثِ حَمَّادٍ - (فِي الصَّلاَةِ) يَعْنِي فِي السُّبْحَةِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوە کەسیّ لەئێوە ناتوانیّ کە لەنوێژە فەرزەکە بوویەوە). موسەددەد راوی فەرمودەکە لە (عَبْدِ الْوَارِثِ)ەوە گێڕایەوە، وتی: (بۆ نوێژە سوننەتەکەی کەمیّ بچێتە پێشەوە یان بڕواتە دواوە، یان بڕوا بۆ لای راستی یان بڕوا بۆ لای چەپی و جیّ گۆڕکێیەك بکات). لە فەرمودەکەی حەمماددا ئەمەی بۆ زیاد کراوە: (لە نوێژدا). واتە: لە نوێژی سوننەتدا.

١٠٠٧ - (ضعيف)[١] عَنِ الأَزْرَقِ بْنِ قَيْسٍ، قَالَ: صَلَّى بِنَا إِمَامٌ لَنَا يُكْنَى أَبَا رِمْثَةَ فَقَالَ: صَلَّيْتُ هَذِهِ الصَّلاَةَ، أَوْ مِثْلَ هَذِهِ الصَّلاَةِ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ يَقُومَانِ فِي الصَّفِّ الْمُقَدَّمِ عَنْ يَمِينِهِ، وَكَانَ رَجُلٌ قَدْ شَهِدَ التَّكْبِيرَةَ الأُولَى مِنَ الصَّلاَةِ فَصَلَّى نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ سَلَّمَ عَنْ يَمِينِهِ، وَعَنْ يَسَارِهِ حَتَّى رَأَيْنَا بَيَاضَ خَدَّيْهِ، ثُمَّ انْفَتَلَ كَانْفِتَالِ أَبِي رِمْثَةَ - يَعْنِي نَفْسَهُ - فَقَامَ الرَّجُلُ الَّذِي أَدْرَكَ مَعَهُ التَّكْبِيرَةَ الأُولَى مِنَ الصَّلاَةِ يَشْفَعُ، فَوَثَبَ إِلَيْهِ عُمَرُ فَأَخَذَ بِمَنْكِبِهِ فَهَزَّهُ، ثُمَّ قَالَ: اجْلِسْ، فَإِنَّهُ لَمْ يَهْلِكْ أَهْلُ الْكِتَابِ إِلاَّ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ بَيْنَ صَلَوَاتِهِمْ فَصْلٌ، فَرَفَعَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَصَرَهُ فَقَالَ: (أَصَابَ اللَّهُ بِكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَقَدْ قِيلَ أَبُو أُمَيَّةَ مَكَانَ أَبِي رِمْثَةَ.

واتە: لە ئەزرەقی کوڕی قەیسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێشنوێژەکەمان کە نازناوی ئەبو (رِمثة) بوو بەنوێژی نوێژێکی بۆ کردین، ئەبو (رِمثة) وتی: ئەم نوێژەم کردووە، یان وەك ئەم نوێژەم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله

---

[١]- تراجع الشيخ عن تضعيفه في: (سلسلة الصحيحة: ٥٢٤/٧ رقم: ٣١٧٣)، (صحيح سنن أبي داود: ٤/ ١٦٢).

عليه وسلم کردووە، ئەبو (رِمثة) وتی: پێشەوایان ئەبو بەکر و عومەر رەزای خوایان لێ بێ لەریزی پێشەوەی لای راستیەوە بوون، پیاوێ کە ئامادەی تەکبیرەی یەکەم بوو واتە (الله اكبر)ی نوێژدابەستن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەرنوێژی بۆ کردن پاشان بەلای راست و چەپیدا سەلامی دایەوە هەتا سپیایی کولمیمان بینی، ئینجا وەك ئەبو (رِمثة) ئاوڕی دایەوە بەلای نوێژخوێناندا، ئەو پیاوەی کە ئامادەی تەکبیرەی یەکەم بوو یەکسەر هەستا بۆئەوەی نوێژی سوننەت بکات، پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ بە پەلە هەستا شانی گرت و رایوەشاند، پاشان وتی: دانیشە، چونکە خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان گومڕانەبوون و لەناونەچوون هەتا ئەو کاتەی کە ماوەیان نەدەخستە نێوان نوێژەکانیانەوە واتە نوێژەکانیان دەدایە دەم یەك، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم چاوی هەڵبڕی و فەرمووی: (خوای گەورە رێگەی راستی نیشاندایت و راستیت پێکا ئەی کوڕی (خَطّاب)). ئەبو داود دەڵێت: لەجیاتی ئەبو (رِمثة) دەڵێن ئەبو ئومەییە.

## باسی سەهو لەدوای دوو رکاتەوە.

## ١٩٥ – باب السَّهْوِ فِي السَّجْدَتَيْنِ.

١٠٠٨ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِحْدَى صَلاَتَيِ الْعَشِيِّ الظُّهْرَ أَوِ الْعَصْرَ، قَالَ: فَصَلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ قَامَ إِلَى خَشَبَةٍ فِي مُقَدَّمِ الْمَسْجِدِ فَوَضَعَ يَدَيْهِ عَلَيْهَا إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى، يُعْرَفُ فِي وَجْهِهِ الْغَضَبُ، ثُمَّ خَرَجَ

سَرَعَانُ النَّاسِ وَهُمْ يَقُولُونَ: قَصُرَتِ الصَّلاَةُ، قَصُرَتِ الصَّلاَةُ، وَفِي النَّاسِ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَهَابَاهُ أَنْ يُكَلِّمَاهُ، فَقَامَ رَجُلٌ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُسَمِّيهِ ذَا الْيَدَيْنِ، فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَسِيتَ، أَمْ قَصُرَتِ الصَّلاَةُ؟ قَالَ: (لَمْ أَنْسَ، وَلَمْ تَقْصُرِ الصَّلاَةُ) قَالَ: بَلْ نَسِيتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْقَوْمِ فَقَالَ: (أَصَدَقَ ذُو الْيَدَيْنِ) فَأَوْمَئُوا أَيْ: نَعَمْ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى مَقَامِهِ، فَصَلَّى الرَّكْعَتَيْنِ الْبَاقِيَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ كَبَّرَ وَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ وَكَبَّرَ، ثُمَّ كَبَّرَ، وَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ وَكَبَّرَ، قَالَ: فَقِيلَ لِمُحَمَّدٍ سَلَّمَ فِي السَّهْوِ؟ فَقَالَ: لَمْ أَحْفَظْهُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَلَكِنْ نُبِّئْتُ أَنَّ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ، قَالَ: ثُمَّ سَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەرنوێژی نوێژی نیوەڕۆ یان نوێژی عەسری بۆ دەكردین، راوی وتی: دوو ركات نوێژی كرد بۆمان پاشان سەلامی دایەوە، ئینجا هەستا تەختەیەك كە لەناو مزگەوتدا بوو لەڕووی قیبلەوە دەستی راستی خستەسەر دەستی چەپی و داینان لەسەری، توڕەیی بە روخساریەوە دیاربوو، پاشان ئەو

خەڵكانـەی كـە پەلـەيان بـوو لەمزگـەوت چـوونەدەرەوە دەيـانوت: نوێـژ كورتكراوەتەوە، نوێـژ كورتكراوەتـەوە، پێشـەوايان ئـەبو بـەكر و عومـەر رەزای خوايان لێ بێ لەناو خەڵكەكەدا بوون، لەبەر رێز و ئيحتيرامی پێغەمبـەر صلى الله عليه وسلم قسەيان نەكرد، پياوێ كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليـه وسـلم ناوی نابوو (ذَا الْيَدَيْنِ) چونكە هـەردوو دەسـتی درێـژ بـوون، هەسـتايەوە وتـی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليـه وسـلم ئايـا نوێـژ كورتكراوەتـەوە، يـان تـۆ لەيادت نەبوو؟ فەرمووی: (نە نوێژ كورتكراوەتەوەو نە لەياديشم چووە)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەڵكو لەيادت چوو، پێغەمبەری خـوا صلى الله عليه وسلم رووی كردە خەڵكەكەو فەرمووی: (ئايـا (ذَا الْيَـدَيْنِ) راسـت دەكات). خەڵكەكە ئاماژەيان بۆ كرد واتە بـە بـەڵێ، پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليه وسلم گەڕايەوە بۆ جێگە نوێژەكەی خۆی و، دوو ڕكات نوێژی تری كـرد، پاشان سەلامی دايەوە، ئينجا (الله اكبر)ی كردو سەجدەی برد وەك چۆن پێشـتر سەجدەی برد يان كەمێ درێژتر، پاشان سەری بـەرزكردەوەو (الله اكـبر)ی كـرد، پاشان سەجدەی برد وەك چۆن پێشتر سەجدەی بـرد يـان كـەمێ درێـژتر، راوی وتی: بە موحەممەد وترا: ئايا لەدوای سـەجدەی سـەهو سـەلامی دايـەوە؟ وتـی: لە ئەبو هورەيرەوە لەبەرم نەكردووە، بەڵام پێم گەيشتووە كە عيمرانـی كـوڕی حوصەين وتويەتی: پاشان سەلامی دايەوە.

١٠٠٩ - (صحيح) عَنْ مُحَمَّدٍ بِإِسْنَادِهِ - وَحَدِيثُ حَمَّادٍ أَتَمُّ - ، قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ، لَـمْ يَقُـلْ: (بِنَا)، وَلَمْ يَقُلْ: (فَأَوْمَئُوا) ، قَالَ: فَقَالَ: النَّاسُ نَعَمْ، قَالَ: ثُمَّ رَفَعَ، وَلَمْ يَقُلْ: وَكَبَّرَ، ثُـمَّ كَبَّـرَ وَسَـجَدَ مِثْـلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ، وَتَمَّ حَدِيثُـهُ لَـمْ يَـذْكُرْ مَـا

بَعْدَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ (فَأَوْمَئُوا). إِلاَّ حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ. ﴿قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكُلُّ مَنْ رَوَى هَذَا الْحَدِيثَ لَمْ يَقُلْ: فَكَبَّرَ، وَلاَ ذَكَرَ: رَجَعَ﴾.

واتە: لە موحەممەدەوە بەهەمان سەنەد فەرموودەی پێشو هاتووە، - بەڵام فەرموودەکەی حەمماد واتە فەرموودەکەی پێشو تەواوترە- موحەممەد وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی کرد، نەیوت: (بِنَا) واتە: بەرنوێژی بۆ کردین وەك حەمماد وتی، هەروەها نەیوت: (فَأَوْمَئُوا)، وتی: خەڵکەکە لەجیاتی (فَأَوْمَئُوا) وتیان: بەڵێ، راوی وتی: پاشان سەری بەرزکردەوە، نەیوت: (الله اکبر)ی کرد لەگەڵ سەر بەرزکردنەوەدا، ئینجا (الله اکبر)ی کردو سەجدەی برد وەك چۆن پێشتر سەجدەی برد یان کەمێ درێژتر، پاشان سەری بەرزکردەوە جا راوی فەرموودەکەی تەواو کرد بەڵام باسی دواتری نەکرد واتە هەتا (ثُمَّ رَفَعَ)ی باس کرد، هەروەها جگە لە حەممادی کوڕی زەید کەس باسی (فَأَوْمَئُوا)ی نەکردووە. ئەبو داود دەڵێت: هەموو ئەوانەی کە ئەم فەرموودەیان ریوایەت کردووە نەیانوتوە: (الله اکبر)ی کرد، هەروەها باسی گەرانەوە(رَجَعَ)یان نەکردووە.

١٠١٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِمَعْنَى حَمَّادٍ كُلِّهِ، إِلَى آخِرِ قَوْلِهِ: نُبِّئْتُ أَنَّ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ قَالَ: ثُمَّ سَلَّمَ. قَالَ: قُلْتُ: فَالتَّشَهُّدُ؟ قَالَ: لَمْ أَسْمَعْ فِي التَّشَهُّدِ، وَأَحَبُّ إِلَيَّ أَنْ يَتَشَهَّدَ، وَلَمْ يَذْكُرْ: كَانَ يُسَمِّيهِ ذَا الْيَدَيْنِ، وَلاَ ذَكَرَ

فَأَوْمَئُوا، وَلاَ ذَكَرَ الْغَضَبَ، وَحَدِيثُ حَمَّادٍ عَنْ أَيُّوبَ أَتَمُّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم بەرنوێژی بۆ کردین، بەهەمان مانا فەرموودەکەی حەممادی گێڕایەوە هەتا کۆتایی وتەکەی: پێم گەیشتووە کە عیمرانی کوڕی حوصەین وتویەتی: پاشان سەلامی دایەوە. راوی وتی: وتم بە موحەممەدی کوڕی سیرین: ئایا باسی تەحیات نەکراوە واتە ئایا لەدوای سەجدەی سەهو تەحیاتی نەخوێد؟ وتی: نەمبیستووە، بەڵام پێم خۆشبوو بیخوێندایە، وە باسی ئەوەی نەکرد کە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم ناوی نابوو (ذَا الْيَدَيْنِ)، وە باسی (فَأَوْمَئُوا)ی نەکرد، هەروەها باسی (غَضَب)ی نەکرد واتە توڕەیی بە روخساریەوە دیاربوو، وە فەرموودەکەی پێشوتری حەمماد لە ئەیوبەوە لەم فەرمووودەش تەواوترە.

١٠١١ - (شاذ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فِي قِصَّةِ ذِي الْيَدَيْنِ أَنَّهُ كَبَّرَ وَسَجَدَ. وَقَالَ هِشَامٌ: - يَعْنِي ابْنَ حَسَّانَ -: كَبَّرَ، ثُمَّ كَبَّرَ وَسَجَدَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَى هَذَا الْحَدِيثَ أَيْضًا حَبِيبُ بْنُ الشَّهِيدِ وَحُمَيْدٌ وَيُونُسُ وَعَاصِمٌ الأَحْوَلُ، عَنْ مُحَمَّدٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، لَمْ يَذْكُرْ أَحَدٌ مِنْهُمْ مَا ذَكَرَ حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ هِشَامٍ، أَنَّهُ كَبَّرَ، ثُمَّ كَبَّرَ. وَرَوَى حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ وَأَبُو

بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ هَذَا الْحَدِيثَ، عَنْ هِشَامٍ لَمْ يَذْكُرَا عَنْهُ هَذَا الَّذِي ذَكَرَهُ حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ: أَنَّهُ كَبَّرَ، ثُمَّ كَبَّرَ.

واتە: ئەبو هورەیرە بەسەرهاتی (ذَا الْيَدَيْنِ)ی لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم گێڕاوەتەوە، كە (الله اكبر)ی كردو سەجدەی برد، هیشام راوی فەرمودەكە – واتە ئیبنو حەسسان - وتی: (الله اكبر)ی كرد، لەپاشدا (الله اكبر)ی كردو سەجدەی برد. ئەبو داود دەڵێت: هەروەها حەبیبی كوڕی شەهید و حومەید و یونسی كوڕی (عَاصِم)ی كوڕی ئەحوەل ئەم فەرمودەیان گێڕاوەتەوە، لە موحەممەدەوە، لە ئەبو هوریرەوە، بەڵام كەسیان باسی ئەوەیان نەكردووە كە حەممادی كوڕی زەید، لە هیشامەوە گێڕاویەتیەوە، (الله اكبر)ی كرد، لەپاشدا (الله اكبر)ی كرد. هەروەها حەممادی كوڕی سەلەمەو ئەبو بەكری كوڕی عەییاش ئەم فەرمودەیان لە هیشامەوە گێڕاوەتەوە، بەڵام باسی ئەوەیان نەكرد كە حەممادی كوڕی زەید باسی كردووە، كە (الله اكبر)ی كرد، پاشان (الله اكبر)ی كرد.

١٠١٢ - (ضعيف) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، بِهَذِهِ الْقِصَّةِ، قَالَ: وَلَمْ يَسْجُدْ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ حَتَّى يَقَّنَهُ اللَّهُ ذَلِكَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرە ئەم بەسەرهاتە هاتووە، كە وتویەتی: دوو سەجدەی سەهوی نەبرد هەتا خوای گەورە دڵنیای كردەوە لەوەی كە لەجیاتی چوار ركات دوو ركاتی كردووە.

١٠١٣ - (صحيح) عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ أَبَا بَكْرِ بْنَ سُلَيْمَانَ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ بَلَغَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِهَذَا الْخَبَرِ، قَالَ: وَلَمْ يَسْجُدِ السَّجْدَتَيْنِ اللَّتَيْنِ تُسْجَدَانِ إِذَا شَكَّ، حَتَّى لَقَّاهُ النَّاسُ. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَأَخْبَرَنِي بِهَذَا الْخَبَرِ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ. (شاذ) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ وَعِمْرَانُ بْنُ أَبِي أَنَسٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَالْعَلاَءُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، بِهَذِهِ الْقِصَّةِ، وَلَمْ يَذْكُرْ أَنَّهُ سَجَدَ السَّجْدَتَيْنِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَاهُ الزُّبَيْدِيُّ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ سُلَيْمَانَ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ فِيهِ: وَلَمْ يَسْجُدْ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ.

واتە: ئیبنو شیهاب دەڵێت: ئەبو بەكری كوڕی سولەیمانی كوڕی ئەبو (حَثمَة) بۆ گێڕامەوە، كە بەسەرهاتی ناوبراوی لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم پێ گەیشتووە، وتی: ئەگەر گومانی هەبوایە ئەو دوو سەجدەیەی نەدەبرد، هەتا خەڵك ئاگاداریان كردەوە، ئیبنو شیهاب وتی: سەعیدی كوڕی موسەییەب، لە ئەبو هورەیرەوە ئەم هەواڵەی پێ ڕاگەیاندوم. ئەبو داود دەڵێت: یەحیای كوڕی ئیبنو (كَثِير) و عیمرانی كوڕی ئەبو ئەنەس، لە سەلەمەی كوڕی (عَبْدُ الرَّحمَن) و عەلائی كوڕی (عَبْدُ الرَّحمَن)ەوە، لە ئەبو هورەیرەوە، ئەم بەسەرهاتەیان گێڕاوەتەوە، بەڵام باسی ئەوەیان نەكرد كە دوو

سەجدەی سەهوی بردووە. ئەبو داود دەڵێت: زوبەیدی، لە زوهریەوە، لە ئەبو بەکری کوڕی سولەیمانی کوڕی ئەبو (حَثْمَة)ەوە، لە پێغەمبەرەوە ئەم بەسەرهاتەیان گێڕاوەتەوە، تێیدا زوبەیدی لە زوهریەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: دوو سەجدەی سەهوی نەبرد.

١٠١٤ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى الظُّهْرَ، فَسَلَّمَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ، فَقِيلَ لَهُ: نَقَصَتِ الصَّلاَةُ؟ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە جارێ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، دوو رکاتی کردوو سەلامی دایەوە، پێی وترا: ئایا نوێژ کورتکراوەتەوە؟ جا هەستایەوە دوو رکات نوێژی تری کرد، لەپاشدا دوو سەجدەی سەهوی برد.

١٠١٥ - (إسناده صحيح وقوله: (وَلَمْ يَسْجُدْ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ) وهمٌ من بعض الرواة) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ انْصَرَفَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ مِنْ صَلاَةِ الْمَكْتُوبَةِ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: أَقَصُرَتِ الصَّلاَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَمْ نَسِيتَ؟ قَالَ: (كُلَّ ذَلِكَ لَمْ أَفْعَلْ !) فَقَالَ النَّاسُ: قَدْ فَعَلْتَ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ! فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ أُخْرَيَيْنِ، ثُمَّ انْصَرَفَ، وَلَمْ يَسْجُدْ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم جارێ نوێژێ لە نوێژە چوار رکاتیە فەرزەکانی دەکرد، دوو رکاتی کردو سەلامی دایەوە، پیاوێ پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! ئایا نوێژ کورتکراوەتەوە، یان تۆ لەیادت چوو؟ فەرمووی: (هیچیان! نە نوێژ کورتکراوەتەوەو نە لەیادیشم چووە). خەڵکەکە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ! بەڵکو تۆ ئەو کارەت کرد، جا هەستا دوو ڕکات نوێژی تری کرد، پاشان سەلامی دایەوە، بەڵام دوو سەجدەی سەهوی نەبرد.

(صحيح) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِهَذِهِ الْقِصَّةِ، قَالَ: ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، وَهُوَ جَالِسٌ بَعْدَ التَّسْلِيمِ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەبو هورەیرە ئەم بەسەرهاتەی لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم گێڕاوەتەوە، وتی: پاشان دوو سەجدەی سەهوی برد، لەکاتێکدا کە دانیشتبوو لەدوای سەلامدانەوە.

١٠١٦ - (حسن صحيح) عَنْ ضَمْضَمِ بْنِ جَوْسٍ الْهِفَّانِيِّ، حَدَّثَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ، بِهَذَا الْخَبَرِ، قَالَ: ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ بَعْدَ مَا سَلَّمَ.

واتە: (ضَمْضَم)ی کوڕی جەوسی هیففانی دەڵێت: ئەبو هورەیرە ئەم بەسەرهاتەی بۆ گێڕامەوە، وتی: لەدوای سەلامدانەوە دوو سەجدەی سەهوی برد.

١٠١٧ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَلَّمَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ، فَذَكَرَ نَحْوَ حَدِيثِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەرنوێژی بۆ کردین دوو رکاتی کردوو سەلامی دایەوە، وەك فەرمودەکەی ئیبنو سیرینی لە ئەبو هورەیرە گێڕایەوە وتی: پاشان دوو سەجدەی سەهوی برد.

١٠١٨ - (صحيح) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، قَالَ: سَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ثَلاَثِ رَكَعَاتٍ مِنَ الْعَصْرِ، ثُمَّ دَخَلَ - قَالَ عَنْ مَسْلَمَةَ: الْحُجَرَ - فَقَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: الْخِرْبَاقُ، كَانَ طَوِيلَ الْيَدَيْنِ، فَقَالَ لَهُ: أَقَصُرَتِ الصَّلاَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَخَرَجَ مُغْضَبًا يَجُرُّ رِدَاءَهُ، فَقَالَ: (أَصَدَقَ؟) قَالُوا: نَعَمْ، فَصَلَّى تِلْكَ الرَّكْعَةَ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْهَا، ثُمَّ سَلَّمَ.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی عەسری دەکرد، سێ رکاتی کردوو سەلامی دایەوە، پاشان هەستا چووە — موسەددەد لە مەسلەمەوە گێڕایەوە، کە چووە ژوورەکەی خۆیەوە - پیاوێ کە هەردوو دەستی درێژ بوون پێیان دەوت:

(خِرْبَاق)، هەستا پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! ئایا نوێژ کورتکراوەتەوە؟ بە توڕەیی هاتەدەرەوە پۆشاکەکەی بەدوای خۆیدا رادەکێشا، فەرمووی: (ئایا راست دەکات؟). وتیان: بەڵێ، جا رکاتەکەی تری کرد، پاشان سەلامی دایەوە، ئینجا دوو سەجدەی سەهوی برد، پاشان سەلامی دایەوە.

## باسی ئەگەر کەسێ پێنج رکات نوێژی کرد.

## ١٩٦ - باب إِذَا صَلَّى خَمْسًا.

١٠١٩ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الظُّهْرَ خَمْسًا. فَقِيلَ لَهُ: أَزِيدَ فِي الصَّلاَةِ؟ قَالَ: (وَمَا ذَاكَ؟) قَالَ: صَلَّيْتَ خَمْسًا. فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ بَعْدَ مَا سَلَّمَ.

واتە: لە (عَبْدُ اللّه)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نیوەڕۆ پێنج رکات نوێژی کرد، پێی وترا: ئایا نوێژ زیادکراوە؟ فەرمووی: (بۆچی؟). وتیان: پێنج رکات نوێژت کرد، دوای ئەوەی کە سەلامی دایەوە دوو سەجدەی سەهوی برد.

١٠٢٠ - (صحيح) عَنْ عَلْقَمَةَ، قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - قَالَ إِبْرَاهِيمُ: فَلاَ أَدْرِي زَادَ أَمْ نَقَصَ - فَلَمَّا سَلَّمَ، قِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَحَدَثَ فِي

الصَّلاَةِ شَيْءٌ؟ قَالَ: (وَمَا ذَاكَ ؟) قَالُوا صَلَّيْتَ كَذَا وَكَذَا، فَثَنَى رِجْلَهُ، وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَسَجَدَ بِهِمْ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، فَلَمَّا انْفَتَلَ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: (إِنَّهُ لَوْ حَدَثَ فِي الصَّلاَةِ شَيْءٌ أَنْبَأْتُكُمْ بِهِ وَلَكِنْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ، فَإِذَا نَسِيتُ فَذَكِّرُونِي) وَقَالَ: (إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَتِهِ، فَلْيَتَحَرَّ الصَّوَابَ، فَلْيُتِمَّ عَلَيْهِ، ثُمَّ لْيُسَلِّمْ، ثُمَّ لْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ)

واتە: لە عەلقەمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (عَبْدُ اللّه) وتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی دەکرد - ئیبراهیم وتی: جا نازانم لێی زیاد کرد یان لێی کەم کرد — کاتێ کە سەلامی دایەوە، پێیان وت: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئایا هیچ گۆڕانێ رویداوە لەنوێژدا؟ فەرمووی: (بۆچی؟). وتیان: ئەوەندەو ئەوەندە رکاتت کرد، قاچی نوشتاندەوەو، رووی کردە قیبلەو، دوو سەجدەی پێ بردن، لەپاشدا سەلامی دایەوە، کاتێ کە لێ بوویەوە رووی تێکردین و، فەرمووی: (ئەگەر گۆڕانکاریە لەنوێژدا روویبدایە پێم رادەگەیاندن، بەڵام منیش ئادەمیزادێکم وەکو ئێوە، چۆن ئێوە شتتان لەبیر دەچێ منیش هەروەها، ئەگەر شتێکم لەبیر چوو یادم بخەنەوە). وە فەرمووی: (ئەگەر کەسێکتان گومانی هەبوو لەنوێژەکەی و نەیزانی چەند رکاتی کردوە ، لەسەر کامیان زیاتر دڵنیا بوو، لەسەر ئەوە باقی نوێژەکەی تەواو بکات — بۆ نمونە لەنوێژێکی چوار رکاتیدا گومانی بۆ دروست بوو کە سێ رکات یان چواری کردوە ئەگەر لەسەر سێ رکاتەکە دڵنیا بوو، ئەوا رکاتێکی تر بکات، لەپاشدا سەلام بداتەوە، ئینجا دوو سەجدەی سەهو ببات).

١٠٢١ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، بِهَذَا، قَالَ: (فَإِذَا نَسِيَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ) ثُمَّ تَحَوَّلَ فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ.

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ەوە فەرمودەی پێشوو هاتووە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر کەسێ لەبیری چوو - لەنوێژدا - با دوو سەجدەی سەهو ببات). لەپاشدا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم رووی وەرچەرخاند و دوو سەجدەی سەهوی برد.

١٠٢٢ - (صحيح) عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَمْسًا، فَلَمَّا انْفَتَلَ تَوَشْوَشَ الْقَوْمُ بَيْنَهُمْ فَقَالَ: (مَا شَأْنُكُمْ؟) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلْ زِيدَ فِي الصَّلَاةِ؟ قَالَ: (لَا) قَالُوا: فَإِنَّكَ صَلَّيْتَ خَمْسًا، فَانْفَتَلَ فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ قَالَ: (إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ)

واتە: لە عەلقەمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (عَبْدُ اللَّه) وتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەرنوێژی بۆ کردین پێنج رکات نوێژی کرد، کاتێ کە لەنوێژی بوویەوە، نوێژخوێنان مقۆ مقۆیان تێکەوت لەنێوان خۆیاندا کەس لێیان تێ نەدەگەیشت، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوە چیتانە؟). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئایا نوێژ زیادکراوە؟ فەرمووی: (نەخێر). وتیان: بێگومان تۆ پێنج رکاتت کرد، رووی

کرده قیبلەو دوو سەجدەی سەهوی برد، لەپاشدا سەلامی دایەوە، ئینجا فەرمووی: (منیش ئادەمیزادێکم وەکو ئێوە، چۆن ئێوە شتتان لەبیر دەچێ منیش هەروەها).

١٠٢٣ - (صحيح) عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ حُدَيْجٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى يَوْمًا، فَسَلَّمَ وَقَدْ بَقِيَتْ مِنَ الصَّلاَةِ رَكْعَةٌ، فَأَدْرَكَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: نَسِيتَ مِنَ الصَّلاَةِ رَكْعَةً! فَرَجَعَ فَدَخَلَ الْمَسْجِدَ، وَأَمَرَ بِلاَلاً، فَأَقَامَ الصَّلاَةَ فَصَلَّى لِلنَّاسِ رَكْعَةً، فَأَخْبَرْتُ بِذَلِكَ النَّاسَ، فَقَالُوا لِي: أَتَعْرِفُ الرَّجُلَ؟ قُلْتُ: لاَ، إِلاَّ أَنْ أَرَاهُ، فَمَرَّ بِي، فَقُلْتُ: هَذَا هُوَ، فَقَالُوا: هَذَا طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ.

واتە: لە مەعاویەی کوڕی حودەیجەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی دەکرد رکاتێکی مابوو سەلامی دایەوە، پیاوێ خۆی گەیاندێ و وتی: رکاتێ نوێژت لەبیرچوو! پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم گەڕایەوەو چووە ناو مزگەوتەوە، فەرمانی کرد بەبیلال، بیلال قامەتی کرد، بەرنوێژی رکاتەکەی تری بۆ خەڵکەکە کرد، بەسەرهاتەکەم بۆ خەڵك گێڕایەوە، پێیان وتم: ئەو پیاوە دەناسی؟ وتم: نەخێر نایناسم بەڵام شێوەی دەکەم ئەگەر بیبینم دەیناسمەوە، جا ئەو پیاوە دای بەلامدا، وتم: ئەوەیە، وتیان: ئەوە (طَلْحَة)ی کوڕی (عُبَيْدِ الله)یە.

## باسی ئەگەر نوێژخوێن گومانی بۆ دروستبو کە دوو رکات یان سێ رکاتی کردوە، ئەوانەی کە دەڵێن: با گومانەکەی لەدڵ دەرکات.

## ١٩٧ – باب إِذَا شَكَّ فِي الثِّنْتَيْنِ وَالثَّلاَثِ مَنْ قَالَ: يُلْقِي الشَّكَّ.

١٠٢٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَتِهِ فَلْيُلْقِ الشَّكَّ، وَلْيَبْنِ عَلَى الْيَقِينِ، فَإِذَا اسْتَيْقَنَ التَّمَامَ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، فَإِنْ كَانَتْ صَلاَتُهُ تَامَّةً كَانَتِ الرَّكْعَةُ نَافِلَةً وَالسَّجْدَتَانِ، وَإِنْ كَانَتْ نَاقِصَةً كَانَتِ الرَّكْعَةُ تَمَامًا لِصَلاَتِهِ، وَكَانَتِ السَّجْدَتَانِ مُرْغِمَتَيِ الشَّيْطَانِ)

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێکتان گومانی بۆ دروست بوو لەنوێژەکەیدا نەیزانی چەند رکاتی کردووە - سێ یان چوار - با گومانەکەی لەدڵ دەرکات، بونیاد لەسەر دڵنیایی بکات، جا ئەگەر - لەسەر سێ رکاتەکە - دڵنیا بوو لەسەر ئەوە نوێژەکەی تەواو بکات – واتە رکاتێکی تر بکات - لەکۆتایی نوێژەکەیدا دوو سەجدەی سەهو بەرێت، ئەگەر نوێژەکەی تەواو کردبوو ئەوا ئەو رکاتە زیادەی کە کردوویەتی لەگەڵ دوو سەجدەکەدا

بە سوننەت بۆی دەنوسرێت، وە ئەگەر نوێژەکەشی تەواو نەکردبوو ئەوا بەو ركاتە نوێژەکەی تەواو دەكات، دوو سەجدەكەش دەبنە هۆی سەرشۆڕی بۆ شەیتان.

١٠٢٥ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَمَّى سَجْدَتَيِ السَّهْوِ الْمُرْغِمَتَيْنِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەجدەی سەهوی بە نوشوستی و سەرشۆڕی بۆ شەیتان ناوزەد کردبو.

١٠٢٦ - (صحيح) عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَتِهِ، فَلاَ يَدْرِي كَمْ صَلَّى ثَلاَثًا أَوْ أَرْبَعًا، فَلْيُصَلِّ رَكْعَةً، وَيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ قَبْلَ التَّسْلِيمِ، فَإِنْ كَانَتِ الرَّكْعَةُ الَّتِي صَلَّى خَامِسَةً شَفَعَهَا بِهَاتَيْنِ، وَإِنْ كَانَتْ رَابِعَةً فَالسَّجْدَتَانِ تَرْغِيمٌ لِلشَّيْطَانِ)

واتە: لە (عَطاء)ی کوڕی یەسارەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێکتان گومانی بۆ دروست بوو لەنوێژەکەیدا نەیدەزانی چەند ركاتی کردووە سێ یان چوار، با ركاتێکی تر

بكات و لەپێش سەلامدانەوەدا دوو سەجدەی سەهو بەرێت، ئەگەر بەو ركاتەوە بوو بەپێنج ركات ئەوا بە دوو سەجدەكەوە نوێژەكەی دەكەنەوە بەجووت، ئەگەر چوار ركاتیش بوو ئەوا دوو سەجدەكە دەبنە هۆی سەرشۆڕی بۆ شەیتان.

١٠٢٧ - (صحيح) عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، بِإِسْنَادِ مَالِكٍ، قَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَتِهِ، فَإِنِ اسْتَيْقَنَ أَنْ قَدْ صَلَّى ثَلاَثًا فَلْيَقُمْ فَلْيُتِمَّ رَكْعَةً بِسُجُودِهَا، ثُمَّ يَجْلِسْ فَيَتَشَهَّدْ، فَإِذَا فَرَغَ فَلَمْ يَبْقَ إِلاَّ أَنْ يُسَلِّمَ فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، ثُمَّ لْيُسَلِّمْ)

واتە: زەیدی كوڕی ئەسلەم بەسەنەدەكەی مالیك فەرمودەی پێشووی گێڕایەوە، وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر كەسێكتان گومانی بۆ دروست بوو لەنوێژەكەیدا، لەپاشدا دڵنیا بوو لەسەر ئەوەی كە سێ ركاتی كردووە با هەستێ ركاتێكی تر بكات بە سەجدەكەیەوە، لەپاش سەجدە تەحیات بخوێنێ، كاتێ كە لێ بوویەوەو هیچ نەما بیخوێنێ جگە لە سەلامدانەوە نەبێت ئەوا بەدانیشتنەوە دوو سەجدەی سەهو بەرێت، لەپاشدا سەلام بداتەوە.

# باسی ئەوانەی کە دەڵێن: با لەسەر لای سەروی گومانەکەی نوێژەکەی تەواو بکات.

## ١٩٨ - باب مَنْ قَالَ: يُتِمُّ عَلَى أَكْبَرِ ظَنِّهِ.

١٠٢٨ - (ضعيف) عَنْ أَبِى عُبَيْدَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا كُنْتَ فِى صَلاَةٍ فَشَكَكْتَ فِى ثَلاَثٍ أَوْ أَرْبَعٍ، وَأَكْبَرُ ظَنِّكَ عَلَى أَرْبَعٍ؟ تَشَهَّدْتَ، ثُمَّ سَجَدْتَ سَجْدَتَيْنِ، وَأَنْتَ جَالِسٌ قَبْلَ أَنْ تُسَلِّمَ، ثُمَّ تَشَهَّدْتَ أَيْضًا، ثُمَّ تُسَلِّمُ)

واتە: لە ئەبو عوبەیدەی کوڕی (عَبْدُ اللّه)ەوە، لەباوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر لەنوێژەکەتدا گومانت بۆ دروستبوو کە سێ رکات یان چوار رکات نوێژت کردووە، لای سەرووی گومانەکەت ئەوەبوو کە چوار رکاتت کردووە تەحیات دەخوێنی، ئینجا دوو سەجدەی سەهو دەبەیت، لەکاتێکدا کە دانیشتووی پێش ئەوەی سەلام بدەیتەوە، لەپاشدا جارێکی تر تەحیات دەخوێنی، لەپاشدا سەلام دەدەیتەوە).

١٠٢٩ - (ضعيف) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلَمْ يَدْرِ زَادَ أَمْ نَقَصَ، فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ قَاعِدٌ، فَإِذَا أَتَاهُ الشَّيْطَانُ فَقَالَ: إِنَّكَ قَدْ أَحْدَثْتَ، فَلْيَقُلْ: كَذَبْتَ، إِلاَّ مَا وَجَدَ رِيحًا بِأَنْفِهِ، أَوْ صَوْتًا بِأُذُنِهِ)

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر یەكێ لەئێوە نوێژی كرد نەیدەزانی زیادی كردووە یان كەم، لەكاتێكدا كە دانیشتبوو بۆ تەحیات خوێندن دوو سەجدەی سەهو بەرێت، ئەگەر شەیتان هات وتی: تۆ دەستنوێژەكەت شكاوە، پێی بڵێ: درۆدەكەیت، مەگەر بەلوتی خۆی بۆنی كردبێ یان بەگوێی خۆی دەنگی بیستبێ.

- واتە دڵنیا بێت بە دەرچوونی - .

١٠٣٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ يُصَلِّي، جَاءَهُ الشَّيْطَانُ فَلَبَسَ عَلَيْهِ، حَتَّى لاَ يَدْرِي كَمْ صَلَّى، فَإِذَا وَجَدَ أَحَدُكُمْ ذَلِكَ، فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ)

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان ئەگەر یەكێ لەئێوە هەستا بۆ نوێژ، شەیتان

وەسوەسەی خستە دڵیەوە لێی تێکدا، بەشێوەیە کە نەیدەزانی چەند رکاتی کردوە، ئەگەر کەسێ لەئێوە ئەوەی لێ روبدا، با دوو سەجدەی سەهو بەرێت لەکاتێکدا کە دانیشتووە).

١٠٣١ - (حسن صحيح) عَـنْ مُحَمَّـدِ بْـنِ مُسْـلِمٍ، بِهَـذَا الْحَـدِيثِ بِإِسْنَادِهِ، زَادَ: (وَهُوَ جَالِسٌ قَبْلَ التَّسْلِيمِ)

واتە: لە موحەمەدی کوڕی موسلیمەوە، بە هەمان سەنەد فەرموودەی پێشو هاتووە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کردوە: (لەکاتێکدا کە دانیشتووە پێش سەلامدانەوە).

١٠٣٢ - (حسن صحيح) عَنْ مُحَمَّدِ بْـنِ مُسْـلِمٍ الزُّهْـرِيِّ، بِإِسْـنَادِهِ وَمَعْنَاهُ، قَالَ: (فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَـلِّمَ، ثُـمَّ لْيُسَلِّمْ)

واتە: لە موحەمەدی کوڕی موسلمی زوهریەوە، بە هەمان سەنەد و مانا فەرمودەی پێشو هاتووە،، وتی: پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرمووی: (با پێش سەلامدانەوە دوو سەجدەی سەهو بەرێت، لەپاشدا سەلام بداتەوە).

# باسی ئەوانەی کە دەڵێن: لەدوای سەلامدانەوە سەجدەی سەهو ببرێت.

# ١٩٩ – باب مَنْ قَالَ: بَعْدَ التَّسْلِيمِ.

١٠٣٣ - (ضعيف)[1] عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنْ شَكَّ فِي صَلَاتِهِ، فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ بَعْدَ مَا يُسَلِّمُ)

واتە: لە (عَبْدُ اللّە)ی کوڕی جەعفەرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ لەئێوە لەنوێژەکەیدا گومانی بۆ دروستبو، با پێش ئەوەی سەلام بداتەوە دوو سەجدەی سەهو بەرێت).

---

[1] - أشار شيخ الباني في (صحيح سنن أبي داود: (٤/ ١٩٠) إلى نقله إلى (صحيح).

## باسی كەسیٚ لەدووەم ركاتدا هەستیٚتەوە تەحیاتی نەخویٚندبیٚ.

## ٢٠٠- باب مَنْ قَامَ مِنْ ثِنْتَيْنِ، وَلَمْ يَتَشَهَّدْ.

١٠٣٦ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ بُحَيْنَةَ أَنَّهُ قَالَ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قَامَ فَلَمْ يَجْلِسْ، فَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ، فَلَمَّا قَضَى صَلَاتَهُ وَانْتَظَرْنَا التَّسْلِيمَ كَبَّرَ فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ قَبْلَ التَّسْلِيمِ، ثُمَّ سَلَّمَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە (عَبْدُ اللّەِ)ی كوڕی بوحەینەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دوو ركات بەرنوێژی بۆ كردین، لەپاشدا هەستایەوەو دانەنیشت بۆ تەحیات خوێندن، جا خەڵكەكەش لەگەڵی هەستانەوە، دوای ئەوەی كە نوێژەكەی تەواو كرد چاوەڕێمان دەكرد سەلام بداتەوە كەچی (الله أكبر)ی كردو دوو سەجدەی سەهوی برد بەدانیشتنەوە پێش ئەوەی سەلام بداتەوە، ئینجا سەلامی دایەوە صلى الله عليه وسلم.

١٠٣٥ - (صحيح) عَنْ شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، بِمَعْنَى إِسْنَادِهِ وَحَدِيثِهِ، زَادَ: وَكَانَ مِنَّا الْمُتَشَهِّدُ فِي قِيَامِهِ.

واتە: لە شوعەیبەوە، لە زوهریەوە، بە هەمان مانای سەنەدەکی زوهری کە پێشتر باسکرا، وە فەرمودەکەی واتە سەنەدی فەرمودەکەی زوهری مەتنەکەی هاتووە، لەرێگەی شوعەیب و مالیکەوە لەمانادا یەکن هەرچەندە گۆ(لفظ)یان جیاوازە، بەڵام شوعەیب ئەمەی بۆ زیاد کرد: (کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە دووەم رکاتدا تەحیاتی نەخوێند و هەستایەوە بۆ رکاتی سێهەم هەندێ لە نوێژخوێنان تەحیاتیان خوێند.

**(صحيح) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَلِكَ سَجَدَهُمَا ابْنُ الزُّبَيْرِ، قَامَ مِنْ ثِنْتَيْنِ قَبْلَ التَّسْلِيمِ، وَهُوَ قَوْلُ الزُّهْرِيِّ.**

ئەبو داود دەڵێت: - وەك چۆن پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم دوو سەجدەی سەهوی برد دوای ئەوەی کە لە دووەم رکاتدا هەستایەوەو تەحیاتی نەخوێند پێش ئەوەی سەلام بداتەوە - بەو شێوەیە ئیبنو زوبەیر دوو سەجدەی سەهوی برد لەکاتێکدا کە هەستایەوە لەدووەم رکات پێش سەلامدانەوە (قَامَ مِنْ ثِنْتَيْنِ قَبْلَ التَّسْلِيمِ) وتەی زوهرییە.

## باسی كەسێ لەكاتێكدا كە دانیشتوە بیری نەبێ تەحیات بخوێنێ.

## ٢٠١ – باب مَنْ نَسِيَ أَنْ يَتَشَهَّدَ وَهُوَ جَالِسٌ.

١٠٣٦ - (صحيح) عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا قَامَ الإِمَامُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ فَإِنْ ذَكَرَ قَبْلَ أَنْ يَسْتَوِيَ قَائِمًا فَلْيَجْلِسْ، فَإِنِ اسْتَوَى قَائِمًا فَلاَ يَجْلِسْ، وَيَسْجُدُ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ)

واتە: لە موغیرەی كوڕی شوعبەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر پێشنوێژ لە ركاتی دووەمدا هەستایەوە لەبیری نەبوو تەحیات بخوێنێ، ئەوە ئەگەر پێش ئەوەی راست بێتەوە بیری كەوتەوە با دانیشێتەوە تەحیات بخوێنێ، بەلآم ئەگەر راست بوویەوە ئینجا بیریكەوتەوە ئەوە با دانەنیشێتەوە، لەجیاتی ئەو هەڵەیە با لەپێش سەلامدانەوەدا دوو سەجدەی سەهو بەرێت.

١٠٣٧ - (صحيح) عَنْ زِيَادِ بْنِ عِلاَقَةَ، قَالَ: صَلَّى بِنَا الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ، فَنَهَضَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ، قُلْنَا: سُبْحَانَ اللَّهِ، قَالَ:

سُبْحَانَ اللَّهِ، وَمَضَى فَلَمَّا أَتَمَّ صَلاَتَهُ وَسَلَّمَ، سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصْنَعُ كَمَا صَنَعْتُ.

واتە: لە زیادی کوڕی عیلاقەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: موغیرەی کوڕی شوعبە بەرنوێژی بۆ دەکردین لە رکاتی دووەمدا هەستایەوەو تەحیاتی نەخوێند، وتمان: (سُبْحَانَ اللَّه) واتە: پاك و بێگەردی بۆ خوا، - ئاماژەمان بۆ کرد کە دانیشێتەوە - ئەویش وتی: (سُبْحَانَ اللَّه) و بەردەوام بوو لەسەر نوێژەکەی - ئاماژەی بۆ کردین کە هەستین - کاتێ کە نوێژەکەی تەواو کردو سەلامی دایەوە، دوو سەجدەی سەهوی برد، جا کاتێ کە لێ بویەوە وتی: پێغەمبەری خودام صلى الله عليه وسلم بینی بەم شێوەی کرد کە من کردم.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَلِكَ رَوَاهُ ابْنُ أَبِي لَيْلَى، عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ وَرَفَعَهُ. وَرَوَاهُ أَبُو عُمَيْسٍ، عَنْ ثَابِتِ بْنِ عُبَيْدٍ، قَالَ: صَلَّى بِنَا الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ مِثْلَ حَدِيثِ زِيَادِ بْنِ عِلاَقَةَ.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: أَبُو عُمَيْسٍ أَخُو الْمَسْعُودِيِّ.
(صحيح) وَفَعَلَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ مِثْلَ مَا فَعَلَ الْمُغِيرَةُ.
(رجاله ثقات) وَعِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ.
(لم أره) وَالضَّحَّاكُ بْنُ قَيْسٍ.
(ضعيف) وَمُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ.
(حسن) وَابْنُ عَبَّاسٍ أَفْتَى بِذَلِكَ.
(ضعيف) وَعُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ.

ئەبو داود دەڵێت: هەموو ئەوانەی سەرەوە کە ناویان هاتووە بەو شێوەیان کردوە کە موغیرەی کوڕی شوعبە کردویەتی.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا فِيمَنْ قَامَ مِنْ ثِنْتَيْنِ ثُمَّ سَجَدُوا بَعْدَ مَا سَلَّمُوا.

ئەبو داود دەڵێت: ئەم حوکمە لەحەقی ئەوانەدایە کە لە رکاتی دووەمدا هەڵئەسنەوەو تەحیات ناخوێنن، لەپاشدا لەپێش سەلامدانەوەدا دوو سەجدەی سەهو دەبەن.

١٠٣٨ - (حسن) عَنْ ثَوْبَانَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لِكُلِّ سَهْوٍ سَجْدَتَانِ بَعْدَ مَا يُسَلِّمُ)

واتە: لە (ثَوْبَان)ەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بۆ هەموو هەڵەکردنێك لە نوێژدا لەدوای سەلامدانەوە دوو سەجدە دەبرێت).

# باسی تەحیات خوێندن و سەلامدانەوە لەدوای سەجدەی سەهوەوە.

## ٢٠٢ - باب سَجْدَتَىِ السَّهْوِ: فِيهِمَا تَشَهُّدٌ وَتَسْلِيمٌ.

١٠٣٩ - (صحيح دون قوله: (ثمَّ تشَهَّدَ) ) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى بِهِمْ فَسَهَا، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ تَشَهَّدَ، ثُمَّ سَلَّمَ.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەرنوێژی بۆ کردین بە هەڵەدا چوو، جا دوو سەجدەی سەهوی برد، لەپاشدا تەحیاتی خوێند، ئینجا سەلامی دایەوە.

## باسی دەرچوون و بڵاوەکردنی ئافرەتان لەمزگەوت لەپێش پیاوانەوە لەدوای نوێژ.

## ٢٠٣ – باب انْصِرَافِ النِّسَاءِ قَبْلَ الرِّجَالِ مِنَ الصَّلاَةِ.

١٠٤٠ - (صحيح) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا سَلَّمَ مَكَثَ قَلِيلاً، وَكَانُوا يَرَوْنَ أَنَّ ذَلِكَ كَيْمَا يَنْفُذَ النِّسَاءُ قَبْلَ الرِّجَالِ.

واتە: لە ئوم سەلەمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کاتێ کە سەلامی دەدایەوە کەمێك دەمایەوە، - هاوەڵانی - پێیان وابوو بۆ ئەوەیە کە ئافرەتان لەپێش پیاوانەوە بڵاوەی لێ بکەن و لە تێکەڵاوی و قەرەباڵغی پیاوان رزگاریان ببێت.

# باسی چۆنیەتی بەجێ هێشتنی جێگەی نوێژ

## ٢٠٤ – باب كَيْفَ الانْصِرَافُ مِنَ الصَّلاَةِ؟

١٠٤١ - (حسن صحيح) عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ هُلْبٍ - رَجُلٍ مِنْ طَيِّئٍ -، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّهُ صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَكَانَ يَنْصَرِفُ عَنْ شِقَّيْهِ.

واتە: لە (قَبِيصَةَ)ی کوڕی (هُلْب)ەوە – کە پیاوێ بوو لە (طَيِّئ) - ، لەباوکیەوە دەگێڕنەوە. کە زۆرجار لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم نوێژی جەماعەتی کردوە، بە هەردوو لایدا جێگە نوێژەکەی بەجێ هێشتوە یان بەمانایەکی تر خۆی وەرچەرخاندوە و رووی کردۆتە نوێژخوێنان - واتە جاری وەها بووە بەلای راستیدا ، جاری وەهاش بووە بەلای چەپیدا - .

١٠٤٢ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: لاَ يَجْعَلْ أَحَدُكُمْ نَصِيبًا لِلشَّيْطَانِ مِنْ صَلاَتِهِ أَنْ لاَ يَنْصَرِفَ إِلاَّ عَنْ يَمِينِهِ، وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَكْثَرَ مَا يَنْصَرِفُ عَنْ شِمَالِهِ، قَالَ: عُمَارَةُ: أَتَيْتُ الْمَدِينَةَ بَعْدُ فَرَأَيْتُ مَنَازِلَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ يَسَارِهِ.

واتە: (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی — مەسعود - دەڵێت: کەستان کارێکی وەها مەکەن، کە بەشی شەیتان بکەوێتە نوێژەکەیەوە بەهۆی ئەوە کە هەر لەلای راستیەوە لەنوێژ دەرچێت، چونکە من دیومە کە زۆرجار پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەلای چەپیەوە لەنوێژ دەرچووە و جێگە نوێژەکەی بەجێ هێشتووە، عومارە وتی: دوای ئەوەی ئەو فەرمودەم بیست رۆشتم بۆ مەدینە بینیم ماڵەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم واتە ژوورەکانی خێزانەکانی لەلای چەپیەوە بوو ئەگەر رووی لە قیبلە بوایە.

## باسی پیاو لەماڵی خۆیدا نوێژی سوننەت بکات.

## ٢٠٥ – باب صَلاَةِ الرَّجُلِ التَّطَوُّعَ فِي بَيْتِهِ.

| |
|---|
| ١٠٤٣ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اجْعَلُوا فِي بُيُوتِكُمْ مِنْ صَلاَتِكُمْ، وَلاَ تَتَّخِذُوهَا قُبُورًا) |

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەندێ لە نوێژەکانتان لە ماڵەوە بکەن، ماڵەکانیشتان مەکەن بە گۆڕستان).

١٠٤٤ - (صحيح) عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (صَلاَةُ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ أَفْضَلُ مِنْ صَلاَتِهِ فِي مَسْجِدِي هَذَا، إِلاَّ الْمَكْتُوبَةَ)

واتە: لە زەیدی کوڕی (ثابت)ەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خێرو گەورەیی نوێژی کەسێ لە ماڵەوە باشترە لەو نوێژەی لەم مزگەوتەی مندا بیکات، جگە لە نوێژە فەرزەکان).

## باسی کەسێ نوێژ بکاتلە پاشدا زانی ڕووی لە قیبلە نییە.

## ٢٠٦ – باب مَنْ صَلَّى لِغَيْرِ الْقِبْلَةِ ثُمَّ عَلِمَ.

١٠٤٥ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابَهُ كَانُوا يُصَلُّونَ نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ، فَلَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ) ، فَمَرَّ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ فَنَادَاهُمْ وَهُمْ رُكُوعٌ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ، أَلاَ إِنَّ الْقِبْلَةَ قَدْ حُوِّلَتْ إِلَى الْكَعْبَةِ - مَرَّتَيْنِ - فَمَالُوا كَمَا هُمْ رُكُوعٌ إِلَى الْكَعْبَةِ.

واته: له ئەنەسەوه دەگێڕنەوه، كه پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و هاوەڵانی بەرەو (بَيْتِ الْمَقْدِس)قودس نوێژیان دەكرد، كاتێ كه ئەم ئايەته هاتەخوارەوه: (فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ). واته: (لەكاتی نوێژ كردندا) رووت وەربگێڕه بۆ لای كەعبەی پیرۆز، وه ئێوەش (ئەی موسڵمانینه له هەر كوێبوون روو وەرگێڕن بۆ لای ئەو (كەعبه). لەكاتێكدا كه موسڵمانان له مزگەوت لەركوعی نوێژی بەيانيدا بوون و روويان له (بَيْت الْمَقْدِس) بوو پياوێ له (بَنِي سَلِمَة) دای بەلاياندا دووجار لەسەريەك بانگی كردن و وتی: ئاگاداربن قيبله له قودسەوه گۆڕاوه بۆ كەعبه، ئەوانيش بەركوعەوه روويان وەرگێڕا بۆ كەعبه.

# باسەکانی نوێژی هەینی

# تَفْرِيعُ أَبْوَابِ الْجُمُعَةِ

## باسی فەزڵی شەو و ڕۆژی هەینی.

## ٢٠٧- باب فَضْلِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَلَيْلَةِ الْجُمُعَةِ

١٠٤٦- (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ فِيهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ: فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ أُهْبِطَ، وَفِيهِ تِيبَ عَلَيْهِ، وَفِيهِ مَاتَ، وَفِيهِ تَقُومُ السَّاعَةُ، وَمَا مِنْ دَابَّةٍ إِلاَّ وَهِيَ مُسِيخَةٌ يَوْمَ الْجُمُعَةِ مِنْ حِينَ تُصْبِحُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، شَفَقًا مِنَ السَّاعَةِ، إِلاَّ الْجِنَّ وَالإِنْسَ، وَفِيهِ سَاعَةٌ لاَ يُصَادِفُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ وَهُوَ يُصَلِّي يَسْأَلُ اللَّهَ حَاجَةً إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهَا) قَالَ كَعْبٌ: ذَلِكَ فِي كُلِّ سَنَةٍ يَوْمٌ؟ فَقُلْتُ بَلْ فِي كُلِّ جُمُعَةٍ، قَالَ: فَقَرَأَ كَعْبٌ التَّوْرَاةَ، فَقَالَ: صَدَقَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: ثُمَّ لَقِيتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَلاَمٍ، فَحَدَّثْتُهُ

بِمَجْلِسِی مَعَ كَعْبٍ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلاَمٍ: قَدْ عَلِمْتُ أَيَّةَ سَاعَةٍ هِيَ، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَقُلْتُ لَهُ: فَأَخْبِرْنِي بِهَا: فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلاَمٍ: هِيَ آخِرُ سَاعَةٍ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ، فَقُلْتُ: كَيْفَ هِيَ آخِرُ سَاعَةٍ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ، وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ يُصَادِفُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ وَهُوَ يُصَلِّي) وَتِلْكَ السَّاعَةُ لاَ يُصَلَّى فِيهَا. فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلاَمٍ: أَلَمْ يَقُلْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ جَلَسَ مَجْلِسًا يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ، فَهُوَ فِي صَلاَةٍ حَتَّى يُصَلِّيَ) قَالَ: فَقُلْتُ بَلَى، قَالَ: هُوَ ذَاكَ.

واته: له ئەبو هورەیرەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (باشترین رۆژی هەفتە كە خۆری لێ هەڵبێ رۆژی هەینیە، خوای گەورە لە رۆژی هەینیدا ئادەمی دروستكرد، هەر لەو رۆژەدا لە بەهەشت دەركراو دابەزی بۆ سەر زەوی، هەر لەو رۆژەدا تەوبەی لێ قبوڵ كرا، هەر لەو رۆژەدا وەفاتی كرد، هەر لەو رۆژەشدا قیامەت هەڵئەسێت، هەرچی گیانەوەر هەیە جگە لە جنۆكە و ئادەمیزاد هەموویان لە رۆژی هەینیدا هەر لە سپێدەی بەرەبەیانەوە هەتا ئەو كاتەی گوێ هەڵدەخەن و چاوەڕانن، لەترسی هەڵسانی قیامەت، رۆژی هەینی كاتێكی تێدایە بەندەیەكی موسڵمان نیە رێك بكەوێت لەو كاتەدا نوێژ بكات و داوای شتێك بكات لە خوا ئیللا خوای گەورە پێی دەبەخشێ. كەعب وتی: لە هەموو ساڵێكدا رۆژێكی هەینی

بەو شێوەیە. وتم نەخێر بەڵكو بۆ هەموو رۆژێكی هەینیە. راوی وتی: كەعب تەوراتی خوێندەوە و وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم راستی فەرمووە. ئەبو هورەیرە وتی: گەیشتم بە (عَبْدُ اللّٰه)ی كوڕی سەلام و باسی كۆڕو دانیشتنەكەمم لەگەڵ كەعب بۆ كرد، (عَبْدُ اللّٰه)ی كوڕی سەلام وتی: بێگومان دەزانم چ كاتێكە، ئەبو هورەیرە وتی: وتم ئەو كاتە چ كاتێكە؟ (عَبْدُ اللّٰه)ی كوڕی سەلام وتی: دوا كاتە لە كاتەكانی رۆژی هەینی، وتم: دوا كاتە لە كاتەكانی رۆژی هەینی لە كاتێكدا كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دەفەرموێت: (بەندەیەكی موسڵمان نیە رێك بكەوێت لەو كاتەدا نوێژ بكات). كەچی ئەو كاتە كاتی نوێژ كردن نیە، (عَبْدُ اللّٰه)ی كوڕی سەلام وتی: ئەی ئایا پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم نافەرموێت: (هەركەسێك چاوەڕوانی نوێژی كرد هەر لە نوێژدایە هەتا نوێژ دەكات). وتی: وتم بەڵێ وایە، وتی: كەواتە ئەو كاتەیە.

١٠٤٧ - (صحيح) عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ قُبِضَ، وَفِيهِ النَّفْخَةُ، وَفِيهِ الصَّعْقَةُ، فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلاَةِ فِيهِ، فَإِنَّ صَلاَتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ) قَالَ: قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ: وَكَيْفَ تُعْرَضُ صَلاَتُنَا عَلَيْكَ وَقَدْ أَرِمْتَ؟ قَالَ: يَقُولُونَ بَلِيتَ. فَقَالَ: (إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ حَرَّمَ عَلَى الأَرْضِ أَجْسَادَ الأَنْبِيَاءِ)

واتە: لە ئەوسی كوڕی ئەوسەوە، دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: رۆژی هەینی یەكێكە لە رۆژە هەرە چاكەكانتان، لەو رۆژەدا ئادەم دروست بوو، هەر لەو رۆژەدا وەفاتی كرد، لەو رۆژەدا فوو دەكرێ بە كەرِنادا، هەر لەو رۆژەشدا نەعرەتە گەورەكە دەبێ و مەرگی سەرتاسەری پەیدا دەبێ، جا ئێوەش لەو رۆژەدا سەلاواتی زۆرم لەسەر بدەن، چونكە سەلاواتەكانتان دەگاتەوە پێم و ڕادەنوێرێ بۆم، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چۆن سەلاواتەكانمانت پێ دەگاتەوە لە كاتێكدا كە تۆ جەستەت رزی لە گۆڕدا ؟ فەرمووی: (خوای گەورە جەستەی پێغەمبەرانی حەرام كردوە لە زەوی، پێغەمبەران جەستەیان لە خاكا نارزێت).

## باسی ئەو كاتە كامەیە كە دوعاو پاڕانەوەی تێدا گیرایە لە رۆژی هەینیدا.

## ٢٠٨ – باب الإِجَابَةِ أَيَّةُ سَاعَةٍ هِيَ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ.

١٠٤٨ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: (يَوْمُ الْجُمُعَةِ ثِنْتَا عَشْرَةَ - يُرِيدُ سَاعَةً - لاَ يُوجَدُ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ شَيْئًا، إِلاَّ آتَاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ، فَالْتَمِسُوهَا آخِرَ سَاعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ)

واتە: لە جابری كوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ڕۆژی جومعە دوانزە سەعاتە - كاتێكی تێدایە دوعای تیا گیرایە - لەو كاتەدا هەر بەندەیەكی موسوڵمان داوای هەرشتێ لە خوای گەورە بكات ئیللا خوای گەورە ئەو شتەی دەداتێ، جا لە سەعاتەكەی كۆتاییدا بە دوایدا بگەڕێن لەدوای عەسرەوە.

١٠٤٩ - (ضعيف والمحفوظ موقوف) عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ، قَالَ: قَالَ لِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: أَسَمِعْتَ أَبَاكَ يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي شَأْنِ الْجُمُعَةِ - يَعْنِي السَّاعَةَ - ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (هِيَ مَا بَيْنَ أَنْ يَجْلِسَ الإِمَامُ إِلَى أَنْ تُقْضَى الصَّلاَةُ) . قَالَ أَبُو دَاوُدَ: يَعْنِي عَلَى الْمِنْبَرِ.

واتە: ئەبو بوردەی كوڕی ئەبو موسای ئەشعەری دەڵێت: (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ پێی وتم: ئایا تۆ هیچت بیستوە سەبارەت بە دیاریكردنی ئەو كاتەی ڕۆژی هەینی كە دوعاو پاڕانەوەی تێدا گیرایە، لە باوكتەوە كە لە پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم بیستبێ و گێڕابێتیەوە؟ وتی: وتم: بەڵێ لێم بیستوە دەیوت: لە پێغەمبەری خودام صلى الله عليه وسلم بیستوە دەیفەرموو: (ئەو كاتە لەو كاتەوە دەست پێ دەكات كە پێشنوێژ لەسەر مینبەر دادەنیشێ هەتا نوێژ تەواو دەبێت). ئەبو داود دەڵێت: واتە: لەسەر مینبەر.

# باسی فەزڵی ڕۆژی هەینی.

## ٢٠٩ – باب فَضْلِ الْجُمُعَةِ.

١٠٥٠ – (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ فَاسْتَمَعَ وَأَنْصَتَ، غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَ الْجُمُعَةِ إِلَى الْجُمُعَةِ وَزِيَادَةُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ، وَمَنْ مَسَّ الْحَصَى فَقَدْ لَغَا)

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: هەر كەسێك بە شێوەیەكی باش دەستنوێژی گرت و لە پاشدا هات بۆ نوێژی هەینی و باش گوێی گرت و بێدەنگ بوو، خوا لە تاوانەكانی نێوان ئەو هەینیەو هەینیەكی تری دەبورێ و سێ ڕۆژی زیاتریش، ئەوەی دەست بدات لە بەرد ئەوە قسەی پڕوپوچی كردوە.

١٠٥١ – (ضعيف) عَنْ عَطَاءٍ الْخُرَاسَانِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنِي عَطَاءٌ الْخُرَاسَانِيُّ عَنْ مَوْلَى امْرَأَتِهِ أُمِّ عُثْمَانَ، قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيًّا رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَلَى مِنْبَرِ الْكُوفَةِ يَقُولُ: (إِذَا كَانَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ غَدَتِ الشَّيَاطِينُ بِرَايَاتِهَا إِلَى

الأَسْوَاقِ، فَيَرْمُونَ النَّاسَ بِالتَّرَابِيثِ - أَو: الرَّبَائِثِ - وَيُثَبِّطُونَهُمْ عَنِ الْجُمُعَةِ، وَتَغْدُو الْمَلاَئِكَةُ فَيَجْلِسُونَ عَلَى أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ، فَيَكْتُبُونَ الرَّجُلَ مِنْ سَاعَةٍ، وَالرَّجُلَ مِنْ سَاعَتَيْنِ، حَتَّى يَخْرُجَ الإِمَامُ، فَإِذَا جَلَسَ الرَّجُلُ مَجْلِسًا يَسْتَمْكِنُ فِيهِ مِنَ الاِسْتِمَاعِ وَالنَّظَرِ، فَأَنْصَتَ وَلَمْ يَلْغُ، كَانَ لَهُ كِفْلاَنِ مِنْ أَجْرٍ فَإِنْ نَأَى وَجَلَسَ حَيْثُ لاَ يَسْمَعُ فَأَنْصَتَ وَلَمْ يَلْغُ، كَانَ لَهُ كِفْلٌ مِنْ أَجْرٍ، وَإِنْ جَلَسَ مَجْلِسًا يَسْتَمْكِنُ فِيهِ مِنَ الاِسْتِمَاعِ وَالنَّظَرِ، فَلَغَا وَلَمْ يُنْصِتْ، كَانَ لَهُ كِفْلٌ مِنْ وِزْرٍ، وَمَنْ قَالَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ لِصَاحِبِهِ صَهْ، فَقَدْ لَغَا، وَمَنْ لَغَا فَلَيْسَ لَهُ فِي جُمُعَتِهِ تِلْكَ شَيْءٌ) ثُمَّ يَقُولُ فِي آخِرِ ذَلِكَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ ذَلِكَ.

واتە: لە (عَطاء)ی خۆراسانیەوە، لە بەندەی خێزانەکەیەوە دایکی (عُثمَان) دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە پێشەوا عەلیم ڕەزای خوای لێ بێ بیستوە لەسەر مینبەری کوفە دەیفەرموو: کاتێ کە ڕۆژی هەینی هات شەیاتینەکان بە ئالاو پەرچەمی تایبەت بە خۆیانەوە دەڕژێنە ناو بازاڕەکانەوە، کۆسپ و تەگەرە دەخەنە بەردەم نوێژخوێنانەوە بۆ ئەوەی لە نوێژی هەینی دوایان بخەن، مەلائیکەش لەبەیانی زووەوە لەسەر دەرگای مزگەوت دادەنیشن، ئەو کەسەی

لە سەعاتی یەکەمدا هات بۆ مزگەوت دەنوسن لە سەعاتی یەکەمدا هاتووە، ئەو کەسەی لە سەعاتی دووەمدا هات بۆ مزگەوت دەنوسن لە سەعاتی دووەمدا هاتووە، هەتا وتاربێژ دەچێتە سەر مینبەر بۆ وتاردان، ئەگەر کەسێ بۆی گونجا لە شوێنێکدا دانیشت گوێی لە وتاربێژ بوو چاویشی لێی بوو، بێدەنگ گوێی لێ بگرێ و قسەی پڕو پوچ نەکات، ئەوە دوو بەش خێرو چاکەی بۆ دەنوسۆێت، بەڵام ئەگەر دوورکەوتەوەو لە شوێنێکدا دانیشت گوێی لەوتاربێژ نەبوو بێدەنگ دانیشێ و قسەی پڕو پوچ نەکات، ئەوە بەشێ خێرو چاکەی بۆ دەنوسۆێت، بەڵام ئەگەر بۆی گونجا لە شوێنێکدا دانیشت گوێی لە وتاربێژ بوو چاویشی لێی بوو، بێدەنگ نەبێ و قسەی پڕو پوچ بکات، ئەوە بەشێ تاوانی بۆ دەنوسرێت، هەرکەس لە رۆژی هەینیدا بە هاوڕێکەی بڵێ بێدەنگ بە، ئەوە قسەی پڕوپوچی کردوە، ئەو کەسەش قسەی پڕوپوچ بکات ئەوە نوێژی هەینی بۆ نیە، پێشەوا عەلی لە کۆتایی وتارەکەوە وتی: لە پێغەمبەری خودام صلى الله عليه وسلم بیستوە ئاوای فەرموو.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ الْوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، عَنِ ابْنِ جَابِرٍ قَالَ: بِالرَّبَائِثِ، وَقَالَ: مَوْلَى امْرَأَتِهِ أُمِّ عُثْمَانَ بْنِ عَطَاءٍ.

ئەبو داود دەڵێت: وەلیدی کوڕی موسلیم، لە جابرەوە ئەم فەرمودەی گێڕاوەتەوە، وەلید وتی: پێشەوا عەلی وتی: (بِالرَّبَائِثِ). هەروەها وتی: بەندەی خێزانەکەی دایکی (عُثْمَان)ی کوڕی (عَطَاء).

# باسی هەڕشەی توند لەو كەسانەی كە تەركی نوێژی هەینی دەكەن.

# ٢١٠ - باب التَّشْدِيدِ فِي تَرْكِ الْجُمُعَةِ.

١٠٥٢ - (حسن صحيح) عَنْ أَبِي الْجَعْدِ الضَّمْرِيِّ - وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ - أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: (مَنْ تَرَكَ ثَلَاثَ جُمَعٍ تَهَاوُنًا بِهَا طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قَلْبِهِ)

واتە: ئەبو جەعدی (ضَّمْرِیّ) – كە هاوەڵێتی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم كردبوو - دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەسێ كەمتەرخەمی بكات سێ جومعە لەسەریەك بەبێ ئیش و كارێكی زۆر زەروور و بەهانەیەكی شەرعی و پێویست واز لە نوێژی جەماعەتی جومعە بهێنێ ئەوە خوای گەورە مۆر دەدا لەسەر دڵی).

# باسى كەفارەتى ئەو كەسەى كە تەركى نوێژى هەينى دەكات.

# ٢١١ – باب كَفَّارَةِ مَنْ تَرَكَهَا.

١٠٥٣ - (ضعيف) عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ فَلْيَتَصَدَّقْ بِدِينَارٍ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَبِنِصْفِ دِينَارٍ) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَكَذَا رَوَاهُ خَالِدُ بْنُ قَيْسٍ، وَخَالَفَهُ فِي الإِسْنَادِ، وَوَافَقَهُ فِي الْمَتْنِ.

[المشكاة: ١٣٧٤].

واتە: لە سەمورەى كوڕى جوندوبەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتى: هەركەسێ بەبێ بەهانەيەكى شەرعى و پێويست تەركى نوێژى هەينى بكات ئەوە با دينارێ بكات بە خێر، ئەگەر تواناى نەبوو با نيو دينار بكات بە خێر. ئەبو داود دەڵێت: هەر بەو شێوەيە خاليدى كوڕى قەيس گێڕاويەتيەوە، هەمام راوى فەرموودەكە لە سەنەدى فەرموودەكەدا جياوازى هەيە، بەڵام لە مەتنى فەرموودەكەدا وەك يەكن.

١٠٥٤ - (ضعيف) عَنْ قُدَامَةَ بْنِ وَبَرَةَ ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ فَاتَتْهُ الْجُمُعَةُ مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ، فَلْيَتَصَدَّقْ بِدِرْهَمٍ، أَوْ نِصْفِ دِرْهَمٍ، أَوْ صَاعِ حِنْطَةٍ، أَوْ نِصْفِ صَاعٍ) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ سَعِيدُ بْنُ بَشِيرٍ، عَنْ قَتَادَةَ هَكَذَا إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: (مُدًّا أَوْ نِصْفَ مُدّ)

واتە: لە قودامەی کوڕی وەبەرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: هەرکەسێ بەبێ بەهانەیەکی شەرعی و پێویست نوێژی هەینی بفەوتێنێ، ئەوە با درهەمێ بکات بە خێر، یان نیو درهەم، یان (صاع)ێ گەنم، یان نیو (صاع)[1]. ئەبو داود دەڵێت: سەعیدی کوڕی بەشیر بە هەمان شێوە لە قەتادەوە گێڕاویەتیەوە، تەنها ئەوەندە نەبێت کە فەرمووی: ( (مُدّ)ێ یان نیو (مُدّ)) [2].

---

[1]- ئەو (صاع)ەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەکاری هێناوە بریتی بووە لە چوار مشت ئەم چوار مشتەش دادەنرێت بە بەسێ لیتر بە پێوانە، یەکسانیشە بە ٢٤٠٠ غرام بە کێشانە. (الفقة المنهجی علی مذهب الامام الشافعی).

[2]- (مُدّ)ێك یەکسانە بە پڕ مشتێ: کە بە کێشانە دەکاتە (رطل) و سێیەکی (رطل)ێك بە (رطل)ی بەغدادی، کە یەکسانە بە نزیکەی ٦٠٠غرام. (الفقه المنهجی).

## باسی نوێژی هەینی لەسەر كێ واجبە.

## ٢١٢ - باب مَنْ تَجِبُ عَلَيْهِ الْجُمُعَةُ.

١٠٥٥ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ النَّاسُ يَنْتَابُونَ الْجُمُعَةَ مِنْ مَنَازِلِهِمْ، وَمِنَ الْعَوَالِي.

واتە: لە خاتو عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: خەڵك جار لەدوای جار لە ناو ماڵەكانیانەوە دەهاتن بۆ نوێژی هەینی، هەروەها لە (عَوَالِي)یەوە - لەلای خۆرهەڵاتی مەدینەوە كە نزیكترینیان سێ تا چوار میل لە مەدینەوە دووربوون - .

١٠٥٦ - (ضعيف) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الْجُمُعَةُ عَلَى كُلِّ مَنْ سَمِعَ النِّدَاءَ)

واتە: لە (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نوێژی هەینی واجبە لەسەر هەموو كەسێك كە بانگی هەینی ببیستێت).

## باسی نوێژی هەینی لەڕۆژی باراندا.

## ٢١٣ – باب الْجُمُعَةِ فِى الْيَوْمِ الْمَطِيرِ.

١٠٥٧ – (ضعيف وصحيح وقفه) عَنْ أَبِى الْمَلِيحِ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ يَوْمَ حُنَيْنٍ كَانَ يَوْمَ مَطَرٍ، فَأَمَرَ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُنَادِيَهُ: أَنِ الصَّلاَةُ فِى الرِّحَالِ.

واتە: لە ئەبو مەلیحەوە، لە باوکیەوە، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ڕۆژی – جەنگی - حونەین[1] باران بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا بەسەر بانکبێژەکەیدا، کە بانگ بدات و بڵێ: لەشوێنی خۆتاندا نوێژ بکەن.

١٠٥٨ – (صحيح) عَنْ أَبِى مَلِيحٍ، أَنَّ ذَلِكَ كَانَ يَوْمَ جُمُعَةٍ.

واتە: لە ئەبو مەلیحەوە دەگێڕنەوە، کە ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەینی بوو.

١٠٥٩ – (صحيح) عَنْ أَبِى الْمَلِيحِ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ شَهِدَ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ فِى يَوْمِ جُمُعَةٍ وَأَصَابَهُمْ مَطَرٌ لَمْ تَبْتَلَّ أَسْفَلُ نِعَالِهِمْ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يُصَلُّوا فِى رِحَالِهِمْ.

---

[1] - حونەین شیوێکە لەنێوان مەککە و (طائف)دا.

واته: له ئەبو مەليحەوە، له باوكيەوە، دەگێڕنەوە، كه خۆی ئامادە بووە له زەمانی حودەيبيەدا لەڕۆژی هەينيدا باران باری ژێر نەعلی تەڕ نەكرد، پێغەمبەری صلی الله عليه وسلم فەرمانی كرد بە خەڵك لەشوێنی خۆياندا نوێژ بكەن.

## باسی دواكەوتن له نوێژی جەماعەت لەشەوی سەرمادا يان لەشەوی باراندا.

## ٢١٤ – باب التَّخَلُّفِ عَنِ الْجَمَاعَةِ فِي اللَّيْلَةِ الْبَارِدَةِ (أَو اللَّيْلَةِ الْمَطِيرَةِ).

١٠٦٠ - (صحيح) عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ نَزَلَ بِضَجْنَانَ فِي لَيْلَةٍ بَارِدَةٍ، فَأَمَرَ الْمُنَادِيَ فَنَادَى: أَنِ الصَّلاَةُ فِي الرِّحَالِ.

واته: نافع وتی: ئيبنو عومەر رەزای خوايان لێ بێ لەشەوێكی سارددا له (ضَجْنَان)[١] دابەزی فەرمانی دا بەسەر بانكبێژدا، كه بانگ بدات، له بانگەكەيدا بڵێ: ئاگاداربن مەيەن بۆ نوێژی جەماعەت، بەڵكو هەر له شوێنی خۆتاندا نوێژ بكەن.

---

[١] - شوێنێكه لەنزيك مەككەوە.

عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا كَانَتْ لَيْلَةٌ بَارِدَةٌ أَوْ مَطِيرَةٌ أَمَرَ الْمُنَادِيَ فَنَادَى: الصَّلاَةُ فِي الرِّحَالِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم لەشەوێکی سارماو سۆڵەدا یان بارانـدا فەرمانی دا بەسەر بانکبێژدا، کە بانگ بدات، لە بانگەکەیدا بڵێ: لە شوێنی خۆتان نوێژ بکەن.

١٠٦١ - (صحيح) عَنْ نَافِعٍ ، قَالَ: نَادَى ابْنُ عُمَرَ بِالصَّلاَةِ بِضَجْنَانَ، ثُمَّ نَادَى: أَنْ صَلُّوا فِي رِحَالِكُمْ، قَالَ فِيهِ: ثُمَّ حَدَّثَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ يَأْمُرُ الْمُنَادِيَ فَيُنَادِي بِالصَّلاَةِ، ثُمَّ يُنَادِي: (أَنْ صَلُّوا فِي رِحَالِكُمْ، فِي اللَّيْلَةِ الْبَارِدَةِ، وَفِي اللَّيْلَةِ الْمَطِيرَةِ فِي السَّفَرِ.

واتە: لە نافعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ لە (ضَجْنَان) بانگیدا بۆ نوێژ، لەپاشدا بانگیدا وتی: لە شوێنی خۆتاندا نوێژ بکەن. راوی لە فەرموودەکەیدا وتی: ئینجا لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم گێڕایەوە، کە فەرمانی داوە بەسەر بانکبێژدا، لەشەوی ساردو لە شەوی باراندا لە سەفەرا بانگ بدات، لە بانگەکەیدا بڵێ: ئاگاداربن مەیەن بۆ نوێژی جەماعەت بەڵکو لە شوێنی خۆتان نوێژ بکەن.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: (لم أرِ مَنْ وَصَلَه)[١]. وَرَوَاهُ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ أَيُّوبَ وَعُبَيْدِ اللَّهِ ، قَالَ فِيهِ: فِى السَّفَرِ فِى اللَّيْلَةِ الْقَرَّةِ أَوِ الْمَطِيرَةِ.

ئەبو داود دەڵێت: حەممادی کوڕی سەلەمە، لە ئەیوب و (عُبَيْدِ اللَّه)ەوە ریوایەتی کردوە، لە فەرموودەکەیدا وتی: لەسەفەردا لە شەوی ساردو شەوی باراندا.

١٠٦٢ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّهُ نَادَى بِالصَّلاَةِ بِضَجْنَانَ، فِى لَيْلَةٍ ذَاتِ بَرْدٍ وَرِيحٍ فَقَالَ: فِى آخِرِ نِدَائِهِ: أَلاَ صَلُّوا فِى رِحَالِكُمْ، أَلاَ صَلُّوا فِى الرِّحَالِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَأْمُرُ الْمُؤَذِّنَ إِذَا كَانَتْ لَيْلَةٌ بَارِدَةٌ أَوْ ذَاتُ مَطَرٍ فِى سَفَرٍ يَقُولُ: أَلاَ صَلُّوا فِى رِحَالِكُمْ.

واتە: لە ئیبنو عەمەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە لە (ضَجْنَان) لەشەوێکی ساردوو باو بۆراندا بانگیدا، لە کۆتایی بانگەکەوە وتی: ئاگاداربن مەیەن بۆ نوێژی جەماعەت بەڵکو لە شوێنی خۆتان نوێژ بکەن، لە شوێنی خۆتان نوێژ بکەن، لەپاشدا وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم

---

[١] ئەمە وتەی: شێخ ئەلبانی یە رەحمەتی خوای لێ بێت.

لەسەفەرا لەشەوی ساردا یان باراندا فەرمانی دەدا بەسەر بانکبێژدا، کە بڵێ: ئاگاداربن مەیەن بۆ نوێژی جەماعەت بەڵکو لە شوێنی خۆتان نوێژ بکەن.

١٠٦٣ - (صحيح) عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ - يَعْنِي أَذَّنَ بِالصَّلاَةِ فِي لَيْلَةٍ ذَاتِ بَرْدٍ وَرِيحٍ - فَقَالَ: أَلاَ صَلُّوا فِي الرِّحَالِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَأْمُرُ الْمُؤَذِّنَ إِذَا كَانَتْ لَيْلَةٌ بَارِدَةٌ أَوْ ذَاتُ مَطَرٍ يَقُولُ: أَلاَ صَلُّوا فِي الرِّحَالِ.

واتە: لە نافعەوە، دەگێڕنەوە، کە ئیبنو عەمەر ڕەزای خوایان لێ بێ — واتە بانگیدا بۆ نوێژ لەشەوێکی ساردوو باو بۆراندا - وتی: ئاگاداربن مەیەن بۆ نوێژی جەماعەت بەڵکو لە شوێنی خۆتان نوێژ بکەن، لە شوێنی خۆتان نوێژ بکەن، لەپاشدا وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەشەوی سارددا یان باراندا فەرمانی دەدا بەسەر بانکبێژدا، کە بڵێ: ئاگاداربن مەیەن بۆ نوێژی جەماعەت بەڵکو لە شوێنی خۆتان نوێژ بکەن.

١٠٦٤ - (منكر) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: نَادَى مُنَادِي رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِذَلِكَ فِي الْمَدِينَةِ فِي اللَّيْلَةِ الْمَطِيرَةِ، وَالْغَدَاةِ الْقَرَّةِ.

واتە: ئیبنو عەمەر ڕەزای خوایان لێ بێ وتی: بانکبێژەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە مەدینە لەشەوێکی باران و، بەیانیەکی سەرماو سۆڵەدا

بە هەمان شێوە بانگیدا – واتە وتی: ئاگاداربن مەیەن بۆ نوێژی جەماعەت بەڵکو لە شوێنی خۆتان نوێژ بکەن - .

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَى هَذَا الْخَبَرَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الأَنْصَارِيُّ، عَنِ الْقَاسِمِ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، قَالَ فِيهِ: فِي السَّفَرِ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەم بەسەرهاتە یەحیای کوڕی سەعیدی ئەنصاری لە قاسمەوە، لە ئیبنو عەمەرەوە رەزای خوایان لێ بێ، ئەویش لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم، گێڕاویەتیەوە، یەحیا لە فەرموودەکەیدا وتی: لەسەفەردا.

١٠٦٥ - (صحيح) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ فَمُطِرْنَا ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لِيُصَلِّ مَنْ شَاءَ مِنْكُمْ فِي رَحْلِهِ)

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووین صلی الله علیه وسلم باران دەباری، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هەرکەس دەیەوێت با لەشوێنی خۆی نوێژ بکات).

١٠٦٦ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْحَارِثِ ابْنُ عَمِّ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ: أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ قَالَ لِمُؤَذِّنِهِ فِي يَوْمٍ مَطِيرٍ: إِذَا قُلْتَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ فَلاَ تَقُلْ: حَيَّ عَلَى

الصَّلاَةِ. قُلْ صَلُّوا فِي بُيُوتِكُمْ. فَكَأَنَّ النَّاسَ اسْتَنْكَرُوا ذَلِكَ! فَقَالَ: قَدْ فَعَلَ ذَا مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّى، إِنَّ الْجُمُعَةَ عَزْمَةٌ، وَإِنِّى كَرِهْتُ أَنْ أُحْرِجَكُمْ، فَتَمْشُونَ فِى الطِّينِ وَالْمَطَرِ.

واتە: لە (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی(حَارِث)ی كوڕی مامی ئیبنو سیرینەوە دەگێڕنەوە، كە ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ لەڕۆژی باران بارینـدا بە بانگدەرەكەی دەوت: كاتێ وتت: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ). مەڵێ: (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ). بەڵكو بڵێ: لە ماڵی خۆتاندا نوێژ بكەن، خەڵكەكە ئینكاریان كرد! ئیبنو عەباسیش وتی: ئەو كەسەی لەمن چاكتر بوو ئەوەی كردوە كە پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم، نوێژی هەینی واجبە بەڵام من حەزم نەكرد بیانهێنمەدەر بەناو قوڕو لیتەدا بڕۆن.

## باسی نوێژی هەینی ئافرەت و بەندە.

## ٢١٥ - باب الْجُمُعَةِ لِلْمَمْلُوكِ وَالْمَرْأَةِ.

١٠٦٧ - (صحيح) عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ، عَنِ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الْجُمُعَةُ حَقٌّ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ فِى جَمَاعَةٍ إِلاَّ أَرْبَعَةً عَبْدٌ مَمْلُوكٌ أَوِ امْرَأَةٌ أَوْ صَبِىٌّ أَوْ مَرِيضٌ)

واته: له (طَارِق)ی كوڕی شیهابەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: نوێژی هەینی حەقێكی پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێ كە بە جەماعەت بیكات، جگە لە چوار كەس: بەندەیەكی خاوەندار، یان ئافرەت، یان منداڵ، یا نەخۆش.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: طَارِقُ بْنُ شِهَابٍ قَدْ رَأَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يَسْمَعْ مِنْهُ شَيْئًا.

ئەبو داود دەڵێت: (طَارِق)ی كوڕی شیهاب پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم دیوە بەڵام هیچ شتێكی لێ نەبیستوە.

## باسی نوێژی هەینی لە گوندەكان.

## ٢١٦ – باب الْجُمُعَةِ فِي الْقُرَى.

١٠٦٨ – (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: إِنَّ أَوَّلَ جُمُعَةٍ جُمِّعَتْ فِي الإِسْلاَمِ بَعْدَ جُمُعَةٍ جُمِّعَتْ فِي مَسْجِدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْمَدِينَةِ لَجُمُعَةٌ جُمِّعَتْ بِجُوَاثَاءَ، قَرْيَةٍ مِنْ قُرَى الْبَحْرَيْنِ، قَالَ عُثْمَانُ: قَرْيَةٌ مِنْ قُرَى عَبْدِ الْقَيْسِ.

واته: له ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: یەكەم نوێژی هەینی كە

لەئیسلامدا کرا لەدوای ئەو نوێژی هەینییەی کە لە مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم لە مەدینە کرا ئەو نوێژی هەینییە بوو لە گوندی (جُوَاثَاء) کرا، کە گوندێکە لە گوندەکانی بەحرەین، (عُثْمَان) راوی فەرمودەکە وتی: گوندێکە لە گوندەکانی(عَبْد الْقَيْس) .

١٠٦٩ - (حسن) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ - وَكَانَ قَائِدَ أَبِيهِ بَعْدَ مَا ذَهَبَ بَصَرُهُ - عَنْ أَبِيهِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّهُ كَانَ إِذَا سَمِعَ النِّدَاءَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ تَرَحَّمَ لأَسْعَدَ بْنِ زُرَارَةَ، فَقُلْتُ لَهُ: إِذَا سَمِعْتَ النِّدَاءَ تَرَحَّمْتَ لأَسْعَدَ بْنِ زُرَارَةَ؟ قَالَ: لأَنَّهُ أَوَّلُ مَنْ جَمَّعَ بِنَا فِي هَزْمِ النَّبِيتِ، مِنْ حَرَّةِ بَنِي بَيَاضَةَ، فِي نَقِيعٍ يُقَالُ لَهُ: نَقِيعُ الْخَضِمَاتِ، قُلْتُ كَمْ أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ: أَرْبَعُونَ.

واتە: کەعبی کوڕی مالیك دوای ئەوەی کە چاوەکانی لەدەستدا (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی چاوساغی بوو دەستی دەگرت و دەیبرد بۆ نوێژی جەماعەت، جا (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی دەڵێت: کاتێ کە باوکم گوێی لە بانگی نوێژی هەینی دەبوو دەپاڕایەوەو رەحمەتی دەنارد بۆ ئەسعەدی کوڕی زرارە، جارێ پێم وت: بۆچی کاتێ کە گوێت لە بانگی نوێژی هەینی دەبێت دەپاڕێیتەوە بۆ ئەسعەدی کوڕی زرارە؟ وتی: چونکە یەکەم کەس بوو نوێژی هەینی بە جەماعەت بۆ کردین لە دێی (هَزْم النَّبِيت) لە هەوار(حَرَّة)ی (بَنِي بَيَاضَةَ) لە نزیك زۆنگاوێکەوە کە پێیان دەوت: (نَقِيعُ الْخَضِمَات) – شوێنێکە دەوری میلێ لە مەدینەوە دوورە - وتم: ئەو کاتە ئێوە چەند کەس دەبوون؟ وتی: چل کەس دەبووین.

## باسی ئەگەر رۆژی هەینی رێکەوتی رۆژی جەژنی كرد.

## ٢١٧ – باب إِذَا وَافَقَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ يَوْمَ عِيدٍ.

١٠٧٠ - (صحيح) عَنْ إِيَاسِ بْنِ أَبِي رَمْلَةَ الشَّامِيِّ، قَالَ: شَهِدْتُ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ وَهُوَ يَسْأَلُ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ قَالَ: أَشَهِدْتَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِيدَيْنِ اجْتَمَعَا فِي يَوْمٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَكَيْفَ صَنَعَ؟ قَالَ: صَلَّى الْعِيدَ، ثُمَّ رَخَّصَ فِي الْجُمُعَةِ فَقَالَ: (مَنْ شَاءَ أَنْ يُصَلِّيَ فَلْيُصَلِّ).

واتە: لە ئیاسی كوڕی ئەبو رەملەی شامییەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: مەعاویەی كوڕی ئەبو سوفیانم دی پرسیاری دەكرد لە زەیدی كوڕی ئەرقەم پێی وت: ئایا تۆ ئامادەبویت لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم كە دوو جەژن پێكەوە لەرۆژێكدا كۆبوبێتەوە؟ - واتە جەژنی هەینی و جەژنی قوربان یان جەژنی هەینی و جەژنی رەمەزان - وتی: بەڵێ، مەعاویە وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەو رۆژەدا چی كرد؟ زەید وتی: نوێژی جەژنی كرد، لەپاشدا رێی پێداین كە نوێژی هەینی نەكەین، فەرمووی: (هەركەس دەیەوێت نوێژی هەینی بكات با بیكات).

١٠٧١ - (صحيح) عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ، قَالَ: صَلَّى بِنَا ابْنُ الزُّبَيْرِ فِي يَوْمِ عِيدٍ فِي يَوْمِ جُمُعَةٍ أَوَّلَ النَّهَارِ، ثُمَّ رُحْنَا إِلَى الْجُمُعَةِ، فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْنَا، فَصَلَّيْنَا وُحْدَانًا، وَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ بِالطَّائِفِ، فَلَمَّا قَدِمَ ذَكَرْنَا ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: أَصَابَ السُّنَّةَ.

واتە: لە (عَطاء)ی کوڕی ئەبو رەباحەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئیبنو زوبەیر لە سەرەتای رۆژی هەینیەوە بەرنوێژی نوێژی جەژنی بۆ کردین، لەپاشدا چووین بۆ نوێژی هەینی، نەهاتەدەرەوە بۆ ناومان بۆ ئەوەی بەرنوێژی نوێژی هەینیمان بۆ بکات، ئێمەش بە تەنیا نوێژی نیوەڕۆمان کرد، لەو کاتەدا ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ لە (طائِف) بوو، کاتێ کە گەڕایەوە بەسەرهاتەکەمان بۆ گێڕایەوە وتی: سوننەتی پێکاوە.

١٠٧٢ - (صحيح) عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: قَالَ عَطَاءٌ: اجْتَمَعَ يَوْمُ جُمُعَةٍ وَيَوْمُ فِطْرٍ عَلَى عَهْدِ ابْنِ الزُّبَيْرِ فَقَالَ: عِيدَانِ اجْتَمَعَا فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ، فَجَمَعَهُمَا جَمِيعًا، فَصَلاَّهُمَا رَكْعَتَيْنِ بُكْرَةً، لَمْ يَزِدْ عَلَيْهِمَا حَتَّى صَلَّى الْعَصْرَ.

واتە: لە ئیبنو جورەیجەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (عَطاء) وتی: لەسەردەمی خەلافەتی ئیبنو زوبەیردا رۆژی جەژن و رۆژی هەینی کەوتنە یەك رۆژەوە، ئیبنو زوبەیر وتی: دوو جەژن لەرۆژێکدا کۆبونەتەوە، لەکاتی

نوێـژی جەژنـدا لـەجیاتی نوێـژی هـەدوو چـەژنەکە دوو رکاتمـان پێکـەوە بـە جەماعەت کرد، ئیتر هەتا نوێژی عەسر نوێژمان نەکرد.

١٠٧٣ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: (قَدِ اجْتَمَعَ فِي يَـوْمِكُمْ عِيـدَانِ، فَمَـنْ شَاءَ أَجْزَأَهُ مِنَ الْجُمُعَةِ، وَإِنَّا مُجَمِّعُونَ)

واتە: لـە ئـەبو هـورەیرەوە دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليـه وسـلم فەرموویـەتی: لـەم رۆژەدا بـۆ ئێـوە دوو چـەژن کۆبونەتـەوە، ئـەوەی دەیەوێت نوێژی چەژن بکات ئەوە بـری نوێـژی هـەینی دەکـەوێت، بـەڵام ئێمـە نوێژی هەینی دەکەین.

## باسی لە نوێژی بەیانی رۆژی هەینی چی سورەتێ دەخوێنرێت؟

## ٢١٨ - باب مَا يُقْرَأُ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ.

١٠٧٤ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ (تَنْزِيلُ) السَّجْدَةِ، وَ(هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە نوێژی بەیانی رۆژی هەینیدا ئەم دوو سورەتەی دەخوێند سورەتی: (السَّجْدَة) و سورەتی: (الإِنْسَان).

١٠٧٥ - (صحيح) عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ مُخَوَّلٍ، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ وَزَادَ: فِي صَلاَةِ الْجُمُعَةِ بِسُورَةِ الْجُمُعَةِ وَ (إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ).

واتە: لە شوعبەوە، لەموخەووەلەوە، بە هەمان سەنەدو مانا فەرمودەی پێشو هاتووە، بەڵام ئەمەی بۆ زیادكرد: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە نوێژی هەینیدا ئەم دوو سورەتەی دەخوێند سورەتی: (الْجُمُعَة) و سورەتی: (الْمُنَافِقُون).

## باسی سەبارەت بە لەبەركردنی پۆشاكی رۆژی هەینی.

## ٢١٩ – باب اللُّبْسِ لِلْجُمُعَةِ.

١٠٧٦ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَأَى حُلَّةً سِيَرَاءَ - يَعْنِي تُبَاعُ عِنْدَ بَابِ الْمَسْجِدِ - فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوِ اشْتَرَيْتَ هَذِهِ فَلَبِسْتَهَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَلِلْوَفْدِ إِذَا قَدِمُوا عَلَيْكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّمَا يَلْبَسُ هَذِهِ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ فِي

الآخِرَةِ) ثُمَّ جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهَا حُلَلٌ، فَأَعْطَى عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ مِنْهَا حُلَّةً، فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَسَوْتَنِيهَا وَقَدْ قُلْتَ فِي حُلَّةِ عُطَارِدَ مَا قُلْتَ؟! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنِّي لَمْ أَكْسُكَهَا لِتَلْبَسَهَا !) فَكَسَاهَا عُمَرُ أَخًا لَهُ مُشْرِكًا بِمَكَّةَ.

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە عومەری کوڕی (خَطَّاب) ڕەزای خوای لێ بێ (حُلَّة سِيَرَاء)ی بینی کە پۆشاکێکە لە ئاوریشم - واتە لەبەردەم مزگەوتدا دەیانفرۆشت – وتی: خۆزگە ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم قاتێ لەم پۆشاکەت دەکڕی و لەرۆژانی هەینیدا لەبەرت دەکرد هەروەها لە کاتێکدا کە نوێنەرەکانیش دێنەلات، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (بێگومان تەنها ئەو کەسانە لەبەری دەکەن کە بەشی باشیان نیە لە دوارۆژدا). لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چەند پۆشاکێکی لەو جۆرەی بۆ هات، پۆشاکێکی دا بە عومەری کوڕی (خَطَّاب)، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەبەری بکەم لە کاتێکدا کە تۆ دەربارەی لەبەرکردنی (حُلَّةِ عُطَارِدَ)[١]. ئاواو ئاوات فەرمووی؟! پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: ( بۆ ئەوە پێم نەدایت لەبەری بکەیت!). – بەڵکو بۆ ئەوە پێم دایت کە سوودی لێ ببینی - عومەر ڕەزای خوای لێ بێ برایەکی دایکی هەبوو لەمەککە هاوەڵ بۆ بڕیاردەر بوو دای بەو.

---

[١]- (عُطارِدَ) خاوەنی پۆشاکە ئاوریشمەکە بوو.

١٠٧٧ - (صحيح) عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ، قَالَ: وَجَدَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ حُلَّةَ إِسْتَبْرَقٍ تُبَاعُ بِالسُّوقِ، فَأَخَذَهَا فَأَتَى بِهَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: ابْتَعْ هَذِهِ تَجَمَّلْ بِهَا لِلْعِيدِ وَلِلْوَفْدِ، ثُمَّ سَاقَ الْحَدِيثَ، وَالأَوَّلُ أَتَمُّ.

واتە: لە سالمەوە، لە باوكیەوە — واتە (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ - دەگێڕنەوە،، كە وتویەتی: عومەری كوڕی (خَطّاب) ڕەزای خوای لێ بێ پۆشاكی ئاوریشمی بینی لە بازاڕ دەیانفرۆشت، پۆشاكێكی هەڵگرت و هێنای بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: ئەم پۆشاكە بكڕە خۆتی پێ برازێنەوە لە ڕۆژی جەژن و لە كاتێكدا كە نوێنەرەكان دێنەلات، لەپاشدا راوی فەرمودەكەی گێڕایەوە، بەڵام فەرمودەی یەكەم تەواو ترە.

١٠٧٨ - (صحيح) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حِبَّانَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَا عَلَى أَحَدِكُمْ إِنْ وَجَدَ - أَوْ: مَا عَلَى أَحَدِكُمْ إِنْ وَجَدْتُمْ - أَنْ يَتَّخِذَ ثَوْبَيْنِ لِيَوْمِ الْجُمُعَةِ سِوَى ثَوْبَيْ مَهْنَتِهِ) قَالَ عَمْرٌو: وَأَخْبَرَنِي ابْنُ أَبِي حَبِيبٍ، عَنْ مُوسَى بْنِ سَعْدٍ، عَنِ ابْنِ حَبَّانَ، عَنِ ابْنِ سَلاَمٍ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ ذَلِكَ عَلَى الْمِنْبَرِ.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی حیببانەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لەسەر هەر یەکێ لە ئێوە ئەگەر توانای هەبوو وا چاکە دوو دەست جل و بەرگ بکڕێت بۆ نوێژی هەینی، جگە لە جلی ئیش و کاری). عەمر وتی: ئیبنو ئەبو حەبیب، لە موسای کوڕی سەعدەوە، لە ئیبنو حیببانەوە، لە ئیبنو سەلامەوە، بۆی گێڕامەوە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بووە لەسەر مینبەر ئەمەی فەرمووە.

## باسی سەرچاککردنی ڕۆژی هەینی لە مزگەوتدا لەپێش نوێژدا.

## ٢٢٠ - باب التَّحَلُّقِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ قَبْلَ الصَّلاَةِ.

١٠٧٩ - (حسن) عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الشِّرَاءِ وَالْبَيْعِ فِي الْمَسْجِدِ، وَأَنْ تُنْشَدَ فِيهِ ضَالَّةٌ، وَأَنْ يُنْشَدَ فِيهِ شِعْرٌ، وَنَهَى عَنِ التَّحَلُّقِ قَبْلَ الصَّلاَةِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لەباوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم شتانەی قەدەغەکردوە لەمزگەوتدا: کڕین و فرۆشتن، بانگەواز بۆ شتی ونبوو، خوێندنەوەی شیعر و هۆنراوە. هەروەها سەرچاککردن لەپێش نوێژی ڕۆژی هەینی دا.

## باسی سەبارەت بە دانانی مینبەر لە مزگەوتدا.

## ٢٢١ - باب فِي اتِّخَاذِ الْمِنْبَرِ.

١٠٨٠ - (صحيح) عَنْ أَبُو حَازِمِ بْنُ دِينَارٍ: أَنَّ رِجَالاً أَتَوْا سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ وَقَدِ امْتَرَوْا فِي الْمِنْبَرِ مِمَّ عُودُهُ؟ فَسَأَلُوهُ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: وَاللَّهِ، إِنِّي لأَعْرِفُ مِمَّا هُوَ، وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ أَوَّلَ يَوْمٍ وُضِعَ، وَأَوَّلَ يَوْمٍ جَلَسَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. أَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى فُلاَنَةَ - امْرَأَةٍ قَدْ سَمَّاهَا سَهْلٌ - أَنْ (مُرِي غُلاَمَكِ النَّجَّارَ أَنْ يَعْمَلَ لِي أَعْوَادًا أَجْلِسُ عَلَيْهِنَّ إِذَا كَلَّمْتُ النَّاسَ) فَأَمَرَتْهُ فَعَمِلَهَا مِنْ طَرْفَاءِ الْغَابَةِ، ثُمَّ جَاءَ بِهَا فَأَرْسَلَتْهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَ بِهَا فَوُضِعَتْ هَا هُنَا، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى عَلَيْهَا، وَكَبَّرَ عَلَيْهَا، ثُمَّ رَكَعَ وَهُوَ عَلَيْهَا، ثُمَّ نَزَلَ الْقَهْقَرَى فَسَجَدَ فِي أَصْلِ الْمِنْبَرِ، ثُمَّ عَادَ، فَلَمَّا فَرَغَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: (أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّمَا صَنَعْتُ هَذَا لِتَأْتَمُّوا بِي، وَلِتَعَلَّمُوا صَلاَتِي)

واتە: لە ئەبو حازمی کوڕی دینارەوە دەگێڕنەوە، کە پیاوانێ هاتنە خزمەت سەهلی کوڕی سەعدی ساعدی مشت و مڕیان بوو لەسەر ئەوە کە مینبەری مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لە تەختەی چ دارێ دروستکراوە؟ بۆیە سەبارەت بەوە لە سەهلیان پرسی؟ ئەویش وتی: بە خوای گەورە دەزانم لە تەختەی چ دارێ دروستکراوە، بەچاوی خۆم مینبەرەکەم بینی کە چۆن دانرا، وە بەچاوی خۆم پێغەمبەری خوام بینی صلی الله علیە وسلم کە یەکەم رۆژ لەسەری دانیشت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ناردی بۆلای فلانە ئافرەت – سەهل ناوی ئافرەتەکەی برد – کە (فەرمان بکە بە نۆکەرە دارتاشەکەت مینبەرێکم بۆ دروست بکات بۆ ئەوەی لەسەری دانیشم لەکاتێکدا کە وتار دەدەم بۆ خەڵك)، ئافرەتەکەش فەرمانی کرد بە نۆکەرەکەی لە(طرفاء) بۆی دروست بکات کە دارێکە لە دارەکانی جەنگەڵەکەی نزیك مەدینە، ئەویش مینبەرەکەی دروستکردو هێنای، ئافرەتەکە مینبەرەکەی نارد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمانی کرد لەم جێگەیەی ئێستادا دانرا - سەهل ئاماژەی کرد بۆ جێگەیە لە قیبلەی مزگەوت کە نزیك دیواری سەرووی قیبلەی مزگەوت بوو، نێوان مینبەرەکەو دیوارەکە بە ئەندازەی گوزەرگای مەڕێك دەبوو، واتە ئەوەندەی کە مەڕێ پێیدا تێپەڕ ببێت – جا بەچاوی خۆم پێغەمبەری خوام صلی الله علیە وسلم بینی نوێژی لەسەر کرد، (الله أکبر)ی نوێژ دابەستنی کرد، دەستی کرد بە قورئان خوێندنی رکاتی یەکەم و لەسەر مینبەرەکە رکوعی برد، لەپاشدا پاشەوپاش لەسەر مینبەرەکە دابەزی رووی لە قیبلە وەرنەگێڕا لەئاستی بنی مینبەرەکەدا لەسەر زەویەکە دوو سەجدەی برد، لەپاشدا سەرکەوتەوە سەر مینبەرەکە بۆ رکاتی دووەم بە هەمان شێوە، کاتێ کە لەنوێژ بوویەوە رووی کردە خەڵکەکە فەرمووی: ( ئەی خەڵکینە، ئەم نوێژەم بۆیە کرد بۆ ئەوەی شوێن خۆم بکەون و بمکەنە سەرمەشق بۆ خۆتان و، چۆنیەتی نوێژ کردنەکەم فێرببن).

١٠٨١ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا بَدَّنَ، قَالَ لَهُ تَمِيمٌ الدَّارِيُّ: أَلاَ أَتَّخِذُ لَكَ مِنْبَرًا يَا رَسُولَ اللَّهِ يَجْمَعُ – أَوْ: يَحْمِلُ – عِظَامَكَ؟ قَالَ: (بَلَى) فَاتَّخَذَ لَهُ مِنْبَرًا مِرْقَاتَيْنِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەساڵاچوو گۆشتی زیادی کرد، تەمیمی داری پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم مینبەرێکت بۆ دانەنێین بۆ ئەوەی جەستەت هەڵگرێت؟ فەرمووی: (بەڵێ). جا ئەوانیش مینبەرێکی دوو پلەیان بۆ دانا.

## باسی سەبارەت بە شوێنی دانانی مینبەر.

## ٢٢٢ – باب مَوْضِعِ الْمِنْبَرِ.

١٠٨٢ - (صحيح) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ قَالَ: كَانَ بَيْنَ مِنْبَرِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَبَيْنَ الْحَائِطِ كَقَدْرِ مَمَرِّ الشَّاةِ.

واتە: لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: نێوان مینبەرەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەو دیوارەی کە بەرامبەری

دەوەستا لەكاتی نوێژدا بە ئەندازەی گوزەرگای مەرێك دەبوو، واتە ئەوەندەی كە مەڕێ پێیدا تێپەڕ ببێت.

## باسی نوێژی هەینی پێش خۆر لاربونەوە.

## ٢٢٣ – باب الصَّلاَةِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ قَبْلَ الزَّوَالِ.

١٠٨٣ - (ضعيف) عَنْ أَبِى قَتَادَةَ، عَنِ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَرِهَ الصَّلاَةَ نِصْفَ النَّهَارِ إِلاَّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَقَالَ: (إِنَّ جَهَنَّمَ تُسْجَرُ، إِلاَّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ)

واتە: لە ئەبو قەتادەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی نیوەی رۆژی پێ ناخۆش بووە جگە لە رۆژی هەینی، وە فەرمووی: (بێگومان ئاگری دۆزەخ هەمیشە هەڵدەگیرسێندرێت، جگە لە رۆژی هەینی).

## باسی سەبارەت بەكاتی نوێژی هەینی.

## ٢٢٦ – باب فِى وَقْتِ الْجُمُعَةِ.

١٠٨٤ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّى الْجُمُعَةَ إِذَا مَالَتِ الشَّمْسُ.

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیكەوە دەگێڕنـەوە، كـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليه وسلم كاتێك نوێژی هەینی دەكرد كە خۆر لە ناوەڕاستـی ئاسمـان لایبدایە، واتە لایبدایە بۆلای خۆرئاوا.

١٠٨٥ - (صحيح) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْجُمُعَةَ، ثُمَّ نَنْصَرِفُ وَلَيْسَ لِلْحِيطَانِ فَىْءٌ.

واتـە: سـەلەمەی كـوڕی ئـەكوەع لـە باوكیـەوە گێڕایـەوەو وتـی: ئێمـە لەگەڵ پێغەمبـەری خـوادا صـلی الله علیـە وسـلم نوێـژی هـەینیمان دەكـرد، لەپاشـدا دەگەڕاینەوە دیوار ئەوەندە سێبەری نەبوو كە بچینە بەر سێبەرەكەی.

١٠٨ - (صحيح) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: كُنَّا نَقِيلُ وَنَتَغَدَّى بَعْدَ الْجُمُعَةِ.

واتـە: لـە سـەهلی كـوڕی سـەعدەوە دەگێڕنـەوە، كـە وتویـەتی: ئێمـە لـەدوای نوێژی هـەینی نـانی نیوەڕۆمـان دەخـوارد و خـەوی پـێش نیـوەڕۆ (قیلولـە)مان دەكرد.

# باسی بانگدانی رۆژی هەینی.

## ٢٢٥ – باب النِّدَاءِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ.

١٠٨٧ - (صحيح) عَنِ السَّائِبُ بْنُ يَزِيدَ، أَنَّ الأَذَانَ كَـانَ أَوَّلُـهُ حِـينَ يَجْلِسُ الإِمَامُ عَلَى الْمِنْبَرِ يَـوْمَ الْجُمُعَـةِ، فِـى عَهْـدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبِى بَكْـرٍ وَعُمَـرَ رَضِـىَ اللهُ عَنْهُما، فَلَمَّا كَانَ خِلاَفَةُ عُثْمَانَ وَكَثُرَ النَّاسُ أَمَـرَ عُثْمَانُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ بِالأَذَانِ الثَّالِـثِ، فَـأُذِّنَ بِـهِ عَلَـى الزَّوْرَاءِ، فَثَبَتَ الأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ.

واته: سائیبی کوڕی یەزید دەڵێت: جاران لەسەردەمی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم هەروەها لەسەردەمی ئەبو بەکر و عەمەریشدا ڕەزای خوایان لێ بێ سەرەتا بانگدان لەڕۆژی هەینیدا لەو کاتە بوو کە پێشنوێژ لەسەر مینبەر دائەنیشت، بەڵام کاتێ کە (عثمان) ڕەزای خوای لێ بێ بوو بە خەلیفەو خەڵك زۆر بوون فەرمانی کرد لە رۆژی هەینیدا بانگی سێهەم بدرێت، لەسەر (زَوْرَاء)[1] بانگ دەدرا، ئەو کارەش بەو شێوەیە جێگیر بوو.

---

[1]- شوێنێك بووە لەبازاڕی مەدینە لەنزیك مزگەوتەوە.

١٠٨٨ - (منكر بزيادة: (عَلَى بَابِ المَسْجِدِ) ) عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ، قَالَ: كَانَ يُؤَذَّنُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ، وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ.

واتە: لە سائیبی كوڕی یەزیدەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: بە ئامادەبوونی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ڕۆژی هەینیدا لەبەردەم دەرگای مزگەوتدا ئەو كاتە بانگ دەدرا كە لەسەر مینبەر دائەنیشت، هەروەها لەسەردەمی ئەبو بەكر و عەمەریشدا ڕەزای خوایان لێ بێ بەو شێوەیە بوو.

١٠٨٩ - (صحيح) عَنِ السَّائِبِ قَالَ: لَمْ يَكُنْ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلاَّ مُؤَذِّنٌ وَاحِدٌ: بِلاَلٌ.

واتە: سائیبی كوڕی یەزید دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەنها یەك بانگبێژی هەبووە بۆ ڕۆژی هەینی: ئەویش بیلال بوو.

١٠٩٠ - (صحيح) عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ ابْنَ أُخْتِ نَمِرٍ أَخْبَرَهُ ، قَالَ: وَلَمْ يَكُنْ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَيْرُ مُؤَذِّنٍ وَاحِدٍ.

واتە: ئیبنو شیهاب دەڵێت: سائیبی كوڕی یەزید خوشكەزای نەمیر بۆی گێڕامەوە، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ ڕۆژی هەینی جگە لە یەك بانگبێژ بانگبێژی تری نەبوو.

# باسی وتاربێژ قسە لەگەڵ كەسێ بكات لەكاتی وتارەكەیدا.

# ٢٢٦ – باب الإِمَامِ يُكَلِّمُ الرَّجُلَ فِي خُطْبَتِهِ.

١٠٩١ - (صحيح) عَنْ جَابِرٍ، قَالَ: لَمَّا اسْتَوَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، قَالَ: (اجْلِسُوا) فَسَمِعَ ذَلِكَ ابْنُ مَسْعُودٍ، فَجَلَسَ عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ، فَرَآهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (تَعَالَ يَا عَبْدَاللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا يُعْرَفُ مُرْسَلٌ، إِنَّمَا رَوَاهُ النَّاسُ عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لە رۆژی هەینیدا كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەسەر مینبەرەكەی جێگیر بوو – بینی هەندێ كەس بە پێوە بوون - فەرمووی: (دانیشن). ئیبنو مەسعود گوێی لێ بوو، لەبەر دەرگای مزگەوتدا دانیشت، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بینی بانگی كردو فەرمووی: (ئەی (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی مەسعود وەرە پێشەوە). - چونكە (عَبْدُ اللّه) لە هاوەڵە گەورە شەرع زانەكان بوو-. ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرمودە بە (مُرْسَل) ناسراوە، چونكە خەڵك لە (عَطَاء)وە گێڕاویانەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم.

# باسی دانیشتنی پێشنوێژ کاتێ کە سەرکەوتە سەر مینبەر.

# ٢٢٧ – باب الْجُلُوسِ إِذَا صَعِدَ الْمِنْبَرَ.

١٠٩٢ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ خُطْبَتَيْنِ، كَانَ يَجْلِسُ إِذَا صَعِدَ الْمِنْبَرَ حَتَّى يَفْرُغَ - أُرَاهُ قَالَ: الْمُؤَذِّنُ - ثُمَّ يَقُومُ فَيَخْطُبُ، ثُمَّ يَجْلِسُ فَلاَ يَتَكَلَّمُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيَخْطُبُ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ڕۆژی هەینی دوو وتاری دەدا، کاتێ کە دەچووە سەر مینبەر دائەنیشت هەتا بانگبێژ لە بانگەکەی دەبۆوە، لەپاشدا هەڵئەسایەوە وتاری یەکەمی دەدا، ئینجا دائەنیشت بەبێدەنگی و قسەی نەدەکرد، جا هەڵئەسایەوە وتاری دووەمی دەدا.

# باسی وتاردان بە پێوە.

## ٢٢٨ - باب الْخُطْبَةِ قَائِمًا.

١٠٩٣ - (حسن) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَخْطُبُ قَائِمًا، ثُمَّ يَجْلِسُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيَخْطُبُ قَائِمًا، فَمَنْ حَدَّثَكَ أَنَّهُ كَانَ يَخْطُبُ جَالِسًا فَقَدْ كَذَبَ، فَقَالَ: فَقَدْ وَاللَّهِ صَلَّيْتُ مَعَهُ أَكْثَرَ مِنْ أَلْفَيْ صَلاَةٍ.

واتە: لە جابری كوڕی سەمورەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لەرۆژی هەینی دا بەپێوە وتارێكی دەدا، لەپاشدا كەمێ دائەنیشت بەبێدەنگی، ئینجا هەڵئەسایەوە وتاری دووەمیشی دەدا،، هەركەس باسی ئەوەی بۆكردن كە گوایە پێغەمبەری صلی الله علیە وسلم وتاری هەینی داوە بەدانیشتنەوە بەڕاستی ئەوە درۆ دەكات، جابر وتی: سوێند بە خوا زیاد لە دوو هەزار جار نوێژم لەپشت پێغەمبەرەوە صلی الله علیە وسلم كردوە نەمدیوە بەدانیشتنەوە وتاری دابێت.

١٠٩٤ - (حسن) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ، قَالَ: كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خُطْبَتَانِ كَانَ يَجْلِسُ بَيْنَهُمَا، يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، وَيُذَكِّرُ النَّاسَ.

واتە: لە جابری كوڕی سەمورەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەرۆژی هەینی دا دوو وتاری دەدا لە نێوانیاندا كەمێ دادەنیشت، لە وتارەكەیدا قورئانی دەخوێندو، ئامۆژگاری خەڵكی دەكرد.

١٠٩٥ - (حسن) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ قَائِمًا، ثُمَّ يَقْعُدُ قَعْدَةً لاَ يَتَكَلَّمُ.

واتە: لە جابری كوڕی سەمورەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلم بینی لەرۆژی هەینی دا بە پێوە وتاری دەدا، لەپاشدا كەمێ دادەنیشت بەبێدەنگی و قسەی نەدەكرد.

## باسی كەسێ لەكاتی وتارداندا خۆی بدات بەسەر كەوانێكدا.

## ٢٢٩ - باب الرَّجُلِ يَخْطُبُ عَلَى قَوْسٍ.

١٠٩٦ - (حسن) عَنْ شُعَيْبُ بْنُ رُزَيْقٍ الطَّائِفِيُّ، قَالَ: جَلَسْتُ إِلَى رَجُلٍ لَهُ صُحْبَةٌ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُقَالُ لَهُ الْحَكَمُ بْنُ حَزْنٍ الْكُلَفِيُّ، فَأَنْشَأَ يُحَدِّثُنَا قَالَ: وَفَدْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَابِعَ سَبْعَةٍ - أَوْ تَاسِعَ تِسْعَةٍ - فَدَخَلْنَا عَلَيْهِ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، زُرْنَاكَ فَادْعُ اللَّهَ لَنَا بِخَيْرٍ، فَأَمَرَ بِنَا، أَوْ

أَمَـرَ لَنَـا بِشَـيْءٍ مِـنَ التَّمْـرِ، وَالشَّـأْنُ إِذْ ذَاكَ دُونٌ، فَأَقَمْنَا بِهَا أَيَّامًا شَهِدْنَا فِيهَا الْجُمُعَةَ مَعَ رَسُولِ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَامَ مُتَوَكِّئًا عَلَـى عَصًـا- أَوْ: قَوْسٍ - فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَـى عَلَيْـهِ: كَلِمَـاتٍ خَفِيفَـاتٍ طَيِّبَاتٍ مُبَارَكَاتٍ، ثُمَّ قَالَ: (أَيُّهَا النَّـاسُ، إِنَّكُـمْ لَـنْ تُطِيقُوا - أَوْ: لَنْ تَفْعَلُوا - كُلَّ مَا أُمِرْتُمْ بِـهِ، وَلَكِـنْ سَدِّدُوا وَأَبْشِرُوا)

واتە: لە شوعەیبی کوڕی روزەیقی (طَّائِفِیّ)ەوە دەگێڕنـەوە، کە وتویەتی: لەلای پیاوێکدا دانیشتبووم هاوەڵێتی پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم کردبوو پێیان دەوت: حەکەمی کوڕی حەزنی کولەفی، دەستی کرد بە قسەکردن بۆمان وتی: حەوتەمینی ئەو حەوت کەسە بووم یان نۆهەمینی ئەو نۆ کەسە بووم کە بە نوێنەری چوینە خزمەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم هاتوین بۆ سەردانت تۆش لەخوا بۆمان بپاڕێرەوەو دوعای خێرو چاکەمان بۆ بکە، فەرمانی کرد کەمێ خورمایان بۆ هێناین، ئەوکاتە حاڵ بەو شێوەیە بوو، لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم چەند رۆژێ ماینەوە نوێژێکی هەینیمان لەگەڵ کرد، جا هەستا خۆیدا بەسەر عەساکەیدا یان کەوانێکدا ئەو دارەی کە بەدەستیەوە بوو، سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگاری کرد: وشەی پاراو و چاك و پاك و ئاسان و پیرۆزی بەکاردەهێنا، لەپاشدا فەرمووی: (ئەی خەڵکینە ئێوە تواناتان نیەو ناتوانن ئەو هەموو بڕیارەی کە دراوە بەسەرتاندا بیکەن، بەڵام بەردەوام دڵسۆزو خۆگربن و موژدەدەربن).

١٠٩٧ - (ضعيف) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا تَشَهَّدَ قَالَ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ، نَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، أَرْسَلَهُ بِالْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ، مَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ رَشَدَ، وَمَنْ يَعْصِهِمَا فَإِنَّهُ لاَ يَضُرُّ إِلاَّ نَفْسَهُ، وَلاَ يَضُرُّ اللَّهَ شَيْئًا)

واتە: ئیبنو مەسعود دەڵێت: كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتاری دەدا دەیفەرموو: (سوپاس و ستایش بۆ خوایە، ستایشی دەكەین و داوای كۆمەكی و لێخۆشبونی لێ دەكەین، پەنا دەگرین بە خوا لە خراپی دەروونمان، هەركەسێ خوا ڕێنمایی بكات گومڕاكەری نیە، وە هەركەسێ گومڕا ببێت ڕێنمایی كەری نیە، وە شایەتی دەدەم كە هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله)، تاكی بێ هاوبەشە، وە شایەتی دەدەم كە موحەممەد صلى الله عليه وسلم بەندەو نێردراوی خوایە، بەهەق ڕەوانەی كرد پێش هاتنی قیامەت كە ترسێنەرو موژدەدەر بێت، هەركەس گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەكەی بێ ئەوە ڕێی ڕاستی دۆزیوەتەوە، هەركەس سەرپێچی بكات ئەوە جگە لەخۆی زیان لەكەسی تر نادات، بە هیچ شێوەیەك زیان بە خوا ناگەیەنێت).

١٠٩٨ - (ضعيف) عَنْ يُونُسَ، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ شِهَابٍ عَنْ تَشَهُّدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ؟ فَذَكَرَ نَحْوَهُ، قَالَ: (وَمَنْ يَعْصِهِمَا فَقَدْ غَوَى، وَنَسْأَلُ اللَّهَ رَبَّنَا أَنْ يَجْعَلَنَا مِمَّنْ يُطِيعُهُ، وَيُطِيعُ رَسُولَهُ، وَيَتَّبِعُ رِضْوَانَهُ، وَيَجْتَنِبُ سَخَطَهُ، فَإِنَّمَا نَحْنُ بِهِ وَلَهُ) .

واتە: یونوس دەڵێت: سەبارەت بە چۆنیەتی وتاردانی نوێژی هەینی لە ئیبنو شیهاب پرسیار کرا؟ راوی بە هەمان شێوە فەرمودەکەی پێشوی گێڕایەوە، فەرمووی: (هەرکەس سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ئەوە بێگومان گومڕابووە، داواکارین لە خوای گەورەو پەروەرگارمان بمانخاتە ریزی ئەو کەسانەی کە گوێڕایەڵی خوا و گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی دەکەن و، شوێن رەزامەندی خوای گەورە دەکەون و، لە رق و تورەیی خۆیان بەدوور دەگرن، بێگومان ئێمە پەنا هەربۆلای ئەو دەبەین و بەندەی ئەوین).

١٠٩٩ - (صحيح) عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ، أَنَّ خَطِيبًا خَطَبَ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: مَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، وَمَنْ يَعْصِهِمَا، فَقَالَ: (قُمْ - أَوِ اذْهَبْ - بِئْسَ الْخَطِيبُ أَنْتَ).

واتە: عەدی کوڕی حاتیم دەڵێت: بە ئامادەبوونی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم وتاربێژێ وتاری دەدا وتی: هەرکەس گوێڕایەڵی خواو

پێغەمبەرەکەی بکات، وە هەرکەس سەرپێچیان بکات، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هەستە – یان بڕۆ – تۆ تاربێژێکی خراپی)[١].

١١٠٠ - (صحيح) عَنْ بِنْتِ الْحَارِثِ بْنِ النُّعْمَان، قَالَتْ: مَا حَفِظْتُ قاف إِلاَّ مِنْ فِي رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، كَانَ يَخْطُبُ بِهَا كُلَّ جُمُعَةٍ، قَالَتْ: وَكَانَ تَنُّورُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَتَنُّورُنَا وَاحِدًا.

واتە: لە کچی (حارِث)ی کوڕی نوعمانەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: سورەتی قافم لەدەمی موبارەکی پێغەمبەری خوا خۆیەوە صلی الله علیه وسلم لەبەرکردوە، چونکە هەموو هەینییەك دەیخوێندەوە، هەروەها وتی: تەنووری ماڵی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و ماڵی ئێمە یەك بوو.

١١٠١ - (حسن) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: كَانَتْ صَلاَةُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَصْدًا، وَخُطْبَتُهُ قَصْدًا، يَقْرَأُ آيَاتٍ مِنَ الْقُرْآنِ، وَيُذَكِّرُ النَّاسَ.

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: هەم نوێژ و هەم وتاری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم مام ناوەندو کورت و پوخت بوو، چەند ئایەتێ لە ئایەتەکانی قورئانی دەخوێندو، ئامۆژگاری خەڵکەکەی دەکرد.

---

[١]- دەبوایە بیگوتایە: هەرکەس سەرپێچی خواو، پێغەمبەری خوا بکات بەڕاستی گومڕا بووە.

١١٠٢ - (صحيح) عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ أُخْتِهَا، قَالَتْ مَا أَخَذْتُ ق إِلاَّ مِنْ فِي رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْرَؤُهَا فِي كُلِّ جُمُعَةٍ.

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە، لە (عَمْرَة)وە، ئەویش لە خوشکەکەیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: سورەتی قافم لەدەمی موبارەکی پێغەمبەری خوا خۆیەوە صلى الله عليه وسلم لەبەرکردوە، چونکە هەموو هەینییەك دەیخوێندەوە.

١١٠٣ - (إسناده صحيح) عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ، عَنْ أُخْتٍ لِعَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ كَانَتْ أَكْبَرَ مِنْهَا، بِمَعْنَاهُ.

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە، لە (عَمْرَة)وە، لە خوشکێکی (عَمْرَة)ی کچی (عَبْدُ الرَّحْمَن)ەوە کە لە خۆی گەورەتر بوو فەرموودەی پێشو بە هەمان مانا هاتووە.

# باسی بەرزکردنەوەی هەردوو دەست لەسەر مینبەر.

## ٢٣٠ – باب رَفْعِ الْيَدَيْنِ عَلَى الْمِنْبَرِ.

١١٠٤ - (صحيح) عَنْ حُصَيْنِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ، قَالَ: رَأَى عُمَارَةُ بْنُ رُؤَيْبَةَ بِشْرَ بْنَ مَرْوَانَ وَهُوَ يَدْعُو فِى يَوْمِ جُمُعَةٍ، فَقَالَ عُمَارَةُ: قَبَّحَ اللَّهُ هَاتَيْنِ الْيَدَيْنِ، قَالَ زَائِدَةُ: قَالَ حُصَيْنٌ: حَدَّثَنِى عُمَارَةُ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ مَا يَزِيدُ عَلَى هَذِهِ، يَعْنِى السَّبَّابَةَ الَّتِى تَلِى الإِبْهَامَ.

واتە: حوصەینی کوڕی (عَبْدُ الرَّحْمَن) دەڵێت: عومارەی کوڕی روئەیبە رۆژی هەینی بیشری کوڕی مەروانی بینی لەسەر مینبەر دەستەکانی بەرزکردبۆوەو دەپاڕایەوە، عومارە وتی: خوا ئەو دوو دەستەی بێ خێر و ناشیرین بکات، (زَائِدَةُ) وتی: حوصەین وتی: عومارە بۆی گێڕامەوە وتی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلم بینی لەوتاری هەینی دا لەمە زیاتری نەدەکرد، واتە بە پەنجەی شایەتومانی ئاماژەی دەکرد لەکاتی پاڕانەوەدا.

١١٠٥ - (ضعيف) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، قَالَ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَاهِرًا يَدَيْهِ قَطُّ يَدْعُو عَلَى مِنْبَرِهِ، وَلاَ عَلَى غَيْرِهِ، وَلَكِنْ رَأَيْتُهُ يَقُولُ هَكَذَا، وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ، وَعَقَدَ الْوُسْطَى بِالإِبْهَامِ.

واتە: سەهلی كوڕی سەعد دەڵێت: هەرگیز پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم نەدیوە لەسەر مینبەر یان غەیری مینبەر دەستەكانی بەرزكردبێتەوە بەشێوەیە كە بن باڵی دەركەوێت، بەڵام بەچاوی خۆم بینم بەم شێوەیەی كرد، پەنجەی ناوەڕاستی و پەنجە گەورەی كرد بە ئەڵقەیەك و پەنجەی شایەتومانی بەرزدەكردەوەو ئاماژەی پێكرد.

## باسی خوێندنەوەی وتاری كورت.

## ٢٣١ - باب إِقْصَارِ الْخُطَبِ.

١١٠٦ - (صحيح) عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ، قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِإِقْصَارِ الْخُطَبِ.

واتە: لە عەماری كوڕی یاسرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ دەكردین بەخوێندنەوەی وتاری كورت و پڕ مانا.

١١٠٧ - (حسن) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ السُّوَائِىِّ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يُطِيلُ الْمَوْعِظَةَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، إِنَّمَا هُنَّ كَلِمَاتٌ يَسِيرَاتٌ.

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەی سوائییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم درێژەی نەدەدا بە وتاری رۆژی هەینی، بەڵکو وتارەکەی بریتی بوو لە چەند وشەیەکی ئاسان و کەم و پڕ مانا.

## باسی نزیکبونەوە لە پێشنوێژ لەکاتی وتارداندا.

## ٢٣٢ - باب الدُّنُوِّ مِنَ الإِمَامِ عِنْدَ الْمَوْعِظَةِ.

١١٠٨ - (حسن) عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ، أَنَّ نَبِىَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: (احْضُرُوا الذِّكْرَ، وَادْنُوا مِنَ الإِمَامِ، فَإِنَّ الرَّجُلَ لاَ يَزَالُ يَتَبَاعَدُ حَتَّى يُؤَخَّرَ فِى الْجَنَّةِ وَإِنْ دَخَلَهَا).

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئامادەی وتاری هەینی بن و، ئەوەندەی بۆتان دەکرێت نزیکببنەوە لە پێشنوێژ – ئەمەش ئاماژەیە بۆ زوو رۆشتن بۆ نوێژی هەینی - ، چونکە بەردەوام پیاو ئەوەندە دوادەکەوێت لە چوون بۆ نوێژی هەینی و دووردەکەوێتەوە لە وتاربێژ هەتا لە چوونە بەهەشت و پلە بەرزەکانی دوادەکەوێت ئەگەر بچێتە ناویەوە).

## باسی وتاربێژ لەبەر روداوێ وتارەکەی دەبڕێت.

## ٢٣٣ - باب الإِمَامِ يَقْطَعُ الْخُطْبَةَ لِلأَمْرِ يَحْدُثُ.

١١٠٩ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَقْبَلَ الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا عَلَيْهِمَا قَمِيصَانِ أَحْمَرَانِ، يَعْثُرَانِ وَيَقُومَانِ، فَنَزَلَ، فَأَخَذَهُمَا، فَصَعِدَ بِهِمَا الْمِنْبَرَ، ثُمَّ قَالَ: (صَدَقَ اللَّهُ: (أَنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ)). رَأَيْتُ هَذَيْنِ فَلَمْ أَصْبِرْ). ثُمَّ أَخَذَ فِي الْخُطْبَةِ.

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی بورەیدەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتاری بۆ دەداین، لەوکاتەدا حەسەن و حوسەین رەزای خوایان لێ بێ هاتن هەریەکەو کراسێکی سوریان لەبەردا بوو، دەکەوتن و هەڵئەسانەوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە سەر مینبەرەکەی دابەزی و، لەباوەشی کردن و بردنیە سەر مینبەرەکە، لەپاشدا فەرمووی: (خوای گەورە راستی فەرمووە کە دەفەرموویێت:( بەڕاستی ماڵ و منداڵەکانتان فیتنەن). کاتێ ئەم دوانەم بینی دەکەوتن و هەڵئەسانەوە خۆم پێ ڕانەگیرا). لەپاشدا دەستی کردەوە بە وتاردان.

# باسی دانیشتنی (الاِحتِبَاء) لەوکاتەدا کە پێشنوێژ وتار دەدات.

## ٢٣٤ - باب الاِحْتِبَاءِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ.

١١١٠ - (حسن) عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الْحُبْوَةِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ.

واتە: لە سەهلی کوڕی (مُعَاذ)ی کوڕی ئەنەسەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم قەدەغەیکردوە لەوکاتەدا کە پێشنوێژ وتاری هەینی دەدات کەسێ هەردوو پێی بلکێنێ بە سکیەوەو بە کراسەکەی توندیان بکات لەگەڵ پشتیدا.

١١١١ - (ضعيف) عَنْ يَعْلَى بْنِ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ قَالَ: شَهِدْتُ مَعَ مُعَاوِيَةَ بَيْتَ الْمَقْدِسِ، فَجَمَّعَ بِنَا، فَنَظَرْتُ، فَإِذَا جُلُّ مَنْ فِي الْمَسْجِدِ أَصْحَابُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَرَأَيْتُهُمْ مُحْتَبِينَ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ يَحْتَبِي وَالإِمَامُ يَخْطُبُ، وَأَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، وَشُرَيْحٌ، وَصَعْصَعَةُ بْنُ صُوحَانَ، وَسَعِيدُ بْنُ

الْمُسَيَّبِ، وَإِبْرَاهِيمُ النَّخَعِيُّ، وَمَكْحُولٌ، وَإِسْمَاعِيلُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ سَعْدٍ، وَنُعَيْمُ بْنُ سَلاَمَةَ، قَالَ: لاَ بَأْسَ بِهَا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَلَمْ يَبْلُغْنِي أَنَّ أَحَدًا كَرِهَهَا إِلاَّ عُبَادَةُ بْنُ نُسَيٍّ.

واته: له یەعلای کوڕی شەددادی کوڕی ئەوسەوە، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەگەڵ موعاویەدا ئامادەی قودس بووم، وتاری هەینی بۆداین، سەرنجم دا زۆربەی ئەو کەسانەی کە لە مزگەوتدا بوون لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوون، بەچاوی خۆم بینیم لەوکاتەدا کە پێشنوێژ وتاری هەینی دەدا بەشێوەی (الإحتبَاء) دانیشتبوون. ئەبو داود دەڵێت: ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ لەوکاتەدا کە پێشنوێژ وتاری هەینی داوە بەشێوەی (الإحتبَاء) دانیشتووە، ئەنەسی کوڕی مالیك و شورەیح و(صَعْصَعَة)ی کوڕی (صُوحَان)و سەعیدی کوڕی موسەییەب و ئیبراهیمی نەخەعی و مەکحول و ئیسماعیلی کوڕی موحەممەدی کوڕی سەعدو نوعەیمی کوڕی سەلامە دەڵێن: دانیشتن بەشێوەی (الإحتِبَاء) هیچی تێدا نیە. ئەبو داود دەڵێت: پێم نەگەیشتووە کەس پێی ناخۆش بێت جگە لە عوبادەی کوڕی نوسەیی.

## باسی قسەکردن لەکاتێکدا کە پێشنوێژ وتار دەدات.

## ٢٣٥ - باب الْكَلاَمِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ.

١١١٢ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، قَالَ: (إِذَا قُلْتَ أَنْصِتْ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ فَقَدْ لَغَوْتَ)

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ئەگەر لەکاتی وتاری هەینی دا بە هاوەڵەکەت بڵێی بێدەنگ بە ئەوە قسەی نابەجێ و پڕوپوچت کردوە و خێری نوێژی هەینیەکەت نامێنێ.

١١١٣ - (حسن) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو عَنِ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، قَالَ: (يَحْضُرُ الْجُمُعَةَ ثَلاَثَةُ نَفَرٍ رَجُلٌ حَضَرَهَا يَلْغُو وَهُوَ حَظُّهُ مِنْهَا، وَرَجُلٌ حَضَرَهَا يَدْعُو فَهُوَ رَجُلٌ دَعَا اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِنْ شَاءَ أَعْطَاهُ وَإِنْ شَاءَ مَنَعَهُ، وَرَجُلٌ حَضَرَهَا بِإِنْصَاتٍ وَسُكُونٍ، وَلَمْ يَتَخَطَّ رَقَبَةَ

مُسْلِمٍ، وَلَمْ يُؤْذِ أَحَدًا، فَهِيَ كَفَّارَةٌ إِلَى الْجُمُعَةِ الَّتِي تَلِيهَا وَزِيَادَةُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ، وَذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَقُولُ: ﴿مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا﴾.

واتە: لە (عَبْدُ اللّٰه)ی كوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: سێ جۆر پیاو ئامادەی نوێژی هەینی دەبن: پیاوێ لەكاتی ئامادەبووندا قسەی نابەجێ و پڕوپوچ دەكات ئەوە هەر ئەوەندەی قسە نابەجێ و پڕوپوچەكەی بۆ دەنوسرێت، پیاوێ ئامادە دەبێ لە خوا دەپاڕێتەوە خوای گەورە بەویستی خۆیەتی ئەو شتەی پێ دەبەخشێت یان لێی قەدەغە دەكات، پیاوێ ئامادە دەبێ بە هێمنی و بە بێدەنگی، هەنگاو نانێت بەسەر ملی هیچ موسوڵمانێكدا، وە ئازاری كەسیش نادات ئەوە ئەو هەینیە دەبێتە كەفارەتی گوناهەكانی ئەو هەفتەیەی هەتا هەفتەیەكی تر لەگەڵ سێ ڕۆژی تری زیادە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە كە خوای گەورە دەفەرموێت: هەر كەسێك چاكەیە بكات ئەوە (لەڕۆژی دوایی دا) دە ئەوەندەی چاكەكەی پاداشتی بۆ هەیە.

# باسی مۆڵەت وەرگرتنی کەسێ لە پێشنوێژ کاتێ کە دەستنوێژی دەشکێ.

# ٢٣٦ - باب اسْتِئْذَانِ الْمُحْدِثِ الإِمَامَ.

١١١٤ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا أَحْدَثَ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَتِهِ، فَلْيَأْخُذْ بِأَنْفِهِ، ثُمَّ لْيَنْصَرِفْ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ وَأَبُو أُسَامَةَ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا دَخَلَ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ). لَمْ يَذْكُرَا عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ لەئێوە لەنوێژەکەیدا دەستنوێژی شکا، با دەست بگرێ بە لوتیەوە بۆ ئەوەی وابزانن کە لوتی پژاوە - ، لەپاشدا بچێتە دەرەوە - دەستنوێژەکەی تازە بکاتەوە -). ئەبو داود دەڵێت: حەممادی کوڕی سەلەمەو ئەبو ئوسامە ئەم فەرمودەیان گێڕاوەتەوە، لە هیشامەوە، لە باوکیەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر چووە ناو مزگەوتەوە لەو کاتەدا پێشنوێژ وتاری دەدا). بەڵام باسی عائیشەیان نەکردوە رەزای خوای لێ بێ.

# باسی کاتیْ کەسیْ چووه مزگەوتەوه لەوکاتەدا پیْشنویْژ وتاری دەدا.

## ٢٣٧ - باب إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ.

١١١٥ - عَنْ جَابِرٍ أَنَّ رَجُلاً جَاءَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ فَقَالَ: (أَصَلَّيْتَ يَا فُلاَنُ) قَالَ: لاَ، قَالَ: (قُمْ فَارْكَعْ).

واته: جابر دەڵێت: رۆژێکی هەینی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وتاری دەدا، لەوکاتەدا پیاویْ هاته ژوورەوه، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (ئەی فلان کەس ئایا دوو رکات نوێژی چوونه مزگەوتت (تحية المسجد)ت کرد کە هاتیتە ژوورەوه؟). وتی: نەخێر، فەرمووی: (دەی هەستە دوو رکات نوێژ بکە).

١١١٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: جَاءَ سُلَيْكٌ الْغَطَفَانِيُّ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ، فَقَالَ: لَهُ (أَصَلَّيْتَ شَيْئًا) قَالَ: لاَ ، قَالَ: (صَلِّ رَكْعَتَيْنِ تَجَوَّزْ فِيهِمَا)

واتــە: لــە ئــەبو هــورەیرەوە دەگێڕنــەوە، كــە وتویــەتی: رۆژی هــەینی بــوو پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم وتـاری دەدا، سولەیكی (غَطَفَانِیِّ) هـات پێش ئەوەی نوێژ بكات دانیشت، پێغەمبەر صلی الله علیه وسـلم پێـی فـەرموو: (ئـەی سـولەیك! ئایـا دوو ركـات نوێـژی چـوونە مزگـەوتت كـرد كـە هاتیتـە ژوورەوە؟). وتی: نەخێر، فەرمووی: (دەی هەستە دوو ركات نوێژ بكە بەڵام بە كورتی).

١١١٧ - (صحيح) عَنْ طَلْحَةَ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يُحَدِّثُ أَنَّ سُلَيْكًا جَاءَ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ، زَادَ: ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ قَالَ: (إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ، فَلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ يَتَجَوَّزْ فِيهِمَا)

واتە: لە (طَلحَة)وە دەگێڕنەوە، كە گوێی لە جابری كوڕی (عَبدُ اللّه) بووە گێڕاویەتیـەوە، كـە سـولەیك هاتـە مزگـەوت، جـا راوی بەهـەمان شـێوە فەرمودەكەی پێشوی گێڕایەوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد كـرد وتـی: لەپاشـدا رووی كردە خەڵكەكەو فەرمووی: (كاتێ كە كەسێكتان رۆژی هەینی هات بۆ مزگـەوت لەوكاتەدا پێشنوێژ وتاری دەدا، با دوو ڕكات نوێژ بكات پێش ئەوەی دابنیشێت بەڵام بەكورتی).

# باسی هەنگاونان بەسەر خەڵكدا.

## ٢٣٨ - باب تَخَطِّی رِقَابِ النَّاسِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ.

١١١٨ - (صحيح) عَنْ أَبِی الزَّاهِرِيَّةِ قَالَ: كُنَّا مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ صَاحِبِ النَّبِیِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَجَاءَ رَجُلٌ يَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ بُسْرٍ: جَاءَ رَجُلٌ يَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالنَّبِیُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ، فَقَالَ: لَهُ النَّبِیُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اجْلِسْ فَقَدْ آذَيْتَ).

واتە: ئەبو (زَّاهِرِيَّة) دەڵێت: ڕۆژێكی هەینی ئێمە لەگەڵ (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی بوسری هاوەڵی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە مزگەوتدا بووین، پیاوێك هات هەنگاوی نا بەسەر ملی خەڵكدا، (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی بوسر وتی: ڕۆژێكی هەینی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتاری دەدا لەوكاتەدا پیاوێك هات هەنگاوی نا بەسەر ملی خەڵكدا، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (دانیشە بەڕاستی خەڵكت ئازاردا).

# باسی كەسیٚ لەوكاتەدا پێشنوێژ وتار دەدات خەوبیباتەوە.

## ٢٣٩ – باب الرَّجُلِ يَنْعَسُ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ.

١١١٩ - (صحيح)عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ فِى الْمَسْجِدِ، فَلْيَتَحَوَّلْ مِنْ مَجْلِسِهِ ذَلِكَ إِلَى غَيْرِهِ)

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بیستووە دەیفەرموو: كاتیٚ كەسێكتان لەمزگەوتدا دانیشتبو، خەو زۆری بۆ هێنا با لەو شوێنەی كە لێی دانیشتوە بچێتە شوێنێكی تر.

## باسی قسەکردنی پێشنوێژ دوای ئەوەی کە لەسەر مینبەر هاتەخوارەوە.

## ٢٤٠ – باب الإِمَامِ يَتَكَلَّمُ بَعْدَ مَا يَنْزِلُ مِنَ الْمِنْبَرِ.

١١٢٠ - (ضعيف) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْزِلُ مِنَ الْمِنْبَرِ فَيَعْرِضُ لَهُ الرَّجُلُ فِي الْحَاجَةِ، فَيَقُومُ مَعَهُ حَتَّى يَقْضِيَ حَاجَتَهُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّي.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بەچاوی خۆم پێغەمبەری خوام صلی الله علیە وسلم بینی لەدوای وتاری هەینی لەسەر مینبەر هاتەخوارەوە پیاوێ باسی کارێکی پێویستی خۆی بۆ کرد، پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم لەگەڵ پیاوەکە ڕۆشت هەتا کارەکەی بۆ جێبەجێکرد، لەپاشدا هاتەوە بەرنوێژی بۆ خەڵکەکە کرد.

## باسی هەرکەسێ بگات بە رکاتێکی هەینیدا نوێژی هەینی بۆ حساب کراوە.

## ٢٤١ – باب مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الْجُمُعَةِ رَكْعَةً.

١١٢١ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصَّلاَةِ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە. کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: هەر کەسێ بگات بە رکاتێکی نوێژدا ئەوە ئەو نوێژەی بۆ حەسێب کراوە.

## باسی لە نوێژی هەینیدا چ سورەتێکی دەخوێند؟

## ٢٤٢ – باب مَا يُقْرَأُ بِهِ فِي الْجُمُعَةِ.

١١٢٢ - (صحيح) عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْرَأُ فِي الْعِيدَيْنِ وَيَوْمِ الْجُمُعَةِ بِ (سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى) وَ (هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَـٰشِيَةِ)، قَالَ: وَرُبَّمَا اجْتَمَعَا فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ فَقَرَأَ بِهِمَا.

واته: له نوعمانی كوڕی بەشیرەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە نوێژی ڕۆژی هەینی و هەردوو جەژنەكەدا واتە جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان ئەم دوو سورەتەی دەخوێند لە ركاتی یەكەمدا سورەتی: (سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى) و لە ركاتی دووەمدا سورەتی: (هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ). ڕاوی وتی: جاری وا هەبوو ڕۆژی جەژن و ڕۆژی هەینی دەكەوتنە یەك ڕۆژەوە بە هەمان شێوە ئەم دوو سورەتەی دەخوێند.

١١٢٣ - (صحيح) عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ الضَّحَّاكَ بْنَ قَيْسٍ سَأَلَ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ: مَاذَا كَانَ يَقْرَأُ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ عَلَى إِثْرِ سُورَةِ الْجُمُعَةِ؟ فَقَالَ: كَانَ يَقْرَأُ (هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ).

واته: لە (عُبَيْدِ اللَّهِ)ی كوڕی (عَبْدُ اللَّهِ) كوڕی عوتبەوە دەگێڕنەوە، كە (ضَحَّاك)ی كوڕی قەیس لە نوعمانی كوڕی بەشیری پرسی وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە نوێژی هەینیدا لەدوای سورەتی: (جُمُعَة) چ سورەتێكی دەخوێند؟ نوعمان وتی: لە ركاتی دووەمدا سورەتی: (هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ)ی دەخوێند.

١١٢٤ - (صحيح) عَنِ ابْنِ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: صَلَّى بِنَا أَبُو هُرَيْرَةَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَقَرَأَ بِسُورَةِ الْجُمُعَةِ، وَفِي الرَّكْعَةِ الآخِرَةِ: (إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ)، قَالَ: فَأَدْرَكْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ حِينَ

انْصَرَفَ، فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّكَ قَرَأْتَ بِسُورَتَيْنِ كَانَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ يَقْرَأُ بِهِمَا بِالْكُوفَةِ! قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ بِهِمَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ.

واتە: لە ئیبنو ئەبی رافیعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: رۆژێکی هەینی ئەبو هورەیرە بەرنوێژی نوێژی هەینی بۆ دەکردین لە رکاتی یەکەمدا سورەتی: (جُمُعَة)ی خوێند؟ وە لە رکاتی دووەمدا سورەتی: (إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ)ی خوێند. ئیبنو ئەبی رافیع وتی: کاتێ کە ئەبو هورەیرە لەنوێژ بوویەوە پێی گەیشتم یان کاتێ کە لەمزگەوت هاتەدەرەوە پێم وت: تۆ ئەم دوو سورەتەت خوێند کە پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ لە کوفە خوێندنی! ئەبو هورەیرە وتی: بەگوێی خۆم بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە نوێژی هەینیدا خوێندنی.

١١٢٥ - (صحيح) عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْجُمُعَةِ (سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى) وَ (هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ).

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە نوێژی هەینی دا ئەم دوو سورەتەی دەخوێند سورەتی: (سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى) وە سورەتی: (هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ).

## باسی کەسێ لەدوای پێشنوێژەوە نوێژ بکات لەنێوانیاندا دیوارێ هەبێت.

## ٢٤٣ – باب الرَّجُلِ يأْتَمُّ بِالإِمَامِ وَبَيْنَهُمَا جِدَارٌ.

١١٢٦ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها قَالَتْ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حُجْرَتِهِ وَالنَّاسُ يَأْتَمُّونَ بِهِ مِنْ وَرَاءِ الْحُجْرَةِ.

واته: له عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كه وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەژوورەكەی خۆیدا نوێژی دەكرد، خەڵكیش لەدەرەوەی ژوورەكەیەوە لەدوایەوە بەكۆمەڵ نوێژیان دەكرد.

## باسی نوێژی سوننەت لەدوای نوێژی هەینی.

## ٢٤٤ – باب الصَّلاَةِ بَعْدَ الْجُمُعَةِ.

١١٢٧ - (صحيح) عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رَأَى رَجُلاً يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فِي مَقَامِهِ، فَدَفَعَهُ وَقَالَ: أَتُصَلِّي الْجُمُعَةَ أَرْبَعًا؟!. وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُصَلِّي يَوْمَ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ، وَيَقُولُ: هَكَذَا فَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە نافیعەوە دەگێڕنەوە، کە ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ ڕۆژی هەینی پیاوێکی بینی لەدوای نوێژی هەینی لەشوێنەکەی خۆیدا دوو ڕکات نوێژی کرد، پاڵی پێوەنا لە شوێنەکەی خۆی دەریکردو وتی: ئایا چوار ڕکات نوێژی هەینی دەکەیت؟!. نافیع وتی: (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەر خۆی لەدوای نوێژی هەینی لەماڵەوە دوو ڕکات نوێژی سوننەتی دەکرد، وە ئیبنو عومەر وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەم شێوەیەی دەکرد، واتە لەدوای نوێژی هەینی لەماڵەوە دوو ڕکات نوێژی سوننەتی دەکرد.

١١٢٨ - (صحيح) عَنْ نَافِعٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ يُطِيلُ الصَّلاَةَ قَبْلَ الْجُمُعَةِ، وَيُصَلِّي بَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ، وَيُحَدِّثُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ.

واتە: لە نافیعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ لە پێش نوێژی هەینی درێژەی دەدا بە نوێژکردن، بەڵام لەدوای نوێژی هەینی لەماڵەوە دوو ڕکات نوێژی سوننەتی دەکرد، ئیبنو عومەر گێڕایەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەم شێوەیەی دەکرد واتە لەدوای نوێژی هەینی لەماڵەوە دوو ڕکات نوێژی دەکرد.

١١٢٩ - (صحيح) عَنْ عُمَرُ بْنُ عَطَاءِ بْنِ أَبِي الْخُوَارِ، أَنَّ نَافِعَ بْنَ جُبَيْرٍ أَرْسَلَهُ إِلَى السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ ابْنِ أُخْتِ نَمِرٍ يَسْأَلُهُ عَنْ شَيْءٍ رَأَى مِنْهُ مُعَاوِيَةُ فِي الصَّلاَةِ؟ فَقَالَ: صَلَّيْتُ مَعَهُ الْجُمُعَةَ فِي الْمَقْصُورَةِ، فَلَمَّا سَلَّمْتُ قُمْتُ فِي مَقَامِي فَصَلَّيْتُ، فَلَمَّا دَخَلَ أَرْسَلَ إِلَيَّ، فَقَالَ: لاَ تَعُدْ

لِمَا صَنَعْتَ، إِذَا صَلَّيْتَ الْجُمُعَةَ فَلاَ تَصِلْهَا بِصَلاَةٍ حَتَّى تَكَلَّمَ أَوْ تَخْرُجَ، فَإِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَ بِذَلِكَ: أَنْ لاَ تُوصَلَ صَلاَةٌ بِصَلاَةٍ حَتَّى يَتَكَلَّمَ أَوْ يَخْرُجَ.

واته: عومەری کوڕی (عَطَاء)ی کوڕی (أَبِي الْخُوَار) دەڵێت: نافیعی کوڕی جوبەیر ناردمی بۆلای سائیبی کوڕی یەزیدی خوشکەزای نەمیر کە سەبارەت بە شتێ کە مەعاویە لە سائیبی دیبوو لەنوێژدا لێی بپرسێت؟ سائیب وتی: من و مەعاویە لە حوجرەکەی مەعاویە کە لەناو مزگەوتدا بوو نوێژی هەینیمان کرد، کاتێ کە سەلامم دایەوە لەشوێنەکەی خۆمدا هەستامەوە نوێژم کرد، کە مەعاویە رۆیشتەوە بۆ ماڵەوە ناردی بەشوێنمدا، کە چووم وتی: جارێکی تر شتی وامەکە، کە نوێژی هەینیت کرد یەکسەر نوێژی تری لەدوا مەکە هەتا قسەیە لەبەینیاندا دەکەیت، یان دەردەچیت لەو شوێنەی کە نوێژە فەرزەکەت تێدا کردوە، چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێکردوین کە نوێژ نەلکێنین بە نوێژەوە، هەتا قسەیە لەنێوانیاندا دەکەین یان دەردەچین و دەچینەوە بۆ ماڵەوە.

١١٣٠ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ إِذَا كَانَ بِمَكَّةَ فَصَلَّى الْجُمُعَةَ تَقَدَّمَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ تَقَدَّمَ فَصَلَّى أَرْبَعًا، وَإِذَا كَانَ بِالْمَدِينَةِ صَلَّى الْجُمُعَةَ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى بَيْتِهِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَلَمْ يُصَلِّ فِي الْمَسْجِدِ، فَقِيلَ لَهُ؟ فَقَالَ:كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَفْعَلُ ذَلِكَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، ئەگەر لە مەککە نوێژی هەینی بکردایە لەشوێنەکەی خۆی دەچووە پێشەوە دوو رکات نوێژی دەکرد، لەپاشدا دەچووە پێشترەوە چوار رکات نوێژی دەکرد، بەلاَم ئەگەر لەمەدینە نوێژی هەینی بکردایە، لەپاشدا بگەڕایەتەوە بۆ ماڵەوە دوو رکات نوێژی دەکرد، لە مزگەوتدا لەدوای نوێژی هەینی نوێژی نەدەکرد، لەوبارەوە لێیان پرسی؟ وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەم شێوەیەی دەکرد.

١١٣١ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ ابْنُ الصَّبَّاحِ: قَالَ - : (مَنْ كَانَ مُصَلِّيًا بَعْدَ الْجُمُعَةِ فَلْيُصَلِّ أَرْبَعًا). وَتَمَّ حَدِيثُهُ، وَقَالَ ابْنُ يُونُسَ: (إِذَا صَلَّيْتُمُ الْجُمُعَةَ فَصَلُّوا بَعْدَهَا أَرْبَعًا). قَالَ: فَقَالَ لِي أَبِي: يَا بُنَيَّ، فَإِنْ صَلَّيْتَ فِي الْمَسْجِدِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَتَيْتَ الْمَنْزِلَ، أَوِ الْبَيْتَ، فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ)

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس لەدوای نوێژی هەینی ویستی نوێژی سوننەت بکات با چوار رکات بکات)، جا راوی فەرمودەکەی (ابْنُ الصَّبَّاح)ی گێڕایەوە، ئیبنو یونوس وتی: (ئەگەر نوێژی هەینیتان کرد لەدوای نوێژ چوار رکات بکەن)، راوی وتی: باوکم پێی وتم: کوری خۆم ئەگەر لە مزگەوت دوو رکات نوێژت کرد، لەپاشدا گەڕایتەوە بۆ شوێنەکەی خۆت، یان گەڕایتەوە بۆ ماڵەوە دوو رکات نوێژی تر بکە.

١١٣٢ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي بَعْدَ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەدوای نوێژی هەینی لەماڵەوە دوو ڕکات نوێژی دەکرد.

١١٣٣ - (صحيح) عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ أَنَّهُ رَأَى ابْنَ عُمَرَ يُصَلِّي بَعْدَ الْجُمُعَةِ فَيَنْمَازُ عَنْ مُصَلاَّهُ الَّذِي صَلَّى فِيهِ الْجُمُعَةَ قَلِيلاً غَيْرَ كَثِيرٍ، قَالَ: فَيَرْكَعُ رَكْعَتَيْنِ، قَالَ: ثُمَّ يَمْشِي أَنْفَسَ مِنْ ذَلِكَ، فَيَرْكَعُ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ. قُلْتُ لِعَطَاءٍ: كَمْ رَأَيْتَ ابْنَ عُمَرَ يَصْنَعُ ذَلِكَ؟ قَالَ: مِرَارًا.

واتە: ئیبنو جورەیج دەڵێت: (عَطَاء) بۆی گێڕامەوە کە بەچاوی خۆی ئیبنو عومەری ڕەزای خوایان لێ بێ دیوە لەدوای نوێژی هەینی لەو شوێنەی کە نوێژە فەرزەکەی تێدا کردبوو کەمێ زۆرنا چووە ئەولاترەوە نوێژی کرد، (عَطَاء) وتی: ئیبنو عومەر دوو ڕکات نوێژی سوننەتی کرد، هەروەها (عَطَاء) وتی: لەپاشدا کەمێ تر چووە ئەولاترەوە کەمێ دوورکەوتەوە، چوار ڕکات نوێژی تری کرد، وتم بە (عَطَاء): چەند جار ئیبنو عومەرت ڕەزای خوایان لێ بێ دیوە بەو شێوەیەی کردوە؟ وتی: چەندەها جار.

## باسی دانیشتنی نێوان دوو وتارەکەی هەینی.

## ٢٤٤ – باب الْقُعُود بَيْنَ الْخُطْبَتَيْنِ.

١١٣٤ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ خُطْبَتَيْنِ كَانَ يَجْلِسُ إِذَا صَعِدَ الْمِنْبَرَ حَتَّى يَفْرُغَ - أُرَاهُ قَالَ: الْمُؤَذِّنُ - ثُمَّ يَقُومُ فَيَخْطُبُ ثُمَّ يَجْلِسُ فَلاَ يَتَكَلَّمُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيَخْطُبُ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕۆژی هەینی دوو وتاری دەدا، کاتێ کە دەچووە سەر مینبەر دائەنیشت هەتا بانگبێژ لە بانگەکەی دەبۆوە - پێم وایە بانگبێژ وتی - لەپاشدا هەڵئەسایەوە وتاری یەکەمی دەدا، ئینجا دائەنیشت بەبێدەنگی و قسەی نەدەکرد، لەپاشدا هەڵئەسایەوە وتاری دووەمی دەدا.

## باسی نوێژی هەردوو چەژنەکە.

## ٢٤٥ – باب صَلاَةِ الْعِيدَيْنِ.

١١٣٤ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ وَلَهُمْ يَوْمَانِ يَلْعَبُونَ فِيهِمَا، فَقَالَ: (مَا هَذَانِ الْيَوْمَانِ) قَالُوا: كُنَّا نَلْعَبُ فِيهِمَا فِي

الْجَاهِلِيَّةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَبْدَلَكُمْ بِهِمَا خَيْرًا مِنْهُمَا: يَوْمَ الأَضْحَى، وَيَوْمَ الْفِطْرِ)

واتە: ئەنەس دەڵێت: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کۆچی کرد بۆ مەدینە خەڵکی مەدینە دوو رۆژیان هەبوو یارییان تێدا دەکردو خۆشی و شادیان تێدا دەردەبڕی،،پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەم دوو رۆژە چین؟). وتیان: لە سەردەمی نەفامیدا لەم دوو رۆژەدا یاریمان دەکرد، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (خوای گەورە گۆڕینی بە دوو رۆژی چاکتر کە خێری دنیاو قیامەتی تێدایە بۆتان ئەویش: رۆژی جەژنی قوربان و رۆژی جەژنی رەمەزانە).

## باسی کاتی دەرچوون بۆ نوێژی جەژن.

## ٢٤٦ – باب وَقْتِ الْخُرُوجِ إِلَى الْعِيدِ.

١١٣٥ - (صحيح) عَنْ يَزِيدُ بْنُ خُمَيْرٍ الرَّحْبِيُّ قَالَ: خَرَجَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ بُسْرٍ صَاحِبُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَعَ النَّاسِ فِي يَوْمِ عِيدِ: فِطْرٍ، أَوْ أَضْحَى، فَأَنْكَرَ إِبْطَاءَ الإِمَامِ، فَقَالَ: إِنَّا كُنَّا قَدْ فَرَغْنَا سَاعَتَنَا هَذِهِ. وَذَلِكَ حِينَ التَّسْبِيحِ.

واتە: یەزیدی كوڕی خومەیری رەحەبی دەڵێت: (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی بوسر هاوەڵی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە رۆژی جەژنی رەمەزان یان قورباندا لەگەڵ خەڵك دەرچوو بۆ نوێژ، بینی پێشنوێژ دەرنەچووە، بۆیە لە دواكەوتنی پێشنوێژ پێ ناخۆش بوونی خۆی دەربڕی وتی: ئێمە لەم كاتانەدا لێ دەبوینەوە. ئەو كاتەش كاتی نوێژی سوننەتی چێشتەنگاو(ضُحَى) بوو.

## باسی كاتی دەرچوونی ئافرەتان بۆ نوێژی چەژن.

## ٢٤٧ - باب خُرُوجِ النِّسَاءِ فِي الْعِيدِ.

١١٣٦ - (صحيح) عَنْ مُحَمَّدٍ، أَنَّ أُمَّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نُخْرِجَ ذَوَاتِ الْخُدُورِ يَوْمَ الْعِيدِ، قِيلَ فَالْحُيَّضُ؟ قَالَ: (لِيَشْهَدْنَ الْخَيْرَ وَدَعْوَةَ الْمُسْلِمِينَ) . قَالَ: فَقَالَتِ امْرَأَةٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ لَمْ يَكُنْ لإِحْدَاهُنَّ ثَوْبٌ كَيْفَ تَصْنَعُ؟ قَالَ: (تُلْبِسُهَا صَاحِبَتُهَا طَائِفَةً مِنْ ثَوْبِهَا)

واتە: لە موحەممەد — ی كوڕی سیرین - ەوە دەگێڕنەوە، كە (أُمَّ عَطِيَّةَ) وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە رۆژی جەژنی رەمەزان یان قورباندا فەرمانی پێ دەكردین: كە ئافرەتانی بێنوێژ و كەیبانوی ناوماڵ لەگەڵ خۆمان ببەین بۆ نوێژگاكە لە دەرەوەی شار بۆ نوێژی جەژن، وتیان: ئافرەتانی بێنوێژیش كە نوێژ ناكەن؟ فەرمووی: (تەنها ئامادەی كۆڕی پڕ خێر و نزاو پاڕانەوەی موسوڵمانان دەبن)، موحەممەد وتی: ئافرەتێ وتی: ئەی

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! ئەگەر وا ڕێکەوت یەکێکیان پۆشاکی نەبوو خۆی پێ داپۆشێت چی بکات؟ فەرمووی: (با هاوڕێکەی هەندێ لەپۆشاکەکەی خۆی بدات بەسەریا).

١١٣٧ - (صحيح) عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ، بِهَذَا الْخَبَرِ، قَالَ: وَيَعْتَزِلُ الْحُيَّضُ مُصَلَّى الْمُسْلِمِينَ، وَلَمْ يَذْكُرِ الثَّوْبَ، قَالَ: وَحَدَّثَ عَنْ حَفْصَةَ، عَنِ امْرَأَةٍ تُحَدِّثُهُ، عَنِ امْرَأَةٍ أُخْرَى قَالَتْ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَذَكَرَ مَعْنَى حَدِيثِ مُوسَى فِي الثَّوْبِ.

واتە: لە (أُمَّ عَطِيَّةَ)ەوە بەسەرهاتی پێشو هاتووە، راوی وتی: با ئافرەتانی بێنوێژ لە نوێژگای موسوڵمانان نەبن، بەڵام باسی پۆشاکی نەکرد، راوی وتی: لە حەفصەوە دەگێڕنەوە، کەئافرەتێ بۆی گێڕاوەتەوە، ئەویش لە ئافرەتێکی ترەوە وتویەتی: وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم!، راوی بە هەمان مانا وەك فەرموودەکەی موسا - راوی فەرموودەکەی پێشو - بەسەرهاتی پۆشاکەکەی گێڕایەوە.

١١٣٨ - (صحيح) عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: كُنَّا نُؤْمَرُ، بِهَذَا الْخَبَرِ، قَالَتْ: وَالْحُيَّضُ يَكُنَّ خَلْفَ النَّاسِ فَيُكَبِّرْنَ مَعَ النَّاسِ.

واتە: لە (أُمَّ عَطِيَّةَ)ەوە هەمان هەواڵی پێشو هاتووە، کە وتویەتی: فەرمانمان پێ کراوە، (أُمَّ عَطِيَّةَ) وتی: دەبێ ئافرەتانی بێنوێژ لەدوای خەڵکەوە بن و لەگەڵ خەڵکەکە (الله أكبر) بکەن.

١١٣٩ - (ضعيف) عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ لَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ جَمَعَ نِسَاءَ الأَنْصَارِ فِـى بَيْـتٍ، فَأَرْسَلَ إِلَيْنَا عُمَرَ بْنَ الْخَطَّـابِ، فَقَـامَ عَلَـى الْبَـابِ، فَسَلَّمَ عَلَيْنَا، فَرَدَدْنَا عَلَيْهِ السَّلاَمَ، ثُمَّ قَالَ: أَنَا رَسُـولُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ إِلَـيْكُنَّ. وَأَمَرَنَـا بِالْعِيدَيْنِ أَنْ نُخْرِجَ فِيهِمَا الْحُيَّضَ وَالْعُتَّقَ، وَلاَ جُمُعَـةَ عَلَيْنَا، وَنَهَانَا عَنِ اتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ.

واتـە: (أُمَّ عَطِيَّـةَ) دەڵێـت: کـاتێ کـە پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليـه وسـلم گەیشـتە مەدینـە ژنـانی یاریـدەدەران لـە مـاڵێ کۆبوینـەوە، پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وسـلم عومـەری کـوڕی (خَطَّـاب)ی ڕەزای خـوای لـێ بـێ نـارد بـۆ لامـان، لەبەردەم دەرگا ڕاوەستا. سڵاوی لێکردین، ئێمەش وەڵامی سڵاوەکەیمان دایـەوە، لەپاشدا وتی: مـن فروسـتادەی پێغەمبـەری خـوام صلى الله عليـه وسلم بـۆ لای ئێوە. (أُمَّ عَطِيَّةَ) وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليـه وسـلم لـە ڕۆژی هـەردوو جەژنەکەدا فەرمانی پێ دەکردین: کـە گـەورە کـچ و ئافرەتـانی بێنوێـژ لەگـەڵ خۆمـان ببـەین بـۆ نوێژگاکـە لـە دەرەوەی شـار بـۆ نوێـژی جـەژن، نوێـژی هەینیشـمان لەسـەر نـەبوو، هـەروەها پێغەمبـەر صـلی الله علیـه وسـلم ڕێگـری ئەوەشی لێ دەکردین کە شوێن جەنازە بکەوین.

# باسی وتاردانی ڕۆژی جەژن.

## ٢٤٨ – باب الْخُطْبَةِ يَوْمَ الْعِيدِ.

١١٤٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: أَخْرَجَ مَرْوَانُ الْمِنْبَرَ فِي يَوْمِ عِيدٍ، فَبَدَأَ بِالْخُطْبَةِ قَبْلَ الصَّلاَةِ، فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا مَرْوَانُ خَالَفْتَ السُّنَّةَ! أَخْرَجْتَ الْمِنْبَرَ فِي يَوْمِ عِيدٍ، وَلَمْ يَكُنْ يُخْرَجُ فِيهِ وَبَدَأْتَ بِالْخُطْبَةِ قَبْلَ الصَّلاَةِ، فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: فُلاَنُ بْنُ فُلاَنٍ، فَقَالَ: أَمَّا هَذَا فَقَدْ قَضَى مَا عَلَيْهِ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ رَأَى مُنْكَرًا فَاسْتَطَاعَ أَنْ يُغَيِّرَهُ بِيَدِهِ فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ)

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: مەروان لە ڕۆژی جەژندا پێش ئەوەی نوێژی جەژن بكات دەستیكرد بە وتاردان، پیاوێ هەستایەوە وتی: ئەی مەروان پێچەوانەی سوننەت جولاّیتەوە! لە ڕۆژی جەژندا مینبەرەكەت دەركرد بۆ شوێنی نوێژگاكە، كە نەدەبوو لات ببردایە، وە پێش ئەوەی نوێژی جەژن بكەیت دەستتكرد بە وتاردان، ئەبو سەعیدی

خودری وتی: ئەم پیاوە کێیە، وتیان: ئەوە فولانی کوڕی فولانە، وتی: ئەم پیاوە ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێهێنا، چونکە بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (هەرکەسێ لە ئێوە شتێکی نارەوای دی با بەزەبری دەست و هێزی بازووی بیگۆڕێ، جا ئەگەر بەدەست نەیتوانی بەزمان و بە ئامۆژگاری بیگۆڕێ، ئەگە بەزمانیش نەیتوانی بەدڵ پێی ناخۆش بێ، کە ئەوەش لاوازترین ئیمانە).

١١٤١ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَامَ يَوْمَ الْفِطْرِ، فَصَلَّى، فَبَدَأَ بِالصَّلاَةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ، ثُمَّ خَطَبَ النَّاسَ، فَلَمَّا فَرَغَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَزَلَ فَأَتَى النِّسَاءَ فَذَكَّرَهُنَّ وَهُوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى يَدِ بِلاَلٍ، وَبِلاَلٌ بَاسِطٌ ثَوْبَهُ تُلْقِي فِيهِ النِّسَاءُ الصَّدَقَةَ، قَالَ: تُلْقِي الْمَرْأَةُ فَتَخَهَا، وَيُلْقِينَ، وَيُلْقِينَ، وَقَالَ: ابْنُ بَكْرٍ فَتَخَتَهَا.

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا هەستا دوو رکات نوێژی جەژنی کرد، دەستیکرد بە نوێژکردن پێش ئەوەی وتاربدات، لەپاشدا وتاریدا بۆ خەڵکەکە، کاتێ کە لەوتاردان بوویەوە دابەزی و هاتە لای کۆمەڵی ئافرەتەکان و ئامۆژگاری کردن بەوەی کە خێر بکەن، لەو کاتەدا خۆی دابوو بەسەر شانی بیلال دا، بیلال چاکی جلەکەی خۆی گرتەوەو ئافرەتەکان ماڵ و سامان وخشڵی خۆیان هەڵدەدایە ناویەوە، راوی وتی: ئافرەت هەبوو

ئەنگوستیلەكەی لە پەنجەی خۆی دادەكەندو هەڵیدەدایە ناو چاكی بیلالەوە، ئیتر بەو شێوەیە ئەنگوستیلەو گوارەیان هەڵدەدایە ناو چاكی بیلالەوە، جا بەوشێوەیە ئافرەتان یەك لەدوای یەك هەر شتێكیان ببوایە لە خشڵ و ماڵ و سامان هەڵیان دەدایە ناویەوە، ئیبنو بەكر لەجیاتی (فَتَخَهَا) بە (فَتَخَتَهَا) ریوایەتی كردوە.

١١٤٢ - (صحيح) عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: أَشْهَدُ عَلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، وَشَهِدَ ابْنُ عَبَّاسٍ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ خَرَجَ يَوْمَ فِطْرٍ، فَصَلَّى، ثُمَّ خَطَبَ، ثُمَّ أَتَى النِّسَاءَ وَمَعَهُ بِلاَلٌ - قَالَ ابْنُ كَثِيرٍ: أَكْبَرُ عِلْمِ شُعْبَةَ - فَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ، فَجَعَلْنَ يُلْقِينَ.

واتە: لە (عَطَاء)ەوە دەگێڕنەوە، كە شایەتی لە ئیبنو عەباس دا رەزای خوایان لێ بێ واتە لێی بیست، ئیبنو عەباسیش شایەتی دا لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم واتە ئامادەبوو لەگەڵ پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم و لێی گێڕاوەتەوە، كە رۆژی جەژنی رەمەزان لەماڵ دەرچوو نوێژی جەژنی بەجێ هێنا، لەپاشدا وتاری خوێندەوە، ئینجا هاتە لای كۆمەڵی ئافرەتان بیلالی لەگەڵ بوو - (ابْنُ كَثِيرٍ) وتی: ئەوەندەی شوعبە زانیاری هەبێ - پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێكردن كە خێر و سەدەقە بكەن، ئیتر ئافرەتەكان خشڵ و ماڵ و سامانی خۆیان هەڵدەدایە ناو چاكی بیلالەوە.

١١٤٣ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، بِمَعْنَاهُ، قَالَ: فَظَنَّ أَنَّهُ لَمْ يُسْمِعِ النِّسَاءَ، فَمَشَى إِلَيْهِنَّ وَبِلاَلٌ مَعَهُ، فَوَعَظَهُنَّ وَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ، فَكَانَتِ الْمَرْأَةُ تُلْقِى الْقُرْطَ وَالْخَاتَمَ فِى ثَوْبِ بِلاَلٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ فەرموودەی پێشو بەهەمان مانا هاتووە. کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی وابوو کە ئافرەتەکان لەبەردووریيان گوێبیستی نەدەبوون بۆیە رۆشت بۆلایان، لەو کاتەدا بیلالیشی لەگەڵ بوو، ئامۆژگاری کردن و فەرمانی پێکردن کە خێر و سەدەقە بکەن. جا ئافرەت هەبوو گوارەو ئەنگوستیلەی خۆی هەڵدەدایە ناو کراسەکەی بیلالەوە.

١١٤٤ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، فِى هَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: فَجَعَلَتِ الْمَرْأَةُ تُعْطِى الْقُرْطَ وَالْخَاتَمَ، وَجَعَلَ بِلاَلٌ يَجْعَلُهُ فِى كِسَائِهِ، قَالَ: فَقَسَمَهُ عَلَى فُقَرَاءِ الْمُسْلِمِينَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە لەم فەرموودەدا وتویەتی: ئافرەت هەبوو گوارەو ئەنگوستیلەی خۆی هەڵدەدایە ناو کراسەکەی بیلالەوە، بیلالیش دەیخستنە ناو پۆشاکەکەیەوە بۆ ئەوەی بیانپارێزێ لەونبوون، راوی وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دابەشی کردن بەسەر هەژارە موسوڵمانەکاندا.

## باسی وتاردان لەسەر كەوان.

## ٢٤٩ - باب يَخْطُبُ عَلَى قَوْسٍ.

١١٤٥ - (حسن) عَنْ يَزِيدَ بْنِ الْبَرَاءِ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نُوِّلَ يَوْمَ الْعِيدِ قَوْسًا فَخَطَبَ عَلَيْهِ.

واتە: لە یەزیدی كوڕی بەرائەوە، لە باوكیەوە دەگێڕنەوە، كە لە ڕۆژی جەژندا كەوانێكیان دا بەدەست پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم ئەویش لەكاتی وتارداندا خۆی دا بەسەریا.

## باسی بانگ نەدان لە ڕۆژی جەژندا.

## ٢٥٠ - باب تَرْكِ الأَذَانِ فِي الْعِيدِ.

١١٤٦ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَابِسٍ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ ابْنَ عَبَّاسٍ أَشَهِدْتَ الْعِيدَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَلَوْلاَ مَنْزِلَتِي مِنْهُ مَا شَهِدْتُهُ مِنَ الصِّغَرِ، فَأَتَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْعَلَمَ الَّذِي عِنْدَ دَارِ كَثِيرِ بْنِ الصَّلْتِ، فَصَلَّى ثُمَّ خَطَبَ، وَلَمْ يَذْكُرْ أَذَانًا وَلاَ إِقَامَةً، قَالَ: ثُمَّ أَمَرَ بِالصَّدَقَةِ، قَالَ: فَجَعَلَ النِّسَاءُ يُشِرْنَ إِلَى آذَانِهِنَّ وَحُلُوقِهِنَّ، قَالَ: فَأَمَرَ

بِلاَلاً فَأَتَاهُنَّ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی عابسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ لە ئیبنو عەباسی پرسی: ئایا ئامادەی نوێژی چەژن بویت لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم؟ وتی: بەڵێ، ئەگەر لەبەر خزمایەتی نەبوایە ئەوەندە منداڵ بووم ئامادەی نوێژی چەژن نەدەبووم - بێگومان کوڕی مامی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بووە - پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاتە لای شوێنێکی دیاریکراو - وەك کێوێ - کە نزیکی ماڵی (كَثِير)ی کوڕی (الصَّلْت) بوو، نوێژی چەژنی کرد، ئیبنو عەباس باسی بانگ و قامەتی نەکرد، لەپاشدا دەستی کرد بە وتاردان، ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ وتی: ئینجا هاتە لای ئافرەتان و فەرمانی پێکردن کە خێر و سەدەقە بکەن، ئەوانیش دەستیان بەرزکردەوە بۆ گوێ و ملی خۆیان بۆ ئەوەی ملوانکە و گەردانەو گوارەکانیان لێبکەنەوەو بیکەن بە خێر، ئیبنو عەباس وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمانی کرد بە بیلال لێیان وەربگرێت، لەپاشدا بیلال بەو شتانەوە کە لە کراسەکەیدا بوو گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم.

١١٤٧ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى الْعِيدَ بِلاَ أَذَانٍ وَلاَ إِقَامَةٍ، وَأَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ، أَوْ عُثْمَانَ شَكَّ يَحْيَى.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی چەژنی کرد بە بێ بانگ و قامەت، هەروەها

ئەبو بەكر و عومەریش یان (عُثْمَان) بە هەهەمان شێوە نوێژی جەژنیان كرد بە بێ بانگ و قامەت،،یەحیا راوی فەرمودەكە گومانی هەبوو لە گۆ(لفظ)ی عومەر یان (عُثْمَان).

١١٤٨ - (حسن صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَيْرَ مَرَّةٍ وَلاَ مَرَّتَيْنِ الْعِيدَيْنِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلاَ إِقَامَةٍ.

واتە: جابری كوڕی سەموره دەڵێت: نەك جار و دووجار، بەڵكو جارەها نوێژی هەردوو جەژنەكانم كردوه لەگەڵ پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم بە بێ بانگ و قامەت.

## باسی (اللّٰه أكبر) كردن لە نوێژی هەردوو جەژنەكەدا.

## ٢٥٤ – باب تَكْبِيرِ فِي الْعِيدَيْنِ.

١١٤٩ - عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُكَبِّرُ فِي الْفِطْرِ وَالأَضْحَى، فِي الأُولَى سَبْعَ تَكْبِيرَاتٍ، وَفِي الثَّانِيَةِ خَمْسًا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە نوێژی جەژنی رەمەزان و قوربانـدا حەوت (اللّٰه أكبر)ی لە ركاتی یەكەم و پێنج(اللّٰه أكبر)ی لە ركاتی دووەمدا دەكرد.

١١٥٠ - (صحيح) عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ، قَالَ: سِوَى تَكْبِيرَتَيِ الرُّكُوعِ.

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە، بە هەمان سەنەد و مانا فەرمودەی پێشو هاتووە، بەڵام راوی ئەمەی بۆ زیاد کرد وتی: جگە لە دوو (الله أكبر)ەکەی چوونە رکوع.

١١٥١ - (حسن) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ قَالَ: قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (التَّكْبِيرُ فِي الْفِطْرِ سَبْعٌ فِي الأُولَى، وَخَمْسٌ فِي الآخِرَةِ، وَالْقِرَاءَةُ بَعْدَهُمَا كِلْتَيْهِمَا).

واتە: لە (عَبْدُ اللّە)ی کوڕی عەمری کوڕی (عاص)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (الله أكبر) لە رکاتی یەکەمی نوێژی جەژنی رەمەزاندا حەوت جارە، بەڵام لە رکاتی دووەمدا پێنج جارە، لەدوای هەردوو جارەکەوە قورئان خوێندن هەیە واتە خوێندنی سورەتی فاتیحە.

١١٥٢ - (حسن صحيح دون قوله: (أَرْبَعًا) والصواب: (خَمْسًا) عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُكَبِّرُ فِي الْفِطْرِ: فِي الأُولَى سَبْعًا، ثُمَّ يَقْرَأُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُكَبِّرُ أَرْبَعًا، ثُمَّ

يَقْـرَأُ، ثُـمَّ يَرْكَـعُ. قَـالَ أَبُـو دَاوُدَ: رَوَاهُ وَكِيـعٌ وَابْـنُ الْمُبَارَكِ، قَالاَ: سَبْعًا وَخَمْسًا.

واتە: لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە، لە باوكیەوە، لـە باپیریـەوە دەگێڕنـەوە، كە پێغەمبـەری خـوا صلـی الله علیـه وسلم لـە ركاتـی یەكـەمی نوێـژی جـەژنی رەمەزانـدا حـەوت (الله أكـبر)ی دەكـرد، لەپاشـدا سـورەتی فاتیحـەی دەخوێنـد، ئینجا (الله أكـبر)ی دەكـردو دەچـووە ركوعـەوە، دوای ئـەوەی لـەدوو سـەجدەكە دەبووییەوە هەڵەسایەوە بۆ ركاتی دووەم چوار (الله أكـبر)ی دەكـرد - راسـتیەكەی ئەوەیـە كـە پێـنج (الله أكـبر)ی دەكـرد - ئینجـا سـورەتی فاتیحـەی دەخوێنـد، لەپاشدا دەچووە ركوعەوە، ئەبو داود دەڵێت: وەكیـع و ئیبنـو موبـارەك هـەمان فەرمووەدەیان لە(عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی (عَبْدُ الـرَّحْمَن)ەوە كـە راوی فەرموودەكەیـە ریوایـەت كـردوە بـە حـەوت (الله أكـبر)و پێـنج (الله أكـبر)، واتـە بـە لـە ركـاتی یەكەمدا حەوت (الله أكبر)ی دەكردو، ركاتی دووەمدا پێنج (الله أكبر)ی دەكرد.

١١٥٣ - (حسن صحيح) عَنْ مَكْحُولٍ قَالَ: أَخْبَرَنِـی أَبُـو عَـائِشَـةَ - جَلِيسٌ لأَبِی هُرَيْرَةَ - أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْعَـاصِ سَـأَلَ أَبَـا مُوسَى الأَشْعَرِیَّ وَحُذَيْفَةَ بْنَ الْيَمَانِ: كَيْفَ كَانَ رَسُـولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُكَبِّرُ فِی الأَضْحَى وَالْفِطْرِ؟ فَقَالَ أَبُو مُوسَـى: كَـانَ يُكَبِّـرُ أَرْبَعًـا، تَكْبِيرَهُ عَلَـى الْجَنَائِزِ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ: صَدَقَ، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: كَذَلِكَ كُنْتُ أُكَبِّرُ فِی الْبَصْرَةِ حَيْثُ كُنْتُ عَلَيْهِمْ، وَقَـالَ أَبُـو عَائِشَةَ: وَأَنَا حَاضِرٌ سَعِيدَ بْنَ الْعَاصِ.

واتە: مەكحول دەڵێت: ئەبو عائیشە - كە هاونشینی ئەبو هورەیرە بوو واتە لە كۆڕ و كۆبوونەوەیدا دادەنیشت - بۆی گێڕامەوە، كە سەعیدی كوڕی عاص لە ئەبو موسای ئەشعەری و (حُذَيْفَة)ی كوڕی یەمانی پرسی: كە ئایا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە نوێژی جەژنی رەمەزان و قورباندا چۆن (الله أكبر)ی دەكرد؟ ئەبو موسا وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چوار (الله أكبر)ی دەكرد، وەك چۆن لەسەر جەنازە چوار (الله أكبر)ی دەكرد، (حُذَيْفَة) وتی: راست دەكات، ئەبو موسا وتی: منیش لەكاتێكدا كە ئەمیر و كاربەدەستی بەسرە بووم بەو شێوەیەم دەكرد، ئەبو عائیشە وتی: منیش ئامادەی ئەو دانیشتنە بووم كە سەعیدی كوڕی عاص لە ئەبو موساو (حُذَيْفَة)ی پرسی.

## باسی لە نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قورباندا چ سوڕەتێ دەخوێندرێ.

## ٢٥٢ - باب مَا يُقْرَأُ فِي الأَضْحَى وَالْفِطْرِ.

١١٥٤ - (صحيح) عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ سَأَلَ أَبَا وَاقِدٍ اللَّيْثِيَّ: مَاذَا كَانَ يَقْرَأُ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الأَضْحَى وَالْفِطْرِ؟ قَالَ: كَانَ يَقْرَأُ فِيهِمَا (قٓ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْمَجِيدِ) وَ (ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ).

واتـە: (عُبَيْـدِ اللَّـه)ی کـوڕی (عَبْـدُ اللَّـه)ی کـوڕی عوتبـەی کـوڕی مەسـعود دەڵێت: عومەری کوڕی (خَطَّاب) ڕەزای خوای لێ بـێ لـە ئـەبو واقیـدی (لَّيْثِـی) پرسی: کە ئایا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربانـدا چ سـورەتێکی دەخوێنـد؟ ئـەبو واقیـد وتـی: لـە ڕکـاتی یەکەمیانـدا سـورەتی (قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ)ی دەخوێنـد، وە لـە ڕکـاتی دووەمیانـدا (ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ)ی دەخوێند.

## باسی دانیشتن بۆ گوێگرتن لە وتاری جەژن.

## ٢٥٣ - باب الْجُلُوسِ لِلْخُطْبَةِ.

١١٥٥ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ قَالَ: شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْعِيدَ، فَلَمَّا قَضَى الصَّلاَةَ قَالَ: (إِنَّا نَخْطُبُ فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَجْلِسَ لِلْخُطْبَةِ فَلْيَجْلِسْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَذْهَبَ فَلْيَذْهَبْ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا مُرْسَلٌ عَنْ عَطَاءٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی سائب دەڵێـت: لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا صـلی الله علیه وسلم ئامادەی نوێژی جەژن بـووم، کـاتێ کـە لەنوێـژ بوویـەوە فـەرمووی: (من دەمـەوێ وتـار بـدەم جا کـێ پێـی خۆشـە دانیشـێ گوێ بگرێـت لـە وتـاری

جەژن با دانیشێ، کێش پێی خۆشە بڕوات با بڕوات). ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرمووده (مُرْسَل)ە لە (عَطَاء)ەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم.

## باسی دەرچوون بۆ نوێژی جەژن لە ڕێگایەکەوەو گەڕانەوە لە ڕێگایەکی ترەوە.

## ٢٥٤ - باب يَخْرُجُ إِلَى الْعِيدِ فِى طَرِيقٍ وَيَرْجِعُ فِى طَرِيقٍ.

١١٥٦ - (صحيح) عَنْ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَذَ يَوْمَ الْعِيدِ فِى طَرِيقٍ، ثُمَّ رَجَعَ فِى طَرِيقٍ آخَرَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێگایەکی هەڵبژارد بۆ چوون بۆ نوێژی جەژن، لەپاشدا لە ڕێگایەکی ترەوە گەڕایەوە.

## باسی ئەگەر پێشنوێژ لەبەر بەهانەیەكی شەرعی لەڕۆژی خۆیدا دەرنەچوو بۆ نوێژی جەژن لەڕۆژی دواتردا دەرچێت.

## ٢٥٥ - باب إِذَا لَمْ يَخْرُجِ الإِمَامُ لِلْعِيدِ مِنْ يَوْمِهِ يَخْرُجُ مِنَ الْغَدِ.

١١٥٧ - (صحيح) عَنْ أَبِي عُمَيْرِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ عُمُومَةٍ لَهُ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ رَكْبًا جَاءُوا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَشْهَدُونَ أَنَّهُمْ رَأَوُا الْهِلاَلَ بِالأَمْسِ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يُفْطِرُوا وَإِذَا أَصْبَحُوا أَنْ يَغْدُوا إِلَى مُصَلاَّهُمْ.

واتە: لە ئەبو عومەیری كوڕی ئەنەسەوە، لە چەند مامەیەكیەوە كە هاوەڵێتی پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم كردبوو دەگێڕنەوە، كە كاروانێك هاتە لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شایەتیان دا كە دوێنێ مانگیان بینیوە، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێكردن ڕۆژووەكانیان بشكێنن، وە كاتێك بەیانی ڕۆژیان لێ بوویەوە بڕۆن بۆ نوێژگاكەیان بۆ نوێژی جەژن.

١١٥٨ - (ضعيف) عَنْ بَكْرُ بْنُ مُبَشِّرٍ الأَنْصَارِيُّ قَالَ: كُنْتُ أَغْدُو مَعَ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْمُصَلَّى يَوْمَ الْفِطْرِ وَيَوْمَ الأَضْحَى، فَنَسْلُكُ بَطْنَ بَطْحَانَ حَتَّى نَأْتِيَ الْمُصَلَّى، فَنُصَلِّيَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ نَرْجِعُ مِنْ بَطْنِ بَطْحَانَ إِلَى بُيُوتِنَا.

واتە: بەكری كوڕی موبەشیری ئەنصاری دەڵێت: لەگەڵ هاوەڵەكانی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بەیانی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان دەچووین بۆ نوێژگاكە. لە دۆڵی (بَطْحَان)ەوە كە شوێنێكە لە مەدینە دەڕۆیشتین هەتا ئەگەیشتینە نوێژگاكە، جا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم نوێژمان دەكرد. لەپاشدا هەر لە دۆڵی (بَطْحَان)ەوە ئەگەڕاینەوە بۆ ماڵەكانمان.

## باسی نوێژكردن لەدوای نوێژی جەژن.

## ٢٥٦ - باب الصَّلاَةِ بَعْدَ صَلاَةِ الْعِيدِ.

١١٥٩ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ فِطْرٍ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهُمَا وَلاَ بَعْدَهُمَا، ثُمَّ أَتَى النِّسَاءَ وَمَعَهُ بِلاَلٌ فَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ فَجَعَلَتِ الْمَرْأَةُ تُلْقِي خُرْصَهَا وَسِخَابَهَا.

واتە: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لیّ بیّ دەڵێت: بۆ نوێژی جەژنی رەزان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەرچوو بۆ نوێژگاكە دوو ركات نوێژی كرد، نە لەپێشیەوە نوێژی سوننەتی كرد، وە نە لەدوایەوە، لەپاشدا رۆیشت بۆ لای ئافرەتان بیلالی لەگەڵ بوو، فەرمانی پێكردن كە خێر و سەدەقە بكەن، ئیتر ئافرەتەكان دەستیان كرد بە خێركردن هەیان بوو ئەڵقە زێڕەكەی یان زیوەكەی دادەكەندو هەڵیدەدایە ناو كۆشی بیلالەوە، هەشیان بوو گەردانەكەی خۆی هەڵدەدایە ناویەوە.

## باسی نوێژی جەژن كردن بە خەڵك لە مزگەوتدا ئەگەر باران بوو.

## ٢٥٧ - باب يُصَلِّى بِالنَّاسِ الْعِيدُ فِي الْمَسْجِدِ إِذَا كَانَ يَوْمَ مَطَرٍ.

**١١٦٠ - (ضعيف)عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ أَصَابَهُمْ مَطَرٌ فِي يَوْمِ عِيدٍ، فَصَلَّى بِهِمُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلاَةَ الْعِيدِ فِي الْمَسْجِدِ.**

[المشكاة: ١٤٤٨].

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێت: رۆژی جەژن باران دەباری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە مزگەوتدا نوێژی جەژنی بۆ كردین.

# کۆباسەکانی نوێژە بارانەو بەشەکانی

## ٢٥٨ – جُمَّاع أبواب صلاة الاستسقاء وتفريعها.

١١٦١ - (صحيح) عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ بِالنَّاسِ يَسْتَسْقِيَ، فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَتَيْنِ جَهَرَ بِالْقِرَاءَةِ فِيهِمَا وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ، وَرَفَعَ يَدَيْهِ فَدَعَا وَاسْتَسْقَى، وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ.

واتە: لە عەببادی کوڕی تەمیمەوە، لە مامیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەگەڵ خەڵکەکە دەرچوو بۆ نوێژگاکە، بۆ نوێژە بارانە، دوو رکات نوێژی بۆکردن بەدەنگی بەرز سورەتی فاتیحەی خوێند تێیاندا، لەپاشدا رووی کردە قیبلەو پۆشاکەکەی راست و چەپ کرد واتە لای راستی دا بەسەر لای چەپدا لای چەپیشی دا بەسەر لای راستی دا، هەردوو دەستی بەرزکردەوەو دەستی کرد بە پاڕانەوەو داوای باران بارینی کرد.

١١٦٢ - (صحيح) عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَخْبَرَنِي عَبَّادُ بْنُ تَمِيمٍ الْمَازِنِيُّ، أَنَّهُ سَمِعَ عَمَّهُ - وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – يَقُولُ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا يَسْتَسْقِي، فَحَوَّلَ إِلَى النَّاسِ ظَهْرَهُ يَدْعُو اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ، قَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ: وَاسْتَقْبَلَ

الْقِبْلَةَ، وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ. قَالَ ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ: وَقَرَأَ فِيهِمَا، زَادَ ابْنُ السَّرْحِ: يُرِيدُ الْجَهْرَ.

واتە: ئیبنو شیهاب دەڵێت: عەببادى كوڕى تەمیمى مازنى بۆى گێڕامەوە، كە ئەویش لە مامى بیستبو – مامى (عَبْدُ اللَّه)ى كوڕى زەید بوو كە یەكێك بووە لە هاوەڵەكانى پێغەمبەرى خوا صلى الله علیه وسلم - وتى: رۆژێ پێغەمبەرى خوا صلى الله علیه وسلم دەرچوو بۆ نوێژگاكە، بۆ نوێژە بارانە، پشتى كردە خەڵكەكەو لە خواى گەورە پاڕایەوە. سولەیمانى كوڕى داود وتى: رووى كردە قیبلەو، پۆشاكەكەى راست و چەپ كرد واتە لاى راستى دا بەسەر لاى چەپدا لاى چەپیشى دا بەسەر لاى راستى دا، لەپاشدا دوو ركات نوێژى كرد، ئیبنو ئەبو (ذِئْب) وتى: قورئانى خوێند تێیاندا، ئیبنو سەرح ئەمەشى بۆ زیاد كرد: مەبەستى ئەوەبوو كە بەدەنگى بەرز سورەتى فاتیحەى خوێند.

١١٦٣ - (صحيح) عَنْ مُحَمَّدُ بْنُ عَوْفٍ قَالَ: قَرَأْتُ فِي كِتَابِ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ - يَعْنِي الْحِمْصِيَّ - عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَالِمٍ، عَنِ الزُّبَيْدِيِّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ مُسْلِمٍ، بِهَذَا الْحَدِيثِ بِإِسْنَادِهِ - لَمْ يَذْكُرِ الصَّلاَةَ - قَالَ: وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ، فَجَعَلَ عِطَافَهُ الأَيْمَنَ عَلَى عَاتِقِهِ الأَيْسَرِ، وَجَعَلَ عِطَافَهُ الأَيْسَرَ عَلَى عَاتِقِهِ الأَيْمَنِ، ثُمَّ دَعَا اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ.

واتە: موحەممەدی کوڕی عەوف دەڵێت: لە کتێبی عەمری کوڕی (حارث)ی (الْحِمْصِيّ) وەرم گرتووە، لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی سالمەوە، لە زوبەیدیەوە، لە موحەممەدی کوڕی موسلیمەوە فەرموودەی پێشوی بە هەمان سەنەد ریوایەت کردوە - بەڵام زوبەیدی لە زوهریەوە باسی نوێژی نەکرد - زوهری لە فەرموودەکەیدا وتی: پۆشاکەکەی راست و چەپ کرد، لەپاشدا لە خوای گەورە پاڕایەوە بارانیان بۆ ببارێنێ و لە وشکەساڵی رزگاریان بکات.

١١٦٤ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ زَيْدٍ قَالَ: اسْتَسْقَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَيْهِ خَمِيصَةٌ لَهُ سَوْدَاءُ، فَأَرَادَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَأْخُذَ بِأَسْفَلِهَا فَيَجْعَلَهُ أَعْلاَهَا، فَلَمَّا ثَقُلَتْ قَلَبَهَا عَلَى عَاتِقِهِ.

واتە: (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی زەید دەڵێت: جارێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژە بارانەی دەکرد پۆشاکێکی خەتداری رەشباوی لەبەردا بوو، ویستی رووی خوارەوەی بگرێ و بیکاتە سەرەوە، کاتێ کە قورس بوو بە سەرشانیا هەڵیگێڕایەوە واتە لای راستی دا بەسەر لای چەپی دا وە لای چەپیشی دا بەسەر لای راستی دا.

١١٦٥ - (حسن) عن هِشَامُ بْنُ إِسْحَاق بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كِنَانَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي قَالَ: أَرْسَلَنِي الْوَلِيدُ بْنُ عُتْبَةَ - قَالَ عُثْمَانُ: ابْنُ عُقْبَةَ - وَكَانَ أَمِيرَ الْمَدِينَةِ، إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ أَسْأَلُهُ عَنْ صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ فِي الاِسْتِسْقَاءِ؟ فَقَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُتَبَذِّلاً، مُتَوَاضِعًا، مُتَضَرِّعًا، حَتَّى أَتَى الْمُصَلَّى - زَادَ عُثْمَانُ فَرَقِيَ عَلَى الْمِنْبَرِ، ثُمَّ اتَّفَقَا - وَلَمْ يَخْطُبْ خُطَبَكُمْ هَذِهِ، وَلَكِنْ لَمْ يَزَلْ فِي الدُّعَاءِ وَالتَّضَرُّعِ وَالتَّكْبِيرِ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَمَا يُصَلِّي فِي الْعِيدِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَالإِخْبَارُ لِلنُّفَيْلِيِّ، وَالصَّوَابُ: ابْنُ عُتْبَةَ.

واتە: لە هیشامی كوڕی ئیسحاقی كوڕی (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی كینانەوە دەگێڕنەوە كە وتویەتی: باوكم بۆی گێڕامەوەو وتی: وەلیدی كوڕی عوتبە — (عُثمَان) وتی: كوڕی عوقبە — كە ئەمیرو كاربەدەستی مەدینە بوو، ناردمی بۆ لای ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ كە سەبارەت بە نوێژە بارانەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لێی بپرسم؟ ئیبنو عەباس وتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بۆ نوێژە بارانە بە جل و بەرگی ئاساییەوەو بەبێ خۆ جوان كردن بە ملكەچی و بەدەم پاڕانەوەو لەسەرخۆ دەردەچوو هەتا دەگەیشتە نوێژگاكە - (عُثْمَان) ئەمەی بۆ زیاد كرد: سەردەكەوتە سەر مینبەر، لەپاشدا هەردوو ڕاوی (عُثْمَان) و نوفەیلی هەماهەنگن لەسەر ئەوەی كە — وتاری خوێندەوە بەڵام نەك وەك ئەم وتارەی ئێوە، بەڵكو بەردەوام بەبێ فیزی و بە ملكەچی دەپاڕایەوەو (الله أكبر)ی دەكرد، لەپاشدا دوو ركات نوێژی كرد وەك چۆن نوێژی جەژنی دەكرد. ئەبو داود دەڵێت: گۆ(لفظ)ی هەواڵەكە هی نوفەیلییە نەك (عُثْمَان)، ڕاستیەكەشی وەلید كوڕی عوتبەیە نەك كوڕی عوقبە.

## باسی لە چ كاتێكدا پۆشاكەكەی ڕاست و چەپ دەكرد ئەگەر نوێژە بارانەی بكردایە.

## ٢٥٩ - باب فِي أَيِّ وَقْتٍ يُحَوِّلُ رِدَاءَهُ إِذَا اسْتَسْقَى.

١١٦٦ - (صحيح) عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ زَيْدٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ إِلَى الْمُصَلَّى يَسْتَسْقِي، وَأَنَّهُ لَمَّا أَرَادَ أَنْ يَدْعُوَ، اسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، ثُمَّ حَوَّلَ رِدَاءَهُ.

واتە: لە عەببادی كوڕی تەمیمەوە هاتووە، كە (عَبْدُ الله)ی كوڕی زەید بۆی گێڕاوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەرچوو بۆ نوێژگاكە بۆ نوێژە بارانە، كاتێ كە ویستی بپاڕێتەوە، رووی دەكردە قیبلە، لەپاشدا پۆشاكەكەی راست و چەپ كردو پاڕیەوە.

١١٦٧ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، أَنَّهُ سَمِعَ عَبَّادَ بْنَ تَمِيمٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ زَيْدٍ الْمَازِنِيَّ يَقُولُ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْمُصَلَّى فَاسْتَسْقَى، وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ حِينَ اسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ.

واتە: لە (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی ئەبو بەكرەوە دەگێڕنەوە، كە لە عەببادی كوڕی تەمیمی بیستوە وتویەتی: لە (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی زەیدی مازنیم بیست دەیوت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەرچوو بۆ نوێژگاكە، نوێژە بارانەی كرد، لە كاتێكدا كە ڕووی كردە قیبلە پۆشاكەكەی ڕاست و چەپ كرد.

# باسی بەرزكردنەوەی هەردوو دەست لەكاتی پاڕانەوە بۆ باران بارین.

# ٢٦٠ - باب رَفْعِ الْيَدَيْنِ فِي الاِسْتِسْقَاءِ.

١١٦٨ - (صحيح) عَنْ عُمَيْرٍ مَوْلَى بَنِي آبِي اللَّحْمِ، أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتَسْقِي عِنْدَ أَحْجَارِ الزَّيْتِ، قَرِيبًا مِنَ الزَّوْرَاءِ، قَائِمًا يَدْعُو يَسْتَسْقِي، رَافِعًا يَدَيْهِ قِبَلَ وَجْهِهِ، لاَ يُجَاوِزُ بِهِمَا رَأْسَهُ.

واتە: لە عومەیری مەولای هۆزی (آبی اللحم)ەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم دیوە لەلای (أحْجَارِ الزَّيْتِ) لە نزیك (زَوْرَاء)ەوە كە دوو شوێنن لە مەدینە، بە پێوە دەپاڕایەوەو داوای باران بارینی دەكرد، هەردوو دەستی بەرزكردبووەوە بەرامبەر بە روخساری، بەڵام دەستەكانی لەئاست سەری تێ نەدەپەڕاند.

١١٦٩ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: أَتَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَوَاكِي فَقَالَ: (اللَّهُمَّ اسْقِنَا غَيْثًا مُغِيثًا مَرِيعًا، نَافِعًا غَيْرَ ضَارٍّ، عَاجِلاً غَيْرَ آجِلٍ) قَالَ: فَأَطْبَقَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ.

واتە: جابری کوڕی (عَبْدُ الله) دەڵێت: کۆمەڵێ ئافرەت بە گریانەوە لەبەر بێ بارانی هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ ئەوەی بپاڕێتەوەو داوای بارانی ڕەحمەتیان بۆ بکات، پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (خوایە بارانمان بۆ ببارێنە بارانێکی بە لێزمەی فریاگوزاری ئاسانی بەپیت و بەرەکەت و سەوزکەری گژوگیا، بەسوودی بێ زیان، بەمزوانەو دوای مەخە بۆمان) ڕاوی وتی: هەر لەو کاتەدا هەور هەموو ئاسمانی داپۆشی و دایکردە لێزمە باران و هەموو ناوچەکەی گرتەوە بەگشتی.

١١٧٠ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ لاَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنَ الدُّعَاءِ إِلاَّ فِي الاِسْتِسْقَاءِ، فَإِنَّهُ كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَتَّى يُرَى بَيَاضُ إِبْطَيْهِ.

واتە: ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە هیچ پاڕانەوەیەکدا هەردوو دەستی بەرزنەدەکردەوە بە ئەندازەی پاڕانەوەی داواکردنی باران بارین، بەڵام لەکاتی داواکردنی باراندا ئەوەندە بەرزی دەکردنەوە هەتا سپێتی بن باڵەکانی دەبینرا.

١١٧١ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَسْتَسْقِي، هَكَذَا، يَعْنِي: وَمَدَّ يَدَيْهِ، وَجَعَلَ بُطُونَهُمَا مِمَّا يَلِي الأَرْضَ، حَتَّى رَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ.

واتە: ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەكاتی پاڕانەوە بۆ باران بارین بەم شێوەیە دەپاڕایەوە واتە: بەری دەستەکانی دەکردە زەوی ئەوەندە بەرزی کردنەوە هەتا سپێتی بن باڵەکانیم بینی.

١١٧٢ - (صحيح) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، أَخْبَرَنِي مَنْ رَأَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدْعُو عِنْدَ أَحْجَارِ الزَّيْتِ بَاسِطًا كَفَّيْهِ.

واتە: موحەممەدی کوڕی ئیبراهیم دەڵێت: ئەوەی کە لە (أحجَارِ الزَّيت) پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم دیبوو دەپاڕایەوە بۆ باران بارین[1] بۆی گێڕامەوە: کە پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم هەردوو دەستی بەرزکردبوەوە.

١١٧٣ - (حسن) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: شَكَى النَّاسُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قُحُوطَ الْمَطَرِ، فَأَمَرَ بِمِنْبَرٍ فَوُضِعَ لَهُ فِي الْمُصَلَّى، وَوَعَدَ النَّاسَ يَوْمًا يَخْرُجُونَ فِيهِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ

[1] - واتە: عومەیری مەولای هۆزی (آبی اللحم)[1] وەك لە فەرمووودەی ژمارە : ١١٦٨ دا هاتووە.

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ بَدَا حَاجِبُ الشَّمْسِ، فَقَعَدَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَكَبَّرَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَحَمِدَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ، ثُمَّ قَالَ: (إِنَّكُمْ شَكَوْتُمْ جَدْبَ دِيَارِكُمْ وَاسْتِئْخَارَ الْمَطَرِ عَنْ إِبَّانِ زَمَانِهِ عَنْكُمْ، وَقَدْ أَمَرَكُمُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ تَدْعُوهُ، وَوَعَدَكُمْ أَنْ يَسْتَجِيبَ لَكُمْ) ثُمَّ قَالَ: ( ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ ) لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ، اللَّهُمَّ أَنْتَ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ الْغَنِيُّ وَنَحْنُ الْفُقَرَاءُ، أَنْزِلْ عَلَيْنَا الْغَيْثَ، وَاجْعَلْ مَا أَنْزَلْتَ لَنَا قُوَّةً وَبَلاَغًا إِلَى حِينٍ) ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ، فَلَمْ يَزَلْ فِي الرَّفْعِ حَتَّى بَدَا بَيَاضُ إِبْطَيْهِ، ثُمَّ حَوَّلَ عَلَى النَّاسِ ظَهْرَهُ، وَقَلَّبَ - أَوْ حَوَّلَ رِدَاءَهُ - وَهُوَ رَافِعٌ يَدَيْهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ وَنَزَلَ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَأَنْشَأَ اللَّهُ سَحَابَةً فَرَعَدَتْ وَبَرَقَتْ، ثُمَّ أَمْطَرَتْ بِإِذْنِ اللَّهِ، فَلَمْ يَأْتِ مَسْجِدَهُ حَتَّى سَالَتِ السُّيُولُ، فَلَمَّا رَأَى سُرْعَتَهُمْ إِلَى الْكِنِّ، ضَحِكَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ، فَقَالَ: (أَشْهَدُ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، وَأَنِّي عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ »).
قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، إِسْنَادُهُ جَيِّدٌ، أَهْلُ

الْمَدِينَةِ يَقْرَءُونَ (مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ) وَإِنَّ هَذَا الْحَدِيثَ حُجَّةٌ لَهُمْ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: خەڵك سکاڵایان هێنایە لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبەر بێ بارانی و نەهاتی و وشکە ساڵی، جا ئەویش فەرمانی دا کە مینبەرێکی بۆ دابنێن، لە نوێژگاکەدا بۆیان دانا، لەپاشدا پەیمانی دا رۆژێك دەربچن تێیدا، عائیشە وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەگەڵ دەرچوونی خۆردا دەرچوو بۆ نوێژگاکە، لەسەر مینبەرەکە دانیشت (الله أکبر)ی کردو، سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد، لەپاشدا فەرمووی: ئێوە سکاڵای وشکە ساڵی و نەهاتی ولآتی خۆتانتان کرد، لەگەڵ دواکەوتنی باران بارین بەسەرتاندا لەکاتی خۆیدا، خوای گەورەش فەرمانی پێکردون کە داوای لێ بکەن، وە پەیمانیشی پێ داون کە وەڵامتان بداتەوە، لەپاشدا فەرمووی: (ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ). سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان، (ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) بەخشندەی میهرەبان، (ٱلرَّحْمَٰنِ) ئەو زاتەیە کە کەرەم و رەحمەتی لە دنیادا هەموو شتێکی گرتۆتەوە، (ٱلرَّحِيمِ)یش سەرچاوەی ئەو رەحمەتە دەگەیەنێت کە تەواو بوونی بۆ نیە، (مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ) خاوەنی رۆژی قیامەت رۆژی سزاو پاداشتدانەوە، ئەو رۆژەی کە جگە لە خوا کەس خاوەن دەسەڵات نیە، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە جگە لە (الله)، چی ویست دەیکات، خودایە تۆ (الله)ی جگە لە تۆ هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە، تۆ دەوڵەمەندی و ئێمەش هەژارین، بارانمان بۆ ببارێنە، ئەوەی کە بۆمان دەبارێنی بۆمان بکە بەهێزێك کە بمانگەیەنێتە کاتێکی تر، لەپاشدا هەردوو دەستی بەرزکردەوە، وە بەردەوام بەرزی کردنەوە هەتا سپێتی بن باڵەکانی دەرکەوتن، ئینجا پشتی لە خەڵکەکە کردو،

پۆشاکەکەی راست و چەپ کرد، هەردوو دەستی هەر بە بەرزی راگرتبوو دەپاڕایەوە، لەپاشدا رووی کردە خەڵکەکەو لەسەر مینبەرەکە هاتەخوارەوە، دوو رکات نوێژی کرد، جا خوای گەورە پەڵە هەورێکی پێك هێنا دەستی کرد بە گرمە گرم و هەورە بروسکە، لەپاشدا بە فەرمانی خوای گەورە دایکردە باران، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەو شوێنەی کە نوێژە بارانەکەی تێدا کردبوو نەگەیشتەوە مزگەوتەکەی لافاو هەستا، کاتێ کە بینی خەڵکەکە بەپەلە دەچنەوە بۆ ماڵەکانیان پێکەنی هەتا ددانەکانی دەرکەوت، فەرمووی: شایەتی دەدەم کە خوای گەورە بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە، وە منیش بەندەو پێغەمبەری خوام، ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرموودە (غَرِيب)ە چونکە تەنها لەرێگایەکەوە هاتووە، بەڵام سەنەدەکەی (جَيِّد)ە، خەڵکی مەدینە بە (مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ) دەیخوێننەوە نەك بە (مالِك يَوْمِ الدِّينِ)، بێگومان ئەم فەرموودە بەڵگەیە بۆ خوێندنەوەیان بەو شێوەیە.

١١٧٤ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: أَصَابَ أَهْلَ الْمَدِينَةِ قَحْطٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبَيْنَمَا هُوَ يَخْطُبُنَا يَوْمَ جُمُعَةٍ إِذْ قَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلَكَ الْكُرَاعُ، هَلَكَ الشَّاءُ، فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يَسْقِيَنَا! فَمَدَّ يَدَيْهِ وَدَعَا. قَالَ أَنَسٌ: وَإِنَّ السَّمَاءَ لَمِثْلُ الزُّجَاجَةِ، فَهَاجَتْ رِيحٌ، ثُمَّ أَنْشَأَتْ سَحَابَةً، ثُمَّ اجْتَمَعَتْ، ثُمَّ أَرْسَلَتِ السَّمَاءُ عَزَالِيَهَا، فَخَرَجْنَا نَخُوضُ الْمَاءَ حَتَّى أَتَيْنَا مَنَازِلَنَا! فَلَمْ يَزَلِ الْمَطَرُ إِلَى الْجُمُعَةِ

الأُخْرَى، فَقَامَ إِلَيْهِ ذَلِكَ الرَّجُلُ، أَوْ غَيْـرُهُ، فَقَـالَ: يَـا رَسُولَ اللَّهِ، تَهَدَّمَتِ الْبُيُوتُ، فَـادْعُ اللَّـهَ أَنْ يَحْبِسَـهُ! فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ، ثُـمَّ قَـالَ: (حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا) فَنَظَرْتُ إِلَى السَّـحَابِ يَتَصَـدَّعُ حَوْلَ الْمَدِينَةِ كَأَنَّهُ إِكْلِيلٌ.

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك دەڵێت: لەسەردەمی پێغەمبەری خـوادا صـلی الله علیه وسلم خەڵكی مەدینە تووشی وشكەساڵی و بێ بارانی هاتن، رۆژی هەینی لەكاتێكدا كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسـلم وتـاری دەدا، پیـاوێ هەسـتا وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم! لەبـەر بـێ بـارانی وڵاخ و ئەسپەكانمان و مـەڕ و ماڵاتـەكانمان تێداچوون، لـەخوای گـەورە بپاڕێرەوە كـە بارانمان بۆ ببارێنێـت، ئـەویش هـەردوو دەسـتی بـەرزكردەوەو دەسـتی كـرد بـە پاڕانـەوە، ئەنـەس وتـی: ئاسمـان ئەوەنـدە سـپی و بـێ پەڵـە بـوو وەك شوشـە وەهابوو، پەڵە هەورێك بە ئاسمانەوە نەبوو، با هەڵی كرد، لەپاشدا هەوری پێك هێنا، ئینجا هەورەكان كۆبوونەوەو، دایكردە بـاران وەك ئـەوەی كـە كونـە ئـاوێ یان جەوەنە ئاوێ سەرەوخوار كەیتەوەو دەمەكەی بیكەیتەوە بـەو شـێوەیە بـە خوڕەم دەباری، لەمزگەوت دەرچووین هـەتا گەیشتینە ماڵەوە بـەردەوام بـاران دەباری هەتا رۆژی هەینی دواتر، جا هەمان پیاو یان پیاوێكی تـر هەسـتا وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسلم! ئەوەنـدە بـاران بـاری خانووەكـان رووخان، لە خوا بپاڕێرەوە كە ئەم بارانە بگرێتەوە، پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیه وسلم پێكەنی، لەپاشدا فـەرمووی: (خودایـە بـەدەورو بەرمانـدا ببارێنـە، نـەوەك بەسـەر سـەرمانا). ئەنـەس وتـی: سـەرنجم دا هەورەكـە بڵاوبـووەوە بەدەوری مەدینەدا وەك تاجێك كـە بەشـی سـەرەوەی پێـوە بێـت واتـە ئاسمـانی مەدینە هەوری پێوە نەما.

١١٧٥ - (صحيح) عَنْ شَرِيكِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِى نَمِرٍ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: فَذَكَرَ نَحْوَ حَدِيثِ عَبْدِ الْعَزِيزِ قَالَ: فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَيْهِ بِحِذَاءِ وَجْهِهِ فَقَالَ: (اللَّهُمَّ اسْقِنَا). وَسَاقَ نَحْوَهُ.

واتە: لە شەریكی كوڕی (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی ئەبو نەمیرەوە، لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، كە شەریك لە ئەنەسی بیستووە وەك فەرموودەكەی (عَبْد الْعَزِيزِ)ی گێڕایەوە، وتی: واتە: شەریك لە فەرموودەكەیدا لە ئەنەسەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەردوو دەستی بەرزكردبووەوە بەرامبەر بە رووخساری فەرمووی: (خوایە بارانی رەحمەتمان بۆ ببارێنە). جا شەریك فەرموودەكەی گێڕایەوە وەك فەرموودەكەی (عَبْد الْعَزِيزِ).

١١٧٦ - (حسن) عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا اسْتَسْقَى قَالَ: (اللَّهُمَّ اسْقِ عِبَادَكَ وَبَهَائِمَكَ، وَانْشُرْ رَحْمَتَكَ، وَأَحْيِ بَلَدَكَ الْمَيِّتَ).

واتە: لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە، لە باوكیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەكاتی پاڕانەوەی داواكردنی باران دا دەیفەرموو: (خوایە بەندەكانت و ئاژەڵ و گیانلەبەرەكانت تێرئاو بكە، رەحمەت و بەزەیی خۆت بڵاوبكەرەوەو، شارە مردووەكەت زیندوو بكەرەوە واتە گژوگیاكەی سەوز كەرەوەو بە پیت و بەرەكەتی بكە).

# باسی نوێژی مانگ گیران و خۆر گیران.

## ٢٦١ - باب صَلاَةِ الْكُسُوفِ.

١١٧٧ - (صحيح) عَنْ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ، أَخْبَرَنِي مَنْ أُصَدِّقُ - وَظَنَنْتُ أَنَّهُ يُرِيدُ عَائِشَةَ - قَالَ: كُسِفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قِيَامًا شَدِيدًا: يَقُومُ بِالنَّاسِ، ثُمَّ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقُومُ، ثُمَّ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقُومُ، ثُمَّ يَرْكَعُ، فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ، فِي كُلِّ رَكْعَةٍ ثَلاَثُ رَكَعَاتٍ، يَرْكَعُ الثَّالِثَةَ، ثُمَّ يَسْجُدُ، حَتَّى إِنَّ رِجَالاً يَوْمَئِذٍ لَيُغْشَى عَلَيْهِمْ مِمَّا قَامَ بِهِمْ، حَتَّى إِنَّ سِجَالَ الْمَاءِ لَتُصَبُّ عَلَيْهِمْ، يَقُولُ إِذَا رَكَعَ: (اللَّهُ أَكْبَرُ) وَإِذَا رَفَعَ (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) حَتَّى تَجَلَّتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ قَالَ: (إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لاَ يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، وَلَكِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ يُخَوِّفُ بِهِمَا عِبَادَهُ، فَإِذَا كُسِفَا فَافْزَعُوا إِلَى الصَّلاَةِ) ﴿ولكن قوله: (ثَلاَثُ رَكَعَاتٍ) شاذ، والمحفوظ (ركوعان) كما في (الصحيحين) ويأتي (١١٨٠)﴾.

واتە: لە عوبەيدى كوڕى عومەيرەوە دەگێڕنەوە، كە وتويەتى: ئەوەى من بڕواى پێ دەكەم بۆى گێڕامەوە – گومانم وايە كە مەبەستى لە عائيشە بووبێت - وتى: لەسەردەمى پێغەمبەرى خوادا صلى الله عليه وسلم خۆر گيرا، پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم هەستا بەرنوێژى بۆ خەڵكەكە كرد بە پێوە زۆر مايەوەو قورئانى زۆرى خوێند، لەپاشدا ركوعى برد، ئينجا سەرى بەرزكردەوەو قورئانى زۆرى خوێند، لەپاشدا ركوعى برد، ئينجا سەرى بەرزكردەوەو قورئانى زۆرى خوێند، لەپاشدا ركوعى بردەوە، بەو شێوەيە دوو ركات نوێژى دورو درێژى كرد، لە هەموو ركاتێكدا سێ جار ركوعى برد، ئينجا لەدواى ركوعى سێهەم سەجدەى برد، هەتا هەندێ لە پياوان لەهۆش خۆيان چوون، دۆڵچە ئاويان پێدا دەكردن بۆ ئەوەى بێنەوە سەرخۆيان، كاتێ كە دەچووە ركوعەوە دەيفەرموو: (اللّهُ أكْبَرُ)، وە كاتێ كە سەرى بەرزدەكردەوە دەيفەرموو: (سَمِعَ اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، هەتا خۆر بەربوو، لەپاشدا فەرمووى: مانگ و خۆر بۆ مردن و ژيانى كەس ناگيرێن، بەڵكو دوو نيشانەن لە نيشانەكانى خواى گەورە، بۆ مردن و ژيانى كەس ناگيرێن، بەندەكانى پێ دەترسێنێت، ئەگەر گيران پەنا بۆ نوێژكردن بەرن.

## باسى ئەوانەى كە دەڵێن: چوار ركوع دەبرێت.

## ٢٦٢ – باب مَنْ قَالَ: أَرْبَعُ رَكَعَاتٍ.

١١٧٨ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كُسِفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَكَانَ ذَلِكَ فِي الْيَوْمِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ إِبْرَاهِيمُ ابْنُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ النَّاسُ: إِنَّمَا كُسِفَتْ لِمَوْتِ إِبْرَاهِيمَ ابْنِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَلَّى بِالنَّاسِ سِتَّ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ: كَبَّرَ، ثُمَّ قَرَأَ فَأَطَالَ الْقِرَاءَةَ، ثُمَّ رَكَعَ نَحْوًا مِمَّا قَامَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَقَرَأَ دُونَ الْقِرَاءَةِ الأُولَى، ثُمَّ رَكَعَ نَحْوًا مِمَّا قَامَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَقَرَأَ الْقِرَاءَةَ الثَّالِثَةَ دُونَ الْقِرَاءَةِ الثَّانِيَةِ، ثُمَّ رَكَعَ نَحْوًا مِمَّا قَامَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَانْحَدَرَ لِلسُّجُودِ، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ ثَلاَثَ رَكَعَاتٍ قَبْلَ أَنْ يَسْجُدَ، لَيْسَ فِيهَا رَكْعَةٌ إِلاَّ الَّتِي قَبْلَهَا أَطْوَلُ مِنَ الَّتِي بَعْدَهَا، إِلاَّ أَنَّ رُكُوعَهُ نَحْوٌ مِنْ قِيَامِهِ. قَالَ: ثُمَّ تَأَخَّرَ فِي صَلاَتِهِ، فَتَأَخَّرَتِ الصُّفُوفُ مَعَهُ، ثُمَّ تَقَدَّمَ فَقَامَ فِي مَقَامِهِ، وَتَقَدَّمَتِ الصُّفُوفُ، فَقَضَى الصَّلاَةَ وَقَدْ طَلَعَتِ الشَّمْسُ فَقَالَ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، لاَ يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ بَشَرٍ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ فَصَلُّوا حَتَّى تَنْجَلِيَ). وَسَاقَ بَقِيَّةَ الْحَدِيثِ. ﴿ولكن قوله:(سِتَّ رَكَعَاتٍ) شاذ، والمحفوظ (أربع ركعات)كما في الطريق التالية (١١٧٩)﴾.

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم لەو ڕۆژەدا کە ئیبراهیمی کوڕی وەفاتی کرد خۆر گیرا، خەڵك وتیان: بۆ وەفاتی ئیبراهیمی کوڕی خۆر گیراوە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەستا دوو ركات نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد لە هەر ركاتێکدا سێ ركوعی برد دانەویەوە دوو سەجدەی برد واتە لەو دوو ركاتەدا شەش جار ركوعی برد لەگەڵ چوار سەجدە، بەم شێوەیە: (الله أكبر)ی کرد، لەپاشدا قورئانی خوێندو درێژەی پێدا، لەپاشدا ركوعی برد بە ئەندازەی بە پێوە وەستانەکەی لەرکوعدا مایەوە، ئینجا سەری بەرزکردەوەو قورئانی خوێند بەڵام کەمتر بوو لە قورئان خوێندنەکەی یەکەم، لەپاشدا ركوعی برد بە ئەندازەی بە پێوە وەستانەکەی لەرکوعدا مایەوە، ئینجا سەری بەرزکردەوەو قورئانی خوێند بەڵام کەمتر لە قورئان خوێندنەکەی دووەم جار، لەپاشدا سەری بەرزکردەوەو بۆ سێهەم جار قورئانی خوێند بەڵام کەمتر لە قورئان خوێندنەکەی دووەم جار، ئینجا ركوعی برد بە ئەندازەی بە پێوە وەستانەکەی لەرکوعدا مایەوە، لەپاشدا سەری بەرزکردەوەو دانەویەوە بۆ سەجدەو دوو سەجدەی برد، لەپاشدا هەستایەوە سێ جار ركوعی برد پێش ئەوەی سەجدە ببات، هەر ركوعێکی دەبرد کەمتر دەمایەوە لەوەی پێشتری، ئەوەندە هەبوو بە ئەندازەی بە پێوە وەستانەکەی لەرکوعدا دەمایەوە، لەپاشدا لەنوێژەکەیدا هاتەدواوە، ڕیزەکانیش هاتنەدواوە لەگەڵی، ئینجا چووەوە پێشەوەو لە شوێنەکەی خۆیدا ڕاوەستا، ڕیزەکانیش چوونەوە پێشەوە، نوێژەکەی تەواو کردو خۆر بەربوو، فەرمووی: (ئەی خەڵکینە، مانگ و خۆر دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خوای گەورە، بۆ مردنی هیچ کەسێك ناگیرێن، ئەگەر بینیتان خۆر یان مانگ گیراوە، نوێژ بکەن هەتا بەردەبێت، لەپاشدا ڕاوی باقی فەرموودەکەی گێڕایەوە.

١١٧٩ - (صحيح) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: كُسِفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي يَوْمٍ شَدِيدِ الْحَرِّ، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِأَصْحَابِهِ، فَأَطَالَ الْقِيَامَ حَتَّى جَعَلُوا يَخِرُّونَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ، ثُمَّ رَفَعَ فَأَطَالَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ، ثُمَّ رَفَعَ فَأَطَالَ ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ قَامَ فَصَنَعَ نَحْوًا مِنْ ذَلِكَ، فَكَانَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ. وَسَاقَ الْحَدِيثَ.

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم لەڕۆژێکی زۆر گەرمدا خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی بۆ هاوەڵەکانی کرد، ئەوەندە بەپێوە مایەوە هەتا کەوتنە سەرزەوی، لەپاشدا رکوعی بردو زۆر مایەوە، ئینجا سەری بەرزکردەوەو بەپێوە زۆر مایەوە، لەپاشدا رکوعی بردو زۆر مایەوە، ئینجا سەری بەرزکردەوەو بەپێوە زۆر مایەوە، لەپاشدا دوو جار سەجدەی برد، لەپاشدا هەستایەوە بۆ رکاتی دووەم و وەك رکاتی یەکەمی کرد، کە دەکاتە چوار رکوع و چوار سەجدە، لەپاشدا راوی باقی فەرموودەکەی گێڕایەوە.

١١٨٠ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَتْ: خُسِفَتِ الشَّمْسُ فِي حَيَاةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَقَامَ فَكَبَّرَ وَصَفَّ النَّاسُ وَرَاءَهُ، فَاقْتَرَأَ

رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قِرَاءَةً طَوِيلَةً، ثُمَّ كَبَّرَ، فَرَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) ثُمَّ قَامَ فَاقْتَرَأَ قِرَاءَةً طَوِيلَةً هِيَ أَدْنَى مِنَ الْقِرَاءَةِ الأُولَى، ثُمَّ كَبَّرَ فَرَكَعَ رُكُوعًا طَوِيلاً، هُوَ أَدْنَى مِنَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ قَالَ: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) ثُمَّ فَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الأُخْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، فَاسْتَكْمَلَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ، وَانْجَلَتِ الشَّمْسُ قَبْلَ أَنْ يَنْصَرِفَ.

واتە: عائیشەی خێزانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەڵێت: لە ژیانی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چوو بۆ مزگەوت، هەستا (الله أكبر)ی کردو خەڵکی لەدوایەوە ریزیان بەست قورئانێکی زۆری خوێند، لەپاشدا (الله أكبر)ی کرد، ئینجا رکوعی بردو رکوعەکەی درێژکردەوە، لەپاشدا سەری بەرزکردەوەو فەرمووی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ). واتە: پەروەردگار بیستی لەوانەی کە سوپاسگوزاری دەکەن، ئەی خودایە سوپاس بۆ تۆ. لەپاشدا هەستایەوەو قورئانێکی زۆری خوێند بەڵام کەمتر بوو لە قورئان خوێندنەکەی یەکەم جار، لەپاشدا (الله أكبر)ی کردو چەمایەوە، بەڵام کورتتر بوو لە چەمانەوەی یەکەم، ئینجا سەری بەرزکردەوەو فەرمووی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ). لەپاشدا رکاتی دووەمی هەروەك رکاتی یەکەم ئەنجامدا هەتا رکاتەکان بوونە چوار رکوع و چوار سەجدە، پێش ئەوەی لەنوێژ بێتەوە خۆر دەرکەوت.

١١٨١ - (صحيح) عن كَثِيرُ بْنُ عَبَّاسٍ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ كَانَ يُحَدِّثُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ، مِثْلَ حَدِيثِ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فِي كُلِّ رَكْعَةٍ رَكْعَتَيْنِ.

واته: له (كَثِير)ی كوڕی عەباسەوە هاتووە، كە ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ دەیوت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی خۆر گیرانی كرد، وەك چۆن لە فەرموودەكەی عوروەدا هاتووە، لە عائیشەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم، بەم شێوەیە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دوو ركات نوێژی كرد، لەهەر ركاتێكدا دوو ركوعی برد.

١١٨٢ - (ضعيف) عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَإِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى بِهِمْ، فَقَرَأَ بِسُورَةٍ مِنَ الطُّوَلِ، وَرَكَعَ خَمْسَ رَكَعَاتٍ، وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ قَامَ الثَّانِيَةَ فَقَرَأَ سُورَةً مِنَ الطُّوَلِ، وَرَكَعَ خَمْسَ رَكَعَاتٍ، وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ جَلَسَ كَمَا هُوَ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ يَدْعُو، حَتَّى انْجَلَى كُسُوفُهَا.

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوو رکات نوێژی خۆر گیرانی بۆ کردن، یەکێك لە سورەتە درێژەکانی خوێند، لەرکاتی یەکەم دا پێج جار رکوعی برد، لەگەڵ دوو سەجدەدا، لەپاشدا هەستایەوە بۆ رکاتی دووەم و یەکێکی تر لە سورەتە درێژەکانی خوێندو، پێج جار رکوعی برد، لەگەڵ دوو سەجدەدا، لەپاشدا لەدوای نوێژ وەك عادەتی خۆی دانیشت رووەو قیبلەو پاڕایەوە، هەتا بەربوو.

**١١٨٣ - (منكر) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ صَلَّى فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ: فَقَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ سَجَدَ وَالأُخْرَى مِثْلُهَا.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەم شێوەیە نوێژی خۆر گیرانی کرد: قورئانی خوێند، لەپاشدا رکوعی برد، ئینجا قورئانی خوێند، لەپاشدا رکوعی دووەمی برد، ئینجا قورئانی خوێند، لەپاشدا رکوعی سێهەمی برد، جا قورئانی خوێند، لەپاشدا رکوعی چوارەمی برد، ئینجا سەجدەی برد، وە رکاتی دووەمیش هەروەها.

**١١٨٣ - (منكر) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ صَلَّى فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ: فَقَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ سَجَدَ وَالأُخْرَى مِثْلُهَا.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەم شێوەیە نوێژی خۆر گیرانی کرد: قورئانی خوێند، لەپاشدا رکوعی برد، ئینجا قورئانی خوێند، لەپاشدا رکوعی دووەمی برد، ئینجا قورئانی خوێند، لەپاشدا رکوعی سێهەمی برد، جا قورئانی خوێند، لەپاشدا رکوعی چوارەمی برد، ئینجا سەجدەی برد، وە رکاتی دووەمیش هەروەها.

١١٨٤ - (ضعيف) عَنْ ثَعْلَبَةُ بْنُ عِبَادٍ الْعَبْدِيُّ - مِنْ أَهْلِ الْبَصْرَةِ - أَنَّهُ شَهِدَ خُطْبَةً يَوْمًا لِسَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ قَالَ: قَالَ سَمُرَةُ: بَيْنَمَا أَنَا وَغُلاَمٌ مِنَ الأَنْصَارِ نَرْمِى غَرَضَيْنِ لَنَا، حَتَّى إِذَا كَانَتِ الشَّمْسُ قِيدَ رُمْحَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةٍ فِى عَيْنِ النَّاظِرِ مِنَ الأُفُقِ، اسْوَدَّتْ حَتَّى آضَتْ كَأَنَّهَا تَنُّومَةٌ، فَقَالَ أَحَدُنَا لِصَاحِبِهِ: انْطَلِقْ بِنَا إِلَى الْمَسْجِدِ فَوَاللَّهِ لَيُحْدِثَنَّ شَأْنُ هَذِهِ الشَّمْسِ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى أُمَّتِهِ حَدَثًا، قَالَ: فَدَفَعْنَا فَإِذَا هُوَ بَارِزٌ فَاسْتَقْدَمَ فَصَلَّى، فَقَامَ بِنَا كَأَطْوَلِ مَا قَامَ بِنَا فِى صَلاَةٍ قَطُّ، لاَ نَسْمَعُ لَهُ صَوْتًا، قَالَ: ثُمَّ رَكَعَ بِنَا كَأَطْوَلِ مَا رَكَعَ بِنَا فِى صَلاَةٍ قَطُّ، لاَ نَسْمَعُ لَهُ صَوْتًا، ثُمَّ سَجَدَ بِنَا كَأَطْوَلِ مَا سَجَدَ بِنَا فِى صَلاَةٍ قَطُّ، لاَ نَسْمَعُ لَهُ صَوْتًا، ثُمَّ فَعَلَ فِى الرَّكْعَةِ الأُخْرَى

مِثْلَ ذَلِكَ، قَالَ: فَوَافَقَ تَجَلِّي الشَّمْسِ جُلُوسَهُ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ، قَالَ: ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ قَامَ، فَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَشَهِدَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَشَهِدَ أَنَّهُ عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، ثُمَّ سَاقَ أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ خُطْبَةَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: (ثعلَبَة)ی کوڕی عەبادی عەبدی خەڵکی بەسرە دەڵێت: کاتێ کە سەمورەی کوڕی جوندوب ئەمیر و کاربەدەستی بەسرە بوو ڕۆژێ ئامادەی وتارێکی بووم: سەمورە وتی: لەکاتێکدا من و غولامێك لە یاریدەدەران رەمی دوو نیشانەمان دەکرد، هەتا پێمان وابوو خۆر لەبەرچاو بە ئەندازەی دوو رم یان سێ رم بەرزبوەوەو رەش داگیرا هەتا وەك رووەکی (تنّومَة)ی لێهات واتە روناکی نەما – (تنّومَة) جۆرێکە لە رووەکی زەوی خۆی و بەرەکەی کەمێك رەش دەنوێنێت – یەکێ لە ئێمە بە هاوەڵەکەی وت: با بڕۆین بۆ مزگەوت سوێند بە خوا بەسەرهاتی ئەم خۆر گیرانە روداوێکی تازە لە ئوممەتی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دێنێتە کایەوە، سەمورە وتی: بە پەلە رۆشتین بۆلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەناو کۆمەڵێکی زۆردا بوو مزگەوت قەڵەباڵغ بوو، چووە پێشەوە بەرنوێژی بۆ کردین، ئەوەندە بە پێوە وەستاندینی هەرگیز بەو شێوەیە بە پێوە نەیوەستاندبوین، گوێمان لە دەنگی نەبوو واتە بە نهێنی قورئانی دەخوێند، لەپاشدا رکوعی پێ بردین هەرگیز بەو شێوەیە رکوعی درێژی پێ نەبردبوین، گوێمان لە دەنگی نەبوو، ئینجا سەجدەی پێ بردین هەرگیز بەو شێوەیە سەجدەی درێژی پێ نەبردبووین، گوێمان لە دەنگی نەبوو، لەپاشدا بە هەمان شێوە رکاتی دووەمی کرد، سەمورە وتی: لەدوای رکاتی دووەم کاتێ کە دانیشت بۆ تەحیات خوێندن خۆر بەربوو

هەماهەنگ بوو لەگەڵ دانیشتنەکەی، سەموره وتی: لەپاشدا سەلامی دایەوە، ئینجا هەستایەوە سوپاس و ستایشی خوای کردو، شایەتومانی هێنا، لەپاشدا ئەحمەدی کوڕی یونس وتارەکەی پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم گێڕایەوە.

١١٨٥ - (ضعيف) عَنْ قَبِيصَةَ الْهِلاَلِيِّ قَالَ: كُسِفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَخَرَجَ فَزِعًا يَجُرُّ ثَوْبَهُ وَأَنَا مَعَهُ يَوْمَئِذٍ بِالْمَدِينَةِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ فَأَطَالَ فِيهِمَا الْقِيَامَ، ثُمَّ انْصَرَفَ وَانْجَلَتْ، فَقَالَ: (إِنَّمَا هَذِهِ الآيَاتُ يُخَوِّفُ اللَّهُ بِهَا، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهَا فَصَلُّوا كَأَحْدَثِ صَلاَةٍ صَلَّيْتُمُوهَا مِنَ الْمَكْتُوبَةِ)

واتە: (قَبيصَة)ی هیلالی دەڵێت: لەسەردەمی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆر گیرا، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە شڵەژاوی دەرچوو بەرەو مزگەوت و پۆشاکەکەی بەدوای خۆیدا رادەکێشا، لەوکاتەدا منیش لە خزمەتیدا بووم لە مەدینە، جا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دوو رکات نوێژی کرد بە پێوە زۆر مایەوە و درێژەی پێدا، لەپاشدا لەنوێژ بوویەوەو خۆر بەربوو، فەرمووی: (ئەم بەڵگەو نیشانانە واتە خۆر گیران و مانگ گیران خوای گەورە بەندەکانی پێ دەترسێنێت، ئەگەر بینیتان نوێژ بکەن وەك ئەو نوێژە فەرزەی کە لەپێش خۆر گیران و مانگ گیرانەکەوە ئەنجامتان دابوو - بۆ نمونە ئەگەر لەدوای نوێژی بەیانی بوو، وەك نوێژی بەیانی تەنها دوو رکات نوێژ دەکرێت -.

١١٨٦ - (ضعيف) عَنْ هِلاَلِ بْنِ عَامِرٍ أَنَّ قَبِيصَةَ الْهِلاَلِيَّ حَدَّثَهُ، أَنَّ الشَّمْسَ كُسِفَتْ، بِمَعْنَى حَدِيثِ مُوسَى، قَالَ: حَتَّى بَدَتِ النُّجُومُ.

واتە: لە هیلالی کوڕی عامیرەوە هاتووە، کە (قبیصة)ی هیلالی بۆی گێڕاوەتەوە، وتویەتی: خۆر گیرا، وەك فەرمودەکەی پێشوی موسای گێڕایەوە، وتی: خۆر گیرا دنیا ئەوەندە تاریك بوو ئەستێرە دەرکەوت.

## باسی قورئان خوێندن لە نوێژی مانگ گیران و خۆرگیران دا.

## ٢٦٣ - باب الْقِرَاءَةِ فِى صَلاَةِ الْكُسُوفِ.

١١٨٧ - (حسن) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: كُسِفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَلَّى بِالنَّاسِ، فَقَامَ فَحَزَرْتُ قِرَاءَتَهُ، فَرَأَيْتُ أَنَّهُ قَرَأَ بِسُورَةِ الْبَقَرَةِ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِرَاءَةَ، فَحَزَرْتُ قِرَاءَتَهُ، فَرَأَيْتُ أَنَّهُ قَرَأَ بِسُورَةِ آلِ عِمْرَانَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا

صلى الله عليه وسلم دەرچوو بەرەو مزگەوت نوێژی بۆ موسوڵمانان كرد، قورئان خوێندنەكەیم قەبلاًن بە قەدەر خوێندنی سورەتی (الْبَقَرَة) دەبوو، جا راوی فەرموودەكەی گێڕایەوە، لەپاشدا دوو سەجدەی برد واتە هی ركاتی یەكەم، ئینجا هەستایەوە بۆ ركاتی دووەم بەپێوە قورئانی زۆری خوێند، قورئان خوێندنەكەیم قەبلاًن پێم وابوو بە قەدەر سورەتی (آلِ عِمْرَان)ی خوێند.

١١٨٨ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَرَأَ قِرَاءَةً طَوِيلَةً فَجَهَرَ بِهَا، يَعْنِي فِي صَلاَةِ الْكُسُوفِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم قورئانی زۆری دەخوێند بەدەنگی بەرز، واتە لە نوێژی خۆر گیران و مانگ گیراندا.

١١٨٩ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: خُسِفَتِ الشَّمْسُ، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالنَّاسُ مَعَهُ، فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلاً بِنَحْوٍ مِنْ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، ثُمَّ رَكَعَ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: جارێ خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی كرد خەڵكیشی لەگەڵ بوو، بە پێوە زۆر مایەوە ئەوەندەی كە سورەتی (الْبَقَرَة) بخوێنێت، لەپاشدا ركوعی برد. جا راوی فەرموودەكەی گێڕایەوە.

## باسی بانگەواز بۆ نوێژی مانگ گیران و خۆر گیران.

## ٤٦٤ – باب يُنَادَى فِيهَا بِالصَّلاَةِ.

| |
|---|
| ١١٩٠ - (صحيح) عَـنْ عَائِشَـةَ رَضِـيَ اللهُ عَنْهَـا قَالَـتْ، كُسِـفَتِ الشَّمْسُ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُـلاً فَنَادَى: أَنَّ الصَّلاَةَ جَامِعَةٌ. |

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێك خۆر گیرا. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی کرد بە پیاوێ بانگەواز بکات و بڵێ: وا نوێژی بە کۆمەڵ دەکرێت بەبۆنەی خۆر گیرانەوە وەرن بۆی.

## باسی خێرکردن لەکاتی مانگ گیران و خۆر گیران دا.

## ٢٦٥ – باب الصَّدَقَةِ فِيهَا.

| |
|---|
| ١١٩١ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ لاَ يُخْسَـفَانِ لِمَـوْتِ أَحَدٍ، وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَـادْعُوا اللَّـهَ عَـزَّ وَجَلَّ، وَكَبِّرُوا وَتَصَدَّقُوا) |

واته: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مانگ و خۆر بۆ مردن و ژیانی کەس ناگیرێن، ئەگەر بینیتان خۆر یان مانگ گیراوە، لە خوای گەورە بپاڕێنەوە و (الله أکبر) بکەن و خێر و سەدەقە بکەن.

## باسی ئازادکردنی بەندە لە کاتی مانگ گیران و خۆرگیران دا.

## ٢٦٦ - باب الْعِتْقِ فِيهِ.

١١٩٢ - (صحيح) عَنْ أَسْمَاءَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْمُرُ بِالْعَتَاقَةِ فِي صَلاَةِ الْكُسُوفِ.

واته: لە ئەسمائەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەکاتی نوێژی مانگ گیران و خۆر گیران دا فەرمانی دەکرد بە ئازادکردنی بەندە.

## باسی ئەوانەی دەڵێن: دوو رکات دوو رکات نوێژ دەکرێت هەتا بەردەبێت.

## ٢٦٧ - باب مَنْ قَالَ: يَرْكَعُ رَكْعَتَيْنِ.

١١٩٣ - (منكر) عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: كُسِفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَجَعَلَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، وَيَسْأَلُ عَنْهَا، حَتَّى انْجَلَتْ.

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دوو رکات دوو رکات نوێژی دەکردو، پرسیاری دەکرد کە ئایا بەربووە یان نا، واتە: دوو رکات نوێژی دەکرد پرسیاری دەکرد کە ئایا بەربووە یان نا؟ ئەگەر بەرنەبوایە ئەوا دوو رکاتی تر نوێژی دەکردو پرسیاری دەکردەوە کە ئایا بەربووە یان نا؟ هەتا خۆر بەردەبوو.

١١٩٤ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يَكَدْ يَرْكَعُ، ثُمَّ رَكَعَ فَلَمْ يَكَدْ يَرْفَعُ، ثُمَّ رَفَعَ فَلَمْ يَكَدْ يَسْجُدُ، ثُمَّ سَجَدَ

فَلَمْ يَكَدْ يَرْفَعُ، ثُمَّ رَفَعَ فَلَمْ يَكَدْ يَسْجُدُ، ثُمَّ سَجَدَ فَلَمْ يَكَدْ يَرْفَعُ، ثُمَّ رَفَعَ، وَفَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الأُخْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ نَفَخَ فِي آخِرِ سُجُودِهِ، فَقَالَ: (أُفْ أُفْ) ثُمَّ قَالَ: (رَبِّ، أَلَمْ تَعِدْنِي أَنْ لاَ تُعَذِّبَهُمْ وَأَنَا فِيهِمْ؟ أَلَمْ تَعِدْنِي أَنْ لاَ تُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ؟) فَفَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ صَلاَتِهِ وَقَدْ أَمْحَصَتِ الشَّمْسُ.

واتە: (عبْدُ اللە)ی کوڕی عەمر دەڵێت: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی اللە علیە وسلم خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم نوێژی کرد ماوەیەکی زۆر بەپێوە مایەوە، لەپاشدا رکوعی بردو ماوەیەکی زۆر لە رکوعدا مایەوە، ئینجا سەری بەرزکردەوەو ماوەیەکی زۆر مایەوە، لەپاشدا سەجدەی بردو لە سەجدەکەیدا ماوەیەکی زۆر مایەوە، ئینجا سەجدەی برد لە سەجدەکەیدا زۆر مایەوە، لەپاشدا سەری بەرزکردەوە لە سەجدەی یەکەم و ماوەیەکی زۆر مایەوە، ئینجا سەجدەی دووەمی بردو ماوەیەکی زۆر لە سەجدەدا مایەوە، لەپاشدا سەری بەرزکردەوە لە سەجدەی دووەم و، هەستایەوە بە هەمان شێوە رکاتێکی تری کرد واتە وەك رکاتی یەکەم، ئینجا لە کۆتایی سەجدەکەیدا، فەرمووی: (أف أف). لەپاشدا فەرمووی: (پەروەردگارم تۆ بەڵێن و پەیمانت نەدامێ کە سزایان نەدەیت هەتا من لەناویاندابم؟ بەڵێن و پەیمانت نەدامێ سزایان نەدەیت هەتا ئەوان تەوبە بکەن و پەشیمان ببنەوەو داوای لێخۆشبون بکەن؟). پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم لە نوێژەکەی بوویەوەو خۆر بەربوو.

١١٩٥ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا أَتَرَمَّى بِأَسْهُمٍ فِي حَيَاةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذْ كُسِفَتِ الشَّمْسُ، فَنَبَذْتُهُنَّ وَقُلْتُ: لأَنْظُرَنَّ مَا أُحْدِثَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ الْيَوْمَ، فَانْتَهَيْتُ إِلَيْهِ وَهُوَ رَافِعٌ يَدَيْهِ، يُسَبِّحُ وَيُحَمِّدُ وَيُهَلِّلُ وَيَدْعُو، حَتَّى حُسِرَ عَنِ الشَّمْسِ فَقَرَأَ بِسُورَتَيْنِ وَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ.

واتە: (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی سەموره دەڵێت: لە ژیانی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم جارێ تیرئەندازیم دەکرد لەو کاتەدا خۆر گیرا، تیرەکەم دەخستە ناو کەوانەکەو دەمهاوێشت لەدڵی خۆمدا وتم: بابزانم بەسەرهاتی ئەم خۆر گیرانە چ رووداوێکی تازە لەلایەن پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم دێنێتە کایەوە، چووم بۆ خزمەتی دەستی بەرزکردبووەوە، (سبحان الله)ی دەکرد، سوپاس و ستایشی خوای دەکرد، (لا اله الا الله)ی دەکردو دەپاڕایەوە، هەتا خۆر بەربوو، بێگومان دوو رکات نوێژی کرد هەر رکاتەو دوو رکوعی تێدا برد.

# باسى نوێژكردن لەشـەوى زۆر تاريك و ڕەشەبا و باران بارينى زۆردا.

# ٢٦٨- باب الصَّلَاةِ عِنْدَ الظُّلْمَةِ وَنَحْوِهَا.

١١٩٦ - (ضعيف) عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ النَّضْرِ حَدَّثَنِى أَبِى قَالَ: كَانَتْ ظُلْمَةٌ عَلَى عَهْدِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: فَأَتَيْتُ أَنَسًا فَقُلْتُ: يَا أَبَا حَمْزَةَ، هَلْ كَانَ يُصِيبُكُمْ مِثْلُ هَذَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: مَعَاذَ اللَّهِ! إِنْ كَانَتِ الرِّيحُ لَتَشْتَدُّ فَنُبَادِرُ الْمَسْجِدَ مَخَافَةَ الْقِيَامَةِ.

واتە: لە (عُبَيدِ اللە)ى كوڕى (نَضر) دەڵێت: باوكم بۆى گێڕامەوە وتى: لەسەردەمى ئەنەسى كوڕى ماليكدا شەوێك زۆر تاريك بوو، وتى: ڕۆشتم بۆلاى ئەنەس و پێم وت: ئەى (أبَا حَمزَة)، لەسەردەمى پێغەمبەرى خوادا صلى الله عليه وسلم توشى شەوەزەنگى وەها هاتوون؟ وتى: پەنا بەخوا ئەگەر با ڕەش زۆر بوايەو شەوەزەنگ بوايە بەپەلە دەچووين بۆ مزگەوت بۆ نوێژكردن و پاڕانەوە لەترسى ئەوەى نەوەكا قيامەت هەڵسێ.

# باسی سەجدەبردن لەکاتی بینینی بەڵگەو نیشانە ترسناکەکاندا.

## ٢٦٩- باب السُّجُودِ عِنْدَ الآيَاتِ.

١١٩٩ - (حسن) عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: قِيلَ لاِبْنِ عَبَّاسٍ مَاتَتْ فُلاَنَـةُ - بَعْضُ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ - فَخَـرَّ سَاجِدًا، فَقِيلَ لَهُ: أَتَسْجُدُ هَذِهِ السَّـاعَةَ؟! فَقَـالَ: قَـالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ: (إِذَا رَأَيْـتُمْ آيَـةً فَاسْجُدُوا) وَأَيُّ آيَةٍ أَعْظَمُ مِـنْ ذَهَـابِ أَزْوَاجِ النَّبِـيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟!.

واتە: عیکریمە دەڵێت: بە ئیبنو عەباسیان وت: فڵانە کەس مرد — واتە یەکێ لە خێزانەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم - ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ یەکسەر سەجدەی برد، پێی وترا: ئا لەم کاتەدا سەجدە دەبەی؟ - لەوانەیە لەو کاتانەدا بووبێت کە نوێژکردن تێیدا کەراهەتی هەیە - ئیبنو عەباس وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر بەڵگەو نیشانەیەکتان بینی سەجدە بەرن). دەی چ بەڵگەو نیشانەیە گەورە ترە لە مردنی خێزانەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم؟!.

# باسەكانی نوێژی سەفەر.

# ٢٧٠ – تفريع أبواب صلاة السفر

## باسی نوێژی سەفەر.

## ١ – باب صَلاَةِ الْمُسَافِرِ.

١١٩٨ - (صحيح) عَـنْ عَائِشَـةَ رَضِـىَ اللهُ عَنْهَـا قَالَـتْ: فُرِضَـتِ الصَّلاَةُ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، فِى الْحَضَرِ وَالسَّفَرِ، فَأُقِرَّتْ صَلاَةُ السَّفَرِ ،وَزِيدَ فِى صَلاَةِ الْحَضَرِ.

واتـە: لـە خـاتو عائیشـەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە وتویـەتی: یەكەمجار كە نوێژ فەرزكرا دوو ركات دوو ركات بـوو، لـە شـوێنی نیشـتەجێ و لەسەفەردا، جا نوێژی سەفەر بەو شێوەیە مایەوە، بەڵام نوێژی نیشتەجێ زیاد كرا.

١١٩٩ - (صحيح) عَن يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ قَالَ: قُلْتُ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّـابِ: أَرَأَيْتَ إِقْصَارَ النَّاسِ الصَّلاَةَ، وَإِنَّمَا قَالَ اللَّه عز وجل: (إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوٓا ) فَقَـدْ ذَهَـبَ ذَلِـكَ الْيَـوْمُ!

فَقَالَ: عَجِبْتُ مِمَّا عَجِبْتَ مِنْهُ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللَّهُ بِهَا عَلَيْكُمْ، فَاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ)

واتە: لە یەعلای کوڕی ئومەییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتم بە عومەری کوڕی خەتاب: ئایا نابینی خەڵك نوێژ کورت دەکەنەوە، لە کاتێکدا کە خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ). واتە: ئەگەر ترسان ئەوانەی بێ باوەڕن جەنگتان لەگەڵ بکەن – گوناهتان ناگات ئەگەر نوێژەکانتان کورت بکەنەوە – بێگومان ئەو ڕۆژە ڕۆشت ئێستا خەڵك ترسیان لە بێباوەڕان نەماوەو بە ئارامی دەژین؟ عومەر وتی: ئەمەی سەرنجی تۆی ڕاکێشاوە سەرنجی منیشی ڕاکێشا، منیش وەك تۆ لەم حاڵەتە سەرم سوڕما، لەوبارەوە لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم پرسی؟ فەرمووی: (ئەمە خێر و چاکەیەکە خوای گەورە پێتانی بەخشیوە، دەی ئێوەش خێر و چاکەکەی وەربگرن).

١٢٠٠ - (صحيح) عَنِ ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي عَمَّارٍ يُحَدِّثُ، فَذَكَرَهُ نَحْوَهُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ أَبُو عَاصِمٍ وَحَمَّادُ بْنُ مَسْعَدَةَ، كَمَا رَوَاهُ ابْنُ بَكْرٍ.

واتە: ئیبنو جورەیج دەڵێت: گوێم لە(عَبْدُ الله)ی کوڕی ئەبی عەممار بوو، وەك فەرمودەی ناوبراوی دەگێڕایەوە، ئەبو داود دەڵێت: (أبُو عاصِم) و حەممادی کوڕی مەسعەدە گێڕاویەتیانەوە وەك چۆن (ابنُ بَكْر) گێڕاویەتیەوە.

## باسی ڕێبوار، كەی نوێژ كورت دەكاتەوە.

## ٢٧١ – باب مَتَى يُقْصِرُ الْمُسَافِرُ.

١٢٠١ - (صحيح) عَنْ يَحْيَى بْنِ يَزِيدَ الْهُنَائِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ عَنْ قَصْرِ الصَّلاَةِ؟ فَقَالَ أَنَسٌ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا خَرَجَ مَسِيرَةَ ثَلاَثَةِ أَمْيَالٍ – أَوْ: ثَلاَثَةِ فَرَاسِخَ، شُعْبَةُ شَكَّ - يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ.

واتە: یەحیای كوڕی یەزیدی (هێنائیَ) دەڵێت: سەبارەت بە كورت كردنەوەی نوێژ لە ئەنەسی كوڕی مالیكم پرسی؟ ئەنەس وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەگەر سێ میل – یان: سێ فەرسەخ بڕۆشتایە، گومانەكە هی شوعبەیە - دوو ركات نوێژی دەكرد واتە نوێژی كورت دەكردەوە.

١٢٠٢ - (صحيح) عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الظُّهْرَ بِالْمَدِينَةِ أَرْبَعًا، وَالْعَصْرَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: نوێژی نیوەڕۆم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم لە مەدینە بە چوار ركاتی كردوە، وە نوێژی عەسریشم لەگەڵیا كردوە لە (ذِی الحُلَیفَة) بە دوو ركاتی.

## باسی بانگدان لەسەفەردا.

## ٢٧٢ – باب الأَذَانِ فِی السَّفَرِ.

١٢٠٣ - (صحیح) عَن عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (يَعْجَبُ رَبُّكُمْ مِنْ رَاعِي غَنَمٍ فِي رَأْسِ شَظِيَّةٍ بِجَبَلٍ، يُؤَذِّنُ بِالصَّلَاةِ وَيُصَلِّي، فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: انْظُرُوا إِلَى عَبْدِي هَذَا، يُؤَذِّنُ وَيُقِيمُ الصَّلَاةَ، يَخَافُ مِنِّي، قَدْ غَفَرْتُ لِعَبْدِي وَأَدْخَلْتُهُ الْجَنَّةَ)

واتە: عوقبەی كوڕی عامر دەڵێت: پەروەردگاری بەدەسەڵات و بەتوانات رازیە لەو شوانەی بە بناری شاخێكەوە ئاژەڵ دەلەوەڕێنێ، كە كاتی نوێژ هات بۆخۆی بانگ دەدات و نوێژ دەكات، خوای گەورە دەفەرموێت: سەیری ئەو بەندەیەم بكەن بانگ دەدات و نوێژ دەكات، ئەو لە من دەترسێت، ئەوا منیش لێی خۆش بووم و دەیخەمە بەهەشتەوە.

## باسی ڕێبوار نوێژ دەكات و گومانی هەیە لە كاتەكەدا.

## ٢٧٣ - باب الْمُسَافِرِ يُصَلِّى وَهُوَ يَشُكُّ فِى الْوَقْتِ.

١٢٠٤ - (صحيح) عَنِ الْمِسْحَاجِ بْنِ مُوسَى قَالَ: قُلْتُ لأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: حَدِّثْنَا مَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: كُنَّا إِذَا كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى السَّفَرِ فَقُلْنَا: زَالَتِ الشَّمْسُ أَوْ لَمْ تَزُلْ صَلَّى الظُّهْرَ ثُمَّ ارْتَحَلَ.

واتە: میسحاجی كوڕی موسا دەڵێت: وتم بە ئەنەسی كوڕی مالیك ئەوەی لە پێغەمبەری خودات صلی الله علیه وسلم بیستووە یان بینیوە بۆمان بگێڕەرەوە، ئەنەس وتی: ئێمە لەسەفەردا ئەگەر لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بوینایە، لەدڵی خۆماندا یان لەناو خۆماندا دەمانوت: خۆر لایداوە لە ناوەڕاستی ئاسمان یان لاینەداوە - واتە گومانمان هەبوو — پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نوێژی نیوەڕۆی دەكرد، ئێمەش لەگەڵی نوێژمان دەكرد، لەپاشدا دەڕۆیشت — مانای فەرمودەكە ئەوە دەگەیەنێت كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی نیوەڕۆی لەیەكەم كاتی خۆیدا دەكردو دوای نەدەخست هەتا گومانیان هەبوو كە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایداوە، لەبەر سەفەركە زوو نوێژی دەكرد - .

١٢٠٥ - (صحيح) عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا نَزَلَ مَنْزِلاً لَمْ يَرْتَحِلْ حَتَّى يُصَلِّيَ الظُّهْرَ فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: وَإِنْ كَانَ بِنِصْفِ النَّهَارِ قَالَ: وَإِنْ كَانَ بِنِصْفِ النَّهَارِ.

واته: ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەفەردا ئەگەر لە شوێنێ لایدایە نزیکی نوێژی نیوەڕۆ بوایە نەدەڕۆشت هەتا نوێژی نیوەڕۆی نەکردایە، پیاوێ پێی وت: ئەگەر لە نیوەی ڕۆژیشدا بوایە واتە لەیەکەم کاتی خۆیدا بوایە، وتی: ئەگەر لە نیوەی ڕۆژیشدا بوایە.

## باسی کۆکردنەوەی دوو نوێژ پێکەوە.

## ٢٧٤ – باب الْجَمْعِ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ.

١٢٠٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ عَامِرِ بْنِ وَاثِلَةَ، أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ أَخْبَرَهُمْ، أَنَّهُمْ خَرَجُوا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَجْمَعُ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ، فَأَخَّرَ الصَّلاَةَ يَوْمًا، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، ثُمَّ دَخَلَ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعًا.

واتە: لە (أبی الطُفَیل)ی كوڕی عامری كوڕی (وَاثِلَة)ەوە هاتووە، كە (مُعَاذ)ی كوڕی جەبەل بۆی گێڕاونەتەوە، هاوەڵان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دەرچوون بۆ غەزای تەبوك، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نوێژی نیوەڕۆو عەسری كۆكردەوە، هەروەها نوێژی شێوان و عیشاشی كۆكردەوە، ڕۆژێ نوێژی نیوەڕۆی دواخست، لەپاشدا هاتەدەرەوە - لە خێمەكەی - نوێژی نیوەڕۆو عەسری پێكەوە كرد، ئینجا چووە ژوورەوە، لەپاشدا هاتەدەرەوە نوێژی شێوان و عیشاشی پێكەوە كرد.

١٢٠٧ - (صحيح) عَن نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ اسْتُصْرِخَ عَلَى صَفِيَّةَ وَهُوَ بِمَكَّةَ، فَسَارَ حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ وَبَدَتِ النُّجُومُ، فَقَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا عَجِلَ بِهِ أَمْرٌ فِي سَفَرٍ جَمَعَ بَيْنَ هَاتَيْنِ الصَّلَاتَيْنِ، فَسَارَ حَتَّى غَابَ الشَّفَقُ، فَنَزَلَ فَجَمَعَ بَيْنَهُمَا.

واتە: نافع دەڵێت: ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ لە مەككە بوو هەواڵی نەخۆشی (صَفِيَّة)ی هاوسەریان بۆ هێنا، كاتی نوێژی شێوان هاتە پێشەوە ئیبنو عومەر هەر لەسەر ڕۆشتن بەردەوام بوو هەتا خۆر ئاوا بوو ئەستێرە دەركەوت - ئەوكاتە دابەزی نوێژی شێوان و نوێژی عیشای كۆكردەوە بە (جمع تأخیر) - ئیبنو عومەر وتی: بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەفەردا ئەگەر كارێكی بە پەلەی ببوایە ئەم دوو نوێژەی كۆدەكردەوە، واتە نوێژی مەغریبی دوادەخست و لەسەر ڕۆشتن بەردەوام دەبوو هەتا كاتی نوێژی عیشا دەهاتە پێشەوە ئەوكاتە دادەبەزی نوێژی شێوان و نوێژی عیشای كۆدەكردەوە بە (جمع تأخیر).

١٢٠٨ - (صحيح) عَن مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ فِى غَزْوَةِ تَبُوكَ إِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ قَبْلَ أَنْ يَرْتَحِلَ جَمَعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَإِنْ يَرْتَحِلْ قَبْلَ أَنْ تَزِيغَ الشَّمْسُ، أَخَّرَ الظُّهْرَ حَتَّى يَنْزِلَ لِلْعَصْرِ، وَفِى الْمَغْرِبِ مِثْلَ ذَلِكَ: إِنْ غَابَتِ الشَّمْسُ قَبْلَ أَنْ يَرْتَحِلَ، جَمَعَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ، وَإِنْ يَرْتَحِلْ قَبْلَ أَنْ تَغِيبَ الشَّمْسُ أَخَّرَ الْمَغْرِبَ حَتَّى يَنْزِلَ لِلْعِشَاءِ، ثُمَّ جَمَعَ بَيْنَهُمَا.

وتە: (معاذ)ی کوڕی جەبەل دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە غەزای تەبوکدا ئەگەر پێش ئەوەی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایبدایە بکەوتایەتەڕێ ئەوا نوێژی نیوەڕۆ و عەسری کۆدەکردەوە، بەڵام ئەگەر پێش ئەوەی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایبدایە بکەوتایەتەڕێ ئەوا نوێژی نیوەڕۆی دوادەخست هەتا دادەبەزی بۆ نوێژی عەسر، وە لە نوێژی شێوانیشدا بە هەمان شێوە ئەگەر خۆر ئاوا ببوایە بکەوتایەتەڕێ ئەوا نوێژی شێوان و عیشای کۆدەکردەوە، بەڵام ئەگەر پێش ئەوەی خۆر ئاوا بوون بکەوتایەتەڕێ نوێژی شێوانی دوادەخست هەتا دادەبەزی بۆ نوێژی عیشا، ئینجا هەردووکیانی کۆدەکردەوە.

١٢٠٩ - (منكر) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: مَا جَمَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ قَطُّ فِى السَّفَرِ إِلاَّ

مَرَّةً. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا يُرْوَى عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ مَوْقُوفًا عَلَى ابْنِ عُمَرَ، أَنَّهُ لَمْ يُرَ ابْنُ عُمَرَ جَمَعَ بَيْنَهُمَا قَطُّ إِلاَّ تِلْكَ اللَّيْلَةَ، يَعْنِي لَيْلَةَ اسْتُصْرِخَ عَلَى صَفِيَّةَ، وَرُوِيَ مِنْ حَدِيثِ مَكْحُولٍ، عَنْ نَافِعٍ، أَنَّهُ رَأَى ابْنَ عُمَرَ فَعَلَ ذَلِكَ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ.

واتە: ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەفەردا هەرگیز نوێژی شێوان و نوێژی عیشای کۆنەکردۆتەوە تەنها جارێ نەبێت. ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرموده ریوایەت كراوە لە ئەیوبەوە، لە نافعەوە، لە ئیبنو عومەرەوە بەڵام لەسەر ئیبنو عومەر وەستاوە، بێگومان لە ئیبنو عومەر نەبینراوە ئەم دوو نوێژەی کۆکردبێتەوە ئەو شەوە نەبێت واتە ئەو شەوەی کە هەواڵی نەخۆشی (صَفِيَّة)ی هاوسەریان بۆ هێنا، لە فەرموودەکەی مەکحول دا، لە نافعەوە هاتووە، کە ئیبنو عومەری دیوە جارێ یان دوو جار ئەم کارەی کردوە واتە نوێژی شێوان و نوێژی عیشای کۆکردۆتەوە.

١٢١٠ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعًا، فِي غَيْرِ خَوْفٍ وَلاَ سَفَرٍ. قَالَ مَالِكٌ: أُرَى ذَلِكَ كَانَ فِي مَطَرٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَاهُ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ نَحْوَهُ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ.

واتە: (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی نیوەڕۆ و عەسری پێكەوە كۆدەكردەوە، هەروەها نوێژی مەغریب و عیشاشی پێكەوە كۆدەكردەوە، بەبێ ترس و بەبێ باران، مالیك دەڵێت: پێم وایە كاتی باران بووبێت. ئەبو داود دەڵێت: حەممادی كوڕی سەلەمە بەهەمان شێوە گێڕاویەتیەوە، لە ئەبو زوبەیرەوە.

(صحيح لكن قوله: (فِى سَفرَةٍ) شاذ) وَرَوَاهُ قُرَّةُ بْنُ خَالِدٍ، عَنْ أَبِى الزُّبَيْرِ قَالَ: فِى سَفْرَةٍ سَافَرْنَاهَا إِلَى تَبُوكَ.

واتە: هەروەها قوڕەی كوڕی خالید، لە ئەبو زوبەیرەوە گێڕاویەتیەوە، كە وتویەتی: لەو سەفەرەدا بوو كە چووین بۆ غەزای تەبوك.

١٢١١ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: جَمَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِالْمَدِينَةِ مِنْ غَيْرِ خَوْفٍ وَلاَ مَطَرٍ. فَقِيلَ لاِبْنِ عَبَّاسٍ: مَا أَرَادَ إِلَى ذَلِكَ؟ قَالَ: أَرَادَ أَنْ لاَ يُحْرِجَ أُمَّتَهُ.

واتە: ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە مەدینە نوێژی نیوەڕۆ و عەسری كۆكردەوەو هەشت ركاتی كرد بە جەمع، هەروەها نوێژی شێوان و عیشاشی كۆكردەوەو حەوت ركاتی كرد بە جەمع، بەبێ ترس و بەبێ باران، بە ئیبنو عەباس وترا: مەبەستی چی بوو؟ وتی: ویستی ئومەتەكەی توشی زەحمەت و ناڕەحەتی نەكات.

١٢١٢ - (صحيح) عَن نَافِعٍ وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ وَاقِدٍ، أَنَّ مُؤَذِّنَ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: الصَّلاَةُ. قَالَ: سِرْ سِرْ حَتَّى إِذَا كَانَ قَبْلَ غُيُوبِ الشَّفَقِ، نَزَلَ فَصَلَّى الْمَغْرِبَ، ثُمَّ انْتَظَرَ حَتَّى غَابَ الشَّفَقُ فَصَلَّى الْعِشَاءَ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا عَجِلَ بِهِ أَمْرٌ صَنَعَ مِثْلَ الَّذِي صَنَعْتُ، فَسَارَ فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ مَسِيرَةَ ثَلاَثٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ ابْنُ جَابِرٍ، عَنْ نَافِعٍ نَحْوَ هَذَا بِإِسْنَادِهِ، (لكن قوله: (قَبْلَ غُيُوبِ الشَّفَقِ) شاذ، والمحفوظ: (بعد غُيُوبِ الشَّفَقِ).

واتە: نافع و (عبد الله)ی کوڕی واقید دەڵێن: بانگبێژەکەی ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ وتی: کاتی نوێژە، ئیبنو عومەر فەرمانی پێ کرد کە لەسەر ڕۆیشتن بەردەوام بێ، هەتا کاتی پێش خۆر ئاوا بوون ئیبنو عومەر دابەزی نوێژی شێوانی کرد، لەپاشدا چاوەڕێی کرد هەتا خۆر ئاوا بوو ئەوسا نوێژی عیشاشی کرد، ئینجا وتی: بێگومان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەگەر کارێکی بە پەلەی ببوایە لەسەفەردا بەم شێوەی دەکرد کە من کردم، ئیبنو عومەر لەو شەو و ڕۆژەدا ماوەی سێ شەو و سێ ڕۆژی بڕی ئەوەندە بە پەلە دەڕۆیشت. ئەبو داود دەڵێت: ئیبنو جابر، لە نافعەوە فەرموودەی پێشوی بە هەمان سەنەد گێڕاوەتەوە، بەڵام: (قَبْلَ غُيُوبِ الشَّفَقِ). (شاذ)ە، (محفوظ)لەبەرکراو: (بعد غُيُوبِ الشَّفَقِ)ە.

١٢١٣ - عَنِ ابْنِ جَابِرٍ بِهَذَا الْمَعْنَى. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَاهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْعَلاَءِ، عَنْ نَافِعٍ قَالَ: حَتَّى إِذَا كَانَ عِنْدَ ذَهَابِ الشَّفَقِ نَزَلَ فَجَمَعَ بَيْنَهُمَا.

واتە: لە ئیبنو جابرەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان مانا هاتووە. ئەبو داود دەڵێت: (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی (عَلاء)، لە نافعەوە گێڕاویەتیەوە، کە وتویەتی: هەتا نزیکی کاتی خۆرئاوا بوون ئەو کاتە ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ دابەزی و کۆیکردنەوە واتە نوێژی شێوان و نوێژی عیشای کۆکردەوە.

١٢١٤ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْمَدِينَةِ ثَمَانِيًا وَسَبْعًا: الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ، وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ. وَلَمْ يَقُلْ سُلَيْمَانُ وَمُسَدَّدٌ: (بِنَا).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە مەدینە هەشت ڕکات نوێژی بۆکردین واتە چوار ڕکات نوێژی نیوەڕۆ و چوار ڕکات نوێژی عەسر، هەروەها حەوت ڕکات نوێژی بۆ کردین واتە سێ ڕکات نوێژی شێوان و چوار ڕکات نوێژی عیشا. سولەیمان و موسەددەد کە دوو ڕاوی فەرموودەکەن گۆی (بنا) یان باس نەکرد.

(صحيح) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: فِي غَيْرِ مَطَرٍ.

ئەبو داود دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: بارانیش نەبوو.

١٢١٥ - (ضعيف) عَن جَابِرٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَابَتْ لَهُ الشَّمْسُ بِمَكَّةَ، فَجَمَعَ بَيْنَهُمَا بِسَرِفَ.

واتە: جابر دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە مەککە خۆری لێ ئاوابوو، لە سەریف نوێژی شێوان و عیشای کۆدەکردەوە.

١٢١٦ - (مقطوع) عَن هِشَامِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: بَيْنَهُمَا عَشْرَةُ أَمْيَالٍ يَعْنِى بَيْنَ مَكَّةَ وَسَرِفَ.

واتە: هیشامی کوڕی سەعد دەڵێت: ماوەی نێوان مەککەو سەریف دە میلە.

١٢١٧ - (صحيح) عن عَبْدُ اللَّهِ بْنُ دِينَارٍ قَالَ: غَابَتِ الشَّمْسُ وَأَنَا عِنْدَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، فَسِرْنَا، فَلَمَّا رَأَيْنَاهُ قَدْ أَمْسَى قُلْنَا: الصَّلاَةَ. فَسَارَ حَتَّى غَابَ الشَّفَقُ وَتَصَوَّبَتِ النُّجُومُ، ثُمَّ إِنَّهُ نَزَلَ فَصَلَّى الصَّلاَتَيْنِ جَمِيعًا، ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا جَدَّ بِهِ السَّيْرُ صَلَّى صَلاَتِى هَذِهِ، يَقُولُ: يَجْمَعُ بَيْنَهُمَا بَعْدَ لَيْلٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ ذُؤَيْبٍ، أَنَّ الْجَمْعَ بَيْنَهُمَا مِنِ ابْنِ عُمَرَ كَانَ بَعْدَ غُيُوبِ الشَّفَقِ.

واتە: (عَبدُ الله)ی كوڕی دینـار دەڵێـت: لـە سـەفەرێكدا لـە خزمـەت (عَبدُ الله)ی كوڕی عومەردا رەزای خوایان لـێ بـێ بـووم خۆرئـاوا بـوو، دانەبـەزی بـۆ نوێژی شێوان هەر رێمان دەكرد، كاتێ كە بینیمان خەریكە شەو دادێـت وتمـان: كـاتی نوێـژە، ئـاوڕی نەدایـەوە و بـەردەوام بـوو لەسـەر رۆیشـتن هـەتا سـورایی ئاسمان نەماو ئەستێرەكان دەركەوتن، لەپاشدا دابەزی نوێـژی شـێوان و عیشـای پێكەوە كۆدەكردەوە، ئینجا وتی: پێغەمبەری خـوام صـلی الله علیـه وسـلم دیـوە لە سەفەردا ئەگەر كارێكی گرنگی ببوایە بەم شێوەیەی دەكرد، راوی وتـی: شـەو داهـات ئەوكاتـە كۆیكردنـەوە. ئـەبو داود دەڵێـت: لـە ئیسـماعیلی كـوڕی (عَبـد الرَّحمَن)ی كوڕی (ذُؤیب)ەوە هاتووە، كـە ئیبنـو عومـەر رەزای خوایـان لـێ بـێ لەدوای نەمانی سورایی ئاسمان كۆیكردنەوە.

١٢١٨ - (صحيح) عَن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا ارْتَحَلَ قَبْلَ أَنْ تَزِيغَ الشَّمْسُ، أَخَّرَ الظُّهْرَ إِلَى وَقْتِ الْعَصْرِ، ثُمَّ نَزَلَ فَجَمَعَ بَيْنَهُمَا، فَإِنْ زَاغَتِ الشَّمْسُ قَبْلَ أَنْ يَرْتَحِلَ، صَلَّى الظُّهْرَ ثُمَّ رَكِبَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم لەسـەفەردا پـێش ئـەوەی خـۆر لـە ناوەڕاسـتی ئاسمـان لایبدایـە بكەوتایەتـەڕێ ئـەوا نوێـژی نیـوەڕۆی دوادەخسـت بـۆ كـاتی نوێـژی عەسـر، ئینجـا دادەبـەزی و كۆیدەكردنـەوە، بـەڵام ئەگـەر خـۆر لـە ناوەڕاسـتی ئاسمـان لایبدایـە پـێش ئـەوەی بكەوتایەتـەڕێ ئـەوا نوێـژی نیـوەڕۆی دەكـرد لەپاشدا سواری وڵاخەكەی دەبوو.

١٢١٩ - (صحيح) عَن عُقَيْلٍ بِهَذَا الْحَدِيثِ بِإِسْنَادِهِ قَالَ: وَيُؤَخِّرُ الْمَغْرِبَ حَتَّى يَجْمَعَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْعِشَاءِ حِينَ يَغِيبُ الشَّفَقُ.

واته: لە عوقەیلەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان سەنەد هاتووه، كە وتويەتی: نوێژی شێوانی دواخست هەتا لەگەڵ نوێژی عیشادا كۆیكردنەوە، كاتێ كە سورایی كەنارەی ئاسمان ونبوو.

١٢٢٠ - (صحيح) عَن مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ إِذَا ارْتَحَلَ قَبْلَ أَنْ تَزِيغَ الشَّمْسُ، أَخَّرَ الظُّهْرَ حَتَّى يَجْمَعَهَا إِلَى الْعَصْرِ فَيُصَلِّيهِمَا جَمِيعًا، وَإِذَا ارْتَحَلَ بَعْدَ زَيْغِ الشَّمْسِ، صَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا ثُمَّ سَارَ، وَكَانَ إِذَا ارْتَحَلَ قَبْلَ الْمَغْرِبِ، أَخَّرَ الْمَغْرِبَ حَتَّى يُصَلِّيَهَا مَعَ الْعِشَاءِ، وَإِذَا ارْتَحَلَ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، عَجَّلَ الْعِشَاءَ فَصَلاَّهَا مَعَ الْمَغْرِبِ.

واته: (مُعَاذ)ی كوڕی جەبەل دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە غەزای تەبوكدا ئەگەر پێش ئەوەی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایبدایە بكەوتایەتەڕێ ئەوا نوێژی نیوەڕۆی دوادەخست لەگەڵ نوێژی عەسر كۆی دەكردنەوەو پێكەوە دەیكردن، بەڵام ئەگەر خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایبدایە

بکەوتایەتەڕێ ئەوا نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی عەسری پێکەوە دەکردن ئینجا دەڕۆیشت، وە ئەگەر پێش نوێژی شێوان بکەوتایەتەڕێ ئەوا نوێژی شێوانی دوادەخست هەتا لەگەڵ نوێژی عیشا پێکەوە دەیکردن، ئەگەر دوای نوێژی شێوان بکەوتایەتەڕێ ئەوا نوێژی عیشای پێش دەخست و لەگەڵ نوێژی شێواندا پێکەوە دەیکردن.

## باسی کەمکردنەوەی قورئان خوێندن

## لە نوێژی سەفەردا.

## ٢٧٥ – باب قِصَرِ قِرَاءَةِ الصَّلاَةِ فِى السَّفَرِ.

١٢٢١ - (صحيح) عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى سَفَرٍ، فَصَلَّى بِنَا الْعِشَاءَ الآخِرَةَ، فَقَرَأَ فِى إِحْدَى الرَّكْعَتَيْنِ بِالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ.

واتە: لە بەرائەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەرچووین بۆ سەفەرێ، نوێژی عیشای بۆکردین لە رکاتێکیاندا سورەتی: (وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ)ی خوێند.

## باسی نوێژی سوننەت سەفەردا.

## ٢٧٦ - باب التَّطَوُّعِ فِي السَّفَرِ.

١٢٢٢ - (ضعيف) عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: صَحِبْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَمَانِيَةَ عَشَرَ سَفَرًا، فَمَا رَأَيْتُهُ تَرَكَ رَكْعَتَيْنِ إِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ قَبْلَ الظُّهْرِ.

واتە: واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبی ئەنصاریەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە هەژدە سەفەردا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووم صلى الله عليه وسلم، نەمدیوە دوو رکاتی پێش نیوەڕۆ تەرك بکات.

١٢٢٣ - (صحيح) عَن حَفْصِ بْنِ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: صَحِبْتُ ابْنَ عُمَرَ فِي طَرِيقٍ قَالَ: فَصَلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَقْبَلَ فَرَأَى نَاسًا قِيَامًا، فَقَالَ: مَا يَصْنَعُ هَؤُلَاءِ؟ قُلْتُ: يُسَبِّحُونَ، قَالَ: لَوْ كُنْتُ مُسَبِّحًا أَتْمَمْتُ صَلَاتِي، يَا ابْنَ أَخِي إِنِّي صَحِبْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي السَّفَرِ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ، وَصَحِبْتُ أَبَا بَكْرٍ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى

رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ، وَصَحِبْتُ عُمَرَ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ تَعَالَى، وَصَحِبْتُ عُثْمَانَ فَلَمْ يَزِدْ عَلَى رَكْعَتَيْنِ حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ تَعَالَى، وَقَدْ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ( لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ).

واتە: لە حەفصی كوڕی عاصمی كوڕی عومەری كوڕی (خَطاب)ەوە، لە باوكیەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لە سەفەرێكدا لە ڕێگەی مەككە لە خزمەت ئیبنو عومەردا بووم، نوێژی نیوەڕۆی بە جەماعەت بۆ كردین، ئینجا ئاوڕی دایەوە كۆمەڵێكی بینی بە پێوە ڕاوەستا بوون، وتی: ئەوانە چی دەكەن؟ وتم: نوێژی سوننەت دەكەن، وتی: جا ئەگەر من نوێژی سوننەت بكەم ئەوە باشترە وایە نوێژە فەرزەكە بكەم، ئەی برازای خۆم! لەسەفەردا هاوڕێیەتی پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم كردوە هەتا خوای گەورە بردیەوە لە دوو ركات زیاتری نەكردوە، هەروەها هاوڕێیەتی ئەبو بەكرم كردوە هەتا خوای گەورە بردیەوە لە دوو ركات زیاتری نەكردوە، وە هاوڕێیەتی عومەرم كردوە هەتا خوای گەورە بردیەوە لە دوو ركات زیاتری نەكردوە، وە هاوڕێیەتی (عُثمان)یشم كردوە هەتا خوای گەورە بردیەوە لە دوو ركات زیاتری نەكردوە، بێگومان خوای گەورە دەفەرموێت: ( لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ). واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی لەپێغەمبەری خوادا بۆ ئێوە هەیە سەرمەشقی و پێشەوایەتی چاك.

## باسی نوێژی سوننەت و نوێژی وەتر بەسواری وڵاخ لەسەفەردا.

## ٢٧٧ - باب التَّطَوُّعِ عَلَى الرَّاحِلَةِ وَالْوِتْرِ.

**١٢٢٤ - (صحيح) عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُسَبِّحُ عَلَى الرَّاحِلَةِ أَيَّ وَجْهٍ تَوَجَّهَ وَيُوتِرُ عَلَيْهَا غَيْرَ أَنَّهُ لاَ يُصَلِّي الْمَكْتُوبَةَ عَلَيْهَا.**

واتە: لە سالمەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی وەتر و نوێژی سوننەتی بەسەر وڵاخەوە دەکرد، بەرەو هەر لایە بوایە بە مەرجێ رووی لە جێگەی مەبەست بوایە واتە قیبلە، بەڵام هەرگیز نوێژی فەرزی بەسەر وڵاخەوە نەدەکرد.

**١٢٢٥ - (حسن) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا سَافَرَ، فَأَرَادَ أَنْ يَتَطَوَّعَ اسْتَقْبَلَ بِنَاقَتِهِ الْقِبْلَةَ فَكَبَّرَ، ثُمَّ صَلَّى حَيْثُ وَجَّهَهُ رِكَابُهُ.**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە سەفەردا ئەگەر بیویستایە نوێژی سوننەت بکات وشترەکەی روو دەکردە قیبلەو (الله أكبر)ی دەکرد، لەپاشدا نوێژی دەکرد ئیتر کاروانەکە بەرەو هەر لایە بڕۆشتایە.

١٢٢٦ - (صحيح) عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّى عَلَى حِمَارٍ وَهُوَ مُتَوَجِّهٌ إِلَى خَيْبَرَ.

واتە: لە (عَبْدُ الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی لەسەر گوێدرێژێك کەبەرەو خەیبەر دەچوو، نوێژی سوننەتی دەکرد - بێگومان خەیبەر کەوتۆتە لای سەرووی مەدینەوە، مەدینەش کەوتۆتە نێوان مەککەو خەیبەرەوە - .

١٢٢٧ - (صحيح) عَن جَابِرٍ قَالَ: بَعَثَنِى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى حَاجَةٍ قَالَ: فَجِئْتُ وَهُوَ يُصَلِّى عَلَى رَاحِلَتِهِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ، وَالسُّجُودُ أَخْفَضُ مِنَ الرُّكُوعِ.

واتە: جابر دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناردمی بۆ کارێکی پێویست، کاتێ کە هاتمەوە بەسەر وڵاخەکەیەوە بەرەو خۆرهەڵات نوێژی سوننەتی دەکرد، بۆ سەجدە زیاتر سەری نەوی دەکرد لەرکوع.

# باسی نوێژی فەرز بەسەر ولاَخەوە لەكاتی بوونی بەهانەی شەرعی دا.

## ٢٧٨ - باب الْفَرِيضَةِ عَلَى الرَّاحِلَةِ مِنْ عُذْرٍ.

١٢٢٨ - (صحيح) عَن عَطَاءِ بْنِ أَبِى رَبَاحٍ، أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ رَضِىَ اللّهُ عَنهَا: هَلْ رُخِّصَ لِلنِّسَاءِ أَنْ يُصَلِّينَ عَلَى الدَّوَابِّ؟ قَالَتْ: لَمْ يُرَخَّصْ لَهُنَّ فِى ذَلِكَ فِى شِدَّةٍ وَلاَ رَخَاءٍ. قَالَ مُحَمَّدٌ: هَذَا فِى الْمَكْتُوبَةِ.

واتە: لە (عطاء)ی كوڕی ئەبو رەباحەوە هاتوو، كە لە عائیشەی رەزای خوای لێ بێ پرسیوە: ئایا رێگە دراوە بە ئافرەتان بە سواری ولاَخەوە نوێژ بكەن لە سەفەردا؟ عائیشە رەزای خوای لێ بێ وتی: نەخێر رێگەیان پێ نەدراوە نە لەكاتی ئارامی و نە لەكاتی نائارامی و ناخۆشی دا بە سواری ولاَخەوە نوێژ بكەن. راوی فەرموودەكە موحەممەد دەڵێت: ئەمە بۆ نوێژی فەرزە، بەلاَم بۆ نوێژی سوننەت دروستە بۆیان.

# باسی ڕێبوار تاکەی نوێژەکانی کورتکاتەوە.

## ٢٧٩ – باب مَتَى يُتِمُّ الْمُسَافِرُ

١٢٢٩ - (ضعيف) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَشَهِدْتُ مَعَهُ الْفَتْحَ، فَأَقَامَ بِمَكَّةَ ثَمَانِيَ عَشْرَةَ لَيْلَةً لاَ يُصَلِّي إِلاَّ رَكْعَتَيْنِ، وَيَقُولُ: (يَا أَهْلَ الْبَلَدِ صَلُّوا أَرْبَعًا، فَإِنَّا قَوْمٌ سَفْرٌ)

واتە: عمرانی کوڕی حوصەین دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بەشداری چەندەها غەزام کردوە بە رزگارکردنی شاری مەککەشەوە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەژدە شەو لە مەککە مایەوە هەر نوێژی کورت دەکردەوە، وە دەیفەرموو: (ئەی خەڵکی مەککە ئێوە چوار رکات نوێژ بکەن نوێژەکانتان کورت مەکەنەوە، بێگومان ئێمە قەومێکی سەفەرین بۆیە نوێژەکانمان کورت دەکەینەوە).

١٢٣٠ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقَامَ سَبْعَ عَشْرَةَ بِمَكَّةَ يَقْصُرُ الصَّلاَةَ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَمَنْ أَقَامَ سَبْعَ عَشْرَةَ قَصَرَ، وَمَنْ أَقَامَ أَكْثَرَ أَتَمَّ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم حەڤدە رۆژ لە مەککە مایەوە هەر نوێژی کورت دەکردەوە. ئیبنو عەباس دەڵێت: هەرکەس حەڤدە رۆژ مایەوە ئەوا با نوێژەکانی کورت بکاتەوە، هەرکەس لەوە زیاتر مایەوە با نوێژەکانی بەتەواوی بکات.

(صحيح) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَقَامَ تِسْعَ عَشْرَةَ.

ئەبو داود دەڵێت: هەروەها لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: نۆزدە رۆژ لە مەککە مایەوە.

١٢٣١ - (ضعيف منكر) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ خَمْسَ عَشْرَةَ (لَيْلَةً) يَقْصُرُ الصَّلَاةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ساڵی رزگاردنی مەککەدا بۆ ماوەی پانزە شەو لە مەککە مایەوە هەر نوێژی کورت دەکردەوە.

١٢٣٢ - (ضعيف منكر، والصحيح: (تِسعَ عَشرَةَ) كما تقدم) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقَامَ بِمَكَّةَ سَبْعَ عَشْرَةَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم حەڤدە رۆژ لە مەككە مایەوە دوو ركات دوو ركات نوێژی دەكرد.

١٢٣٣ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَكَانَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ حَتَّى رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ، فَقُلْنَا: هَلْ أَقَمْتُمْ بِهَا شَيْئًا قَالَ: أَقَمْنَا عَشْرًا.

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم لە مەدینە دەرچووین بەرەو مەككە، دوو ركات دوو ركات نوێژە چوار ركاتیەكانی دەكرد، هەتا گەڕاینەوە بۆ مەدینە، وتمان: لە مەككە هیچ مانەوە، وتی: دە شەو ماینەوە.

١٢٣٤ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عُمَرَ بْنِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ عَلِيًّا رَضِيَ اللهُ عَنهُ كَانَ إِذَا سَافَرَ، سَارَ بَعْدَ مَا تَغْرُبُ الشَّمْسُ حَتَّى تَكَادَ أَنْ تُظْلِمَ، ثُمَّ يَنْزِلُ فَيُصَلِّي الْمَغْرِبَ، ثُمَّ يَدْعُو بِعَشَائِهِ فَيَتَعَشَّى، ثُمَّ يُصَلِّي الْعِشَاءَ، ثُمَّ يَرْتَحِلُ، وَيَقُولُ: هَكَذَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصْنَعُ. قَالَ عُثْمَانُ: عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عُمَرَ بْنِ عَلِيٍّ،

سَمِعْتُ أَبَا دَاوِدَ يَقُولُ: وَرَوَى أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ عَن حَفْصِ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ - يَعْنِي ابْنَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ - أَنَّ أَنَسًا كَانَ يَجْمَعُ بَيْنَهُمَا حِينَ يَغِيبُ الشَّفَقُ، وَيَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصْنَعُ ذَلِكَ.

واتە: لە (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی موحەممەدی کوڕی عومەری کوڕی عەلی کوڕی (أبی طالِب)ەوە ڕەزای خوایان لێ بێ، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە، هاتووە، پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ ئەگەر سەفەری بکردایە دوای خۆرئاوبوون دەڕۆیشت هەتا کاتێ کە نزیك بوو تاریکی شەو دابێت، ئینجا دادەبەزی نوێژی شێوانی دەکرد، ئینجا داوای خواردنی دەکرد نانی دەخوارد، لەپاشدا نوێژی عیشای دەکرد، ئینجا دەڕۆیشت، دەیوت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بەم شێوەیەی دەکرد. (عُثمَان) لە (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی موحەممەدی کوڕی عومەری کوڕی عەلیەوە گێڕایەوە، وتی: لە (أبا داود)م بیستوە وتی: ئوسامەی کوڕی زەید، لە حەفصی کوڕی (عُبَيْدِ اللّه) - واتە کوڕی ئەنەسی کوڕی مالیك — وە، گێڕاویەتیەوە، کە ئەنەس کاتێ سورایی ئاسمان نەمایە نوێژی شێوان و نوێژی عیشای کۆدەکردەوە، جا دەیوت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بەم شێوەیەی دەکرد.

## باسی ئەگەر کەسێ لە خاکی دوژمندا مایەوە ئایا نوێژ کورتکاتەوە؟

## ١١ - باب إِذَا أَقَامَ بِأَرْضِ الْعَدُوِّ يَقْصُرُ.

١٢٣٥ - (صحيح) عَن جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: أَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِتَبُوكَ عِشْرِينَ يَوْمًا يَقْصُرُ الصَّلَاةَ.

واته: جابری کوڕی (عَبْدُ اللهِ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بیست ڕۆژ لە تەبوك مایەوە نوێژی کورت دەکردەوە.

## باسی نوێژی ترس لە دوژمن.

## ٢٨١ - باب صَلَاةِ الْخَوْفِ.

مَنْ رَأَى أَنْ يُصَلِّيَ بِهِمْ وَهُمْ صَفَّانِ، فَيُكَبِّرُ بِهِمْ جَمِيعًا، ثُمَّ يَرْكَعُ بِهِمْ جَمِيعًا، ثُمَّ يَسْجُدُ الإِمَامُ وَالصَّفُّ الَّذِي يَلِيهِ وَالآخَرُونَ قِيَامٌ يَحْرُسُونَهُ، فَإِذَا قَامُوا سَجَدَ الآخَرُونَ الَّذِينَ كَانُوا خَلْفَهُمْ، ثُمَّ تَأَخَّرَ الصَّفُّ الَّذِي يَلِيهِ إِلَى مَقَامِ الآخَرِينَ وَتَقَدَّمَ الصَّفُّ الأَخِيرُ إِلَى مَقَامِهِمْ، ثُمَّ يَرْكَعُ الإِمَامُ

وَيَرْكَعُونَ جَمِيعًا، ثُمَّ يَسْجُدُ وَيَسْجُدُ الصَّفُّ الَّذِي يَلِيهِ، وَالآخَرُونَ يَحْرُسُونَهُمْ، فَإِذَا جَلَسَ الإِمَامُ وَالصَّفُّ الَّذِي يَلِيهِ سَجَدَ الآخَرُونَ، ثُمَّ جَلَسُوا جَمِيعًا، ثُمَّ سَلَّمَ عَلَيْهِمْ جَمِيعًا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا قَوْلُ سُفْيَانَ.

واتە: ئەوانەی کە پێیان وایە: پێشنوێژ بە دوو ڕێز نوێژی ترسیان پێ بکات بەم شێوەیە: (الله أكبر)ی نوێژ دابەستن بکات بە هەموویان، لەپاشدا ڕکوع بەرێت بە هەموویان، ئینجا پێشنوێژ سەجدە بەرێت لەگەڵ ئەو ڕیزەی کە لەدوایەن واتە ڕیزی یەکەم ڕیزی دووەمیش بە پێوە پاسەوانیان بکەن، کاتێ کە هەستانەوە ڕیزی دوای ئەوان سەجدە بەرن واتە ڕیزی دووەم،، لەپاشدا ڕیزی یەکەم بچنە دواوە بۆ شوێنی ڕیزی دووەم و ڕیزی دووەمیش بێنە جێگای ئەوان، ئینجا پێشنوێژ ڕکوع بەرێت و ئەوانیش هەموویان ڕکوع بەرن، لەپاشدا پێشنوێژ سەجدە ببات جا ئەو ڕیزەی کە لە دواوەیەوەن سەجدە بەرن واتە ئەوانەی کە پێشتر ڕیزی دووەم بوون، ڕیزەکەی دوای ئەوان بە پێوە پاسەوانیان بکەن، کاتێ کە پێشنوێژ دانیشت بۆ تەحیات خوێندن لەگەڵ ئەوانەی کە لەدوایەوە بوون ئەوکاتە ڕیزەکەی تریش سەجدە بەرن، لەپاشدا هەموویان پێکەوە دانیشن بۆ تەحیات خوێندن، ئینجا هەموویان پێکەوە سەلام بدەنەوە. ئەبو داود دەڵێت: ئەمە وتەی سوفیانە.

١٢٣٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي عَيَّاشٍ الزُّرَقِيِّ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعُسْفَانَ، وَعَلَى الْمُشْرِكِينَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ، فَصَلَّيْنَا الظُّهْرَ، فَقَالَ الْمُشْرِكُونَ: لَقَدْ

أَصَبْنَا غِرَّةً لَقَدْ أَصَبْنَا غَفْلَةً لَوْ كُنَّا حَمَلْنَا عَلَيْهِمْ وَهُمْ فِي الصَّلاَةِ! فَنَزَلَتْ آيَةُ الْقَصْرِ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ. فَلَمَّا حَضَرَتِ الْعَصْرُ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ، وَالْمُشْرِكُونَ أَمَامَهُ، فَصَفَّ خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَفٌّ، وَصَفَّ بَعْدَ ذَلِكَ الصَّفِّ صَفٌّ آخَرُ، فَرَكَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرَكَعُوا جَمِيعًا، ثُمَّ سَجَدَ وَسَجَدَ الصَّفُّ الَّذِينَ يَلُونَهُ، وَقَامَ الآخَرُونَ يَحْرُسُونَهُمْ، فَلَمَّا صَلَّى هَؤُلاَءِ السَّجْدَتَيْنِ وَقَامُوا، سَجَدَ الآخَرُونَ الَّذِينَ كَانُوا خَلْفَهُمْ، ثُمَّ تَأَخَّرَ الصَّفُّ الَّذِي يَلِيهِ إِلَى مَقَامِ الآخَرِينَ، وَتَقَدَّمَ الصَّفُّ الأَخِيرُ إِلَى مَقَامِ الصَّفِّ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَرَكَعُوا جَمِيعًا، ثُمَّ سَجَدَ وَسَجَدَ الصَّفُّ الَّذِي يَلِيهِ وَقَامَ الآخَرُونَ يَحْرُسُونَهُمْ، فَلَمَّا جَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالصَّفُّ الَّذِي يَلِيهِ سَجَدَ الآخَرُونَ، ثُمَّ جَلَسُوا جَمِيعًا، فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ جَمِيعًا، فَصَلاَّهَا بِعُسْفَانَ، وَصَلاَّهَا يَوْمَ بَنِي سُلَيْمٍ.

واتە: ئەبو عەیياشی زورەقی دەڵێت: لە عوسفان لە خزمەت پێغەمبەری

خـوادا بـووین صلی الله علیـه وسـلم، خالیـدی كـوڕی وەلیـد سـەركردەی سـوپای هـاوەڵ بـۆ خـوا بڕیـاردەران بـوو، نوێـژی نیوەڕۆمـان دەكـرد، هـاوەڵ بـۆ خـوا بڕیاردەران وتیان: لەناكاو دەدەین بەسەریاند، غافڵ گیریان دەكەین و لـەناویان دەبەین كە هەڵمەتمان بـۆ بـردن ئـەوان لـەناو نوێـژدا بـوون، لەوكاتـەدا ئایـەتی كورتكردنەوەی نوێـژی نیـوەڕۆ و عەسـر دابـەزی واتـە نوێـژی تـرس، كـاتێ كـە نوێژی عەسر هاتە پێشەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسـلم بـەرەو رووی قیبلـە راوەسـتا، هـاوەڵ بـۆ خـوا بڕیـاردەران لـەلای قیبلـەوە بـوون، لـەدوای پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم ریزێ ریزبوون، ریزێكی تـریش لـەدوای ئەوانەوە ریزبوون واتە بوون بە دوو ریز، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ركوعی بردو ئەوانیش هەموویان ركوعیان برد، لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەجدەی برد ئەوانەی كە لەدوایەوە بوون سەجدەیان برد واتـە ریـزی یەكـەم، ریـزی دووەم بـە پێـوە پاسـەوانیان دەكـردن، كـاتێ كـە دوو سەجدەیان بردو هەستانەوە، ریزی دووەم سەجدەیان برد، ئینجا ریـزی یەكـەم چوونە دواوە بۆ شوێنی ریـزی دووەم و ریـزی دووەمـیش هاتنـە جێگـای ریـزی یەكەم، لەپاشـدا پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـه وسـلم ركـوعی بـردو هـەردوو ریزەكەش هەموویان ركوعیان برد، ئینجا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەجدەی برد ئەوانەی كە لەدوایەوە بـوون سـەجدەیان بـرد واتـە ئەوانـەی كـە پێشتر ریزی دووەم بـوون، ئەوانـەی تـریش بـە پێـوە پاسـەوانیان دەكـردن واتـە ئەوانەی كە پێشتر ریزی یەكەم بوون، كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسلم دانیشت بۆ تەحیات خوێندن لەگەڵ ئەوانەی كە لەدوایەوە بوون ئەوكاتە ریزەكـەی تـریش سـەجدەیان بـرد، لەپاشـدا هـەموویان پێكـەوە دانیشـن بـۆ تەحیات خوێندن، ئینجا سەلامی بە هەموویان دایـەوە، پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیه وسلم دوو جار نوێـژی ترسـی ئەنجامـدا جـارێ لـە عوسـفان، جـارێ لـە خاكی هۆزی سولەیم دا.

٢٨٢ - باب مَنْ قَالَ: يَقُومُ صَفٌّ مَعَ الإِمَـامِ، وَصَـفٌّ وِجَـاهَ الْعَـدُوِّ، فَيُصَلِّى بِالَّذِينَ يَلُونَهُ رَكْعَـةً، ثُـمَّ يَقُـومُ قَائِمًـا حَتَّـى يُصَلِّيَ الَّذِينَ مَعَهُ رَكْعَةً أُخْرَى، ثُمَّ يَنْصَرِفُونَ فَيَصُفُّونَ وِجَاهَ الْعَدُوِّ، وَتَجِيءُ الطَّائِفَةُ الأُخْرَى فَيُصَلِّى بِهِمْ رَكْعَةً وَيَثْبُتُ جَالِسًا فَيُتِمُّونَ لأَنْفُسِهِمْ رَكْعَةً أُخْرَى، ثُمَّ يُسَلِّمُ بِهِمْ جَمِيعًا.

باسی ئەوانـەی کـە دەڵێن: ریـزێ لـەدوای پێشـنوێژەوە ریـزبن و، ریـزێکیش بەرەورووی دوژمن راوەستن، جا پێشنوێژ رکاتێ بکات بەوانەی کە لەدوایـەوەن، لەپاشدا پێشنوێژ بە پێـوە راوەسـتێ هـەتا رکـاتێکی تـر دەکـەن، ئینجا دەڕۆن و بەرامبەر بە دوژمـن رادەوەسـتن، ئینجـا ریـزی دووەم دێـن و رکـاتێکیش بـەوان دەکات و بەدانیشتنەوە بمێنێتەوە هەتا ئـەوان بـۆ خۆیـان رکـاتێکی تـر دەکـەن، لەپاشدا سەلام بە هەموویان بداتەوە.

١٢٣٧ - (صحيح) عَن سَهْلِ بْنِ أَبِى حَثْمَـةَ، أَنَّ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى بِأَصْحَابِهِ فِى خَوْفٍ، فَجَعَلَهُـمْ خَلْفَـهُ صَفَّيْنِ، فَصَلَّى بِالَّذِينَ يَلُونَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ قَامَ، فَلَـمْ يَـزَلْ قَائِمًا حَتَّى صَلَّى الَّـذِينَ خَلْفَهُـمْ رَكْعَـةً، ثُـمَّ تَقَـدَّمُوا وَتَأَخَّرَ الَّذِينَ كَانُوا قُدَّامَهُمْ فَصَلَّى بِهِـمُ النَّبِـيُّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَكْعَةً، ثُـمَّ قَعَـدَ حَتَّـى صَـلَّى الَّـذِينَ

تَخَلَّفُوا رَكْعَةً، ثُمَّ سَلَّمَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَأَمَّا رِوَايَةُ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنِ الْقَاسِمِ نَحْوُ رِوَايَةِ يَزِيدَ بْنِ رُومَانَ، إِلاَّ أَنَّهُ خَالَفَهُ فِي السَّلاَمِ، وَرِوَايَةُ عُبَيْدِ اللَّهِ نَحْوُ رِوَايَةِ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ قَالَ: وَيَثْبُتُ قَائِمًا.

واتە: سەهلی كوڕی (أبی حَثمَة) دەڵێت: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نوێژی ترسی بە هاوەڵانی بەم شێوەیە كرد، لەدوای خۆیەوە كردنی بە دوو ریز، جا ركاتێكی كرد بە ریزی یەكەم، لەپاشدا هەستایەوە بە پێوە راوەستا، هەتا ریزی دووەم لەشوێنی خۆیان ركاتی یەكەمیان بۆ خۆیان كرد، ئینجا ریزی یەكەم چوونە دواوە، ریزی دووەمیش هاتنە پێشەوە، لەپاشدا ركاتێكی بەمانیش كرد، ئینجا دانیشتن هەتا ریزی یەكەم كە چووبوونە دواوە ركاتی دووەمیان كرد، لەپاشدا سەلامی بە هەموویان دایەوە. ئەبو داود دەڵێت: بەڵام ریوایەتی یەحیای كوڕی سەعید، لە قاسمەوە وەك ریوایەتەكەی یەزیدی كوڕی رومانە تەنها ئەوەندە هەیە كە رایان جیاوازە لەسەر سەلامی بە هەموویان دایەوە، وە ریوایەتی (عُبَیْدِ الله) وەك ریوایەتەكەی یەحیای كوڕی سەعیدە كە وتویەتی: بە پێوە مایەوە.

## باسی ئەوانەی کە دەڵێن: ئەگەر پێشنوێژ ڕکاتێکی کرد بەوانەی ڕیزی یەکەم، لەرکاتی دووەمدا بە پێوە بمێنێتەوە، تا ئەوان بۆ خۆیان ڕکاتیٚ دەکەن واتە ڕیزی یەکەم، لەپاشاندا سەلام بدەنەوەو، بڕۆن بەرامبەر بە دوژمن ڕاوەستن، بەڵام جیاوازیان هەیە لەسەر سەلامدانەوە.

## ٢٨٣ – باب مَنْ قَالَ: إِذَا صَلَّى رَكْعَةً، وَثَبَتَ قَائِمًا، أَتَمُّوا لأَنْفُسِهِمْ رَكْعَةً، ثُمَّ سَلَّمُوا، ثُمَّ انْصَرَفُوا، فَكَانُوا وِجَاهَ الْعَدُوِّ، وَاخْتُلِفَ فِي السَّلاَمِ.

١٢٣٨ - (صحيح) عَنْ صَالِحِ بْنِ خَوَّاتٍ، عَمَّنْ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ ذَاتِ الرِّقَاعِ صَلاَةَ الْخَوْفِ، أَنَّ طَائِفَةً صَفَّتْ مَعَهُ، وَطَائِفَةً وِجَاهَ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِالَّتِي مَعَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ ثَبَتَ قَائِمًا، وَأَتَمُّوا لأَنْفُسِهِمْ، ثُمَّ انْصَرَفُوا وَصَفُّوا وِجَاهَ الْعَدُوِّ، وَجَاءَتِ الطَّائِفَةُ الأُخْرَى فَصَلَّى بِهِمُ الرَّكْعَةَ الَّتِي بَقِيَتْ مِنْ صَلاَتِهِ، ثُمَّ ثَبَتَ جَالِسًا، وَأَتَمُّوا لأَنْفُسِهِمْ، ثُمَّ سَلَّمَ بِهِمْ.

واتە: لە صالّحی كوڕی خەواتەوە، لەوانەی كە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم لە ڕۆژی (ذات الرقاع)دا نوێژی ترسیان كرد هاتووە، كە كۆمەڵێ لەگەڵ پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم ریزیان بەستوەو نوێژیان كردوە، كۆمەڵەكەی تریان بەرەورووی دوژمن وەستاون، جا ركاتێكی كرد بەوانەی لەگەڵیا بوون، لەپاشدا هەستایەوە بۆ ركاتی دووەم بە پێوە راوەستا هەتا ئەوان بۆ خۆیان ركاتێكی تریان كردو رۆیشتن بەرامبەر بە دوژمن راوەستان، ئینجا كۆمەڵەكەی تر هاتن پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ركاتێكی مابوو لەگەڵ ئەم كۆمەڵەدا كردی، لەپاشدا خۆی بەدانیشتنەوە چاوەڕێی كردن تا ئەوانیش بۆ خۆیان ركاتێكی تریان كرد، ئینجا سەلامی بەمان دایەوە.

١٢٣٩ - (صحيح) عَن صَالِحِ بْنِ خَوَّاتٍ الأَنْصَارِيِّ، أَنَّ سَهْلَ بْنَ أَبِي حَثْمَةَ الأَنْصَارِيَّ حَدَّثَهُ أَنَّ صَلاَةَ الْخَوْفِ: أَنْ يَقُومَ الإِمَامُ وَطَائِفَةٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، وَطَائِفَةٌ مُوَاجِهَةَ الْعَدُوِّ، فَيَرْكَعُ الإِمَامُ رَكْعَةً، وَيَسْجُدُ بِالَّذِينَ مَعَهُ، ثُمَّ يَقُومُ، فَإِذَا اسْتَوَى قَائِمًا ثَبَتَ قَائِمًا، وَأَتَمُّوا لأَنْفُسِهِمُ الرَّكْعَةَ الْبَاقِيَةَ، ثُمَّ سَلَّمُوا وَانْصَرَفُوا، وَالإِمَامُ قَائِمٌ، فَكَانُوا وِجَاهَ الْعَدُوِّ، ثُمَّ يُقْبِلُ الآخَرُونَ الَّذِينَ لَمْ يُصَلُّوا فَيُكَبِّرُونَ وَرَاءَ الإِمَامِ، فَيَرْكَعُ بِهِمْ وَيَسْجُدُ بِهِمْ، ثُمَّ يُسَلِّمُ، فَيَقُومُونَ، فَيَرْكَعُونَ لأَنْفُسِهِمُ الرَّكْعَةَ الْبَاقِيَةَ، ثُمَّ يُسَلِّمُونَ.

واتە: لە صالّحی کوڕی خەواتی ئەنصاریەوە هاتووە، کە سەهلی کوڕی (أبی حَثمَة)ی ئەنصاری باسی نوێژی ترسی بۆ کردوە بەم شێوەیە: پێشنوێژ لەگەڵ کۆمەڵێکدا رادەوەستن بۆ نوێژکردن، کۆمەڵێکی تر بەرەوڕووی دوژمن دەوەستن، جا پێشنوێژ رکوع و سەجدە دەبات بەوانەی کە لەگەڵیان، لەپاشدا هەڵئەسێتەوە، کاتێ کە هەستایەوە بە پێوە رادەوەستێ هەتا ئەوان بۆ خۆیان رکاتەکەی تر دەکەن، ئینجا سەلام دەدەنەوەو دەڕۆن بەرامبەر بە دوژمن رادەوەستن، پێشنوێژ هەر بە پێوە دەبێ لەرکاتی دووەمدا، لەپاشدا کۆمەڵەکەی تر کە نوێژیان نەکردوە دێن لەدوای پێشنوێژەوە نوێژ دادەبەستن، ئینجا رکوع و سەجدەش بەوان دەبات، لەپاشدا پێشنوێژ سەلام دەداتەوە چونکە دوو رکاتی خۆی تەواو کردوە، جا کۆمەڵی دووەم هەڵئەسنەوە بۆ خۆیان رکاتەکەی تر تەواو دەکەن، لەپاشدا سەلام دەدەنەوە.

## ٢٨٤- باب مَنْ قَالَ: يُكَبِّرُونَ جَمِيعًا، وَإِنْ كَانُوا مُسْتَدْبِرِي الْقِبْلَةِ، ثُمَّ يُصَلِّي بِمَنْ مَعَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ يَأْتُونَ مَصَافَّ أَصْحَابِهِمْ، وَيَجِيءُ الآخَرُونَ فَيَرْكَعُونَ لأَنْفُسِهِمْ رَكْعَةً، ثُمَّ يُصَلِّي بِهِمْ رَكْعَةً، ثُمَّ تُقْبِلُ الطَّائِفَةُ الَّتِي كَانَتْ مُقَابِلَ الْعَدُوِّ، فَيُصَلُّونَ لأَنْفُسِهِمْ رَكْعَةً، وَالإِمَامُ قَاعِدٌ، ثُمَّ يُسَلِّمُ بِهِمْ كُلِّهِمْ جَمِيعًا.

باسی ئەوانەی کە دەڵێن: هەردوو کۆمەڵەکە (الله أكبر) دەکەن و نوێژ دادەبەستن، با رووشیان لە قیبلە نەبێت، لەپاشدا پێشنوێژ رکاتێ دەکات بەوانەی لەگەڵیان واتە کۆمەڵی یەکەم، کاتێ کە رکاتی یەکەمیان تەواو کرد دەچنە شوێنی کۆمەڵی دووەم، کۆمەڵی دووەم دێن بۆ خۆیان رکاتێ نوێژ دەکەن دوای ئەوەی کە تەواو بوون، پێشنوێژ رکاتێ دووەمیان پێ دەکات،

لەپاشدا ئەو کۆمەڵەی کە بەرامبەر بە دوژمن وەستابوون دێن بۆ خۆیان رکاتی دووەم دەکـەن، پێشـنوێژ دانیشـتووە بـۆ تـەحیات، ئینجـا سـەلام بـە هـەردوو کۆمەڵەکە دەداتەوە.

١٢٤٠ - (صحيح) عَن مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ، أَنَّهُ سَأَلَ أَبَا هُرَيْرَةَ: هَلْ صَلَّيْتَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلاَةَ الْخَوْفِ؟ قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: نَعَمْ. قَالَ مَرْوَانُ: مَتَى؟ فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: عَامَ غَزْوَةِ نَجْدٍ. قَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى صَلاَةِ الْعَصْرِ، فَقَامَتْ مَعَهُ طَائِفَةٌ، وَطَائِفَةٌ أُخْرَى مُقَابِلَ الْعَدُوِّ، ظُهُورُهُمْ إِلَى الْقِبْلَةِ، فَكَبَّرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَكَبَّرُوا جَمِيعًا: الَّذِينَ مَعَهُ وَالَّذِينَ مُقَابِلِي الْعَدُوِّ، ثُمَّ رَكَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَكْعَةً وَاحِدَةً، وَرَكَعَتِ الطَّائِفَةُ الَّتِي مَعَهُ، ثُمَّ سَجَدَ فَسَجَدَتِ الطَّائِفَةُ الَّتِي تَلِيهِ، وَالآخَرُونَ قِيَامٌ مُقَابِلِي الْعَدُوِّ، ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَامَتِ الطَّائِفَةُ الَّتِي مَعَهُ، فَذَهَبُوا إِلَى الْعَدُوِّ، فَقَابَلُوهُمْ. وَأَقْبَلَتِ الطَّائِفَةُ الَّتِي كَانَتْ مُقَابِلِي الْعَدُوِّ، فَرَكَعُوا وَسَجَدُوا، وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَائِمٌ كَمَا هُوَ، ثُمَّ قَامُوا، فَرَكَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَكْعَةً أُخْرَى وَرَكَعُوا

مَعَهُ، وَسَجَدَ وَسَجَدُوا مَعَهُ، ثُمَّ أَقْبَلَتِ الطَّائِفَةُ الَّتِي كَانَتْ مُقَابِلِي الْعَدُوِّ، فَرَكَعُوا وَسَجَدُوا، وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَاعِدٌ وَمَنْ مَعَهُ، ثُمَّ كَانَ السَّلَامُ، فَسَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَسَلَّمُوا جَمِيعًا، فَكَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَكْعَتَيْنِ، وَلِكُلِّ رَجُلٍ مِنَ الطَّائِفَتَيْنِ رَكْعَةٌ رَكْعَةٌ.

واتە: لە مەروانی كوڕی حەكەمەوە هاتووە، كە لە ئەبو هورەیرەی پرسیوە: ئایا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم نوێژی ترست كردوە؟ ئەبو هورەیرە وتی: بەڵێ، مەروان وتی: كەی؟ ئەبو هورەیرە وتی: ساڵی غەزای نەجد. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەستا بۆ نوێژی عەسر، كۆمەڵێ لەگەڵیا هەستان، كۆمەڵەكەی تر بەرامبەر بە دوژمن وەستان و پشتیان لە قیبلە بوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم (الله أكبر)ی كردو نوێژی دابەست، ئەوانیش هەموویان (الله أكبر)یان كردو نوێژیان دابەست، ئەوانەی لەگەڵی بوون و ئەوانەی بەرەو دوژمن وەستا بوون، لەپاشدا چووە ركوعەوە لەگەڵ ئەوانەی كە لە گەڵیا بوون، ئینجا دانەویەوە بۆ سەجدە لەگەڵ ئەو كۆمەڵەی كە لە دوایەوە بوون، ئەوانی تر هەر بەپێوە وەستابوون بەرامبەر بە دوژمن، لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەستایەوە ئەوانەی لە گەڵیا بوون هەستانەوەو ڕۆشتن بەرامبەر بە دوژمن وەستان، ئەو كۆمەڵەی بەرامبەر بە دوژمن وەستابوون هاتن ركوعیان بردو سەجدەیان برد، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەر بەپێوە وەستابوو، ئینجا هەستانەوە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ركوعێكی تری بردو ئەوانیش ركوعیان برد، هەروەها پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەجدەی برد ئەوانیش

سەجدەیان برد، لەپاشدا ئەو کۆمەڵەی کە بەرامبەر بە دوژمن وەستابوون هاتن رکوعیان بردو سەجدەیان برد، لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و ئەوانەی کە لە گەڵی بوون دانیشتبوون چاوەڕێی ئەوانیان دەکرد، ئینجا تەحیاتیان خوێند، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەلامی دایەوە، هەموویان لەدوایەوە سەلامیان دایەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوو رکاتی کردو، هەریەکەش لە هەردوو کۆمەڵەکە یەك رکات یەك رکات.

١٢٤١ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى نَجْدٍ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِذَاتِ الرِّقَاعِ مِنْ نَخْلٍ، لَقِيَ جَمْعًا مِنْ غَطَفَانَ، فَذَكَرَ مَعْنَاهُ، وَلَفْظُهُ عَلَى غَيْرِ لَفْظِ حَيْوَةَ، وَقَالَ فِيهِ: حِينَ رَكَعَ بِمَنْ مَعَهُ وَسَجَدَ، قَالَ: فَلَمَّا قَامُوا مَشَوُا الْقَهْقَرَى إِلَى مَصَافِّ أَصْحَابِهِمْ، وَلَمْ يَذْكُرِ اسْتِدْبَارَ الْقِبْلَةِ.

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بەرەو نجد دەرچووین، هەتا گەیشتینە (ذات الرِّقَاع) خاکی (غَطفَان)، گەیشت بە کۆمەڵێ لە خەڵکی (غَطفَان)، راوی فەرمودەکەی بە هەمان مانا گێڕایەوە، بەڵام گۆکەی وەك گۆی حەیوە نەبوو، راوی لە فەرمودەکەیدا وتی: لەکاتێکدا کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم رکوع و سەجدەی برد بەوانەی کە لە گەڵی بوون، راوی وتی: کاتێ کە هەستانەوە پشتاو پشت گەڕانەدواوە بۆ شوێنی هاوڕێکانیان، بەڵام باسی ئەوەی نەکرد کە پشتیان لە قیبلە بوو.

١٢٤٢ - (حسن) عَن عَائِشَةَ قَالَتْ: كَبَّرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَكَبَّرَتِ الطَّائِفَةُ الَّذِينَ صُفُّوا مَعَهُ، ثُمَّ رَكَعَ فَرَكَعُوا، ثُمَّ سَجَدَ فَسَجَدُوا، ثُمَّ رَفَعَ فَرَفَعُوا، ثُمَّ مَكَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسًا، ثُمَّ سَجَدُوا هُمْ لأَنْفُسِهِمُ الثَّانِيَةَ، ثُمَّ قَامُوا فَنَكَصُوا عَلَى أَعْقَابِهِمْ يَمْشُونَ الْقَهْقَرَى، حَتَّى قَامُوا مِنْ وَرَائِهِمْ، وَجَاءَتِ الطَّائِفَةُ الأُخْرَى فَقَامُوا فَكَبَّرُوا، ثُمَّ رَكَعُوا لأَنْفُسِهِمْ، ثُمَّ سَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَجَدُوا مَعَهُ، ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَسَجَدُوا لأَنْفُسِهِمُ الثَّانِيَةَ. ثُمَّ قَامَتِ الطَّائِفَتَانِ جَمِيعًا، فَصَلُّوا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرَكَعَ فَرَكَعُوا، ثُمَّ سَجَدَ فَسَجَدُوا جَمِيعًا، ثُمَّ عَادَ فَسَجَدَ الثَّانِيَةَ وَسَجَدُوا مَعَهُ سَرِيعًا كَأَسْرَعِ الإِسْرَاعِ جَاهِدًا لاَ يَأْلُونَ سِرَاعًا، ثُمَّ سَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَسَلَّمُوا، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَقَدْ شَارَكَهُ النَّاسُ فِي الصَّلاَةِ كُلِّهَا.

واتە: عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (الله أكبر)ی كردو نوێژی دابەست، ئەو كۆمەڵەش كە لەگەڵی بوون (الله

أکبر)یان کردو نوێژیان دابەست واتە کۆمەڵەی یەکەم، لەپاشدا رکوعی برد ئەوانیش رکوعیان برد، ئینجا سەجدەی برد ئەوانیش سەجدەیان برد، لەپاشدا سەری بەرزکردەوە لە سەجدە ئەوانیش سەریان بەرزکردەوە لە سەجدە، ئینجا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەجدەی دووەمی نەبرد بەدانیشتنەوە مایەوە، کۆمەڵەی یەکەم بۆ خۆیان سەجدەی دووەمیان برد، لەپاشدا هەستانەوە پشتاو پشت گەڕانەدواوە پشتیان نەکردبوە قیبلە هەتا چوونە دوای کۆمەڵەی دووەمەوە کە بەرامبەر بە دوژمن وەستابوون، جا کۆمەڵەی دووەم هاتن (الله أکبر)یان کردو نوێژیان دابەست، لەپاشدا بۆ خۆیان رکوعیان برد، ئینجا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەجدەی دووەمی برد، ئەوانیش سەجدەیان برد، لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستایەوە بۆ رکاتی دووەم، ئەوانیش بۆ خۆیان سەجدەی دووەمیان برد، ئینجا هەردوو کۆمەڵەکە هەستانەوە، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم نوێژیان کرد، لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رکوعی برد، ئەوانیش هەموویان رکوعیان برد، ئینجا سەجدەی برد، ئەوانیش هەموویان سەجدەیان برد، لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەجدەی دووەمی برد، ئەوانیش لەترسی دوژمن زۆر بەپەلە بێ کەموکوڕی نواندن سەجدەی دووەمیان برد، ئینجا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەلامی دایەوە، ئەوانیش هەموویان سەلامیان دایەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستایەوە، بەوشێوەیە خەڵکەکە بەشداری هەموو نوێژکەیان کرد.

## باسی ئەوانەی کە دەڵێن: پێشنوێژ یەك رکات نوێژ بکات بە کۆمەڵەی یەکەم و رکاتێکیش بە کۆمەڵەی دووەم، لەپاشدا سەلام بداتەوە، جا هەر ریزێ هەستێتەوە بۆ خۆی رکاتەکەی تر بکات.

## ١٦ - باب مَنْ قَالَ: يُصَلِّي بِكُلِّ طَائِفَةٍ رَكْعَةً، ثُمَّ يُسَلِّمُ فَيَقُومُ كُلُّ صَفٍّ، فَيُصَلُّونَ لأَنْفُسِهِمْ رَكْعَةً.

١٢٤٣ - (صحيح) عَن ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى بِإِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ رَكْعَةً، وَالطَّائِفَةُ الأُخْرَى مُوَاجِهَةُ الْعَدُوِّ، ثُمَّ انْصَرَفُوا فَقَامُوا فِي مَقَامِ أُولَئِكَ، وَجَاءَ أُولَئِكَ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً أُخْرَى، ثُمَّ سَلَّمَ عَلَيْهِمْ، ثُمَّ قَامَ هَؤُلاَءِ فَقَضَوْا رَكْعَتَهُمْ وَقَامَ هَؤُلاَءِ فَقَضَوْا رَكْعَتَهُمْ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَلِكَ رَوَاهُ نَافِعٌ وَخَالِدُ بْنُ مَعْدَانَ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَكَذَلِكَ قَوْلُ مَسْرُوقٍ وَيُوسُفَ بْنِ مِهْرَانَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَكَذَلِكَ رَوَى يُونُسُ، عَنِ الْحَسَنِ، عَنْ أَبِي مُوسَى أَنَّهُ فَعَلَهُ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم رکاتێ نوێژی کرد بە یەکێ لەدوو کۆمەڵەکە، کۆمەڵەکەی تریان بەرامبەر بە دوژمن راوەستابوون، کۆمەڵی یەکەم کاتێ کە لە رکاتی یەکەم لێ بوونەوە رۆیشتن لە جێگای ئەواندا راوەستان، کۆمەڵی دووەم هاتن رکاتێکی بەوانیش کرد، ئینجا سەلامی دایەوە، لەپاشدا هەر کۆمەڵەو بۆ خۆی رکاتەکەی تری تەواو کرد. ئەبو داود دەڵێت: نافیع و خالیدی کوڕی مەعدان، لە ئیبنو عومەرەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم، بە هەمان شێوە فەرموودەی پێشویان گێڕاوەتەوە، هەروەها مەسروق و یوسفی کوڕی میهران، لە ئیبنو عەباسەوە بە هەمان شێوە گێڕاویانەتەوە، وە یونوس، لە حەسەنەوە، لە ئەبو موساوە بە هەمان شێوە گێڕاویەتیەوە، کە ئەبو موسا ئەو کارەی کردوە.

## باسی ئەوانەی کە دەڵێن: پێشنوێژ یەك ركات نوێژ بكات بە کۆمەڵەی یەکەم و ركاتێکیش بە کۆمەڵەی دووەم، لەپاشدا سەلام بداتەوە، جا ئەوانەی کە لەدوایەوەن هەستنەوە ركاتەکەی تر بکەن، لەپاشدا کۆمەڵەکەی تر بێن بۆ جێگەی ئەوان بۆ خۆیان ركاتەکەی تر بکەن.

## ٢٨٦ - باب مَنْ قَالَ: يُصَلِّى بِكُلِّ طَائِفَةٍ رَكْعَةً، ثُمَّ يُسَلِّمُ، فَيَقُومُ الَّذِينَ خَلْفَهُ فَيُصَلُّونَ رَكْعَةً، ثُمَّ يَجِيءُ الآخَرُونَ إِلَى مَقَامِ هَؤُلاَءِ فَيُصَلُّونَ رَكْعَةً.

١٢٤٤ - (ضعيف) عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلاَةَ الْخَوْفِ، فَقَامُوا صَفَّيْنِ صَفٌّ خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَصَفٌّ مُسْتَقْبِلَ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِهِمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَكْعَةً، ثُمَّ جَاءَ الآخَرُونَ فَقَامُوا مَقَامَهُمْ، وَاسْتَقْبَلَ هَؤُلاَءِ الْعَدُوَّ فَصَلَّى بِهِمُ النَّبِيُّ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَكْعَةً، ثُمَّ سَلَّمَ، فَقَامَ هَؤُلاَءِ فَصَلَّوْا لأَنْفُسِهِمْ رَكْعَةً، ثُمَّ سَلَّمُوا، ثُمَّ ذَهَبُوا فَقَامُوا مَقَامَ أُولَئِكَ مُسْتَقْبِلِي الْعَدُوِّ وَرَجَعَ أُولَئِكَ إِلَى مَقَامِهِمْ فَصَلَّوْا لأَنْفُسِهِمْ رَكْعَةً، ثُمَّ سَلَّمُوا.

واتە: (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی مەسعود دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی ترسی بۆ کردین بەم شێوەیە: بە دوو ریز راوەستان ریزێ لەدوای پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم، ریزێ بەرامبەر بە دوژمن، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم رکاتێکی کرد بەوانەی کە لەدوایەوە بوون، ئینجا ئەوانەی بەرامبەر بە دوژمن وەستابوون هاتن بۆ جێگای ئەمان و رکاتێکی بەوانیش کرد، ئەوانیش رۆشتن بەرامبەر بە دوژمن وەستان، ئینجا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەلامی دایەوە، ئەوانیش هەستانەوە بۆ خۆیان رکاتەی تریان کردو سەلامیان دایەوە،، لەپاشدا چوون بۆ جێگای ئەوانەی کە بەرامبەر بە دوژمن وەستابوون، ئەوانیش گەڕانەوە بۆ جێگای خۆیان و بۆ خۆیان رکاتەکەی تریان کردو سەلامیان دایەوە.

١٢٤٥ - (ضعيف) عَن خُصَيْفٍ بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ. قَالَ: فَكَبَّرَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَكَبَّرَ الصَّفَّانِ جَمِيعًا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ الثَّوْرِيُّ بِهَذَا الْمَعْنَى عَن خُصَيْفٍ، وَصَلَّى عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَمُرَةَ هَكَذَا، إِلاَّ أَنَّ الطَّائِفَةَ الَّتِي صَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً، ثُمَّ سَلَّمَ مَضَوْا إِلَى مَقَامِ أَصْحَابِهِمْ،

وَجَاءَ هَؤُلاَءِ فَصَلَّوْا لأَنْفُسِهِمْ رَكْعَةً، ثُمَّ رَجَعُوا إِلَى مَقَامِ أُولَئِكَ فَصَلَّوْا لأَنْفُسِهِمْ رَكْعَةً.

واته: لەخوصەیفەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان سەنەد و مانا هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم (الله أكبر)ی کردو نوێژی دابەست. ئەبو داود دەڵێت: (ثَوْرِیَ)یش فەرمودەی پێشوی بە هەمان مانا لە خوصەیفەوە گێڕاوەتەوە،،(عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی سەمورەش بە هەمان شێوە نوێژی ترسی کردوە، تەنها ئەوەندە نەبێت کە ئەو کۆمەڵەی کە رکاتەی پێکردن و، لەپاشدا خۆی سەلامی دایەوە، رۆیشتن بۆ جێگای کۆمەڵەکەی تر، ئەوانیش هاتن بۆ خۆیان رکاتێکیان کرد، ئینجا گەڕانەوە بۆ جێگای ئەوان و بۆ خۆیان رکاتەکەی تریان کردو سەلامیان دایەوە.

١٢٤٥ / م - (ضعيف) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ عَبْدُ الصَّمَدِ بْنُ حَبِيبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي، أَنَّهُمْ غَزَوْا مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ كَابُلَ، فَصَلَّى بِنَا صَلاَةَ الْخَوْفِ.

ئەبو داود دەڵێت: لە (عَبْدُ الصَّمَد)ی کوڕی حەبیبەوە هاتووە، کە وتویەتی: باوکم پێی راگەیاندم کە ئەوکاتە لە غەزای کابول بوون لەگەڵ (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی سەمورە دا، نوێژی ترسی بۆ کردین.

## باسی ئەوانەی كە دەڵێن: پێشنوێژ بە هەریەكێ لەو دوو كۆمەڵە یەك ركات نوێژ دەكات، ركاتی دووەم ناكەن و سەلام ئەدەنەوە.

## ٣٨٧ - باب مَنْ قَالَ: يُصَلِّى بِكُلِّ طَائِفَةٍ رَكْعَةً وَلاَ يَقْضُونَ.

١٢٤٦ - (صحيح) عَن ثَعْلَبَةَ بْنِ زَهْدَمٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ بِطَبَرِسْتَانَ فَقَامَ فَقَالَ: أَيُّكُمْ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلاَةَ الْخَوْفِ؟ فَقَالَ حُذَيْفَةُ: أَنَا فَصَلَّى بِهَؤُلاَءِ رَكْعَةً، وَبِهَؤُلاَءِ رَكْعَةً، وَلَمْ يَقْضُوا. قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَكَذَا رَوَاهُ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ وَمُجَاهِدٌ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ شَقِيقٍ، عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَيَزِيدُ الْفَقِيرُ وَأَبو مُوسَى - قَالَ أَبو دَاوُدَ: رَجُلٌ مِنَ التَّابِعِينَ لَيْسَ بِالأَشْعَرِيِّ - جَمِيعًا، عَن جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَقَدْ قَالَ بَعْضُهُمْ (عن شعبة) فِى حَدِيثِ يَزِيدَ الْفَقِيرِ: إِنَّهُمْ قَضَوْا رَكْعَةً أُخْرَى. وَكَذَلِكَ رَوَاهُ سِمَاكٌ الْحَنَفِىُّ،

عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَكَذَلِكَ رَوَاهُ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: فَكَانَتْ لِلْقَوْمِ رَكْعَةً (رَكْعَةً)، وَلِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَكْعَتَيْنِ.

واتە: (ثعلَبَةْ)ى كوڕى زەهدەم دەڵێت: لە (طبَرستان) لەگەڵ سەعیدى كوڕى عاصدا بووین هەستایەوە وتی: كێ لەئێوە لەكەڵ پێغەمبەرى خوادا صلى الله علیه وسلم نوێژى ترسى كردوە؟ (حُذَیفَةْ) وتی: من، یەك ركات نوێژى كرد بە كۆمەڵەى یەكەم و، ركاتێكیش بە كۆمەڵەى دووەم، بەڵام ركاتى دووەمیان نەكرد بەڵكو تەنها یەكى یەك ركاتیان كردو سەلامیان دایەوە. ئەبو داود دەڵێت: (عُبَیدُ الله)ى كوڕى (عَبدُ الله) و موجاهید، لە ئیبنو عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله علیه وسلم، فەرمودەى پێشویان بە هەمان شێوە گێڕاوەتەوە، هەروەها (عبدُ اللە)ى كوڕى شەقیق، لە ئەبو هورەیرە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله علیه وسلم، بە هەمان شێوە فەرمودەى پێشوى گێڕاوەتەوە، وە یەزیدى فەقیر و ئەبو موسا - كە ئەبو داود دەڵێت: پیاوێك بووە لە تابعین و ئەشعەرى نەبووە – هەموویان لە جابرەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله علیه وسلم، هەندێكیان لە فەرمودەكەى یەزیدى فەقیردا وتویانە لە (شوعبەوە): هەر كۆمەڵەو بۆ خۆیان ركاتەكەى تریان كرد. وە سەماكى كوڕى وەلیدى حەنەفى، لە ئیبنو عومەرەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله علیه وسلم، بە هەمان شێوە فەرمودەى پێشوى گێڕاوەتەوە. وە زەیدى كوڕى (ثابت) لە پێغەمبەرەوە صلى الله علیه وسلم، بە هەمان شێوە فەرمودەى پێشوى گێڕاوەتەوە وتی: هەریەك لە دوو كۆمەڵەكە یەك ركات یەك ركاتیان كردو، پێغەمبەریش صلى الله علیه وسلم دوو ركاتى كرد.

١٢٤٧ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: فَرَضَ اللَّهُ تَعَالَى الصَّلَاةَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّكُمْ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْحَضَرِ أَرْبَعًا، وَفِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ وَفِي الْخَوْفِ رَكْعَةً.

واته: لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: خوای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەری ئێوە صلى الله عليه وسلم نوێژی فەرزکردوە لەسەرتان: لە شوێنی نیشتەجێ چوار رکات، وە لە سەفەردا دوو رکات، وە لەکاتی ترسیشدا یەك رکات.

## باسی ئەوانەی کە دەڵێن: پێشنوێژ بە هەریەکێ لەو دوو کۆمەڵە دوو رکات نوێژ دەکات، خۆشی چوار رکات دەکات.

## ٢٨٨ - باب مَنْ قَالَ: يُصَلِّي بِكُلِّ طَائِفَةٍ رَكْعَتَيْنِ، (وتكون للإمام أربعا).

١٢٤٨ - (صحيح) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي خَوْفٍ الظُّهْرَ فَصَفَّ بَعْضَهُمْ خَلْفَهُ، وَبَعْضَهُمْ بِإِزَاءِ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ، فَانْطَلَقَ الَّذِينَ صَلَّوْا مَعَهُ فَوَقَفُوا مَوْقِفَ أَصْحَابِهِمْ، ثُمَّ جَاءَ أُولَئِكَ فَصَلَّوْا خَلْفَهُ، فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ،

**فَكَانَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرْبَعًا، وَلأَصْحَابِهِ رَكْعَتَيْنِ، رَكْعَتَيْنِ. وَبِذَلِكَ كَانَ يُفْتِي الْحَسَنُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَلِكَ فِي الْمَغْرِبِ: يَكُونُ لِلإِمَامِ سِتُّ رَكَعَاتٍ، وَلِلْقَوْمِ ثَلاَثًا، ثَلاَثًا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَلِكَ رَوَاهُ يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. وَكَذَلِكَ قَالَ سُلَيْمَانُ الْيَشْكُرِيُّ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.**

واتە: (أبی بَكْرَة) دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی ترسی نیوەڕۆی بۆ كردین بەم شێوەیە: كۆمەڵەی یەكەم لەدوایەوە ریزبوون، كۆمەڵەی دووەم بەرامبەر بە دوژمن راوەستان، دوو ركات نوێژی كرد بە كۆمەڵەی یەكەم لەپاشدا سەلامیان دایەوە، جا ئەوانەی لەگەڵیا نوێژیان كرد رۆشتن بۆ جێگای ئەوانەی كە بەرامبەر بە دوژمن راوەستابوون، ئینجا ئەوانیش هاتن لەدوایەوە نوێژیان كرد، دوو ركات نوێژی بەوانیش كردو سەلامیان دایەوە، بەو پێ یە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم چوار ركات نوێژی كرد، هەریەكە لەو دوو كۆمەڵەش دوو ركات دوو ركاتیان كرد. لەسەر ئەم شێوەیەش حەسەن فەتوای داوە. ئەبو داود دەڵێت: هەروەها لە نوێژی شێوانیش دا بەم شێوەیە: پێشنوێژ شەش ركات دەكات، دوو كۆمەڵەكەش هەریەكی سێ ركات سێ ركات. ئەبو داود دەڵێت: یەحیای كوڕی (أبی كَثِیر)، لە ئەبو سەلەمەوە، لە جابرەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم بە هەمان شێوە گێڕاویەتیەوە، هەروەها سولەیمانی یەشكوریش، لە جابرەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم.

## باسى نوێژى كەسێ بكەوێتە دواى دوژمنێ بۆ ئەوەى بيكوژێت.

## ٢٨٩ – باب صَلاَةِ الطَّالِبِ.

١٢٤٩ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُنَيْسٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: بَعَثَنِى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى خَالِدِ بْنِ سُفْيَانَ الْهُذَلِيِّ، وَكَانَ نَحْوَ عُرَنَةَ وَعَرَفَاتٍ، فَقَالَ: (اذْهَبْ فَاقْتُلْهُ) قَالَ: فَرَأَيْتُهُ وَحَضَرَتْ صَلاَةُ الْعَصْرِ، فَقُلْتُ: إِنِّى لأَخَافُ أَنْ يَكُونَ بَيْنِى وَبَيْنَهُ مَا إِنْ أُؤَخِّرُ الصَّلاَةَ، فَانْطَلَقْتُ أَمْشِى - وَأَنَا أُصَلِّى أُومِئُ إِيمَاءً – نَحْوَهُ، فَلَمَّا دَنَوْتُ مِنْهُ، قَالَ لِى: مَنْ أَنْتَ؟ قُلْتُ: رَجُلٌ مِنَ الْعَرَبِ، بَلَغَنِى أَنَّكَ تَجْمَعُ لِهَذَا الرَّجُلِ، فَجِئْتُكَ فِى ذَاكَ. قَالَ: إِنِّى لَفِى ذَاكَ، فَمَشَيْتُ مَعَهُ سَاعَةً حَتَّى إِذَا أَمْكَنَنِى عَلَوْتُهُ بِسَيْفِى حَتَّى بَرَدَ.

واتە: لە كوڕى (عَبْد اللّـه)ى كوڕى ئونەيسەوە، لە باوكيەوە دەگێڕنەوە، كە وتويەتى: پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم ناردمى بەدواى خاليدى كوڕى سوفيانى (هذَلىَ)دا كە بەرەو عورنەو عەرەفات دەڕۆيشت، فەرمووى: (بڕۆ بيكوژە). كاتێ كە بەديم كرد كاتى نوێژى عەسربوو، وتم: دەترسم ئەگەر دابەزم نوێژەكەم بكەم لێم دوور بكەوێتەوەو لەدەستم دەربچێت، لەبەر ئەوە

بەرێوە دەڕۆیشتم بەرەو ئەو و نوێژم دەکرد بە ئیشارەت، کاتێ کە لێی نزیك بوومەوە، خالید وتی: تۆ کێی؟ وتم: پیاوێکی عەرەبم، بیستوومە تۆ خەڵك کۆدەکەیتەوە دژی ئەو کابرایە، منیش بۆ ئەوە هاتووم بۆ لات، وتی: بەڵێ خەریکی ئەوەم، ساتێك لەگەڵی ڕۆیشتم هەتا هەلم بۆ هەڵکەوت بە شمشێرەکەم لێم دا هەتا کوشتم.

# باسەکانی نوێژی سوننەت و ژمارەی ڕکاتەکانی.

## ٢٩٠ – تفريع أبواب التَّطَوُّعِ ورَكَعَاتِ السُّنَّةِ.

| |
|---|
| ١٢٥٠ - (صحيح) عَن أُمِّ حَبِيبَةَ، قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ صَلَّى فِي يَوْمٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً تَطَوُّعًا، بُنِيَ لَهُ بِهِنَّ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ) |

واتە: ئوم حەبیبە دەڵێت: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێك لە ڕۆژێکدا دوانزە ڕکات نوێژی سوننەت بکات، خوای گەورە لە بەهەشتداماڵێکی بۆ دروست دەکات).

| |
|---|
| ١٢٥١ - (صحيح) عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَن صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ التَّطَوُّعِ؟ فَقَالَتْ:كَانَ يُصَلِّى قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعًا فِي بَيْتِي، ثُمَّ |

يَخْرُجُ فَيُصَلِّي بِالنَّاسِ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى بَيْتِي فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، وَكَانَ يُصَلِّي بِالنَّاسِ الْمَغْرِبَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى بَيْتِي فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، وَكَانَ يُصَلِّي بِهِمُ الْعِشَاءَ، ثُمَّ يَدْخُلُ بَيْتِي فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، وَكَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ تِسْعَ رَكَعَاتٍ فِيهِنَّ الْوِتْرُ، وَكَانَ يُصَلِّي لَيْلاً طَوِيلاً قَائِمًا، وَلَيْلاً طَوِيلاً جَالِسًا، فَإِذَا قَرَأَ وَهُوَ قَائِمٌ: رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ قَائِمٌ، وَإِذَا قَرَأَ وَهُوَ قَاعِدٌ: رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ قَاعِدٌ، وَكَانَ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَخْرُجُ فَيُصَلِّي بِالنَّاسِ صَلاَةَ الْفَجْرِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واته: (عبدُ الله)ی کوڕی شەقیق دەڵێت: سەبارەت بەنوێژە سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە عائیشەم پرسی؟ وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێش نوێژی نیوەڕۆ لە ماڵەکەی مندا چوار رکات نوێژی سوننەتی دەکرد، لەپاشدا دەردەچوو بۆ مزگەوت بەرنوێژی نوێژی نیوەڕۆی بۆ خەڵکەکە دەکرد، ئینجا دەهاتەوە بۆ ماڵەکەی من و دوو رکات سوننەتی پاش نیوەڕۆی دەکرد، کە نوێژی شێوانیشی بۆ خەڵکەکە دەکرد، لەپاشدا دەهاتەوە بۆ ماڵەکەی من و دوو رکات سوننەتی پاش نوێژی شێوانی دەکرد، کە نوێژی عیشای بۆ خەڵکەکە دەکرد، لەپاشدا دەهاتەوە بۆ ماڵەکەی من و دوو رکات سوننەتی پاش نوێژی عیشای دەکرد، لەشەودا نۆ رکات شەونوێژی دەکرد بە نوێژی سوننەتی وەتریشەوە، هەندێ جار شەوگارێکی درێژ بە پێوە شەونوێژی دەکرد، هەندێ جاریش شەوگارێکی درێژ بە

دانیشتنەوە شەونوێژی دەكرد، ئەگەر بە پێوە قورئانی بخوێندایە بە پێوە ركوعی دەبرد جا دەچووە سەجدەوە، هەروەها ئەگەر بە دانیشتنەوە قورئانی بخوێندایە هەر بە دانیشتنەوە ركوع و سەجدەی دەبرد، كاتێ كە شەبەقی دەدا دوو ركات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی دەكرد، لەپاشدا دەردەچوو بۆ مزگەوت بەرنوێژی نوێژی بەیانی بۆ خەڵكەكە دەكرد.

**١٢٥٢ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي قَبْلَ الظُّهْرِ رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْمَغْرِبِ رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ، وَبَعْدَ صَلاَةِ الْعِشَاءِ رَكْعَتَيْنِ، وَكَانَ لاَ يُصَلِّي بَعْدَ الْجُمُعَةِ حَتَّى يَنْصَرِفَ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ.**

واتە: لە (عبدُ الله)ی كوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە پێش نوێژی نیوەڕۆدا دوو ركات نوێژی سوننەتی دەكرد، وە لەدوای نوێژی نیوەڕۆوە دوو ركات سوننەتی دەكرد، هەروەها لەدوای نوێژی شێوانەوە دوو ركات نوێژی سوننەتی دەكرد لە ماڵەكەی خۆیدا، وە لەدوای نوێژی عیشاوە دوو ركات نوێژی سوننەتی دەكرد، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەدوای نوێژی هەینی نوێژی تری نەدەكرد هەتا دەهاتەوە بۆ ماڵەوە ئەوكاتە دوو ركات نوێژی دوای هەینی دەكرد.

**١٢٥٣ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ لاَ يَدَعُ أَرْبَعًا قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ الْغَدَاةِ.**

واتە: عائیشە رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم هەرگیز ئەم نوێژە سوننەتانەی تەرك نەدەکرد: چوار رکات لەپێش نوێژی نیوەڕۆوە، وە دوو رکاتیش لەپێش نوێژی بەیانیەوە.

## باسی دوو رکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی.

## ٢٩١ - باب رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ.

١٢٥٤ - (صحيح) عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا، قَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَكُنْ عَلَى شَيْءٍ مِنَ النَّوَافِلِ أَشَدَّ مُعَاهَدَةً مِنْهُ عَلَى الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الصُّبْحِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ئەوەندەی لەسەر ئەو دوو رکاتەی پێش نوێژی بەیانی بەردەوام دەبوو لەسەر هیچ نوێژێکی سوننەتی تر بەردەوام نەدەبوو.

# باسی ئەنجامدانی دوو رکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی بەکورتی.

## ٣ - باب فِي تَخْفِيفِهِمَا.

١٢٥٥ - (صحيح) عَن عَائِشَةَ ، قَالَتْ كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُخَفِّفُ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ الْفَجْرِ، حَتَّى إِنِّي لأَقُولُ: هَلْ قَرَأَ فِيهِمَا بِأُمِّ الْقُرْآنِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەوەندە خێرا دوو رکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی دەکرد، هەتا من دەموت: ئایا سورەتی فاتیحەی خوێندووە تیایاندا؟.

١٢٥٦ - (صحيح) عَن أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَرَأَ فِي رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ: (قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ )، وَ (قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ).

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە دوو رکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانیدا، لەدوای سورەتی فاتیحەوە: لە رکاتی یەکەمدا سورەتی: (قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ )ی دەخوێند، وە لە رکاتی دووەمدا سورەتی: (قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ )ی دەخوێند.

١٢٥٧ – (صحيح) عَن أُبو زِيَادَةَ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ زِيَادٍ الْكِنْدِيُّ، عَنْ بِلاَلٍ أَنَّهُ حَدَّثَهُ، أَنَّهُ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِيُؤْذِنَهُ بِصَلاَةِ الْغَدَاةِ، فَشَغَلَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنها بِلاَلاً بِأَمْرٍ سَأَلَتْهُ عَنهُ حَتَّى فَضَحَهُ الصُّبْحُ، فَأَصْبَحَ جِدًّا، قَالَ: فَقَامَ بِلاَلٌ فَآذَنَهُ بِالصَّلاَةِ، وَتَابَعَ أَذَانَهُ، فَلَمْ يَخْرُجْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا خَرَجَ صَلَّى بِالنَّاسِ، وَأَخْبَرَهُ أَنَّ عَائِشَةَ شَغَلَتْهُ بِأَمْرٍ سَأَلَتْهُ عَنهُ، حَتَّى أَصْبَحَ جِدًّا، وَأَنَّهُ أَبْطَأَ عَلَيْهِ بِالْخُرُوجِ، فَقَالَ: (إِنِّي كُنْتُ رَكَعْتُ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ أَصْبَحْتَ جِدًّا. قَالَ: (لَوْ أَصْبَحْتُ أَكْثَرَ مِمَّا أَصْبَحْتُ لَرَكَعْتُهُمَا وَأَحْسَنْتُهُمَا وَأَجْمَلْتُهُمَا).

واتە: لە ئەبو زیادە (عُبَيْدُ اللَّه)ی کوڕی زیادی کیندییەوە، لە بیلالەوە، کە بۆی گێڕاوەتەوە: جارێ چووە بۆلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ ئەوەی ئاگاداری بکاتەوە لەوەی کاتی نوێژی بەیانی هاتووە بێت بۆ مزگەوت بەرنوێژیان بۆ بکات، بەڵام عائیشە رەزای خوای لێ بێ ئیشێکی داوە بەسەریا بە پرسیار لەو بارەوە سەرقاڵی کردوە هەتا رۆژ تەواو رووناك بۆتەوە، راوی وتی: بیلال لەدوای ئەنجامدانی کارەکەی عائیشە هەستا پەیتا پەیتا پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم ئاگادار دەکردەوە کە بێت بۆ نوێژ، بەڵام پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دواکەوت و لەژوورەکەی خۆی دەرنەچوو

بۆ نوێژ، کاتێ کە هات بەرنوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، بیلال پێی ڕاگەیاند کە عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ سەرقاڵی کردوە بۆیە دواکەوت لە ئاگادارکردنەوەی، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (من دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانیم دەکرد). بیلال وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زۆر درەنگ بوو، فەرمووی: (ئەگەر لەمەیش درەنگ تر بوایە من ئەو دوو ڕکاتەم کەلێ چاکتر و جوانتر دەکرد).

١٢٥٨ – (ضعيف) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ تَدَعُوهُمَا وَإِنْ طَرَدَتْكُمُ الْخَيْلُ)

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر بەسواری ئەسپ نیشتونەتە سەرتان ئەم دوو ڕکاتە تەرك مەکەن).

١٢٥٩ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ كَثِيرًا مِمَّا كَانَ يَقْرَأُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ بِ: (ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا) هَذِهِ الآيَةَ، قَالَ: هَذِهِ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى، وَفِي الرَّكْعَةِ الآخِرَةِ بِ: (ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ).

واتە: (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: زۆرجار پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی

بەیانیدا، لەدوای سورەتی فاتیحەوە، لە ركاتی یەكەمدا ئەم ئایەتەی: (ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا )ی دەخوێنن، وە لە ركاتی دووەمدا ئایەتی: (ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ )ی دەخوێنن.

١٢٦٠ - (حسن) عَن أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِي رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ: (ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا) فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى، وَفِي الرَّكْعَةِ الأُخْرَى بِهَذِهِ الآيَةِ: (رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلۡتَ وَٱتَّبَعۡنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ) أَوْ ( إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۖ وَلَا تُسۡـَٔلُ عَنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَحِيمِ ). شَكَّ الدَّرَاوَرْدِيُّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، كە لە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم بیستووە لە دوو ركاتە سونەتەكەی پێش نوێژی بەیانیدا، لەدوای سورەتی فاتیحەوە، لە ركاتی یەكەمدا ئەم ئایەتەی خوێند: (ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا)، وە لە ركاتی دووەمیشدا ئەم ئایەتە: (رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلۡتَ وَٱتَّبَعۡنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ) یان ئەم ئایەتەی خوێند: ( إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۖ وَلَا تُسۡـَٔلُ عَنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَحِيمِ). گومانەكە لە راوی فەرموودەكە دەراوەردییەوەیە.

# باسی راكشان بەرەو قیبلە لەسەر لای راست لەدوای ئەنجامدانی دوو ركات سوننەتەكەی پێش نوێژی بەیانیەوە.

## ٢٩٣ – باب الاضْطِجَاعِ بَعْدَهَا.

١٢٦١ - (صحيح) عَن أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمُ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الصُّـبْحِ فَلْيَضْطَجِعْ عَلَى يَمِينِهِ) فَقَالَ لَهُ مَرْوَانُ بْـنُ الْحَكَـمِ: أَمَا يُجْزِئُ أَحَدَنَا مَمْشَاهُ إِلَى الْمَسْجِدِ حَتَّى يَضْـطَجِعَ عَلَى يَمِينِهِ؟ - قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ فِى حَدِيثِهِ: - قَـالَ: لاَ. قَالَ: فَبَلَغَ ذَلِكَ ابْنَ عُمَرَ فَقَالَ: أَكْثَرَ أَبُو هُرَيْرَةَ عَلَـى نَفْسِهِ! قَالَ: فَقِيلَ لاِبْنِ عُمَرَ: هَـلْ تُنْكِـرُ شَـيْئًا مِمَّـا يَقُولُ؟ قَالَ: لاَ وَلَكِنَّهُ اجْتَرَأَ وَجَبُنَّا. قَـالَ: فَبَلَـغَ ذَلِـكَ أَبَا هُرَيْرَةَ، قَالَ: فَمَا ذَنْبِى إِنْ كُنْتُ حَفِظْتُ وَنَسُوا!.

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر كەسێ لەئێوە دوو ركات سوننەتەكەی پێش نوێژی بەیانی كرد با بەرەو قیبلە لەسەر لای راستی راكشێت). مەروانی كوڕی حەكەم بە ئەبو هورەیرەی وت: ئایا هەر یەكێ لە ئێمە ئەوەندەی بەس نیە كە لەماڵەوە دوو ركات سوننەتەكە بكات و بڕوات بۆ مزگەوت هەتا لەسەر لای راستی

رانەکشێت؟ - (عُبَيْدُ الله) لە فەرموودەکەیدا وتی: - ئەبو هورەیرە وتی: نەخێر ئەوەندەی بەس نیە، راوی وتی: هەواڵەکە گەیشت بە ئیبنو عومەر ئەویش وتی: ئەبو هورەیرە ئەوەندە فەرموودەی زۆر دەگێڕێتەوە زیانی بۆی دەبێت لەڕووی هەڵەو لەبیرچوونەوەوە، بە ئیبنو عومەر وترا: ئایا ئینکاری هیچ شتێ دەکەیت لەوەی کە وتویەتی؟ وتی: نەخێر، بەڵام جەریئە کە ئەو هەموو فەرموودە زۆرە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم ، ئێمەش ترسنۆکین بە نسبەت ئەوەوە کە ئەو هەموو فەرموودە دەگێڕێتەوە ئێمەش فەرموودەی کەم دەگێڕینەوە. راوی وتی: هەواڵەکە گەیشتەوە بە ئەبو هورەیرە، ئەویش وتی: گوناهم چییە من لەبەرم کردووەو ئێوەش لەیادتان چووە.

١٢٦٢ - (صحيح لكن ذكر الحديث والاضطجاع قبل ركعتي الصبح شاذ، والمحفوظ: بعدها كما في رواية الآتية) عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَضَى صَلاَتَهُ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ نَظَرَ: فَإِنْ كُنْتُ مُسْتَيْقِظَةً حَدَّثَنِي، وَإِنْ كُنْتُ نَائِمَةً أَيْقَظَنِي، وَصَلَّى الرَّكْعَتَيْنِ، ثُمَّ اضْطَجَعَ حَتَّى يَأْتِيَهُ الْمُؤَذِّنُ فَيُؤْذِنَهُ بِصَلاَةِ الصُّبْحِ، فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ يَخْرُجُ إِلَى الصَّلاَةِ.

واتە: عائیشە رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کاتێ کە لەشەونوێژ دەبووەوە ئاوڕی ئەدایەوە: ئەگەر بەخەبەر بومایە دەیدواندم، وە ئەگەر لەخەوا بومایە خەبەری دەکردمەوە بۆ ئەوەی نوێژی وەتر بکەم، جا دوو رکات نوێژی دەکرد، لەپاشدا رادەکشا هەتا بانگبێژ دەهات

ئاگاداری دەکردەوە لەکاتی هاتنی نوێژی بەیانی، ئەو کاتە خێرا دوو رکات سونەتی پێش نوێژی بەیانی دەکرد، ئینجا دەردەچوو بۆ نوێژی بەیانی.

**١٢٦٣ - (صحيح) عَن أَبِى سَلَمَةَ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: كَانَ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا صَلَّى رَكْعَتَىِ الْفَجْرِ، فَإِنْ كُنْتُ نَائِمَةً اضْطَجَعَ، وَإِنْ كُنْتُ مُسْتَيْقِظَةً حَدَّثَنِى.**

واتە: ئەبو سەلەمە دەڵێت: عائیشە رەزای خوای لێ بێ وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کاتێ کە دوو رکات سونەتی پێش نوێژی بەیانی دەکرد، ئەگەر لەخەوا بومایە رادەکشا، وە ئەگەر بەخەبەر بومایە دەیدواندم.

**١٢٦٤ - (ضعيف)عَن مُسْلِمِ بْنِ أَبِى بَكْرَةَ، عَن أَبِيهِ قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِصَلاَةِ الصُّبْحِ، فَكَانَ لاَ يَمُرُّ بِرَجُلٍ إِلاَّ نَادَاهُ بِالصَّلاَةِ، أَوْ حَرَّكَهُ بِرِجْلِهِ.**

واتە: لە موسلیمی کوڕی ئەبی بەکرەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە وتویەتی: لە خزمەت پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم دەرچووین بۆ نوێژی بەیانی، دەیدا بەلای هەرکەسێکدا بانگی دەکرد بۆ نوێژ، یان قاچی تێوەدەژەند بۆ ئەوەی خەبەری کاتەوە بۆ نوێژ.

# باسی ئەگەر كەسیٚ هات بۆ مزگەوت پێشنوێژ نوێژی بەیانی بكات دوو ركات سوننەتەكەی پێش نوێژی نەكردبیٚ چی بكات؟

## ٢٩٤ – باب إِذَا أَدْرَكَ الإِمَامَ وَلَمْ يُصَلِّ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ.

١٢٦٥ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي الصُّبْحَ، فَصَلَّى الرَّكْعَتَيْنِ، ثُمَّ دَخَلَ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الصَّلاَةِ فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: (يَا فُلاَنُ أَيَّتُهُمَا صَلاَتُكَ: الَّتِي صَلَّيْتَ وَحْدَكَ، أَوِ الَّتِي صَلَّيْتَ مَعَنَا).

واتە: (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی سەرجیس دەڵێت: پیاوێ هات بۆ مزگەوت بۆ نوێژی بەیانی، لەوكاتەدا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نوێژی بەیانی دەكرد، ئەویش دوو ركات نوێژی كرد، لەپاشدا چووە ریزەوە لەگەڵ پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم بە جەماعەت نوێژی كرد، كاتێ كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە نوێژەكەی بویەوە ئینكاری كردو فەرمووی: (ئەی فلان كەس كام نوێژەیان بۆ خۆت حساب دەكەیت: ئەوەیان كە بە تەنیا كردت، یان ئەوەیان كە لەگەڵ ئێمەدا كردت؟).

١٢٦٦ - (صحيح) عَن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ صَلاَةَ إِلاَّ الْمَكْتُوبَةُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: کاتێ کە قامەت کرا بۆ نوێژی فەرز، جگە لە نوێژە فەرزەکە نابێ هیچ نوێژێکی تر بکرێت.

## باسی ئەوەی لەدەستی چوو کەی بیکاتەوە.

## ٢٩٥ - باب مَنْ فَاتَتْهُ، مَتَى يَقْضِيهَا؟.

١٢٦٧ - (صحيح) عَن قَيْسِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلاً يُصَلِّي بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ رَكْعَتَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (صَلاَةُ الصُّبْحِ رَكْعَتَانِ). فَقَالَ الرَّجُلُ: إِنِّي لَمْ أَكُنْ صَلَّيْتُ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا فَصَلَّيْتُهُمَا الآنَ، فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: قەیسی کوڕی عەمر دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پیاوێکی بینی دوو رکات نوێژی دوای نوێژی بەیانی کرد، پێی فەرموو: (نوێژی بەیانی دوو رکاتە). پیاوەکە وتی: من دوو رکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانیم نەکردبو ئێستا ئەوم کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بێدەنگ بوو.

١٢٦٨ - (صحيح بما قبله) عن حَامِدُ بْنُ يَحْيَى الْبَلْخِيُّ قَالَ: قَالَ سُفْيَانُ: كَانَ عَطَاءُ بْنُ أَبِي رَبَاحٍ يُحَدِّثُ بِهَذَا الْحَدِيثِ، عَنْ سَعْدِ بْنِ سَعِيدٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَى عَبْدُ رَبِّهِ وَيَحْيَى ابْنَا سَعِيدٍ هَذَا الْحَدِيثَ مُرْسَلاً، أَنَّ جَدَّهُمْ زَيْدًا صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: حامیدی کوڕی یەحیای بەڵخی دەڵێت: سوفیان وتی: (عَطاء)ی کوڕی ئەبو رەباح فەرموودەی پێشوی گێڕاوەتەوە، لە سەعدی کوڕی سەعیدەوە. ئەبو داود دەڵێت: (عَبدُ رَبّه) و یەحیا کوڕانی سەعید فەرموودەی پێشویان بە (مُرسَل)ی گێڕاوەتەوە، کە زەیدی باپیریان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم نوێژی کردوە.

# باسی چوار ركات سوننەتی پێش نوێژی نیوەڕۆو چوار ركاتی پاش نیوەڕۆ.

## ٢٩٦ – باب الأَرْبَعُ قَبْلَ الظُّهْرِ وَبَعْدَهَا.

١٢٦٩ – (صحيح) عَن عَنبَسَةَ بْنِ أَبِى سُفْيَانَ قَالَ: قَالَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ زَوْجُ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ حَافَظَ عَلَى أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَأَرْبَعٍ بَعْدَهَا حَرُمَ عَلَى النَّارِ)

وتە: عەنبەسەی كوڕی ئەبو سوفیان دەڵێت: ئوم حەبیبەی خێزانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەركەسێك پارێزگاری بكات لە چوار ركات سوننەتی پێش نوێژی نیوەڕۆ و چوار ركاتی پاش نیوەڕۆ و بەردەوام بێت لەسەریان، ئەوە جەستەی لە ئاگری دۆزەخ حەرام دەبێت).

١٢٧٠ – (حسن دون قوله: (لَيسَ فِيهِنَّ تَسلِيمٌ)) عَن أَبِى أَيُّوبَ، عَنِ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (أَرْبَعٌ قَبْلَ الظُّهْرِ لَيْسَ فِيهِنَّ تَسْلِيمٌ: تُفْتَحُ لَهُنَّ أَبْوَابُ السَّمَاءِ)

واتە: لە ئەبو ئەیوبەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: چوار ركات سوننەتی پێش نوێژی نیوەڕۆی ئینسان بەبێ سەلام

دانـەوە لـەنێوانیادا: دەبنـە هـۆى كردنـەوەى دەرگاكـانى ئاسمـان بـۆى واتـە زوو قبولْ دەكرێن لەلايەن خواى پەروەردگارەوە.

## باسى سوننەتى پێش نوێژى عەسر.

## ٢٩٧ – باب الصَّلاَةِ قَبْلَ الْعَصْرِ.

١٢٧١ - (حسن) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ: (رَحِمَ اللَّهُ امْرَأً صَلَّى قَبْلَ الْعَصْرِ أَرْبَعًا)

واتە: لە ئيبنو عومـەرەوە رەزاى خوايـان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە وتويـەتى: پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويـەتى: رەحمـەتى خـوا لـەو كەسـە بێ لەپێش نوێژى عەسر چوار ركات نوێژى سوننـەت دەكات.

١٢٧٢ - (حسن لكن بلفظ: (أربع ركعات) ) عَنْ عَلِيٍّ عَلَيْهِ السَّلاَمُ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّى قَبْـلَ الْعَصْـرِ رَكْعَتَيْنِ.

واتە: پێشەوا عەلى رەزاى خواى لـێ بـێ دەڵێـت: پێغەمبـەرى خـوا صـلى الله عليه وسلم لەپێش نوێژى عەسردا دوو ركات نوێژى سوننەتى دەكرد.

## باسی سوننەتی دوای نوێژی عەسر.

## ٩ - باب الصَّلاَةِ بَعْدَ الْعَصْرِ.

١٢٧٣ - عَن كُرَيْبٍ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَزْهَرَ وَالْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ أَرْسَلُوهُ إِلَى عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالُوا: اقْرَأْ عَلَيْهَا السَّلاَمَ مِنَّا جَمِيعًا وَسَلْهَا عَنِ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ؟ وَقُلْ: إِنَّا أُخْبِرْنَا أَنَّكِ تُصَلِّينَهُمَا، وَقَدْ بَلَغَنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنهُمَا!.فَدَخَلْتُ عَلَيْهَا فَبَلَّغْتُهَا مَا أَرْسَلُونِي بِهِ، فَقَالَتْ: سَلْ أُمَّ سَلَمَةَ: فَخَرَجْتُ إِلَيْهِمْ فَأَخْبَرْتُهُمْ بِقَوْلِهَا فَرَدُّونِي إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ بِمِثْلِ مَا أَرْسَلُونِي بِهِ إِلَى عَائِشَةَ. فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْهَى عَنهُمَا، ثُمَّ رَأَيْتُهُ يُصَلِّيهِمَا أَمَّا حِينَ صَلاَّهُمَا: فَإِنَّهُ صَلَّى الْعَصْرَ، ثُمَّ دَخَلَ - وَعِنْدِي نِسْوَةٌ مِنْ بَنِي حَرَامٍ مِنَ الأَنْصَارِ – فَصَلهمَا، فَأَرْسَلْتُ إِلَيْهِ الْجَارِيَةَ فَقُلْتُ: قُومِي بِجَنْبِهِ فَقُولِي لَهُ: تَقُولُ أُمُّ سَلَمَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَسْمَعُكَ تَنْهَى عَن هَاتَيْنِ

الرَّكْعَتَيْنِ، وَأَرَاكَ تُصَلِّيهِمَا؟ فَإِنْ أَشَارَ بِيَدِهِ فَاسْتَأْخِرِي عَنْهُ. قَالَتْ: فَفَعَلَتِ الْجَارِيَةُ، فَأَشَارَ بِيَدِهِ، فَاسْتَأْخَرَتْ عَنْهُ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: (يَا بِنْتَ أَبِي أُمَيَّةَ، سَأَلْتِ عَنِ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ، إِنَّهُ أَتَانِي نَاسٌ مِنْ عَبْدِ الْقَيْسِ بِالإِسْلاَمِ مِنْ قَوْمِهِمْ، فَشَغَلُونِي عَنِ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ، فَهُمَا هَاتَانِ)

واتە: لە کورەیبی خزمەتکاری ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە (عَبْدُ الله)ی کوڕی عەباس رەزای خوایان لێ بێ لەگەڵ (عَبْدُ الرَّحمَن)ی کوڕی ئەزهەر و میسوەری کوڕی مەخرەمە ناردویانە بۆلای عائیشەی خێزانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، وتیان: سەلامی ئێمەی پێ بگەیەنەو پرسیاری لێ بکە سەبارەت بە دوو رکات سوننەتی دوای نوێژی عەسر؟ پێی بڵێ: هەواڵمان پێ گەیشتوە کە تۆ ئەو دوو رکاتە دەکەی، بێگومان پێشیان راگەیاندوین کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لەدوو رکاتی دوای نوێژی عەسر!. کورەیب وتی: چوومە خزمەتی عائیشە بۆ ئەو کارەی کە ناردمیان بۆی پێم راگەیاند، ئەویش وتی: بڕۆ لە ئوممو سەلەمە بپرسە، چومەوە بۆ لایان هەواڵی وتەکەی عائیشەم پێ راگەیاندن، ئەوانیش گەڕاندمیانەوە بۆلای ئوممو سەلەمە وەك چۆن پێشتر ناردمیان بۆلای عائیشە. چووم بۆلای ئوممو سەلەمە لێم پرسی؟ ئەویش وتی: لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیستوە نەهی کرد لە دوو رکاتی دوای نوێژی عەسر! لەپاشدا بینیم کردنی، بەڵام کاتێ کە کردنی نوێژی عەسری کردبو، لەپاشدا هاتەوە بۆ ماڵەوە – لەوکاتەدا چەند ئافرەتێکی هۆزی حەرامم لە ئەنصار لەلا بوو – لە ماڵەوە دوو رکات نوێژی کرد، کەنیزەکەم نارد بۆلای

وتم: هەستە بڕۆ تەنیشتیەوە پێی بڵێ: ئوممو سەلەمە دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! گوێم لێت بوو نەهیت كرد لەدوو ركاتەی دوای نوێژی عەسر، كەچی ئێستا دەبینم دەیانكەیت؟ ئەگەر بەدەستی ئاماژەی بۆ كردی بگەڕێرە دواوە، وتی: كەنیزەكەكە كارەكەی كرد، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەدەستی ئاماژەی بۆ كرد كە بگەڕێتەوە بۆ دواوە و واز لەو باسە بێنێ، ئەویش گەڕایەدواوە، كاتێ كە لە نوێژ بویەوە فەرمووی: (ئەی كچی ئەبو ئومەییە، سەبارەت بەو دوو ركاتەی دوای نوێژی عەسر كردم پرسیارت كرد؟ ئەوە كۆمەڵێ لەهۆزی (عَبْدِ الْقَيْس) هاتن بۆلام و سەرقاڵیان كردم دوو ركاتی دوای نوێژی نیوەڕۆم نەكرد، ئەو دوو ركاتە ئەوان بوون).

## باسی ئەوەی رێگەی داوە بە ئەنجامدانی دوو ركاتی دوای نوێژی عەسر لەكاتێكدا كە خۆر بەرز بێت.

## ٢٩٩ – باب مَنْ رَخَّصَ فِيهِمَا إِذَا كَانَتِ الشَّمْسُ مُرْتَفِعَةً.

**١٢٧٤ - (صحيح) عَن عَلِيّ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الصَّلاَةِ بَعْدَ الْعَصْرِ، إِلاَّ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ.**

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی كردوە لە نوێژكردنی دوای عەسر، تەنها ئەو كاتە نەبێت كە خۆر بەرز بوبێتەوە.

١٢٧٥ - (ضعيف) عَن عَلِيّ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّى فِى إِثْرِ كُلِّ صَلاَةٍ مَكْتُوبَةٍ رَكْعَتَيْنِ، إِلاَّ الْفَجْرَ وَالْعَصْرَ.

واتە: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەدوای هەموو نوێژێکی فەرزەوە دوو ڕکات نوێژی سوننەتی دەکرد، جگە لە نوێژی بەیانی و نوێژی عەسر.

١٢٧٦ - (صحيح) عَن ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: شَهِدَ عِنْدِى رِجَالٌ مَرْضِيُّونَ فِيهِمْ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، وَأَرْضَاهُمْ عِنْدِى عُمَرُ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ صَلاَةَ بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَلاَ صَلاَةَ بَعْدَ صَلاَةِ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ)

واتە: ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: چەند کەسێ ئەم فەرموودەیان بۆ ڕوون کردمەوە گومان لە دین و ڕاستگۆییان ناکرێت، چاکترینیان لای من پێشەوا عومەر بوو ڕەزای خوای لێ بێ، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لەپاش نوێژی بەیانی نوێژی تر ناکرێت هەتا ڕۆژ هەڵدێت و بە ئەندازەی ڕمێك یان دوو ڕم بەرزدەبێتەوە، وە لەپاش نوێژی عەسریش نوێژ ناکرێت تاکو ڕۆژ ئاوا دەبێت).

١٢٧٧ - (صحيح دون جملة (جَوْفُ اللَّيلِ) ) عَـنْ عَمْـرِو بْـنِ عَبَسَـةَ السُّلَمِيِّ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّـهِ أَيُّ اللَّيْـلِ أَسْـمَعُ؟ قَالَ: (جَوْفُ اللَّيْلِ الآخِرُ، فَصَلِّ مَا شِئْتَ، فَإِنَّ الصَّلاَةَ مَشْهُودَةٌ مَكْتُوبَةٌ، حَتَّى تُصَلِّيَ الصُّبْحَ، ثُمَّ أَقْصِرْ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ فَتَرْتَفِعَ قِيسَ رُمْحٍ، أَوْ رُمْحَـيْنِ، فَإِنَّهَـا تَطْلُعُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ، وَتُصَلِّي لَهَا الْكُفَّارُ، ثُمَّ صَـلِّ مَا شِئْتَ فَإِنَّ الصَّلاَةَ مَشْهُودَةٌ مَكْتُوبَةٌ، حَتَّـى يَعْـدِلَ الرُّمْحُ ظِلَّهُ، ثُمَّ أَقْصِرْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ تُسْجَرُ وَتُفْتَحُ أَبْوَابُهَا، فَإِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ فَصَـلِّ مَـا شِـئْتَ، فَـإِنَّ الصَّـلاَةَ مَشْهُودَةٌ، حَتَّى تُصَلِّيَ الْعَصْرَ، ثُمَّ أَقْصِرْ حَتَّى تَغْـرُبَ الشَّمْسُ، فَإِنَّهَا تَغْرُبُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ، وَيُصَلِّي لَهَـا الْكُفَّارُ)

واتە: عەمری کوڕی عەبەسەی سولەمی دەڵێت: وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم چ کـاتێکی شـەو نوێـژو پاڕانـەوە باشـتر گـیرا دەبێـت؟ فەرمووی: (نوێژی ناوەڕستی کۆتایی شەو ئیتر چەند ئارەزوو دەکەی نوێژ بکە، چونکە نوێژی ئەم کاتـە وەرگیراوەو مەلائیکـە ئامـادە دەبـن و دەبنـە شـایەت و پاداشتەکەی دەنوسن هەتا نوێژی بەیانی دەکرێت، لەپاشدا وازبێنـە هـەتا خـۆر هەڵدێ و بە ئەندازەی رمێك یـان دوو رم بەرزدەبێتـەوە، چـونکە لـەنێوان دوو شاخەی شەیتانەوە خۆر هەڵدێ و بێ بڕواکـان لەوکاتـەدا سـەجدەی بـۆ دەبـەن، ئینجا چەند ئارەزوو دەکەی نوێژ بکە، چونکە لەو کاتەدا وەرگیراوەو مەلائیکـە

ئامادە دەبن و دەبنە شایەت و پاداشتەكەی دەنوسن، ئیتر نوێژ بكە هەتا سێبەری رم بە ئەندازەی خۆی لێ دێت، لەپاشدا وازبێنە چونكە لەوكاتەدا دۆزەخ وەك تەنور دادەخرێ و جۆش دەسەنێ و دەرگاكانی دەكرێنەوە، بەلام كە خۆرلایدا لە ناوەڕاستی ئاسمان ئیتر چەند ئارەزوو دەكەی نوێژ بكە، هەتا نوێژی عەسر دەكەیت، ئینجا وازبێنە هەتا خۆر ئاوادەبێت لەنێوان دوو شاخەی شەیتانەوە ئاوادەبێ و لەوكاتەدا بێ بڕواكان سەجدەی بۆ دەبەن).

١٢٧٨ - (صحيح) عَن يَسَارٍ مَوْلَى ابْنِ عُمَرَ قَالَ: رَآنِي ابْنُ عُمَرَ وَأَنَا أُصَلِّي بَعْدَ طُلُوعِ الْفَجْرِ، فَقَالَ: يَا يَسَارُ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ عَلَيْنَا وَنَحْنُ نُصَلِّي هَذِهِ الصَّلاَةَ، فَقَالَ: (لِيُبَلِّغْ شَاهِدُكُمْ غَائِبَكُمْ: لاَ تُصَلُّوا بَعْدَ الْفَجْرِ إِلاَّ سَجْدَتَيْنِ)

واتە: یەساری خزمەتكاری ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: ئیبنو عومەر بینی لەدوای دەركەوتنی فەجر نوێژ دەكەم، وتی: ئەی یەسار پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم جارێ لەم كاتەدا هاتە لامان نوێژمان دەكرد فەرمووی: (با ئەوانەی ئامادەن لێرەدا غائیبەكان ئاگادار بكەنەوە: كە لەدوای دەركەوتنی فەجر نوێژ مەكەن جگە لە دوو ركات نوێژی بەیانی).

١٢٧٩ - (صحيح) عَنِ الأَسْوَدِ وَمَسْرُوقٍ قَالاَ: نَشْهَدُ عَلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا أَنَّهَا قَالَتْ: مَا مِنْ يَوْمٍ يَأْتِي عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، إِلاَّ صَلَّى بَعْدَ الْعَصْرِ رَكْعَتَيْنِ.

واتە: ئەسوەد و مەسروق دەڵێن: ئاگامان لە عائیشە بوو ڕەزای خوای لێ بێ کە وتی: هیچ ڕۆژێ نەبووە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەدوای نوێژی عەسرەوە دوو ڕکات نوێژی نەکردبێ.

١٢٨٠ - (ضعيف) عَنْ ذَكْوَانَ مَوْلَى عَائِشَةَ، أَنَّهَا حَدَّثَتْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي بَعْدَ الْعَصْرِ، وَيَنْهَى عَنهَا، وَيُوَاصِلُ، وَيَنْهَى عَنِ الْوِصَالِ.

واتە: لە (ذكوان)ی خزمەتکاری عائیشەوە هاتووە، کە عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ بۆی گێڕاوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەدوای نوێژی عەسر نوێژی دەکرد، لەپاشدا نەهی لێ کرد، بەردەوام دەبوو لەسەر ڕۆژووگرتن - بۆ نمونە ڕۆژێ بەڕۆژوو دەبوو بەبێ ئەوەی بەربانگ بکاتەوە ڕۆژی دواتری دەگرت - لەپاشدا نەهی لێ کرد.

## باسی ئەنجامدانی نوێژی سوننەت لەپێش نوێژی شێوانەوە.

## ٣٠٠ - باب الصَّلاَةِ قَبْلَ الْمَغْرِبِ.

١٢٨١ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ الْمُزَنِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (صَلُّوا قَبْلَ الْمَغْرِبِ رَكْعَتَيْنِ) ثُمَّ

قَالَ: (صَلُّوا قَبْلَ الْمَغرِبِ رَكْعَتَيْنِ لِمَنْ شَاءَ) خَشْـيَةَ أَنْ يَتَّخِذَهَا النَّاسُ سُنَّةً.

واته: (عَبْدُ الله)ى كوڕى موزەنی دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لەپێش نوێژی شێوانەوە دوو ركات نوێژی سوننەت بكەن). لەپاشدا فەرمووی: (لەپێش نوێژی شێوانەوە دوو ركات نوێژی سوننەت بكەن ئەوەی كە ئارەزووی لێ یە). بۆیە ئەوەی فەرموو لەترسی ئەوەی نەوەك خەڵك بیكەن بە سوننەت و بەردەوام بن لەسەری.

١٢٨٢ - (صحيح) عَن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: صَلَّيْتُ الـرَّكْعَتَيْنِ قَبْـلَ الْمَغْرِبِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ، قَالَ: قُلْتُ لأَنَسٍ: أَرَآكُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: نَعَمْ، رَآنَا فَلَمْ يَأْمُرْنَا، وَلَمْ يَنْهَنَا.

واته: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم لەپێش نوێژی شێوان دوو ركات نوێژی سوننەتم كرد، راوی وتی: بە ئەنەسم وت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بینینی؟ وتی: بەڵێ، بینینی نە فەرمانی پێ كردین، نە نەهیشی لێ كردین، واته بێدەنگ بوو.

١٢٨٣ - (صحيح) عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاَةٌ، بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاَةٌ لِمَنْ شَاءَ)

واتە: لە (عَبدُ اللـه)ی کوڕی موغەففەلـەوە دەگێڕنـەوە، کـە وتویـەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویـەتی: (لـە نێوان هەموو بـانگ و قامەتێکدا نوێژی سوننەت هەیە، لە نێوان هەموو بـانگ و قامەتێکدا نوێـژی سوننەت هەیە هەرکەس ئارەزووی لێ بێت).

١٢٨٤ - (ضعيف) عَن طَاوُسٍ قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عُمَرَ عَنِ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْمَغْرِبِ؟ فَقَالَ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّيهِمَا، وَرَخَّصَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ.

واتە: (طاوُس) دەڵێت: سەبارەت بە ئەنجامـدانی دوو ڕکات نوێـژی سـوننەت لەپێش نوێـژی شێوانەوە لـە ئیبنـو عومـەریان ڕەزای خوایـان لـێ بـێ پرسـی؟ ئـەویش وتـی: لەسـەردەمی پێغەمبـەری خـوادا صلى الله عليه وسلم کەسێکم نەدیوە دوو ڕکات نوێـژی سـوننەتی لـەپێش نوێـژی شێوانەوە کردبێـت، بـەڵام ڕێگەی دابوو بە دوو ڕکات سوننەتی دوای نوێژی عەسر.

## باسی ئەنجامدانی نوێژی چێشتەنگاو.

## ٣٠١- باب صَلاَةِ الضُّحَى.

١٢٨٥ - (صحيح) عَن أَبِي ذَرّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (يُصْبِحُ عَلَى كُلِّ سُلاَمَى مِنِ ابْنِ آدَمَ صَدَقَةٌ، تَسْلِيمُهُ عَلَى مَنْ لَقِيَ صَدَقَةٌ، وَأَمْرُهُ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ، وَنَهْيُهُ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ، وَإِمَاطَتُهُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ، وَبُضْعَةُ أَهْلِهِ صَدَقَةٌ، وَيُجْزِئُ مِنْ ذَلِكَ كُلِّهِ رَكْعَتَانِ مِنَ الضُّحَى) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَحَدِيثُ عَبَّادٍ أَتَمُّ وَلَمْ يَذْكُرْ مُسَدَّدٌ الأَمْرَ وَالنَّهْيَ، زَادَ فِي حَدِيثِهِ: وَقَالَ: كَذَا وَكَذَا، وَزَادَ ابْنُ مَنِيعٍ فِي حَدِيثِهِ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَحَدُنَا يَقْضِي شَهْوَتَهُ وَتَكُونُ لَهُ صَدَقَةٌ؟ قَالَ: (أَرَأَيْتَ لَوْ وَضَعَهَا فِي غَيْرِ حِلِّهَا، أَلَمْ يَكُنْ يَأْثَمُ؟)

واتە: لە (أَبِي ذَرّ)ەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: هەموو رۆژێك گشت جومگە و ئێسکێکی ئادەمیزاد خێرێکی دەکەوێتە سەر: گەیشت بە هەر موسوڵمانێ سەلامی لێ بکات خێرێکە، فەرمان بەچاکە خێرێکە، قەدەغەکردنی خراپە خێرێکە، شتێ ببێ بەهۆی ئازار لەڕێگەی خەڵکدا لایبات خێرێکە، بچێتە لای خێزانی خۆی

خێریکە، ئەنجامدانی دوو رکات نوێژی چێشتەنگاو بە قەد ئەمانە هەموویان خێری هەیە. ئەبو داود دەڵێت: فەرمودەکەی عەبباد تەواو ترە، موسەددەد باسی فەرمان بەچاکە خێریکە، قەدەغەکردنی خراپە خێریکەی نەکرد، لە فەرمودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: وتی: ئەوەو ئەوە، ئیبنو مونیع لە فەرمودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، یەکێ لە ئێمە کە دەچێتە لای خێزانی ئارەزووی خۆی جێ بەجێ دەکات بە خێر و چاکە بۆی دەنوسرێت؟ فەرمووی: (ئەی ئەگەر لە غەیری جێگەی خۆیدا واتە لە جێگەی حەرامدا جێ بەجێی بکات ئایا گوناهبار نابێت؟) - بێگومان پێی گوناهبار دەبێت - کەواتە بەو شێوەیە ئەگەر لە حەڵاڵدا جێبەجێی بکات بە خێر و چاکە بۆی دەنوسرێت.

١٢٨٦ - (صحيح) عَن أَبِي الأَسْوَدِ الدُّؤَلِيِّ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ أَبِي ذَرّ قَالَ: (يُصْبِحُ عَلَى كُلِّ سُلاَمَى مِنْ أَحَدِكُمْ فِي كُلِّ يَوْمٍ صَدَقَةٌ، فَلَهُ بِكُلِّ صَلاَةٍ صَدَقَةٌ، وَصِيَامٍ صَدَقَةٌ، وَحَج صَدَقَةٌ، وَتَسْبِيحٍ صَدَقَةٌ، وَتَكْبِيرٍ صَدَقَةٌ، وَتَحْمِيدٍ صَدَقَةٌ) فَعَدَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ هَذِهِ الأَعْمَالِ الصَّالِحَةِ، ثُمَّ قَالَ: (يُجْزِئُ أَحَدَكُمْ مِنْ ذَلِكَ رَكْعَتَا الضُّحَى)

واتە: ئەبو ئەسوەدی دوئەلی دەڵێت: جارێ لەخزمەت (أَبِي ذَرّ)دا بووین وتی: هەموو رۆژێك گشت جومگە و ئێسکێکی کەسێ لە ئێوە خێرو چاکەیەکی دەکەوێتە سەر: هەموو نوێژێ خێریکە، رۆژوو خێریکە، حەج خێریکە، هەموو تەسبیحاتێ(سبحان الله)یەك خێر و چاکەیەکە، هەموو( الله اکبر)ێك خێر و

چاكەیەكە، هەموو سوپاس و ستایش كردنیٚ(الحمد لله)یەك خێـر و چـاكەیەكە، هەموو(لا اله الا الله)یەك چاكەیەكە، فەرمان بەچاكە خێرێكە، قەدەغـەكردنی خراپـە چـاكەیەكە، دوو ركـات نوێـژی چێشـتەنگاو بـە قـەد ئەمانـە هـەموویان خێـری هەیـە. پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم ئـەم كـردەوە چـاكانەی ژمـارد، لەپاشـدا فـەرمووی: (دوو ركـات نوێـژی چێشـتەنگاو بـە قـەد ئەمانـە هەموویان خێری هەیە).

١٢٨٧ - (ضعيف) عَن سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ الْجُهَنِيِّ، عَـن أَبِيـهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَـنْ قَعَـدَ فِي مُصَلاَّهُ حِينَ يَنْصَرِفُ مِنْ صَلاَةِ الصُّبْحِ حَتَّى يُسَبِّحَ رَكْعَتَيِ الضُّحَى لاَ يَقُولُ إِلاَّ خَيْرًا: غُفِرَ لَهُ خَطَايَاهُ وَإِنْ كَانَتْ أَكْثَرَ مِنْ زَبَدِ الْبَحْرِ)

واتە: لە سەهلی كوڕی (مُعَاذ)ی كوڕی ئەنەسـی جوهـەنی، لـە باوكیـەوە، لـە باپیریەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویـەتی: (ئـەو كەسەی لەدوای نوێژی بەیانیەوە لە جێگا نوێژەكەیدا هەتا دوو ركات سوننەتی چێشتەنگاو دەكـات بمێنێتـەوە قسـەی خێـر نـەبێ نـەیكات - یـادی خـوا بكـات - خوای گەورە لە گوناهەكانی خۆش دەبێت با لە كەفی دەریاش زۆرتر بن).

١٢٨٨ - (حسن) عَن أَبِي أُمَامَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (صَلاَةٌ فِي أَثَرِ صَلاَةٍ لاَ لَغْوَ بَيْنَهُمَا، كِتَابٌ فِي عِلِّيِّينَ).

واتە: لە ئەبو ئومامەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەنجامدانی نوێژ لەدوای نوێژ ئەگەر لە نێوانیاندا قسەی پڕوپوچ و دنیایی و کردەوەی خراپە نەکرێت، کردەوەیەکە لەناو دەفتەرێکی بەرزدا دەنوسرێت کە کردەوەی پیاوچاکانی تێدا دەنوسرێت). - واتە وەرگیراوەو مەلائیکە تۆماری دەکەن و بەرزی دەکەنەوە بۆلای خوای گەورە - .

١٢٨٩ - (صحيح) عَنْ نُعَيْمِ بْنِ هَمَّارٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ، يَا ابْنَ آدَمَ، لاَ تُعْجِزْنِي مِنْ أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ فِي أَوَّلِ نَهَارِكَ أَكْفِكَ آخِرَهُ).

واتە: نوعەیمی کوڕی هەممار دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیستوە دەیفەرموو: خوای گەورە دەفەرموێت: (ئەی نەوەی ئادەم چوار رکات نوێژی سەر لەبەیانیان لەدەست خۆت مەدە واتە چوار رکات نوێژم بۆ بکەو یادم بکە، منیش تاکۆتایی ماوەی ئەو رۆژە دەتپارێزم. - مەبەستی ئەبو داود لێرەدا چوار رکات نوێژی چێشتەنگاوە، بەڵام هەندێ لە زانایان پێیان وایە نوێژی بەیانی و دوو رکاتە سوننەتەکەی پێشیەتی - .

١٢٩٠ - (ضعيف) عَنْ أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الْفَتْحِ صَلَّى سُبْحَةَ الضُّحَى ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ، يُسَلِّمُ مِنْ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ يَوْمَ الْفَتْحِ صَلَّى سُبْحَةَ الضُّحَى، فَذَكَرَ مِثْلَهُ. قَالَ ابْنُ السَّرْحِ: إِنَّ أُمَّ هَانِئٍ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَمْ يَذْكُرْ سُبْحَةَ الضُّحَى، بِمَعْنَاهُ.

واتە: ئوم (هانِئ)ی كچی ئەبو (طالِب) دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەڕۆژی رزگاركردنی شاری مەككەدا هەشت ركات نوێژی سوننەتی چێشتەنگاوی كرد، لەهەر دوو ركاتێكدا سەلامی دەدایەوە. ئەبو داود دەڵێت: لە ئەحمەدی كوڕی (صالِح)ەوە فەرموودەی پێشو هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەڕۆژی رزگاركردنی شاری مەككەدا نوێژی چێشتەنگاوی كردوە، راوی (ابْنُ السَّرْحِ) دەڵێت: (أمُّ هانِئ) وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هاتەژوورەوە بۆلام، (ابنُ السَّرْح) فەرموودەی پێشوی بە هەمان مانا گێڕایەوە، بەڵام باسی سوننەتی چێشتەنگاوی نەكرد.

١٢٩١ - (صحيح) عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: مَا أَخْبَرَنَا أَحَدٌ أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى الضُّحَى غَيْرَ أُمِّ هَانِئٍ، فَإِنَّهَا ذَكَرَتْ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ اغْتَسَلَ فِي بَيْتِهَا وَصَلَّى ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ، فَلَمْ يَرَهُ أَحَدٌ صَلاَّهُنَّ بَعْدُ.

واتە: ئیبنو ئەبی لەیلا دەڵێت: بێجگە لە (أمُّ هانِئ) هیچ كەسێ پێی رانەگەیاندوین كە پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم دیبێ نوێژی سوننەتی

چێشتەنگاوی کردبێ، (أمّ هانِئ) گێڕایەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەڕۆژی رزگارکردنی شاری مەککەدا خۆی شتووەو هەشت رکات نوێژی سوننەتی چێشتەنگاوی لەماڵی ئەودا کردوە، دوای ئەو رۆژە ئیتر هیچ کەسێ نەیدیوە ئەم نوێژەی کردبێت.

١٢٩٢ - (صحيح) عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ: هَلْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي الضُّحَى؟ فَقَالَتْ: لاَ، إِلاَّ أَنْ يَجِيءَ مِنْ مَغِيبِهِ، قُلْتُ: هَلْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرِنُ بَيْنَ السُّورَتَيْنِ، قَالَتْ: مِنَ الْمُفَصَّلِ.

واتە: لە (عَبْدُ الله)ی کوڕی شەقیقەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە عائیشەم رەزای خوای لێ بێ پرسی: ئایا پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد؟ وتی: نەخێر، مەگەر لەسەفەر بهاتایەتەوە، وتم: ئایا پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم لەرکاتێکدا دوو سورەتی قورئانی پێکەوە دەخوێند؟ وتی: بەڵێ لە سورەتە کورتەکان.

١٢٩٣ - (صحيح) عَن عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ: مَا سَبَّحَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُبْحَةَ الضُّحَى قَطُّ، وَإِنِّي لأُسَبِّحُهَا، وَإِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيَدَعُ الْعَمَلَ وَهُوَ يُحِبُّ أَنْ يَعْمَلَ بِهِ، خَشْيَةَ أَنْ يَعْمَلَ بِهِ النَّاسُ فَيُفْرَضَ عَلَيْهِمْ.

واتــە: لــە عائیشــەی خێزانــی پێغەمبــەری خــواوە صــلی الله علیــه وســلم دەگێڕنــەوە، کــە وتویــەتی: هــەرگیز نەمــدیوە پێغەمبــەری خــوا صــلی الله علیــه وســلم نوێــژی چێشــتەنگاو بکــات، بــەڵام مــن خــۆم نوێــژی چێشــتەنگاو دەکــەم، زۆرجار پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەردەوام دەبووە لەسـەر کـارێ وە حەزیشی دەکرد بەردەوام بێت لەسەری و ئەنجامی بدات، بەڵام وازی لەو کـارە دەهێنا لەترسی ئەوەی نەوەك خەڵك کاری پێ بکەن و فەرز ببێت لەسەریان.

| |
|---|
| ١٢٩٤ - (صحيح) عن سِمَاكٌ قَالَ: قُلْتُ لِجَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ: أَكُنْتَ تُجَالِسُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: نَعَمْ كَثِيرًا، فَكَانَ لاَ يَقُومُ مِنْ مُصَلاَّهُ الَّذِي صَلَّى فِيهِ الْغَدَاةَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، فَإِذَا طَلَعَتْ قَامَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. |

واتە: سیماکی کوڕی حەرب دەڵێ: بـە جـابری کـوڕی سـەمورەم وت: ئایـا تـۆ ئامادەی دانیشتنەکانی پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم دەبوویـت؟ وتـی: بەڵێ زۆر، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەو شوێنەی کە نوێژی بـەیانی تێدا دەکرد هەڵنەئەسا هەتا خۆر دەرنەکەوتایەو بـەرز نەبوایەتـەوە، کـاتێ کـە خـۆر دەردەکـەوت و بـەرزدەبۆوە ئەوکاتـە هەڵئەسـا - نوێـژی چێشـتەنگاوی دەکردو دەرۆیشت - .

# باسی نوێژی سوننەت دوو رکات دوو رکاتە لەرۆژدا.

## ٣٠٢ – باب فِي صَلاَةِ النَّهَارِ.

١٢٩٥ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَالَ: (صَلاَةُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مَثْنَى مَثْنَى)

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبـەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتی: نوێژی سـوننەتی شـەو و رۆژ دوو رکـات دوو رکات دەکرێت.

١٢٩٦ - (ضعيف) عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَـارِثِ، عَـنِ الْمُطَّلِـبِ، عَـنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ قَـالَ: (الصَّـلاَةُ مَثْنَـى مَثْنَـى، أَنْ تَشَـهَّدَ فِـي كُـلِّ رَكْعَتَـيْنِ، وَأَنْ تَبَـاءَسَ، وَتَمَسْكَنَ، وَتُقْنِعَ بِيَدَيْكَ وَتَقُولَ: اللَّهُمَّ اللَّهُمَّ! فَمَـنْ لَـمْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَهِيَ خِدَاجٌ).، سُئِلَ أَبُـو دَاوُدَ: عَـن صَـلاَةِ اللَّيْلِ مَثْنَى؟ قَالَ: إِنْ شِئْتَ مَثْنَى، وَإِنْ شِئْتَ أَرْبَعًا.

واتـە: لـە (عَبْـدُ اللّـە)ی کـوڕی (حَـارِث)وە، لـە (مُطلِـب)ەوە هـاتووە، کـە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتی: (نوێژی سوننەت دوو رکات دوو رکاتە، لەهەموو دوو رکاتێکدا تەحيات بخوێنێ و سەلام بداتەوە، هەژاری و

گـەردن کەچـی و ئـارامی خـۆی دەربخـات بـۆ خـوای گـەورە و پـەروەرگاری، دەستەکانی بەرز بکاتەوە بلّێ: خودایە خودایە - واتە بلّێ خودایە ئەوەو ئـەوەم پێم ببەخشە، خودایە لێم ببورە - هەرکەس ئەوە نەکات ئەوە نوێژەکەی کامـڵ و تەواو نییە – واتە پاداشتی لەسەر وەرناگرێت). سـەبارەت بـە دوو رکـات دوو رکاتی شەو نوێژ پرسیار کرا لە ئـەبو داود؟ ئـەویش وتـی: ئەگـەر ئـارەزوت لـێ بوو دوو رکات دوو رکات ئـەنجامیان بـدە، وە ئەگـەر ئارەزوویشـت لـێ بـوو چـوار رکات چوار رکات.

## باسی ئەنجامدانی نوێژی تەسبیحات.

## ٣٠٣ – باب صَلاَةِ التَّسْبِيحِ.

١٢٩٧ - (صحيح) عَن ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِلْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ :(يَـا عَبَّـاسُ يَـا عَمَّاهُ، أَلاَ أُعْطِيكَ؟ أَلاَ أَمْنَحُكَ؟ أَلاَ أَحْبُوكَ؟ أَلاَ أَفْعَلُ بِكَ!عَشْرَ خِصَالٍ إِذَا أَنْتَ فَعَلْتَ ذَلِـكَ غَفَـرَ اللَّـهُ لَـكَ ذَنْبَكَ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ، قَدِيمَهُ وَحَدِيثَهُ، خَطَأَهُ وَعَمْدَهُ، صَغِيرَهُ وَكَبِيرَهُ، سِرَّهُ وَعَلاَنِيَتَهُ، عَشْرَ خِصَالٍ. أَنْ تُصَـلِّيَ أَرْبَـعَ رَكَعَاتٍ، تَقْرَأُ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ فَاتِحَـةَ الْكِتَـابِ وَسُـورَةً، فَإِذَا فَرَغْتَ مِنَ الْقِرَاءَةِ فِي أَوَّلِ رَكْعَةٍ وَأَنْتَ قَائِمٌ قُلْتَ: سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ،

خَمْسَ عَشْرَةَ مَـرَّةً، ثُـمَّ تَرْكَـعُ فَتَقُولُهَـا وَأَنْـتَ رَاكِـعٌ عَشْرًا، ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ مِنَ الرُّكُوعِ فَتَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ تَهْوِي سَاجِدًا فَتَقُولُهَا وَأَنْتَ سَاجِدٌ عَشْـرًا، ثُـمَّ تَرْفَـعُ رَأْسَكَ مِنَ السُّجُودِ فَتَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ تَسْجُدُ فَتَقُولُهَا عَشْرًا، ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ فَتَقُولُهَا عَشْرًا، فَـذَلِكَ خَمْـسٌ وَسَبْعُونَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ تَفْعَلُ ذَلِكَ فِي أَرْبَعِ رَكَعَـاتٍ. إِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ تُصَلِّيَهَا فِي كُلِّ يَوْمٍ مَرَّةً فَافْعَلْ، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي كُلِّ جُمُعَةٍ مَرَّةً، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي كُـلِّ شَهْرٍ مَرَّةً، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي كُلِّ سَنَةٍ مَـرَّةً، فَـإِنْ لَـمْ تَفْعَلْ فَفِي عُمُرِكَ مَرَّةً!)

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنـەوە، کە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلمبە عەباسـی کـوڕی (عَبْـد المُطَّلِـب)ی فـەرموو: ئـەی عـەباس ئـەی مامـەگیان دەشـتت فێـر دەکـەم ئەگـەر ئـەنجامیان بـدەیت! خـوای گەورە لە گوناهەکانی ڕابردوو و داهاتووت خۆش دەبێت، گونـاهی کۆن و نـوێ، هەڵە و ئەنقەست، گەورە و بچوك، پەنهان و ئاشـکرا، دەخەسڵەت؟ چوار ڕکات نوێژ بکە لەهەموو ڕکاتێکدا فاتیحە و سورەتێکی تر بخوێنـە کـە تـەواو بوویـت هەر بەپێوە پانزە جار لە دوای فاتیحەوە بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ، وَالحَمْدُ لِلهِ، وَلاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَـرُ)، لەپاشـدا ڕکـوع بـەرەو دەجـاری تـر بیـانڵێ، لەپاشـدا ڕاسـت بەرەوە لە ڕکوع و دەجـاری تـر بیـانڵێرەوە، ئینجـا سـەجدە بـەرەو دەجاری کـە بیـان خوێنـە، هەسـتەرەوە لەسـەجدە لـە نێـوان دانیشـتنی دوو سەجدەکەشـدا

دەجاری تر بیانڵێ، لەپاشدا بچۆرەوە سەجدە و دەجاری تریش بیان خوێنە لەپاشدا لە سەجدە سەر بەرز كەرەوەو دەجاری كەش بیان خوێنە، ئەمەش دەكاتە هەفتاو پێنج جار لەهەر ركاتێكدا، هەر چوار ركاتەكە بەو شێوەیە بكە، "ئەگەر گوناه و تاوانەكانت وەك كەفی دەریا بێت یان بەقەدەر ژمارەی زیخ و چەو و لم بێت خوای گەورە لێت خۆش دەبێ"، ئەگەر ئەتوانی هەموو رۆژێ یەك جار ئەو نوێژە بكە، ئەگەر ناتوانی هەفتەی جارێك، ئەگەر نەتتوانی مانگی جارێ، ئەگەر هەر نەتتوانی ساڵی جارێ، ئەگەر هەر بۆت نەكرا لە هەموو تەمەنتدا جارێك ئەو نوێژە بكە).

١٢٩٨ - (حسن صحيح) عَنْ أَبِي الْجَوْزَاءِ، قَالَ: حَدَّثَنِي رَجُلٌ كَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ يُرَوْنَ أَنَّهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ائْتِنِي غَدًا أَحْبُوكَ وَأُثِيبُكَ وَأُعْطِيكَ). حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ يُعْطِينِي عَطِيَّةً! قَالَ: (إِذَا زَالَ النَّهَارُ فَقُمْ فَصَلِّ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ). فَذَكَرَ نَحْوَهُ، قَالَ: (تَرْفَعُ رَأْسَكَ - يَعْنِي مِنَ السَّجْدَةِ الثَّانِيَةِ - فَاسْتَوِ جَالِسًا، وَلاَ تَقُمْ حَتَّى تُسَبِّحَ عَشْرًا، وَتَحْمَدَ عَشْرًا، وَتُكَبِّرَ عَشْرًا، وَتُهَلِّلَ عَشْرًا، ثُمَّ تَصْنَعُ ذَلِكَ فِي الأَرْبَعِ رَكَعَاتٍ) قَالَ: (فَإِنَّكَ لَوْ كُنْتَ أَعْظَمَ أَهْلِ الأَرْضِ ذَنْبًا غُفِرَ لَكَ بِذَلِكَ). قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ أَسْتَطِعْ أَنْ أُصَلِّيَهَا تِلْكَ السَّاعَةَ؟ قَالَ: (صَلِّهَا مِنَ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ).

واتە: لە ئەبو جەوزائەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی:: پیاوێ کە لە یارانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بوو بۆی گێڕامەوە، راویەکان پێیان وایە کە(عَبْدُ اللّه)ی کوڕی عەمرە رەزای خوایان لێ بێ وتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی فەرمووم: (بەیانی وەرەوە تا خەلاتێکی باشت بکەم). هەتا وام ئەزانی کە خەلاتی مالیم دەکات، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (کاتێ کە خۆر لایدا هەستە چوار رکات نوێژ بکە). جا راوی وەك فەرمودەکەی پێشو گێڕایەوە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (سەرت بەرزکەرەوە – واتە لەسەجدەی دووەم – رێك دانیشە هەڵنەسیتەوە هەتا دە جار دەڵێی: (سُبْحَانَ اللّهِ، وَالْحَمْدُ لِلّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ، وَاللّهُ أَكْبَرُ). لەپاشدا لە هەر چوار رکاتەکە بەو شێوەیە بکە). فەرمووی: (ئەگەر تۆ گوناهبارترین کەسی سەر زەوی بیت بەوە خوا لێت خۆش دەبێت). وتم: ئەی ئەگەر نەمتوانی لەم کاتەدا ئەم چوار رکاتە بکەم؟ فەرمووی: (لەهەر کاتێکی شەو و رۆژدا بۆت کرا ئەنجامیان بدە). – جگە لەو کاتانەی کە نوێژکردن تێیاندا کەراهەتی هەیە - .

١٢٩٩ - (صحيح) عَنْ عُرْوَةَ بْنِ رُوَيْمٍ، حَدَّثَنِي الأَنْصَارِيُّ، أَنَّ رَسُولَ اللّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِجَعْفَرٍ، بِهَذَا الْحَدِيثِ، فَذَكَرَ نَحْوَهُمْ، قَالَ: فِي السَّجْدَةِ الثَّانِيَةِ مِنَ الرَّكْعَةِ الأُولَى، كَمَا قَالَ فِي حَدِيثِ مَهْدِيِّ بْنِ مَيْمُونٍ.

واتە: عوروەی کوڕی روەیم دەڵێت: پیاوێ لە یاریدەدەران بۆی گێڕامەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەم فەرموودەی بە جەعفەر فەرموو، راوی فەرموودەی پێشوی بە هەمان شێوە گێڕایەوە، وتی: (لەسەجدەی دووەمی رکاتی یەکەمدا)، لەهەموو ریوایەتەکاندا بەم شێوەیە باسی سەجدەی دووەم هاتووە.

# باسی ئەنجامدانی دوو رکات نوێژی سوننەت لەدوای نوێژی شێوانەوە لەکوێ دەکرێت لەماڵەوە یان لەمزگەوت؟

## ٣٠٤ رَكْعَتَيِ الْمَغْرِبِ أَيْنَ تُصَلَّيَانِ.

١٣٠٠ - (حسن) عَن كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتَى مَسْجِدَ بَنِي عَبْدِ الأَشْهَلِ فَصَلَّى فِيهِ الْمَغْرِبَ، فَلَمَّا قَضَوْا صَلاَتَهُمْ رَآهُمْ يُسَبِّحُونَ بَعْدَهَا فَقَالَ: (هَذِهِ صَلاَةُ الْبُيُوتِ)

واتە: لە کەعبی کوڕی عوجرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هات بۆ مزگەوتی هۆزی (عَبد الأشهَل) نوێژی شێوانی تێدا کرد، کاتێ کە لێ بونەوە بینینی سوننەتی دوای نوێژی شێوانیان دەکرد فەرمووی: (ئەمە نوێژی ماڵەکانە، واتە باشتر وایە لەماڵەوە ئانجامی بدەن).

١٣٠١- (ضعيف) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُطِيلُ الْقِرَاءَةَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ حَتَّى يَتَفَرَّقَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم درێژەی دەدا بە قورئان خوێندنی دوو ركاتی دوای نوێژی شێوان هەتا خەڵكی مزگەوت بڵاوەیان لێ دەكرد.

١٣٠٢- (ضعيف) عَن سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، مَعْنَاهُ مُرْسَلٌ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ حُمَيْدٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ يَعْقُوبَ يَقُولُ: كلُّ شَيْءٍ حَدَّثْتُكُمْ عَن جَعْفَرٍ (بن أبي المغيرة) ، عَن سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَهُوَ مُسْنَدٌ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: سەعیدی كوڕی جوبەیر فەرمودەی پێشوی گێراوەتەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم بە هەمان مانا بە (مرسل)ی. ئەبو داود دەڵێت: لە موحەممەد كوڕی حومەیدم بیستووە دەیوت: لە یەعقوبم بیستووە دەیوت: هەموو شتێك كە بۆتانی ئەگێڕمەوە لە جەعفەری (كوڕی ئەبو موغیرە)وە، لە سەعیدی كوڕی جوبەیرەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم، (مُسنَد)ە لە ئیبنو عەباسەوە، لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم.

## باسی ئەنجامدانی نوێژی سوننەت لەدوای نوێژی عیشاوە.

## ٣٠٥ – باب الصَّلاَةِ بَعْدَ الْعِشَاءِ.

١٣٠٣- (ضعيف) عَن شُرَيْحِ بْنِ هَانِئٍ، عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا، قَالَ: سَأَلْتُهَا عَن صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: ما صلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْعِشَاءَ قَطُّ فَدَخَلَ عَلَيَّ إِلاَّ صَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، أَوْ سِتَّ رَكَعَاتٍ، وَلَقَدْ مُطِرْنَا مَرَّةً بِاللَّيْلِ فَطَرَحْنَا لَهُ نِطْعًا، فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى ثُقْبٍ فِيهِ يَنْبُعُ الْمَاءُ مِنْهُ، وَمَا رَأَيْتُهُ مُتَّقِيًا الأَرْضَ بِشَيْءٍ مِنْ ثِيَابِهِ قَطُّ.

واتە: شورەیحی کوڕی (هانئ) دەڵێت: سەبارەت بە نوێژی سوننەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە عائیشەم ڕەزای خوای لێ بێ پرسی؟ وتی: هەرگیز نوێژی عیشای نەکردوەو هاتبێتەوە بۆ ماڵەکەی من ئیللا چوار رکات یان شەش رکاتی نەکردبێ، شەوێ باران دەباری راخەرێکی پێستمان بۆ راخست لەسەر زەوی بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بکات، وەك ئەوەی ئێستا چاوم لەو کونەوە بێت کە تییّدا بوو چۆن ئاوی لێ ئەهاتەدەرەوە، هەرگیز پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلم نەدیوە هیچ بەشێکی پۆشاکەکەی لەزەوی دوورخاتەوە، واتە لەنوێژدا پۆشاکەکەی نەدەپاراست لەوەی کە بکەوێتە سەر زەوی.

# باسەکانی شەونوێژ.

# أبواب قيام الليل

## باسی ئەنجامدانی شەونوێژ.

## ٣٠٦ - باب نَسْخِ قِيَامِ اللَّيْلِ وَالتَّيْسِيرِ فِيهِ.

١٣٠٤ - (حسن) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: فِى الْمُزَّمِّلِ (قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا نِّصْفَهُۥ). نَسَخَتْهَا الآيَةُ الَّتِى فِيهَا (عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ). وَ(نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ) أَوَّلُهُ، وَكَانَتْ صَلاَتُهُمْ لأَوَّلِ اللَّيْلِ، يَقُولُ: هُوَ أَجْدَرُ أَنْ تُحْصُوا مَا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ مِنْ قِيَامِ اللَّيْلِ، وَذَلِكَ أَنَّ الإِنْسَانَ إِذَا نَامَ لَمْ يَدْرِ مَتَى يَسْتَيْقِظُ، وَقَوْلُهُ: (وَأَقْوَمُ قِيلًا). هُوَ أَجْدَرُ أَنْ يُفْقَهَ فِى الْقُرْآنِ، وَقَوْلُهُ: (إِنَّ لَكَ فِى ٱلنَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا). يَقُولُ: فَرَاغًا طَوِيلاً.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەم ئایەتەی سورەتی (مزمل): (قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا نِّصْفَهُۥ). واتە: شەو هەستە

(شەونوێژ بكە) مەگەر كەمێكی نەبێت، نیوەی. بەڵگەیە لەسەر واجب بوونی شەونوێژ، بەڵام ئەم ئایەتەی تری هەمان سورەت نەسخی كردۆتەوە، كە دەفەرموێت: (عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْءَانِ). واتە: خوای گەورە زانی كە ئێوە ناتوانن ئەندازەی شەونوێژ رابگرن لەبەرئەوە لێتان خۆشبوو، دەی ئەوەندەی بۆتان ئاسانە لەقورئان دەوری بكەنەوە. وە (نَاشِئَةَ الَّيْلِ). سەرەتای شەوە، یارانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەسەرەتای شەوەوە هەڵئەسان بۆ شەونوێژ، لەسەرەتای شەوەوە چاكتر و شایەنترە بۆ ئەوەی بتوانن هەستن بۆ ئەوەی كە خوا گەورە فەرزی كردوە لەسەرتان پارێزگاری لێ بكەن كە شەونوێژە، چونكە ئینسان ئەگەر خەوت نازانێ كەی خەبەری دەبێتەوە، وە فەرموودەكەی: (وَأَقْوَمُ قِيلًا). چاكتر و شایەنترە بۆ ئەوەی لەقورئان تێبگەن و بە رەوانی بیخوێننەوە، وە فەرموودەكەی: (إِنَّ لَكَ فِي النَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا). دەفەرموێت: فەراغێكی دورو درێژ، واتە ئینسان كاتی هەیە بۆ ئەوەی كار بكات و بخەوێ.

**١٣٠٥ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ أَوَّلُ الْمُزَّمِّلِ كَانُوا يَقُومُونَ نَحْوًا مِنْ قِيَامِهِمْ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، حَتَّى نَزَلَ آخِرُهَا، وَكَانَ بَيْنَ أَوَّلِهَا وَآخِرِهَا سَنَةٌ.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: كاتێ كە سەرەتای سورەتی (مُزَّمِّل) دابەزی یارانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەڵئەسان بۆ شەونوێژ وەك چۆن لە مانگی رەمەزاندا هەڵئەسان، هەتا

کۆتایی سورەتەکە دابەزی - واتە ئیتر خوای گەورە ئاسانی کرد لەسەریان بەو شێوەیە هەڵنەئەسان بۆ شەونوێژ - ، ماوەی نێوان دابەزینی سەرەتای سورەتەکەو کۆتایی دابەزینی سورەتەکە ساڵێك بوو.

## باسی هەستان بۆ شەونوێژ.

## ١٨ – باب قِيَامِ اللَّيْلِ.

١٣٠٦ - (صحيح) عَن أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ إِذَا هُوَ نَامَ ثَلاَثَ عُقَدٍ، يَضْرِبُ مَكَانَ كُلِّ عُقْدَةٍ عَلَيْكَ لَيْلٌ طَوِيلٌ فَارْقُدْ، فَإِنِ اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللَّهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ تَوَضَّأَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ صَلَّى انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَأَصْبَحَ نَشِيطًا طَيِّبَ النَّفْسِ، وَإِلاَّ أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلاَنَ)

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: کەسێ لە ئێوە کاتێ کە دەخەوێت شەیتان سێ گرێ دەدات لەبەشی دواوەی سەری و دەست دەماڵێ بە شوێنی گرێکانداو دەڵێ: بخەوە شەوگارێکی دوورو درێژە راکشێ لێی بەبێ خەم، جا ئەگەر هەستا لەخەو یادی خوای گەورەی کرد گرێیەکیان دەکرێتەوە، ئەگەر دەستنوێژی گرت گرێیەکی تریان دەکرێتەوە، ئەگەر نوێژیشی کرد گرێکەی تریشیان دەکرێتەوە، ئەوکاتە

دڵخۆش و چوست و چالاك دەبێ، ئەگەری واشی نەكرد ئەوا تەمەڵ و سست و پەست و دلگران دەبێ.

١٣٠٧ - (صحيح) عَن يَزِيدَ بْنِ خُمَيْرٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِى قَيْسٍ يَقُولُ: قَالَتْ عَائِشَةُ رضى الله عنها: لاَ تَدَعْ قِيَامَ اللَّيْلِ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ لاَ يَدَعُهُ، وَكَانَ إِذَا مَرِضَ أَوْ كَسِلَ صَلَّى قَاعِدًا.

واتە: یەزیدی كوڕی خومەیر دەڵێت: لە (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی ئەبو قەیسم بیست دەیوت: عائیشە رەزای خوای لێ بێ وتی: هەستان بۆ شەونوێژ تەرك مەكەن و وازی لێ مەهێنن، چونكە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەرگیز تەركی نەدەكرد، ئەگەر نەخۆش بوایە یان ماندو بوایە بە دانیشتنەوە ئەنجامی دەدا.

١٣٠٨ - (حسن صحيح) عَن أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (رَحِمَ اللَّهُ رَجُلاً قَامَ مِنَ اللَّيْلِ، فَصَلَّى وَأَيْقَظَ امْرَأَتَهُ، فَإِنْ أَبَتْ نَضَحَ فِى وَجْهِهَا الْمَاءَ، رَحِمَ اللَّهُ امْرَأَةً قَامَتْ مِنَ اللَّيْلِ، فَصَلَّتْ وَأَيْقَظَتْ زَوْجَهَا، فَإِنْ أَبَى نَضَحَتْ فِى وَجْهِهِ الْمَاءَ)

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (رەحمەتی خوا لەو پیاوەی كە شەو هەستا بۆ

شەونوێژ ژنەکەشی هەڵئەسێنێ جا ئەگەر بەگوێی نەکرد یان خەو بەری نەدا یا تەمەڵی کرد ئاو دەپژێنێ لەدەم و چاوی بۆ ئەوەی خەبەری کاتەوە هەستێ بۆ شەونوێژ. رەحمەتی خوا لەو ئافرەتەی کە هەڵئەسێ بۆ شەونوێژ مێردەکەشی هەڵئەسێنێ، جا ئەگەر بەگوێی نەکرد یان خەو بەری نەدا یا تەمەڵی کرد ئاو دەپژێنێ لەدەم و چاوی بۆ ئەوەی خەبەری کاتەوە هەستێ بۆ شەونوێژ).

**١٣٠٩ - (صحيح) عَن أَبِي سَعِيدٍ وَأَبِي هُرَيْرَةَ قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا أَيْقَظَ الرَّجُلُ أَهْلَهُ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّيَا - أَوْ صَلَّى - رَكْعَتَيْنِ جَمِيعًا، كُتِبَا فِي الذَّاكِرِينَ وَالذَّاكِرَاتِ)**

واتە: لە ئەبو سەعید و ئەبو هورەیرە دەڵێن: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (ئەگەر پیاو لەشەودا خێزانەکەی خۆی خەبەرکاتەوە پێکەوە شەونوێژ بکەن یان هەریەکەیان بە تەنیا دوو رکات شەونوێژ بۆ خۆی بکات، ئەوا ناویان لە ناو ریزی ئەو ژن و پیاوانەدا دەنوسرێت کە هەمیشە و بەردەوام زیکر و یادی خوا دەکەن).

## باسی باوێشكدان لەنوێژدا.

## ١٩ - باب النُّعَاسِ فِى الصَّلاَةِ.

١٣١٠ - (صحيح) عَن عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ فِى الصَّلاَةِ فَلْيَرْقُدْ حَتَّى يَذْهَبَ عَنهُ النَّوْمُ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا صَلَّى وَهُوَ نَاعِسٌ لَعَلَّهُ يَذْهَبُ يَسْتَغْفِرُ فَيَسُبَّ نَفْسَهُ).

واتە: لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم هاتوو، كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: ئەگەر یەكێك لە ئێوە نوێژی دەكرد لەو كاتەدا خەوی دەهات ئەوا با راكشێ و بخەوێ هەتا خەوەكەی دەڕوا، چونكە ئەگەر كەسێك لە ئێوە بەدەم خەووە باوێشك بدات و نوێژ بكات رەنگە بیەوێت بپاڕێتەوە بۆ خۆی بەڵام لەجیاتی ئەوە جنێو بەخۆی بدات.

١٣١١ - (صحيح) عَن أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنَ اللَّيْلِ، فَاسْتَعْجَمَ الْقُرْآنُ عَلَى لِسَانِهِ، فَلَمْ يَدْرِ مَا يَقُولُ، فَلْيَضْطَجِعْ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر كەسێكتان هەستا بۆ شەونوێژ خەو زۆری بۆ

هێنـا، قورئانەکـەی بـەڕەوانی بـۆ نەدەخوێنـدراو زمـانی تەتەڵـەی دەکـردو نەیئەزانی چی دەڵێت با راکشێت هەتا خەو بەری دەدات).

١٣١٢ - (صحيح دون ذكر(حمنـة) ) عَن أَنَسٍ قَالَ: دَخَلَ رَسُـولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَسْـجِدَ، وَحَبْـلٌ مَمْـدُودٌ بَـيْنَ سَارِيَتَيْنِ، فَقَالَ: (مَا هَذَا الْحَبْلُ) فَقِيـلَ: يَـا رَسُـولَ اللَّهِ، هَذِهِ حَمْنَةُ بِنْتُ جَحْشٍ تُصَلِّى، فَإِذَا أَعْيَتْ تَعَلَّقَتْ بِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لِتُصَلِّ مَا أَطَاقَتْ، فَإِذَا أَعْيَتْ فَلْتَجْلِسْ) قَالَ زِيَادٌ: فَقَالَ: (مَـا هَذَا) فَقَالُوا: لِزَيْنَبَ تُصَلِّى فَـإِذَا كَسِـلَتْ أَوْ فَتَـرَتْ أَمْسَكَتْ بِهِ، فَقَالَ: (حُلُّوهُ) فَقَـالَ: (لِيُصَـلِّ أَحَـدُكُمْ نَشَاطَهُ فَإِذَا كَسِلَ، أَوْ فَتَرَ فَلْيَقْعُدْ)

واتە: لە ئەنەسەوە هاتوو، کە وتویـەتی: جارێ پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیه وسلم چوو بۆ مزگەوت، سەیری کرد وا لـەنێوان دوو کۆڵەکەدا گوریسێك رایەڵکراوە، فەرمووی: ئەم گوریسە چییە؟ وتـرا: ئـەی پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـه وسـلم! ئەمـە گوریسـی حەمنـەی کچـی جەحشـە کـە لەنوێـژکردنی سـوننەتدا مانــدوو وەڕس بــوو خــۆی پــێ دەگــرێ بــۆ ئــەوەی بحەســێتەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فـەرمووی: (ئەوەنـدە توانـای هەیـە بـە پێـوە نوێـژ بکات کاتێ کە توانـای نـەما با دانیشێت). زیـاد راوی فەرمودەکە دەڵێت: فەرمووی: ئەم گوریسە چییە؟ وتیان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـه وسـلم! ئەمـە گوریسـی زەینـەبی خێزانتـە کـە لەنوێـژکردنی سـوننەتدا

ماندوو بوو خوای پێ دەگرێ، فەرمووی: (بیکەنەوەو لایبەن). فەرمووی: (ئەوەندە نوێژی سوننەت بکەن کە گورج و گۆڵن، ئەگەر ماندو بوون و وەڕس و بێ تاقەت بوون دانیشن هەتا دەحەسێنەوە).

## باسی کەسێ شەو خەوت نوێژی سوننەتی شەوی نەکرد چی بکات؟

## ٣٠٩ - باب مَنْ نَامَ عَن حِزْبِهِ.

١٣١٣ - (صحيح) عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ نَامَ عَن حِزْبِهِ، أَوْ عَن شَيْءٍ مِنْهُ، فَقَرَأَهُ مَا بَيْنَ صَلاَةِ الْفَجْرِ وَصَلاَةِ الظُّهْرِ: كُتِبَ لَهُ كَأَنَّمَا قَرَأَهُ مِنَ اللَّيْلِ)

واتە: لە عومەری کوڕی (خطاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ خەوت نوێژی سوننەتی شەوی نەکرد، یان هەندێکی نەکرد، لەنێوان نوێژی بەیانی و نیوەڕۆدا بیانکاتەوە وەك ئەوەی کە بەشەو کردبێتی ئاوەها پاداشتەکەی بۆ دەنوسرێت). - بۆ نمونە کەسێ عادەتی وەها بێت شەوانە یانزە رکات شەونوێژ بکات و ئەوەندەو ئەوەندە قورئانیان تێدا بخوێنێت، ئەگەر شەوێ خەوت و خەبەری نەبووەوە دەتوانێت لەنێوان نوێژی بەیانی و نیوەڕۆدا بیانکاتەوە -

# باسی کەسێ عادەتی وابێ شەونوێژ بکات خەو زۆری بۆ بێنێ و بخەوێت.

## ٣١٠ – باب مَنْ نَوَى الْقِيَامَ فَنَامَ.

١٣١٤ - (صحيح) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ رَجُلٍ عِنْدَهُ رَضِي، أَنَّ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَا مِنِ امْرِئٍ تَكُونُ لَهُ صَلاَةٌ بِلَيْلٍ يَغْلِبُهُ عَلَيْهَا نَوْمٌ إِلاَّ كُتِبَ لَهُ أَجْرُ صَلاَتِهِ، وَكَانَ نَوْمُهُ عَلَيْهِ صَدَقَةً).

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، لە پیاوێکەوە کە لای ئەو پەسەند بوو هاتووە، کە عائیشەی خێزانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێی ڕاگەیاندووەو وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کەسێ عادەتی وابێ شەونوێژ بکات خەو زۆری بۆ بێنێ و بخەوێت خەبەری نەبێتەوەو شەونوێژەکەی بفەوتێ، ئیللا پاداشتی ئەو شەونوێژەی بۆ دەنوسرێت، وە خەوەکەشی بە خێرو سەدەقە بۆ دەنوسرێت).

# باسی چ كاتێكی شەو چاكترە بۆ شەونوێژ.

## ٣١١ – باب أَيُّ اللَّيْلِ أَفْضَلُ.

١٣١٥ - (صحيح) عَن أَبِى هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى سَمَاءِ الدُّنْيَا حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ، فَيَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِى فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ مَنْ يَسْأَلُنِى فَأُعْطِيَهُ؟ مَنْ يَسْتَغْفِرُنِى فَأَغْفِرَ لَهُ؟).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: خوای گەورەو پەروەردگار هەموو شەوێ لەسێیەكی دوایی شەودا دێتەخوارەوە[1] بۆ ئاسمانی دونیا، دەفەرموێت: كێ لێم دەپاڕێتەوەو هاناو هاوارم بۆ دێنێ هەتا بێم بەهاواریەو نزاكانی گیرا بكەم، كێ داوام لێ دەكات هەتا پێی ببەخشم، كێ داوای لێخۆشبونم لێ دەكات تا لێی خۆش ببم.

[1]- دابەزینێ كە شایەنی گەورەیی شكۆمەندی و كەمالی ئەو بێت بەبێ ئەوەی بچوێنرێت بە دروستكراوەكانی و، چۆنیەتیەكەی نازانین خوا خۆی دەیزانێ.

## باسی کاتی هەستانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بۆ شەونوێژ.

## ٣١٢ – باب وَقْتِ قِيَامِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ اللَّيْلِ.

١٣١٦ - (حسن) عَن عَائِشَةَ قَالَتْ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيُوقِظُهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بِاللَّيْلِ، فَمَا يَجِيءُ السَّحَرُ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْ حِزْبِهِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خوای گەورە بەشەو خەبەری دەکردەوە، واتە کۆتایی شەو نەدەهات واتە بەیانی نەدەدا لە بەشە شەونوێژی خۆی دەبووەوە، ئیسراحەتێکی بۆ دەکردو خۆی ئامادە دەکرد بۆ نوێژی بەیانی.

١٣١٧ - (صحيح) عَن مَسْرُوقٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَن صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ لَهَا: أَيُّ حِينٍ كَانَ يُصَلِّي؟ قَالَتْ: كَانَ إِذَا سَمِعَ الصُّرَاخَ قَامَ فَصَلَّى.

واتە: مەسروق دەڵێت: سەبارەت بە شەونوێژی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە عائیشەم پرسی پێم وت: لە چی کاتێکدا شەونوێژی دەکرد؟

وتـی: کـاتێ کـە گـوێی لـە خوێنـدنی کەڵەشـێر دەبـوو ئەوکاتـە هەڵئەسـا بـۆ شەونوێژ –لەولآتی حیجاز زۆرجار کەڵەشێر لەدوای نیوە شەوەوە دەخوێنێت.

١٣١٨ - (صحيح) عَن عَائِشَةَ رَضِـيَ اللهُ عَنْهَـا قَالَـتْ: مَـا أَلْفَـاهُ السَّحَرُ عِنْدِي إِلاَّ نَائِمًا. تَعْنِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە وتویـەتی: هـەرکاتێ نۆبەی من بوایە کۆتایی شەو نەدەهات واتە بەیانی نـەدەدا ئـیللا ئـەو لەخـەودا بوو. واتە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم.

١٣١٩ - (حسن) عَن حُذَيْفَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ إِذَا حَزَبَهُ أَمْرٌ صَلَّى.

واتە: (حُذَيْفَة) دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەرکاتێك بەڵاو ناخۆشیەك رووی تێ بکردایە هانای بۆ نوێژ دەبرد.

١٣٢٠ - (صحيح) عَن رَبِيعَةَ بْنَ كَعْبٍ الأَسْلَمِيَّ قَالَ: كُنْتُ أَبِيتُ مَعَ رَسُولِ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ آتِيـهِ بِوَضُـوئِهِ وَبِحَاجَتِهِ، فَقَالَ: (سَلْنِي) فَقُلْتُ: مُرَافَقَتَكَ فِي الْجَنَّةِ، قَالَ: (أَوَغَيْرَ ذَلِكَ) قُلْتُ: هُـوَ ذَاكَ، قَـالَ: (فَـأَعِنِّي عَلَى نَفْسِكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ)

واتــە: رەبیعــەی کــوڕی کــەعبی ئەســلەمی دەڵێــت: شــەوێ لەخزمــەت پێغەمبــەری خــوادا صــلی الله علیــه وســلم بــووم ئــاوی دەســتنوێژ و پێویســتی ئەوکاتەیم بۆ ئامادە دەکرد، فەرمووی: (داوای شتێکم لێ بکە؟). وتم: لە خوای گەورە بۆم بپاڕێرەوە کە لەبەهەشتدا پێکەوە بین، فەرمووی: (جگە لەوە داوا بکە). وتم: هەر ئەوە، فەرمووی: (دەی تۆش یارمەتیم بدە بە زۆر سەجدە بردن واتە نوێژکردن و پەرستشی زۆر).

١٣٢١ - (صحيح) عَن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ - فِي هَذِهِ الآيَةِ: ( تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ). - قَالَ: كَانُوا يَتَيَقَّظُونَ مَا بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ يُصَلُّونَ، وَكَانَ الْحَسَنُ يَقُولُ: قِيَامُ اللَّيْلِ.

واتــە: لــە ئەنەســی کــوڕی مالیکــەوە دەگێڕنــەوە، کــە ســەبارەت بــەم ئایەتــە: ( تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ). ﴿السجدە:١٦﴾. واتە: تەنشتیان دوور ئەکەوێتەوە لە جێگای خەوتنیان (لەخەو هەڵدەسن شەو نوێژ دەکەن) هاوار و نــزا لــە پــەروەردگاریان دەکــەن بــەترس و هیــواوە و لــەو رۆزی و ســامانەی پێمــان داوون دەبەخشــن. وتویــەتی: یــارانی پێغەمبــەر صــلی الله علیــه وســلم لــەنێوان شــێوان و عیشــادا بەخەبــەر بــوون نوێژیان دەکرد – لەو کاتــەدا چاوەڕێی نوێــژی عیشا بــوون بــۆ ئــەوەی لــەکاتی خۆیــدا بیکــەن و نوێژەکــەیان نەفــەوتێت - ، حەســەنی - بەصــری - دەڵێــت: مەبەست لە ئایەتی: ( تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ ). شەونوێژ.

١٣٢٢ - (صحيح) عَن أَنَسٍ فِي - قَوْلِهِ جَلَّ وَعَزَّ: ( كَانُوا قَلِيلًا مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ). ﴿الذاريات:١٧﴾. - قَالَ: كَانُوا يُصَلُّونَ (فِيمَا بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ)، زَادَ فِي حَدِيثِ يَحْيَى: وَكَذَلِكَ: ( تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ ).

واته: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە سەبارەت بەم ئایەتە: ( كَانُوا قَلِيلًا مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ). واتە: ئەوانە کەمێك لەشەودا دەخەوتن (شەو نوێژیان دەکرد). وتویەتی: یارانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم (لەنێوان شێوان و عیشادا) نوێژیان دەکرد، راوی لە فەرموودەکەی یەحیادا ئەمەی بۆ زیاد کرد: هەروەها: ( تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ). ئەمەش وەك فەرموودەکەی پێشو.

## باسی دەست پێ کردنی شەونوێژ بە دوو رکات.

## ٣١٣ - باب افْتِتَاحِ صَلاَةِ اللَّيْلِ بِرَكْعَتَيْنِ.

١٣٢٣ - (ضعيف وصحيح وقفه) عَن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنَ اللَّيْلِ فَلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ)

واتە: ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (ئەگەر کەسێ لەئێوە هەستا بۆ شەونوێژ با بە دوو رکاتی سوکەڵە دەست پێ بکات).

١٣٢٤ - (صحيح موقوف) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: (إِذَا) بِمَعْنَاهُ، زَادَ: (ثُمَّ لْيُطَوِّلْ بَعْدُ مَا شَاءَ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَى هَذَا الْحَدِيثَ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ وَزُهَيْرُ بْنُ مُعَاوِيَةَ وَجَمَاعَةٌ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ مُحَمَّدٍ أَوْقَفُوهُ عَلَى أَبِي هُرَيْرَةَ، وَكَذَلِكَ رَوَاهُ أَيُّوبُ وَابْنُ عَوْنٍ، أَوْقَفُوهُ عَلَى أَبِي هُرَيْرَةَ، وَرَوَاهُ ابْنُ عَوْنٍ، عَنْ مُحَمَّدٍ قَالَ: فِيهِمَا تَجَوَّزْ.

واتە: ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: مەخلەد راوی فەرمودەکە فەرمودەکەی پێشوی بەهەمان مانا گێراپەوە و ئەمەی بۆ زیاد کرد: (لەدوای ئەو دوو رکاتە سوکەڵە بە ئارەزووی خۆی درێژەی پێ بدات). پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (ئەگەر کەسێ لەئێوە هەستا بۆ شەونوێژ با بە دوو رکاتی سوکەڵە دەست پێ بکات). ئەبو داود دەڵێت: حەمادی کوڕی سەلەمەو زوهێری کوڕی موعاویەو کۆمەڵێ ئەم فەرمودەیان گێڕاوەتەوە لە هیشامەوە، لە موحەممەدەوە لەسەر ئەبو هورەیرە وەستاندویانە، هەروەها ئەیوب و ئیبنو عەون لەسەر ئەبو هورەیرە وەستاندویانە، ئیبنو عەون لە موحەممەدەوە گێڕاویەتیەوە، کە وتی: (فِيهِمَا تَجَوَّزْ)، لەجیاتی (خَفِيفَتَيْنِ)، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بە دوو رکات نوێژی سوکەڵە دەستی پێ کردوە.

١٣٢٥ - (صحيح بلفظ: أيُّ الصلاة؟) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُبْشِيٍّ الْخَثْعَمِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُئِلَ أَيُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (طُولُ الْقِيَامِ).

واتە: لە (عَبْدُ اللە)ی كوڕی حوبشی (خَثْعَمی)ەوە دەگێڕنـەوە، كـە سـەبارەت بە چ كردەوەیە چاكترە لە پێغەمبـەری خودایـان صـلی الله علیـه وسـلم پرسـی؟ فەرمووی: (زۆر مانەوە بە پێوە لەنوێژدا بۆ قورئان خوێندن).

## باسی شەونوێژ دوو ركات دوو ركاتە.

## ٣١٤ - باب صَلاَةِ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى.

١٣٢٦ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ صَلاَةِ اللَّيْلِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (صَلاَةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيَ أَحَدُكُمُ الصُّبْحَ صَلَّى رَكْعَةً وَاحِدَةً تُوتِرُ لَهُ مَا قَدْ صَلَّى)

واتە: لە (عَبْدُ اللە)ی كوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنـەوە، كـە پیـاوێ سـەبارەت بـە شـەونوێژ لـە پێغەمبـەری خـودای صـلی الله علیـه وسـلم پرسـی؟ پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه فـەرمووی: (شـەونوێژ دوو ركـات دوو ركاتە، ئەگەر كەسێ لە ئێوە ترسی بەیانی هەبوو یەك ركات بكات ئەوە دەبێتە نوێژی وەتر بۆ ئەو نوێژانەی كە ئەو شەوە كردونی).

## باسی دەنگ بەرزکردنەوە لەکاتی قورئان خوێندنی شەونوێژدا.

## ٣١٥ – باب فِي رَفْعِ الصَّوْتِ بِالْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ اللَّيْلِ.

**١٣٢٧ - (حسن صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَتْ قِرَاءَةُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى قَدْرِ مَا يَسْمَعُهُ مَنْ فِي الْحُجْرَةِ وَهُوَ فِي الْبَيْتِ.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ کە قورئانی دەخوێند لەماڵەوە ئەوەندە دەنگی بەرزدەکردەوە ئەوانەی لە هۆدەکەدا بوون گوێیان لێی دەبوو، - واتە نەزۆر دەنگی بەرزدەکردەوە، وە نەزۆریش دەنگی نزم دەکردەوە - .

**١٣٢٨ - (حسن) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَتْ قِرَاءَةُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِاللَّيْلِ يَرْفَعُ طَوْرًا، وَيَخْفِضُ طَوْرًا.**

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: قورئان خوێندنی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە شەونوێژدا بەم شێوەیە بوو: هەندێ جار دەنگی بەرزدەکردەوە، وە هەندێ جاریش نزمی دەکردەوە – بەپێی بەرژەوەندی و پێویستی - .

١٣٢٩ - (صحيح) عَن أَبِي قَتَادَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ لَيْلَةً فَإِذَا هُوَ بِأَبِي بَكْرٍ يُصَلِّي يَخْفِضُ مِنْ صَوْتِهِ. قَالَ: وَمَرَّ بِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ وَهُوَ يُصَلِّي رَافِعًا صَوْتَهُ، قَالَ: فَلَمَّا اجْتَمَعَا عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا أَبَا بَكْرٍ مَرَرْتُ بِكَ وَأَنْتَ تُصَلِّي تَخْفِضُ صَوْتَكَ!) قَالَ: قَدْ أَسْمَعْتُ مَنْ نَاجَيْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ! قَالَ: وَقَالَ لِعُمَرَ: (مَرَرْتُ بِكَ وَأَنْتَ تُصَلِّي رَافِعًا صَوْتَكَ) قَالَ: فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أُوقِظُ الْوَسْنَانَ، وَأَطْرُدُ الشَّيْطَانَ. زَادَ الْحَسَنُ فِي حَدِيثِهِ: فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا أَبَا بَكْرٍ، ارْفَعْ مِنْ صَوْتِكَ شَيْئًا) وَقَالَ لِعُمَرَ: (اخْفِضْ مِنْ صَوْتِكَ شَيْئًا)

واتە: ئەبو قەتادە دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم شەوێ لەماڵ دەرچوو بەلای ئەبو بەکردا تێپەڕی خەریکی شەونوێژ بوو بە دەنگی نزم قورئانی دەخوێند، ئەبو قەتادە وتی: بەلای عومەردا تێپەڕی خەریکی شەونوێژ بوو بەدەنگی بەرز قورئانی دەخوێند، ئەبو قەتادە وتی: کاتێ کە هەردوکیان لەخزمەت پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم کۆبونەوە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەی ئەبو بەکر بەلاتدا تێپەڕیم شەونوێژت دەکرد بە دەنگی نزم قورئانت دەخوێند!) وتی: ئەو کەسەی کە من گفتوگۆم لەگەڵی دەکردو لێی دەپاڕامەوە گوێی لێم بوو ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله

علیه وسلم! بۆیە پێویست ناكات دەنگم بەرزكەمەوە. بە عومەریشی فەرموو: (ئەی عومەر بەلاتدا تێپەڕیم شەونوێژت دەكرد بە دەنگی بەرز قورئانت دەخوێند!). راوی وتی: عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خەو لەچاوی خەواڵووەكان دەتۆرێنم و خەبەریان دەكەمەوە، شەیتانیش راودەنێم و دووری دەخەمەوە! حەسەن لە فەرموودەكەیدا ئەمەی بۆ زیاد كرد: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە ئەبو بەكری فەرموو: (ئەی ئەبو بەكر تۆ كەمێ دەنگت بەرزكەرەوە!). بە عومەریشی فەرموو: (ئەی عومەر تۆش كەمێ دەنگت نزمكەرەوە).

١٣٣٠ - (حسن) عَن أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِهَذِهِ الْقِصَّةِ لَمْ يَذْكُرْ فَقَالَ لأَبِي بَكْرٍ: (ارْفَعْ مِنْ صَوْتِكَ شَيْئًا) وَلِعُمَرَ: (اخْفِضْ شَيْئًا) زَادَ: (وَقَدْ سَمِعْتُكَ يَا بِلاَلُ وَأَنْتَ تَقْرَأُ مِنْ هَذِهِ السُّورَةِ وَمِنْ هَذِهِ السُّورَةِ). قَالَ: كَلاَمٌ طَيِّبٌ يَجْمَعُ اللَّهُ تَعَالَى بَعْضَهُ إِلَى بَعْضٍ. فَقَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (كُلُّكُمْ قَدْ أَصَابَ).

واتە: ئەبو هورەیرە ئەم بەسەرهاتەی لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم گێڕاوەتەوە، بەڵام باسی ئەمەی نەكرد: بە ئەبو بەكری فەرموو: (ئەی ئەبو بەكر، تۆ كەمێ دەنگت بەرزكەرەوە). وە بە عومەریشی فەرموو: (ئەی عومەر تۆش كەمێ دەنگت نزمكەرەوە). بەڵام راوی ئەمەی بۆ زیاد كرد: (ئەی بیلال گوێم لێت بوو لەم سورەتەو لەو سورەتەت دەخوێند). بیلال وتی: كەلامێكی باش و جوانە خوای گەورە هەندێكی داوەتە پاڵ هەندێكی تری - واتە قورئان

هـەمووی وتـەی بـاش و جوانـە نـەفس ئـارەزووی دەكـات و ئـەهلی ئیمـان دەیانـەوێت بیخـوێنن و گوێیـان لێـی بێـت، خـوای گـەورە هەنـدێكی كـۆكردەوە داویەتیە پاڵ هەندێكی تری و هەندێكی لەپاڵ هەندێكی تریدا داناوە لەپێناوی پێویستی دا، منیش ئەو ئایەتانە دەخوێنم كە ئارەزووم لێیەتی - ، پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم فـەرمووی: (هـەمووتان پێكاتـان، واتـە: ئـەوەی كـە بەدەنگی بەرز خوێندی، ئەوەشی كە بە دەنگی نزم خوێندی).

١٣٣١ - عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ رَجُلاً قَامَ مِنَ اللَّيْلِ فَقَـرأَ فَرَفَعَ صَوْتَهُ بِالْقُرآنِ، فَلَمَّا أَصْبَحَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَرْحَمُ اللَّـهُ فُلانًـا، كَـأَيِّنْ مِـنْ آيَـةٍ أَذْكَرَنِيهَا اللَّيْلَةَ كُنْتُ قَدْ أَسْـقَطْتُهَا) قَـالَ أَبُـو دَاوُدَ: رَوَاهُ هَارُونُ النَّحْوِيُّ، عَن حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ فِي سُـورَةِ آلِ عِمْرَانَ فِي الْحُرُوفِ: (وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ). ﴿آل عمران:١٤٦﴾.

واتە: عائیشە رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: پیـاوێ لـە شـەونوێژدا بـە دەنگـی بەرز قورئـانی دەخوێنـد، كـاتێ كـە رۆژبـوەوە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم فـەرمووی: (رەحمـەتی خـوا لـە فـلان كـەس بێـت، چـەند ئایـەتێكی یادخستمەوە كە من لەیادم برابونەوە). ئەبو داود دەڵێت: هارونی نەحەوی، لـە حـەمادی كوڕی سـەلەمەوە، گێڕاویەتیـەوە، چـەند ئایـەتێكی لـە سـورەتی: (آلِ عِمْـرَان). ئایـەتی: (وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ). واتـە: ماناكـەی وەك ئـەوەی كـە ئەمـە بێـت لەیادم چووبێت.

١٣٣٢ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: اعْتَكَفَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَسْجِدِ، فَسَمِعَهُمْ يَجْهَرُونَ بِالْقِرَاءَةِ، فَكَشَفَ السِّتْرَ وَقَالَ: (أَلاَ إِنَّ كُلَّكُمْ مُنَاجٍ رَبَّهُ، فَلاَ يُؤْذِيَنَّ بَعْضُكُمْ بَعْضًا، وَلاَ يَرْفَعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ فِي الْقِرَاءَةِ) أَوْ قَالَ: (فِي الصَّلاَةِ)

واتە: لە ئەبی سەعیدەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە مزگەوتدا ئیعتیكافی كردبوو گوێی لێ بوو یارانی بە دەنگی بەرز قورئانیان دەخوێند، پەردەكەی لاداو فەرمووی: (ئاگاداربن بەڕاستی ئێوە هەمووتان لە نوێژدا لەگەڵ پەروەردگاتان ئەدوێن، كەستان ئازاری كەستان مەدەن و كەستان دەنگ بەرز نەكاتەوە بە قورئان خوێندن بەسەر كەسدا). یان فەرمووی: (لەنوێژدا).

١٣٣٣ - (صحيح) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الْجَاهِرُ بِالْقُرْآنِ كَالْجَاهِرِ بِالصَّدَقَةِ، وَالْمُسِرُّ بِالْقُرْآنِ كَالْمُسِرِّ بِالصَّدَقَةِ)

واتە: لە عوقبەی كوڕی عامری جوهەنیەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەو كەسەی بە دەنگی بەرز قورئان بخوێنێت وەك ئەو كەسە وایە بە ئاشكرا خێر و سەدەقە بكات، وە ئەو كەسەی بە دەنگی نزم قورئان بخوێنێت وەك ئەو كەسە وایە بە نهێنی خێر و سەدەقە بكات).

# باسی چۆنیەتی و ژمارەی ركاتەكانی شەونوێژ.

## ٣١٦ - باب فِي صَلاَةِ اللَّيْلِ.

١٣٣٤ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ قَالَت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ عَشْرَ رَكَعَاتٍ، وَيُوتِرُ بِسَجْدَةٍ، وَيَسْجُدُ سَجْدَتَيِ الْفَجْرِ، فَذَلِكَ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەشەودا دە ركات نوێژی دەكرد، لەگەڵ یەك ركات نوێژی وەتر و دوو ركات نوێژی بەیانی، كە دەكاتە سیانزە ركات.

١٣٣٥ - (صحيح وذكر: اضطجاع بعد الوتر، شاذ، والمحفوظ: بعد الفجر) عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً يُوتِرُ مِنْهَا بِوَاحِدَةٍ، فَإِذَا فَرَغَ مِنْهَا اضْطَجَعَ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ.

واتە: لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەشەودا یانزە ركات نوێژی دەكرد، بە

یەك ركات نوێژی وەتر كۆتایی دەهێنا بە شەونوێژ، كاتێ كە لێ دبوەوە لەسەر لای راست روو بە قیبلە رادەكشا.

١٣٣٦ - (صحيح) عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي فِيمَا بَيْنَ أَنْ يَفْرُغَ مِنْ صَلاَةِ الْعِشَاءِ إِلَى أَنْ يَنْصَدِعَ الْفَجْرُ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُسَلِّمُ مِنْ كُلِّ ثِنْتَيْنِ، وَيُوتِرُ بِوَاحِدَةٍ، وَيَمْكُثُ فِي سُجُودِهِ قَدْرَ مَا يَقْرَأُ أَحَدُكُمْ خَمْسِينَ آيَةً قَبْلَ أَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ، فَإِذَا سَكَتَ الْمُؤَذِّنُ بِالأُولَى مِنْ صَلاَةِ الْفَجْرِ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ اضْطَجَعَ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ، حَتَّى يَأْتِيَهُ الْمُؤَذِّنُ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەنێوان لێ بوونەوە لە نوێژی عیشا هەتا ئەو كاتەی كە بەیانی دەدا یانزە ركات شەونوێژی دەكرد، بۆ هەموو دوو ركاتێ سەلامی دەدایەوە، لە كۆتاییدا یەك ركات نوێژی وەتری دەكرد، ئەوەندەی یەكێ لەئێوە پەنجا ئایەت بخوێنێ لە سەجدەدا دەمایەوە، ئەو هێشتا سەری بەرزنەدەكردەوە، كاتێ كە بانگبێژ كۆتایی بە بانگی بەیانی دەهێنا لێرەدا مەبەست لە بانگی دووەمە هەڵئەسا دوو ركات نوێژی سوننەتی سوكەڵەی دەكرد، لەپاشدا لەسەر لای راست روو بە قیبلە رادەكشا، هەتا بانگبێژ دەهات خەبەری دەدایە كە كاتی قامەتە ئەوكاتە هەڵئەسا دوو ركاتە فەرزەكەی بەیانی دەكرد.

١٣٣٧ - (صحيح) عَن عَمْرُو بْنُ الْحَارِثِ وَيُونُسُ بْـنُ يَزِيـدَ، أَنَّ ابْـنَ شِهَابٍ أَخْبَـرَهُمْ – بِإِسْـنَادِهِ وَمَعْنَـاهُ - قَـالَ: وَيُـوتِرُ بِوَاحِدَةٍ، وَيَسْجُدُ سَجْدَةً قَدْرَ مَا يَقْـرَأُ أَحَـدُكُمْ خَمْسِـينَ آيَةً قَبْلَ أَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ، فَإِذَا سَكَتَ الْمُؤَذِّنُ مِنْ صَـلاَةِ الْفَجْرِ وَتَبَيَّنَ لَهُ الْفَجْرُ، وَسَاقَ مَعْنَاهُ. قَـالَ: وَبَعْضُـهُمْ يَزِيدُ عَلَى بَعْضٍ.

واتـە: لـە عـەمری كوڕی (حـارث) و یونوسـی كـوڕی یەزیـدەوە هـاتووە، كـە ئیبنو شیهاب بە هەمان سەنەدو مانا فـەرمودەی پێشوی پـێ ڕاگەیانـدون، ڕاوی وتی: لـە كۆتاییـدا یـەك ركات نوێـژی وەتـری دەكـرد، ئەوەنـدەی یـەكێ لـەئێوە پـــەنجا ئایـــەت بخـــوێنێ لـــە ســـەجدەدا دەمایـــەوە، ئـــەو هێشـــتا ســـەری بەرزنـــەدەكردەوە، كـاتێ كـە بانگبێـژ لـە بـانگی بـەیانی دەبـوەوەو شـەبەقی دەدا(فەجری سادق)، ڕاوی بە هەمان مانا فەرمودەكەی پێشوی گێڕایەوە، وتـی: ڕاویەكان هەندێكیان بۆیان زیاد كرد بەسەر هەندێكی تریاندا.

١٣٣٨ - (صحيح) عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَـتْ: كَـانَ رَسُـولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَـلِّي مِـنَ اللَّيْـلِ ثَـلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً يُوتِرُ مِنْهَا بِخَمْسٍ، لاَ يَجْلِـسُ فِـي شَـيْءٍ مِنَ الْخَمْسِ، حَتَّى يَجْلِسَ فِي الآخِرَةِ فَيُسَلِّمَ. قَالَ أَبُـو دَاوُدَ: رَوَاهُ ابْنُ نُمَيْرٍ عَن هِشَامٍ نَحْوَهُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەشەودا سیانزە ڕکات نوێژی دەکرد، بە پێنج ڕکات نوێژی وەتر کۆتایی بە شەونوێژ دەهێنا، لە هیچ ڕکاتێکیاندا دانەئەنیشت بۆ تەحیات خوێندن، هەتا ڕکاتی کۆتایی، واتە لە ڕکاتی پێنجەمدا دائەنیشت بۆ تەحیات خوێندن جا سەلامی دەدایەوە.

١٣٣٩ - (صحيح) عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي بِاللَّيْلِ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، ثُمَّ يُصَلِّي إِذَا سَمِعَ النِّدَاءَ بِالصُّبْحِ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەشەودا سیانزە ڕکات نوێژی دەکرد، لەپاشدا کاتێ کە گوێی لە بانگ بوایە خێرا دوو ڕکات نوێژی سوننەتی بەیانی دەکرد.

١٣٤٠ - (صحيح) عَن عَائِشَةَ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً وَكَانَ يُصَلِّي ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ، وَيُوتِرُ بِرَكْعَةٍ، ثُمَّ يُصَلِّي – قَالَ مُسْلِمٌ: بَعْدَ الْوِتْرِ (ثُمَّ اتَّفَقَا) - رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ قَاعِدٌ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ قَامَ فَرَكَعَ، وَيُصَلِّي بَيْنَ أَذَانِ الْفَجْرِ وَالإِقَامَةِ رَكْعَتَيْنِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزاى خواى لىٚ بىٚ دەگێڕنەوە، كە وتویەتى: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەشەودا سیانزە ركات نوێژى دەكرد، هەشت ركاتى دەكرد، لە كۆتاییدا یەك ركات وەترى دەكرد، لەپاشدا كاتىٚ كە گوێى لە بانگ بوایە خێرا دوو ركات نوێژى سوننەتى بەیانى دەكرد. - راوى فەرمودەكە موسلیم دەڵێت: لەدواى وەتر، - موساى كوڕى ئیسماعیل كە یەكێكى ترە لە راوى فەرمودەكە نەیوت: لەدواى وەتر، لەپاشدا موسلیم و موسا هەماهەنگن – لەسەر ئەوەى بەدانیشتنەوە دوو ركات نوێژى دەكرد، ئەگەر بیویستایە ركوع بەرێت هەڵئەسایەوە ركوعى دەبرد، لەنێوان بانگى بەیانى و قامەتدا دوو ركات نوێژى سونەتى پێش نوێژى بەیانى دەكرد.

١٣٤١ - (صحيح) عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ: أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَيْفَ كَانَتْ صَلاَةُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي رَمَضَانَ؟ فَقَالَتْ: مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَزِيدُ فِي رَمَضَانَ وَلاَ فِي غَيْرِهِ عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً: يُصَلِّي أَرْبَعًا، فَلاَ تَسْأَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي أَرْبَعًا، فَلاَ تَسْأَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي ثَلاَثًا، قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللهُ عَنهَا: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَنَامُ قَبْلَ أَنْ تُوتِرَ؟ قَالَ: (يَا عَائِشَةُ إِنَّ عَيْنَيَّ تَنَامَانِ، وَلاَ يَنَامُ قَلْبِي)

واتە: لە سەعیدی كوڕی ئەبو سەعیدی مەقبورییەوە هاتووە، ئەبو سەلەمەی كوڕی (عَبْدُ الرَّحْمَن)بۆی گێڕاوەتەوە، كە سەبارەت بە چۆنیەتی شەونوێژی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەمانگی رەمەزاندا لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم پرسیوە؟ عائیشەش رەزای خوای لێ بێ لەوەڵامدا وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە رەمەزان و جگە لە رەمەزانیش لە یانزە ركات زیاتری نەكردوە: لەپێشدا چوار ركاتی دەكرد، مەپرسە لە جوانی و درێژی ئەو چوار ركاتە، ئینجا چوار ركاتی تری دەكرد، مەپرسە لە جوانی و درێژی ئەو چوار ركاتەش، لەپاشدا سێ ركاتی تریشی دەكرد، عائیشە رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! پێش ئەوەی نوێژی وەتر بكەی دەخەویت؟ فەرمووی: (ئەی عائیشە چاوەكانم دەخەون بەڵام دڵم ناخەوێت).

١٣٤٢ - (صحيح) عَن سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ قَالَ: طَلَّقْتُ امْرَأَتِي فَأَتَيْتُ الْمَدِينَةَ لأَبِيعَ عَقَارًا كَانَ لِي بِهَا فَأَشْتَرِيَ بِهِ السِّلاَحَ وَأَغْزُوَ، فَلَقِيتُ نَفَرًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالُوا: قَدْ أَرَادَ نَفَرٌ مِنَّا سِتَّةٌ أَنْ يَفْعَلُوا ذَلِكَ، فَنَهَاهُمُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَالَ: ( لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ) فَأَتَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، فَسَأَلْتُهُ، عَن وِتْرِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ: أَدُلُّكَ عَلَى أَعْلَمِ النَّاسِ بِوِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأْتِ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا

فَأَتَيْتُهَا فَاسْتَتْبَعْتُ حَكِيمَ بْنَ أَفْلَحَ فَأَبَى، فَنَاشَدْتُهُ، فَانْطَلَقَ مَعِى، فَاسْتَأْذَنَّا عَلَى عَائِشَةَ، فَقَالَتْ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: حَكِيمُ بْنُ أَفْلَحَ، قَالَت: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: سَعْدُ بْنُ هِشَامٍ، قَالَت: هِشَامُ بْنُ عَامِرٍ الَّذِى قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَت: نِعْمَ الْمَرْءُ كَانَ عَامِرً. قَالَ: قُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ حَدِّثِينِى عَن خُلُقِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَت: أَلَسْتَ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ، فَإِنَّ خُلُقَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ الْقُرْآنَ. قَالَ: قُلْتُ: حَدِّثِينِى عَن قِيَامِ اللَّيْلِ؟ قَالَت: أَلَسْتَ تَقْرَأُ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ﴾ قَالَ: قُلْتُ: بَلَى، قَالَت: فَإِنَّ أَوَّلَ هَذِهِ السُّورَةِ نَزَلَتْ، فَقَامَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى انْتَفَخَتْ أَقْدَامُهُمْ، وَحُبِسَ خَاتِمَتُهَا فِى السَّمَاءِ اثْنَىْ عَشَرَ شَهْرًا، ثُمَّ نَزَلَ آخِرُهَا، فَصَارَ قِيَامُ اللَّيْلِ تَطَوُّعًا بَعْدَ فَرِيضَةٍ. قَالَ: قُلْتُ: حَدِّثِينِى عَن وِتْرِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَت: كَانَ يُوتِرُ بِثَمَانِ رَكَعَاتٍ، لاَ يَجْلِسُ إِلاَّ فِى الثَّامِنَةِ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّى رَكْعَةً أُخْرَى، لاَ يَجْلِسُ إِلاَّ فِى الثَّامِنَةِ وَالتَّاسِعَةِ، وَلاَ يُسَلِّمُ إِلاَّ فِى التَّاسِعَةِ، ثُمَّ يُصَلِّى

رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، فَتِلْكَ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً يَا بُنَيَّ، فَلَمَّا أَسَنَّ وَأَخَذَ اللَّحْمَ أَوْتَرَ بِسَبْعِ رَكَعَاتٍ، لَمْ يَجْلِسْ إِلاَّ فِي السَّادِسَةِ وَالسَّابِعَةِ، وَلَمْ يُسَلِّمْ إِلاَّ فِي السَّابِعَةِ، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، فَتِلْكَ هِيَ تِسْعُ رَكَعَاتٍ، يَا بُنَيَّ وَلَمْ يَقُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةً يُتِمُّهَا إِلَى الصَّبَاحِ، وَلَمْ يَقْرَإِ الْقُرآنَ فِي لَيْلَةٍ قَطُّ، وَلَمْ يَصُمْ شَهْرًا يُتِمُّهُ غَيْرَ رَمَضَانَ، وَكَانَ إِذَا صَلَّى صَلاَةً دَاوَمَ عَلَيْهَا، وَكَانَ إِذَا غَلَبَتْهُ عَيْنَاهُ مِنَ اللَّيْلِ بِنَوْمٍ صَلَّى مِنَ النَّهَارِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً. قَالَ: فَأَتَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ فَحَدَّثْتُهُ، فَقَالَ: هَذَا وَاللَّهِ هُوَ الْحَدِيثُ، وَلَوْ كُنْتُ أُكَلِّمُهَا لأَتَيْتُهَا حَتَّى أُشَافِهَهَا بِهِ مُشَافَهَةً، قَالَ: قُلْتُ: لَوْ عَلِمْتُ أَنَّكَ لاَ تُكَلِّمُهَا مَا حَدَّثْتُكَ.

واتە: سەعدی کوڕی هیشام دەڵێت: خێزانکەم تەلاقدا – بۆ ئەوەی خۆی یەکلایی بکاتەوە بۆ جیهادو تێکۆشان لەڕێی خوا – چووم بۆ مەدینە لەوێ پارچەیە زەوی و زارم هەبوو بۆئەوەی بیفرۆشم و بە پارەکەی چەك و کەرەسەی جەنگی و وڵاخی سواری پێ بکڕم و غەزای پێ بکەم، گەیشتم بە چەند کەسێ لەیارانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وتیان: شەش کەس لە ئێمە ویستیان وابکەن بەڵام پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕێگەی پێ نەدان و

نــــەهی لـــێ کـــردن، فــــەرمووی: ( لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ) ﴿الأحزاب: ٢١﴾ واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی لەپێغەمبەری خوادا صلی الله علیە وسلم بۆ ئێوە هەیە سەرمەشقی و پێشەوایەتی چاك.

سەعددەڵێت: چووم بۆ خزمەت ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ سەبارەت بە چۆنیەتی نوێژی وەتری پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم لێم پرسی؟ وتی: رێگەت نیشان دەدەم بۆلای زاناترین کەس لەسەر رووی زەویدا بەنوێژی وەتری پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم، کەوتمە رێ بۆلای عائیشە رەزای خوای لێ بێ، چووم بۆلای حەکیمی کوڕی ئەفلەح داوام لێ کرد بێت لەگەڵما بۆ خزمەت عائیشە، ئەویش نەیویست بێت، سوێندم لێ خوارد کە دەبێ لەتەکمدا بێیت، ئەویش هات، رۆشتین هەتا گەیشتینە بەرماڵی عائیشە، داوای مۆڵەتی چوونە ژوورەوەمان کرد، عائیشە وتی: ئەوە کێیە؟ وتم: حەکیمی کوڕی ئەفلەحم، وتی: ئەی ئەوە کێیە لەگەڵتا؟ وتم: سەعدی کوڕی هیشامە، وتی: هیشامی کوڕی عامر کە لە جەنگی بەدردا کوژرا؟ حەکیم وتی: وتم: بەڵێ، عائیشە وتی: باشترین و چاکترین پیاو عامر بوو، وتی: وتم: ئەی دایکی باوەڕداران پێم بڵێ هەڵس و کەوت و رەوشتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم چۆن بوو؟ وتی: ئایا تۆ قورئانت نەخوێندووە؟ هەرچی لەقورئاندا هاتووە سەبارەت بە رەوشتی بەرز و ئادابی جوان و رەفتاری شیرین ئەو بەو شێوەیە بووە، رەوشتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم رەنگدانەوەی ئایەتەکانی قورئان بوو.

سەعد وتی: وتم: پێم بڵێ شەونوێژی پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم چۆن بوو؟ وتی: ئایا تۆ ئایەتی: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ)ت نەخوێندووە ؟ وتی: وتم: بەڵێ، عائیشە وتی: دەی کاتێ کە سەرەتای ئەم سورەتە دابەزی- خوای گەورە بەو ئایەتانە شەونوێژی فەرز کرد - ، یارانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم

ئەوەندە بەپێوە مانەوە لەشەونوێژدا هەتا قاچەکانیان ئاوسا، خوای گەورە کۆتایی سورەتەکەی هەتا دوانزە مانگ لە ئاسمان گلدایەوە، سەرەنجام لەکۆتایی سورەتەکەدا شەونوێژ کە لەپێشدا فەرز بوو بوو بە سوننەت.

سەعد وتی: وتم: ئەی دایکی باوەڕداران چۆنیەتی نوێژی وەتری پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم بۆ باس بکە؟ وتی: هەشت رکات نوێژی وەتری دەکرد، لەرکاتی هەشتەمدا نەبێ لە هیچ رکاتێکیاندا دانەئەنیشت بۆ تەحیات خوێندن، لەپاشدا هەڵئەسایەوە رکاتێکی تری دەکرد، لەرکاتی هەشتەم و نۆیەمدا نەبێ لە هیچ رکاتێکیاندا دانەئەنیشت بۆ تەحیات خوێندن، لەرکاتی نۆیەمدا نەبێ لە هیچ رکاتێکیی تردا سەلامی نەئەدایەوە، لەپاشدا بەدانیشتنەوە دوو رکات نوێژی دەکرد، کە ئەمە هەمووی دەکاتە یانزە رکات ئەی کوڕی شیرینم!

کاتێ کە بەساڵاچوو کەمێ گۆشتی گرت حەوت رکات نوێژی وەتری دەکرد، لەرکاتی شەشەم و حەوتەمدا نەبێ لە هیچ رکاتێکیاندا دانەئەنیشت بۆ تەحیات خوێندن، لەرکاتی حەوتەمدا نەبێ لە هیچ رکاتێکی تردا سەلامی نەئەدایەوە، لەپاشدا بەدانیشتنەوە دوو رکات نوێژی دەکرد، کە ئەمە هەمووی دەکاتە نۆ رکات ئەی کوڕی شیرینم!

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هیچ شەوێ هەتا بەیانی بەتەواوی شەونوێژی نەکردوە، هەرگیز لەشەوێکدا هەموو قورئانی خەتم نەکردوە، جگە لەمانگی رەمەزان هیچ مانگێکی تر هەموو مانگەکە بەرۆژوو نەبووە، کە نوێژی سوننەتی دەکرد حەزی دەکرد بەردەوام بێت لەسەری، ئەگەر خەو زۆری بۆ بهێنایە لەرۆژدا دوانزە رکاتی دەکرد، وتی: چوومەوە بۆلای ئیبنو عەباس، قسەکانی عائیشەم بۆ گێڕایەوە، وتی: سوێند بە خوا ئەم فەرمودەیە تەواوە، ئەگەر قسەم لەگەڵ بکردایەو هاتوچۆم بکردایە خۆم دەچووم بۆلای هەتا ئەم فەرمودەیەم لەدەمی خۆی ببیستایە، سەعد وتی: وتم: ئەگەر

ئــەمزانی قسـەی لەگــەڵ ناکـەی و هاتوچــۆی ناکـەی ئــەم فــەرموودەم بــۆ نەدەگێڕایتەوە.

١٣٤٣ - (صحيح) عَن سَعِيدٍ عَن قَتَادَةَ، بِإِسْنَادِهِ نَحْوَهُ قَالَ: يُصَلِّى ثَمَانِ رَكَعَاتٍ، لاَ يَجْلِسُ فِيهِنَّ إِلاَّ عِنْدَ الثَّامِنَةِ، فَيَجْلِسُ فَيَذْكُرُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ، ثُمَّ يَدْعُو، ثُمَّ يُسَلِّمُ تَسْلِيمًا يُسْمِعُنَا، ثُمَّ يُصَلِّى رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ بَعْدَ مَا يُسَلِّمُ، ثُمَّ يُصَلِّى رَكْعَةً، فَتِلْكَ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، يَا بُنَىَّ فَلَمَّا أَسَنَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَخَذَ اللَّحْمَ أَوْتَرَ بِسَبْعٍ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ بَعْدَ مَا يُسَلِّمُ، بِمَعْنَاهُ إِلَى: مُشَافَهَةً.

واتە: سەعیدی کوڕی قەتادە بە هەمان سەنەد فەرموودەی پێشوی گێڕایەوە، سەعید وتی: هەشت رکات نوێژی وەتری دەکرد، لەرکاتی هەشتەمدا نەبێ لە هیچ رکاتێکیاندا دانەنیشت بۆ تەحیات خوێندن، دائەنیشت لە تەحیاتدا یادی خــوای دەکــردو دەپاڕایــەوە، لەپاشــدا ســەلامی ئەدایــەوە ئەوەنــدە دەنگــی بەرزئەکردەوە ئێمە ئەمان بیست، ئینجا پاش ئەوەی کە سەلامی ئەدایەوە بەدانیشتنەوە دوو رکات نوێژی دەکرد، لەپاشدا رکاتێکی تر نوێژی دەکرد، کە ئەمە هەمووی دەکاتە یانزە رکات، ئەی کوڕی شیرینم! کاتێ کە بەساڵاچوو کەمێ گۆشتی گرت حەوت رکات نوێژی وەتری دەکرد، پاش ئەوەی کە سەلامی دایــەوە بەدانیشــتنەوە دوو رکــات نوێــژی دەکــرد، راوی بــە هــەمان مانــا فەرموودەکەی بەدرێژی گێڕایەوە هەتا کۆتایی.

١٣٤٤ – (صحيح) عَن مُحَمَّدُ بْنُ بِشْرٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، بِهَذَا الْحَدِيثِ. قَالَ: يُسَلِّمُ تَسْلِيمًا يُسْمِعُنَا، كَمَا قَالَ: يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ.

واتە: موحەممەدی کوڕی بیشر دەڵێت: سەعید فەرمودەی پێشوی بۆ گێڕاینەوە، وتی: سەلامی دایەوە ئەوەندە دەنگی بەرزدەکردەوە ئێمە ئەمان بیست، هەروەك یەحیای کوڕی سەعید گێڕایەوە.

١٣٤٥ -(صحيح) عَن سَعِيدٍ، بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ ابْنُ بَشَّارٍ، بِنَحْوِ حَدِيثِ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: وَيُسَلِّمُ تَسْلِيمَةً يُسْمِعُنَا.

واتە: لە سەعیدەوە فەرمودەی پێشو هاتووە، ئیبنو بەششار فەرمودەی پێشوی وەك یەحیای کوڕی سەعید گێڕایەوە، تەنها ئەوەندە نەبێ وتی: (وَيُسَلِّمُ تَسْلِيمَةً يُسْمِعُنَا). پیتی(ةً)ی بۆ (تَسْلِيمَ) زیاد کرد، - لەوانەیە سەلامی بەلای راستدا بەدەنگی بەرزدابێتەوە، بەلای چەپیشدا بە دەنگی نزم - .

١٣٤٦ - (صحيح دون الأربع ركعات، والمحفوظ عند عائشة ركعتان) عَن زُرَارَةَ بْنِ أَوْفَى، أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا سُئِلَتْ عَن صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ؟ فَقَالَت: كَانَ يُصَلِّى صَلاَةَ الْعِشَاءِ فِي جَمَاعَةٍ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى أَهْلِهِ فَيَرْكَعُ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ يَأْوِي إِلَى

فِرَاشِهِ وَيَنَامُ، وَطَهُورُهُ مُغَطًّى عِنْدَ رَأْسِهِ، وَسِوَاكُهُ مَوْضُوعٌ، حَتَّى يَبْعَثَهُ اللَّهُ سَاعَتَهُ الَّتِي يَبْعَثُهُ مِنَ اللَّيْلِ، فَيَتَسَوَّكُ وَيُسْبِغُ الْوُضُوءَ، ثُمَّ يَقُومُ إِلَى مُصَلاَّهُ، فَيُصَلِّي ثَمَانِ رَكَعَاتٍ، يَقْرَأُ فِيهِنَّ بِأُمِّ الْكِتَابِ، وَسُورَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ، وَمَا شَاءَ اللَّهُ، وَلاَ يَقْعُدُ فِي شَيْءٍ مِنْهَا حَتَّى يَقْعُدَ فِي الثَّامِنَةِ، وَلاَ يُسَلِّمُ وَيَقْرَأُ فِي التَّاسِعَةِ، ثُمَّ يَقْعُدُ فَيَدْعُو بِمَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَدْعُوَهُ، وَيَسْأَلُهُ وَيَرْغَبُ إِلَيْهِ، وَيُسَلِّمُ تَسْلِيمَةً وَاحِدَةً شَدِيدَةً، يَكَادُ يُوقِظُ أَهْلَ الْبَيْتِ مِنْ شِدَّةِ تَسْلِيمِهِ، ثُمَّ يَقْرَأُ وَهُوَ قَاعِدٌ بِأُمِّ الْكِتَابِ، وَيَرْكَعُ وَهُوَ قَاعِدٌ، ثُمَّ يَقْرَأُ الثَّانِيَةَ، فَيَرْكَعُ وَيَسْجُدُ وَهُوَ قَاعِدٌ، ثُمَّ يَدْعُو مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَدْعُوَ، ثُمَّ يُسَلِّمُ وَيَنْصَرِفُ، فَلَمْ تَزَلْ تِلْكَ صَلاَةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى بَدَّنَ، فَنَقَصَ مِنَ التِّسْعِ ثِنْتَيْنِ، فَجَعَلَهَا إِلَى السِّتِّ وَالسَّبْعِ وَرَكْعَتَيْهِ وَهُوَ قَاعِدٌ، حَتَّى قُبِضَ عَلَى ذَلِكَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: زورارەی كوڕی ئەوفا دەڵێت: سەبارەت بە شەونوێژی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ پرسیار كرا؟ ئەویش وتی:

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نوێژی عیشای بە جەماعەت دەکرد، لەپاشدا دەگەڕایەوە بۆ ناو خانەوادەکەی چوار رکات نوێژی دەکرد – ئەوەی کە چەسپاوە دوو رکاتی دەکرد نەك چوار رکات - ، ئینجا دەچووە سەر جێگە خەوتنەکەی و دەخەوت، ئاوی دەستنوێژەکەی لەلای سەریەوە دائەناو، سیواکەکەشی لە نزیکیەوە، هەتا ئەو کاتەی کە خوا خەبەری دەکردەوە لەشەودا، کاتێ کە خەبەری دەبووەوە سیواکی دەکردو دەستنوێژی دەگرت، ئینجا هەڵئەسا دەچووە سەر جێگا نوێژەکەی و هەشت رکات نوێژی دەکرد، لەهەموو رکاتێکدا سورەتی فاتیحەو سورەتێکی تری دەخوێند، یان قورئانی زیاتر دەخوێند ئەوەندی کە خوای گەورە بیویستایە، لەرکاتی هەشتەمدا نەبێ لە هیچ رکاتێکیاندا دانەئەنیشت بۆ تەحیات خوێندن، لەرکاتی هەشتەمدا سەلامی نەئەدایەوە، بەڵکو هەڵئەسایەوە بۆ رکاتی نۆیەم سورەتی فاتیحەو سورەتێکی تری دەخوێند، لەپاشدا دائەنیشت بۆ تەحیات خوێندن ئەوەندی کە خوای گەورە بیویستایە دەپاڕایەوە، داوای لێ دەکردو بە تاسەوە دەگەڕایەوە بۆلای، سەلامی ئەدایەوە ئەوەندە دەنگی بەرزئەکردەوە خەریك بوو خانەوادەکەی خەبەرکاتەوە، کاتێ کە لەنوێژی وەتر دەبووەوە بەدانیشتنەوە دوو رکات نوێژی دەکرد سورەتی فاتیحەو سورەتێکی تری دەخوێند، هەر بەدانیشتنەوە رکوعی دەبرد دوو سەجدەی دەبرد، ئینجا بە هەمان شێوە رکاتەکەی تری دەکرد، لەپاشدا ئەوەندی کە خوای گەورە بیویستایە دەپاڕایەوە، ئینجا سەلامی ئەدایەوەو لەنوێژ دەبووەوە و دەچووەوە بۆ جێگەی خەوتنەکەی خۆی، بەردەوام پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەم شێوەیە شەونوێژی دەکرد هەتا بەساڵاچوو گۆشتی گرت و کەمێ قەڵەو بوو، دوو رکاتی لێ کەم کردەوە نۆ رکات شەونوێژی دەکرد، لەپاشدا رکاتێکی تری دەکرد ئینجا بە دانیشتنەوە دوو رکاتی دەکرد، لەسەر ئەو شێوەیە مایەوە هەتا وەفاتی کردو لەدنیا دەرچوو.

١٣٤٧ - (صحيح) عَن بَهْزُ بْنُ حَكِيمٍ، فَذَكَرَ هَذَا الْحَدِيثَ بِإِسْنَادِهِ، قَالَ: يُصَلِّي الْعِشَاءَ، ثُمَّ يَأْوِي إِلَى فِرَاشِهِ، لَمْ يَذْكُرِ الأَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ، قَال فِيهِ: فَيُصَلِّي ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ يُسَوِّي بَيْنَهُنَّ فِي الْقِرَاءَةِ وَالرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ، وَلاَ يَجْلِسُ فِي شَيْءٍ مِنْهُنَّ إِلاَّ فِي الثَّامِنَةِ، فَإِنَّهُ كَانَ يَجْلِسُ، ثُمَّ يَقُومُ وَلاَ يُسَلِّمُ فَيُصَلِّي رَكْعَةً يُوتِرُ بِهَا، ثُمَّ يُسَلِّمُ تَسْلِيمَةً يَرْفَعُ بِهَا صَوْتَهُ حَتَّى يُوقِظَنَا، ثُمَّ سَاقَ مَعْنَاهُ.

واتە: لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان سەنەد هاتووە، وتی: نوێژی عیشای بە جەماعەت بۆ خەڵکەکە دەکرد، لەپاشدا دەگەڕایەوە بۆ سەر جێگە خەوتنەکەی و دەخەوت، باسی چوار رکات نوێژی نەکرد، جا فەرموودەکەی گێڕایەوە، تێیدا وتی: هەشت رکات نوێژی دەکرد، قورئان خوێندن و رکوع و سەجدەکانیان وەك یەك بوون، لەرکاتی هەشتەمدا نەبێ لە هیچ رکاتێکیاندا دانەئەنیشت بۆ تەحیات خوێندن، ئینجا لە دانیشتنی رکاتی هەشتەمدا سەلامی نەئەدایەوە بەڵکو هەڵئەسایەوە رکاتێکی تر وەتری دەکرد، لەپاشدا سەلامی ئەدایەوە ئەوەندە دەنگی بەرزئەکردەوە هەتا خەبەری دەکردینەوە، جا راوی بەهەمان مانا فەرموودەکەی گێڕایەوە.

١٣٤٨ - (صحيح إلا الأربع، والمحفوظ ركعتان كما تقدم) عَن عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ، أَنَّهَا سُئِلَتْ عَن صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَت: كَانَ يُصَلِّي بِالنَّاسِ الْعِشَاءَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى أَهْلِهِ فَيُصَلِّي أَرْبَعًا، ثُمَّ يَأْوِي إِلَى فِرَاشِهِ، ثُمَّ سَاقَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَلَمْ يَذْكُرْ: يُسَوِّي بَيْنَهُنَّ فِي الْقِرَاءَةِ وَالرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ، وَلَمْ يَذْكُرْ فِي التَّسْلِيمِ: حَتَّى يُوقِظَنَا.

واتە: لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە سەبارەت بە شەونوێژی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پرسیاری لێ کراوە؟ ئەویش وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نوێژی عیشای بە جەماعەت بۆ خەڵکەکە دەکرد، لەپاشدا دەگەڕایەوە بۆماڵەوە چوار رکات نوێژی دەکرد، ئینجا دەچووە سەر جێگە خەوتنەکەی و دەخەوت، جا راوی بەدرێژی فەرمودەکەی گێڕایەوە، باسی ئەوەی نەکرد کە: قورئان خوێندن و رکوع و سەجدەکانیان وەك یەك بوون، هەروەها باسی ئەوەشی نەکرد کە: سەلامی ئەدایەوە ئەوەندە دەنگی بەرزنەکردەوە هەتا خەبەری دەکردینەوە.

١٣٤٩ - (صحيح) عَن بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ زُرَارَةَ بْنِ أَوْفَى، عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا بِهَذَا الْحَدِيثِ، وَلَيْسَ فِي تَمَامِ حَدِيثِهِمْ.

واتە: لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە، لەزورارەی کوڕی ئەوفاوە، لە سەعدی

كوڕی هیشامەوە، لەعائیشەوە رەزای خوای لێ بێ فەرمودەی پێشو هاتووە، بەڵام وەك فەرمودەكانی پێشو نیە بۆ تەواوی.

١٣٥٠ - (حسن صحيح) عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُوتِرُ بِسَبْعٍ - أَوْ كَمَا قَالَتْ - وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، وَرَكْعَتَيِ الْفَجْرِ بَيْنَ الأَذَانِ وَالإِقَامَةِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەشەودا سیانزە ركات نوێژی دەكرد، حەوت ركات نوێژی وەتری دەكرد - یان وەك عائیشە وتی: - بەدانیشتنەوە دوو ركات نوێژی دەكرد، لەنێوان بانگ و قامەتدا دوو ركات نوێژی سوننەتی پێش بەیانی دەكرد.

١٣٥١ - (حسن صحيح) عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُوتِرُ بِتِسْعِ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ أَوْتَرَ بِسَبْعِ رَكَعَاتٍ، وَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ بَعْدَ الْوِتْرِ يَقْرَأُ فِيهِمَا، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ قَامَ فَرَكَعَ، ثُمَّ سَجَدَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَى هَذَيْنِ الْحَدِيثَيْنِ خَالِدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الْوَاسِطِيُّ عَن مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو مِثْلَهُ، قَالَ فِيهِ: قَالَ عَلْقَمَةُ بْنُ وَقَّاصٍ: يَا أُمَّتَاهُ! كَيْفَ كَانَ يُصَلِّي الرَّكْعَتَيْنِ؟ فَذَكَرَ مَعْنَاهُ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم لەشەودا نۆ رکات نوێژی وەتری دەکرد، لەپاشدا حەوت رکات نوێژی وەتری دەکرد، لەدوای نوێژی وەتر بەدانیشتنەوە دوو رکات نوێژی دەکرد قورئانی تێدا دەخوێندن، ئەگەر بیویستایە رکوع بەرێت هەڵئەسایەوە رکوعی دەبرد، ئینجا سەجدەی دەبرد. ئەبو داود دەڵێت: خالیدی کوڕی (عبد الله)ی (واسطی) و موحەممەدی کوڕی عەمر بە هەمان شێوە دوو فەرموودەکەی پێشویان گێڕاوەتەوە، راوی لە فەرمودەکەیدا وتی: عەلقەمەی کوڕی وەقاص وتی: ئەی دایە گیان! چۆن ئەو دوو رکاتەی دەکرد. جا راوی بەهەمان مانا فەرمودەکەی گێڕایەوە.

١٣٥٢ - (صحيح) عَن سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ قَالَ: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فَدَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ فَقُلْتُ: أَخْبِرِينِي عَن صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَت: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي بِالنَّاسِ صَلاَةَ الْعِشَاءِ، ثُمَّ يَأْوِي إِلَى فِرَاشِهِ فَيَنَامُ، فَإِذَا كَانَ جَوْفُ اللَّيْلِ قَامَ إِلَى حَاجَتِهِ وَإِلَى طَهُورِهِ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَصَلَّى ثَمَانِ رَكَعَاتٍ يُخَيَّلُ إِلَيَّ أَنَّهُ يُسَوِّي بَيْنَهُنَّ فِي الْقِرَاءَةِ وَالرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ، ثُمَّ يُوتِرُ بِرَكْعَةٍ، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، ثُمَّ يَضَعُ جَنْبَهُ، فَرُبَّمَا جَاءَ بِلاَلٌ فَآذَنَهُ بِالصَّلاَةِ، ثُمَّ يُغْفِي، وَرُبَّمَا شَكَكْتُ أَغَفَى أَوْ لاَ؟ حَتَّى يُؤْذِنَهُ بِالصَّلاَةِ، فَكَانَتْ تِلْكَ صَلاَتَهُ حَتَّى أَسَنَّ وَلَحُمَ فَذَكَرَتْ مِنْ لَحْمِهِ مَا شَاءَ اللَّهُ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ.

واتە: سەعدی كوڕی هیشام دەڵێت: چووم بۆ مەدینە لەوێ چوومە خزمەت عائیشە رەزای خوای لێ بێ، پێم وت: باسی چۆنیەتی شەونوێژی پێغەمبەرم صلی الله علیە وسلم بۆ بكە؟ ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بەرنوێژی نوێژی عیشای بە جەماعەت بۆ خەڵك دەكرد، لەپاشدا دەگەڕایەوە بۆ سەر جێگە خەوتنەكەی و دەخەوت، لە قوڵایی شەودا هەڵئەسا دەستی بەئاو دەگەیاندو دەستنوێژی دەگرت، لەپاشدا دەچووە مزگەوت هەشت ركات نوێژی دەكرد پێم وایە قورئان خوێندن و ركوع و سەجدەكانیان وەك یەك بوون، ئینجا یەك ركات نوێژی وەتری دەكرد، لەپاشدا بەدانیشتنەوە دوو ركات نوێژی دەكرد، ئینجا لەسەر لای راستی رادەكشا، هەندێ جار بیلال دەهات لەكاتی نوێژی بەیانی ئاگاداری دەكردەوە، لەپاشدا سەرخەوێكی بۆ دەشكاند، هەندێ جار گومانم هەبوو لەوەی كە سەرخەوی بۆ دەشكاند یان نا، هەتا ئاگاداریان دەكردەوە لەكاتی نوێژ، بەردەوام پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بەم شێوەیە شەونوێژی دەكرد هەتا بەساڵاچوو گۆشتی گرت و كەمێ قەڵەو بوو. جا راوی فەرموودەكەی گێڕایەوە.

١٣٥٢ م – (صحيح) عَن عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّى مِنَ اللَّيْلِ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً يُوتِرُ مِنْهَا بِخَمْسٍ، لاَ يَجْلِسُ فِى شَىْءٍ مِنَ الْخَمْسِ، حَتَّى يَجْلِسَ فِى الآخِرَةِ فَيُسَلِّمَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وإنما كررت هذا الحديث" لأنهم اضطربوا فيه. ثم قال أبو داود: أصحابُنا لا يرونَ الركعتينِ بعد الوترِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەشەودا سیانزە ڕکات نوێژی دەکرد، بە پێنج ڕکات نوێژی وەتر کۆتایی بە شەونوێژ دەهێنا، لە هیچ ڕکاتێکیاندا دانەئەنیشت بۆ تەحیات خوێندن، هەتا ڕکاتی کۆتایی واتە لە ڕکاتی پێنجەمدا دائەنیشت بۆ تەحیات خوێندن جا سەلامی دەدایەوە. ئەبو داود دەڵێت: بۆیە ئەم فەرمودەم دووبارە کردەوە چونکە فەرمودەناسان ڕای جیاوازیان هەیە لەسەری. لەپاشدا ئەبو داود دەڵێت: هاوەڵانمان لە فەرمودەناسان دوو ڕکات نوێژی دوای نوێژی وەتریان نەگێڕاوەتەوە.

١٣٥٣- (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّهُ رَقَدَ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَرَآهُ اسْتَيْقَظَ فَتَسَوَّكَ وَتَوَضَّأَ وَهُوَ يَقُولُ: (إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ) حَتَّى خَتَمَ السُّورَةَ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ أَطَالَ فِيهِمَا الْقِيَامَ وَالرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ، ثُمَّ إِنَّهُ انْصَرَفَ، فَنَامَ حَتَّى نَفَخَ، ثُمَّ فَعَلَ ذَلِكَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ: سِتَّ رَكَعَاتٍ، كُلُّ ذَلِكَ يَسْتَاكُ، ثُمَّ يَتَوَضَّأُ وَيَقْرَأُ هَؤُلاَءِ الآيَاتِ، ثُمَّ أَوْتَرَ: - قَالَ: عُثْمَانُ: بِثَلاَثِ رَكَعَاتٍ، فَأَتَاهُ الْمُؤَذِّنُ، فَخَرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ. وَقَالَ ابْنُ عِيسَى: ثُمَّ أَوْتَرَ، فَأَتَاهُ بِلاَلٌ فَآذَنَهُ بِالصَّلاَةِ حِينَ طَلَعَ الْفَجْرُ، فَصَلَّى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ - . ثُمَّ اتَّفَقَا: وَهُوَ يَقُولُ: (اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا، وَاجْعَلْ فِي لِسَانِي نُورًا، وَاجْعَلْ فِي سَمْعِي

نُورًا، وَاجْعَلْ فِي بَصَرِي نُورًا، وَاجْعَلْ خَلْفِي نُورًا، وَأَمَامِي نُورًا، وَاجْعَلْ مِنْ فَوْقِي نُورًا، وَمِنْ تَحْتِي نُورًا، اللَّهُمَّ وَأَعْظِمْ لِي نُورًا)

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە شەوێ لە خزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم ماوەتەوە لەماڵی مەیمونەی پوری کە خێزانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بووە، پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم بینی هەستا بۆ شەونوێژ سیواکی کردو دەستنوێژی گرت، جا ئەم ئایەتانەی خوێنـــــدەوە: (إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَأَيَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ). آل عمران: ١٩٠. واتە: بەڕاستی لەدرووست کردنی ئاسمانەکان و زەویدا و لەجیاوازی و گۆڕانی شەو و ڕۆژدا چەندەها بەڵگە هەیە بۆ خاوەن ژیرییەکان... هەتا کۆتایی سورەتەکە. لەپاشدا هەستا دوو رکات نوێژی کرد درێژەی دا بە قورئان خوێندن و رکوع و سەجدەکانیان، ئینجا لەنوێژ بویەوە گەڕایەوە بۆ جێگاکەی و خەوتەوە هەتا پرخی لێدا، لەپاشدا سێ جار بەم شێوەیەی کرد: واتە شەش رکاتی کرد بەم شێوەیە لەهەموو جارەکاندا سیواکی دەکردو دەستنوێژی دەگرت و دوو رکات نوێژی دەکردو ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی (آل عمران)ی دەخوێند، ئینجا نوێژی وەتری دەکرد، - (عثمان) وتی: سێ رکات نوێژی وەتری دەکرد، بانگبێژ دەهات هەواڵی کاتی نوێژی دەدایە، ئەوکاتە دەردەچوو بۆ نوێژی جەماعەتی بەیانی، ئیبنو عیسا وتی: لەپاشدا نوێژی وەتری دەکرد، کاتێ کە بەیانی دەدا بیلال دەهات لەکاتی نوێژی بەیانی ئاگاداری دەکردەوە، ئینجا دەردەچوو بۆ نوێژی جەماعەتی بەیانی، لەپاشدا (عثمان) و ئیبنو عیسا هەماهەنگن: کە دەیفەرموو: (پەروەردگارا نوورو رووناکی بخەرە دڵمەوە، هەروەها نوور بخەرە سەر زوبانم، نوور بخەرە بیستنم،

نوور بخەرە چاومەوە، لە پشتمەوە نوور بێ، لە سەرمەوە نوور بێ، لە ژێرمەوە نوور بێ، خودایە نووروم پێ ببەخشە).

١٣٥٤ - (صحيح) عَن حُصَيْنٍ نَحْوَهُ قَالَ: (وَأَعْظِمْ لِي نُورًا)

واتە: لە حوصەینەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتووە، بەلام: (اللَّهُمَّ وَأَعْظِمْ لِي نُورًا) بە (وَأَعْظِمْ لِي نُورًا) هاتووە، وشەی: (اللَّهُمَّ)ی لەگەڵ نیە.

١٣٥٥ - (ضعيف) عَنِ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: بِتُّ لَيْلَةً عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لأَنْظُرَ كَيْفَ يُصَلِّي، فَقَامَ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، قِيَامُهُ مِثْلُ رُكُوعِهِ، وَرُكُوعُهُ مِثْلُ سُجُودِهِ، ثُمَّ نَامَ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ فَتَوَضَّأَ وَاسْتَنَّ، ثُمَّ قَرَأَ بِخَمْسِ آيَاتٍ مِنْ آلِ عِمْرَانَ: (إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ). فَلَمْ يَزَلْ يَفْعَلُ هَذَا حَتَّى صَلَّى عَشْرَ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى سَجْدَةً وَاحِدَةً فَأَوْتَرَ بِهَا، وَنَادَى الْمُنَادِي عِنْدَ ذَلِكَ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ مَا سَكَتَ الْمُؤَذِّنُ، فَصَلَّى سَجْدَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ جَلَسَ حَتَّى صَلَّى الصُّبْحَ.

واتە: لە (فضلِ)ی كوڕی عەباسەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: شەوێ لە خزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم مامەوە بۆ ئەوەی سەرنج بدەم و بزانم چۆن شەونوێژ دەكات، لەخەو هەستا دەستنوێژی گرت، لەپاشدا دوو ركات نوێژی كرد، بەپێوە وەستانەكەی بە ئەندازەی ركوعەكەی بوو، ركوعەكەشی بە ئەندازەی سەجدەكەی بوو، ئینجا خەوتەوە، لەپاشدا هەستایەوە دەستنوێژی گرت و سیواكی كرد، ئینجا پێنج ئایەت لە ئایەتەكانی كۆتایی سورەتی (آل عمران)ی خوێندەوە: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ...﴾. بەردەوام بەم شێوەیەی دەكرد هەتا دە ركات نوێژی كرد، ئینجا هەستایەوە یەك ركات نوێژی وەتری كرد، لەوكاتەدا بانگبێژ بانگی بەیانی دا، دوای ئەوەی كە بانگبێژ لەبانگەكەی بویەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا دوو ركات نوێژی سوكەڵەی كرد، لەپاشدا دانیشت هەتا نوێژی بەیانی كرد.

**١٣٥٦ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ مَا أَمْسَى، فَقَالَ: (أَصَلَّى الْغُلاَمُ؟) قَالُوا: نَعَمْ. فَاضْطَجَعَ حَتَّى إِذَا مَضَى مِنَ اللَّيْلِ مَا شَاءَ اللَّهُ قَامَ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ صَلَّى سَبْعًا أَوْ خَمْسًا، أَوْتَرَ بِهِنَّ، لَمْ يُسَلِّمْ إِلاَّ فِي آخِرِهِنَّ.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: شەوێك لەماڵ مەیمونەی پورم مامەوە - كە خێزانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه

وسلم بوو – لەدوای ئێوارە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم هاتەوە، فەرمووی: (ئەم غوڵامە واتە ئیبنو عەباس نوێژی کردوە؟). وتیان: بەڵێ، لەسەر جێگاکەی راکشا هەتا ئەوەندەی خوای گەورە ویستی لەسەر بێت لەشەوگار تێپەڕی ئەوکاتە هەستا دەستنوێژی گرت، لەپاشدا حەوت یان هەشت رکات نوێژی وەتری کرد، هەتا رکاتی کۆتایی سەلامی نەدایەوە.

١٣٥٧ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: بِتُّ فِي بَيْتِ خَالَتِي مَيْمُونَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ، فَصَلَّى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْعِشَاءَ، ثُمَّ جَاءَ فَصَلَّى أَرْبَعًا، ثُمَّ نَامَ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَدَارَنِي فَأَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ فَصَلَّى خَمْسًا، ثُمَّ نَامَ حَتَّى سَمِعْتُ غَطِيطَهُ - أَوْ خَطِيطَهُ - ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الْغَدَاةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: شەوێك لەماڵی پورم مەیمونەی کچی (حارِث) مامەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم نوێژی عیشای کرد، لەپاشدا هاتەوە چوار رکات نوێژی کرد، ئینجا خەوت، لەپاشدا هەستایەوە نوێژی کرد، منیش هەستام دەستنوێژم گرت و لەلای چەپیەوە وەستام، ئەویش بەدەستی راستی لەپشتی خۆیەوە هێنامیە لای راستی خۆیەوەو پێنج رکات نوێژی کرد، ئینجا خەوتەوە گوێم لە پرخەی بوو، لەپاشدا هەستایەوە دوو رکات نوێژی - سوننەتی پێش بەیانی - کرد، ئینجا دەرچوو بۆ مزگەوت نوێژی بەیانی کرد.

١٣٥٨ - (صحيح) عَن سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ حَدَّثَهُ - فِي هَذِهِ الْقِصَّةِ - قَالَ: فَقَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى صَلَّى ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ أَوْتَرَ بِخَمْسٍ وَلَمْ يَجْلِسْ بَيْنَهُنَّ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە هاتووە، کە ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بەسەرهاتی پێشوی بۆ گێڕاوەتەوە، وتی: هەستا دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژی کرد هەتا هەشت ڕکات، لەپاشدا پێنج ڕکات نوێژی وەتری کرد دانەنیشت بۆ تەحیات خوێندن هەتا ڕکاتی پێنجەم.

١٣٥٩ - (صحيح) عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً بِرَكْعَتَيْهِ قَبْلَ الصُّبْحِ، يُصَلِّي سِتًّا مَثْنَى مَثْنَى، وَيُوتِرُ بِخَمْسٍ لاَ يَقْعُدُ بَيْنَهُنَّ إِلاَّ فِي آخِرِهِنَّ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە دوو ڕکات سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانیەوە سیانزە ڕکات شەونوێژی دەکرد، دوو ڕکات دوو ڕکات شەش ڕکاتی دەکرد، لەپاشدا پێنج ڕکات نوێژی وەتری کرد دانەئەنیشت بۆ تەحیات خوێندن هەتا ڕکاتی پێنجەم.

١٣٦٠ - (صحيح) عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي بِاللَّيْلِ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً بِرَكْعَتَيِ الْفَجْرِ.

واتە: لە عورووەوە هاتووە، کە عائیشە رەزای خوای لێ بێ بۆی گێراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە دوو رکات سونەتەکەی پێش نوێژی بەیانیەوە سیانزە رکات شەونوێژی دەکرد.

١٣٦١ - (صحيح دون قوله بَيْنَ الأَذَانَيْنِ، والمحفوظ بعد الوتر) عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى الْعِشَاءَ، ثُمَّ صَلَّى ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ قَائِمًا، وَرَكْعَتَيْنِ بَيْنَ الأَذَانَيْنِ، وَلَمْ يَكُنْ يَدَعُهُمَا. قَالَ جَعْفَرُ بْنُ مُسَافِرٍ فِي حَدِيثِهِ: وَرَكْعَتَيْنِ جَالِسًا بَيْنَ الأَذَانَيْنِ، زَادَ: جَالِسًا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی عیشای کرد، لەپاشدا بەپێوە هەشت رکات نوێژی کرد، لەنێوان بانگی بەیانی و قامەتەکەیدا دوو رکات نوێژی کرد، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەرگیز تەرکی ئەو دوو رکاتەی نێوان بانگ و قامەتی نەدەکرد. جەعفەری کوڕی موسافیر لە فەرمودەکەیدا وتی: لەنێوان بانگی بەیانی و قامەتدا بەدانیشتنەوە دوو رکات نوێژی دەکرد، جەعفەر وشەی دانیشتنی بۆ زیاد کرد.

١٣٦٢ - (صحيح) عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِى قَيْسٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا: بِكَمْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُوتِرُ؟ قَالَت: كَانَ يُوتِرُ بِأَرْبَعٍ وَثَلاَثٍ، وَسِتّ وَثَلاَثٍ، وَثَمَانٍ وَثَلاَثٍ، وَعَشْرٍ وَثَلاَثٍ، وَلَمْ يَكُنْ يُوتِرُ بِأَنْقَصَ مِنْ سَبْعٍ، وَلاَ بِأَكْثَرَ مِنْ ثَلاَثَ عَشْرَةَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: زَادَ أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ: وَلَمْ يَكُنْ يُوتِرُ بِرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ. قُلْتُ: مَا يُوتِرُ؟ قَالَت: لَمْ يَكُنْ يَدَعُ ذَلِكَ. وَلَمْ يَذْكُرْ أَحْمَدُ: وَسِتّ وَثَلاَثٍ.

واته: (عَبْدُ الله)ی كوڕی ئەبو قەیس دەڵێت: بە عائیشەم رەزای خوای لێ بێ وت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چەند ركات شەونوێژی دەكردو بە چەند ركات نوێژی وەتر كۆتایی پێ دەهێنا؟ وتی: چوار ركات شەونوێژ و سێ ركات نوێژی وەتری دەكرد، شەش ركات شەونوێژ و سێ ركات نوێژی وەتری دەكرد، هەشت ركات شەونوێژ و سێ ركات نوێژی وەتری دەكرد، دە ركات شەونوێژ و سێ ركات نوێژی وەتری دەكرد، چوار ركات شەونوێژ و سێ ركات نوێژی وەتری دەكرد، بەهەرحاڵ لەحەوت ركات كەمتری نە دەكردو، لەسیانزە ركاتیش زیاتری نەدەكرد، ئەبو داود دەڵێت: ئەحمەدی كوڕی صالح ئەمەی بۆ زیاد كرد: پێش ئەوەی بانگی بە یانی بدات نوێژی وەتری دەكرد بەڵكو پێش ئەوكاتە نوێژی وەتری دەكرد، وتم: (وَلَمْ يَكُنْ يُوتِرُ بِرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ) مانای چییە؟ عائیشە وتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەرگیز تەركی ئەو كارەی نەدەكرد.

١٣٦٣ - (ضعيف) عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ، أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ فَسَأَلَهَا عَن صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِاللَّيْلِ؟ فَقَالَت: كَانَ يُصَلِّي ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً مِنَ اللَّيْلِ، ثُمَّ إِنَّهُ صَلَّى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، وَتَرَكَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قُبِضَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ قُبِضَ وَهُوَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ تِسْعَ رَكَعَاتٍ، وَكَانَ آخِرُ صَلاَتِهِ مِنَ اللَّيْلِ الْوِتْرَ.

واتە: لە ئەسوەدی کوڕی یەزیدەوە هاتوو، کە چووەتە خزمەت عائیشە رەزای خوای لێ بێ سەبارەت بە شەونوێژی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پرسیاری لێ کردوە؟ ئەویش وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەشەودا سیانزە رکات نوێژی دەکرد، لەپاشدا یانزە رکاتی دەکرد – لەوانەیە ئەو دوو رکاتەی تەرك کردبێ کە بە دانیشتنەوە دەیکرد- ، دوو رکاتی تریشی تەرك کرد – لەگەڵ ئەو دوو رکاتەی کە بە دانیشتنەوە دەیکرد - ، ئیتر هەتا ئەوکاتەی کە لەدنیا دەرچوو لەشەودا نۆ رکات شەونوێژی دەکرد، بە نوێژی وەتر کۆتایی بە شەونوێژ دەهێنا.

١٣٦٤ - (صحيح) عَنْ مَخْرَمَةَ بْنِ سُلَيْمَانَ، أَنَّ كُرَيْبًا مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ كَيْفَ كَانَتْ صَلَاةُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِاللَّيْلِ؟ قَالَ: بِتُّ عِنْدَهُ لَيْلَةً وَهُوَ عِنْدَ مَيْمُونَةَ، فَنَامَ حَتَّى إِذَا ذَهَبَ

ثُلُثُ اللَّيْلِ أَوْ نِصْفُهُ اسْتَيْقَظَ، فَقَامَ إِلَى شَنٍ فِيهِ مَاءٌ، فَتَوَضَّأَ، وَتَوَضَّأْتُ مَعَهُ، ثُمَّ قَامَ فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ عَلَى يَسَارِهِ، فَجَعَلَنِي عَلَى يَمِينِهِ، ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ عَلَى رَأْسِي كَأَنَّهُ يَمَسُّ أُذُنِي، كَأَنَّهُ يُوقِظُنِي، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، قُلْتُ: فَقَرَأَ فِيهِمَا بِأُمِّ الْقُرْآنِ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ صَلَّى حَتَّى صَلَّى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً بِالْوِتْرِ، ثُمَّ نَامَ، فَأَتَاهُ بِلَالٌ فَقَالَ: الصَّلَاةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ صَلَّى لِلنَّاسِ.

واتە: لە مەخرەمەی كوڕی سولەیمانەوە هاتووە، كە كورەیبی خزمەتكاری ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ بۆی گێڕاوەتەوە، وتویەتی: سەبارەت بە چۆنیەتی شەونوێژی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لە ئیبنو عەباسم ڕەزای خوایان لێ بێ پرسی: ئیبنو عەباس وتی: شەوێك لەماڵی مەیمونەی پورم لەخزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیە وسلم مامەوە، خەوت هەتا سێیەكی دوایی شەو یان نیوەی شەو تێپەڕی ئەوكاتە هەستا لەخەو، هەستا چووە لای كونەیە یان جەوەنەیە كە ئاوی تێدا بوو دەستنوێژی گرت،، منیش لەگەڵی دەستنوێژم گرت، لەپاشدا هەستا بۆ نوێژكردن، منیش هەستام لەلای چەپیەوە وەستام، خستمیە لای ڕاستی خۆیەوە، دەستی هێنا بە سەرم گوێچكەمدا وەك ئەوەی كە بیەوێت خەبەرم كاتەوە - پێ دەچێت ئیبنو عەباس خەوالۆ بوبێت بۆیە وای لێ كردوە خەو بەری بدات - ، جا پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم خێرا دوو ركات نوێژی كرد، وتم: ئایا لەهەردوو ركاتەكەدا سورەتی فاتیحەی خوێند، ئینجا سەلامی دایەوە، لەپاشدا نوێژی كرد هەتا یانزە ركات نوێژی كرد

بە نوێژى وەترەوە، ئینجا خەوتەوە، بیلال هات وتى: ئەى پێغەمبەرى خوا صلى الله علیه وسلم كاتى نوێژە، هەستا دوو ركات نوێژى كرد، لەپاشدا بەرنوێژى نوێژى بەیانى كرد بۆ خەڵكەكە.

١٣٦٥ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ، فَقَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ، فَصَلَّى ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، مِنْهَا رَكْعَتَا الْفَجْرِ، حَزَرْتُ قِيَامَهُ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ بِقَدْرِ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ﴾. لَمْ يَقُلْ نُوحٌ: مِنْهَا رَكْعَتَا الْفَجْرِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزاى خوایان لێ بێ هاتووە، كە وتویەتى: شەوێك لەماڵى مەیمونەى پورم مامەوە، پێغەمبەرى خوا صلى الله علیه وسلم هەستا بۆ شەونوێژ، سیانزە ركات نوێژى كرد لەگەڵ دوو ركات سوننەتەكەى پێش نوێژى بەیانى، مەزندە(تەخمین)ى بە پێوە راوەستانەكەیم كرد لەهەموو ركاتێكدا بەئەندازەى خوێندنى سورەتى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ﴾. دەبوو، راوى فەرمودەكە نوح نەیوت: لەگەڵ دوو ركات سوننەتەكەى پێش نوێژى بەیانى.

١٣٦٦ - (صحيح) عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ قَالَ: لَأَرْمُقَنَّ صَلَاةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اللَّيْلَةَ. قَالَ: فَتَوَسَّدْتُ عَتَبَتَهُ - أَوْ فُسْطَاطَهُ - فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ صَلَّى

رَكْعَتَيْنِ طَوِيلَتَيْنِ طَوِيلَتَيْنِ طَوِيلَتَيْنِ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ أَوْتَرَ، فَذَلِكَ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً.

واتە: زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی وتی: وتم ئەبێ ئەم شەو سەرنجی شەونوێژی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بدەم، زەید وتی: سەرم کردە بەر دەرگاکەی یان خەیمەکەی، جا سەرنجمدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوو رکات نوێژی سوکەڵەی کرد، لەپاشدا دوو رکات نوێژی درێژ درێژ درێژی کرد، ئینجا دوو رکات نوێژی کرد کورت تر لەدوو رکاتەکەی پێشو، لەپاشدا دوو رکات نوێژی تری کرد کورت تر لەدوو رکاتەکەی پێشو، لەپاشدا دوو رکات نوێژی تری کرد کورت تر لەدوو رکاتەکەی پێشو، ئینجا دوو رکات نوێژی تری کرد کورت تر لەدوو رکاتەکەی پێشو، لەپاشدا نوێژی وەتری کرد، کە ئەمەش هەمووی دەکاتە سیانزە رکات.

١٣٦٧ - (صحيح) عَنْ كُرَيْبٍ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ : أَنَّهُ بَاتَ عِنْدَ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَهِيَ خَالَتُهُ، قَالَ: فَاضْطَجَعْتُ فِي عَرْضِ الْوِسَادَةِ وَاضْطَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَهْلُهُ فِي طُولِهَا، فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى إِذَا انْتَصَفَ اللَّيْلُ، أَوْ قَبْلَهُ بِقَلِيلٍ، أَوْ بَعْدَهُ بِقَلِيلٍ، ثم اسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَلَسَ يَمْسَحُ النَّوْمَ عَنْ وَجْهِهِ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَرَأَ الْعَشْرَ الآيَاتِ الْخَوَاتِمَ مِنْ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ، ثُمَّ قَامَ إِلَى شَنٍّ مُعَلَّقَةٍ فَتَوَضَّأَ مِنْهَا فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: فَقُمْتُ فَصَنَعْتُ مِثْلَ مَا صَنَعَ، ثُمَّ ذَهَبْتُ فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ، فَوَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى رَأْسِي فَأَخَذَ بِأُذُنِي يَفْتِلُهَا، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ. قَالَ الْقَعْنَبِيُّ: سِتَّ مَرَّاتٍ، ثُمَّ أَوْتَرَ، ثُمَّ اضْطَجَعَ حَتَّى جَاءَهُ الْمُؤَذِّنُ، فَقَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الصُّبْحَ.

واتە: لە کورەیبی خزمەتکاری ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە(عبد الله)ی کوڕی عەباس بۆی گێڕاوەتەوە، شەوێك لەماڵی مەیمونەی پوری ماوەتەوە کە خێزانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو،، ئیبنو عەباس وتی: لەسەر باری پانی فەرشێك راکشام، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و مەیمونەی خێزانیشی لەسەر باری درێژی فەرشەکە لێی راکشان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خەوت هەتا نیوەی شەو یان کەمێ پێشتر، یا کەمێ دوای نیوەی شەو، لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا لەخەو دانیشت دەستی هێنا بەدەم و چاویدا بۆ ئەوەی خەو

بەری بدات، لەپاشدا دە ئایەت لەکۆتایی سورەتی (آل عمران)ی خوێند، ئینجا هەستا چووە لای جەوەنەیەکی هەڵواسراو کە ئاوی تێدا بوو دەستنوێژێکی بەتەواوی بە جوانی لێ گرت، جا هەستا نوێژی کرد، (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەباس وتی: منیش هەستام ئەو چی کرد ئەوەم کرد، ڕۆشتم لەتەنیشتیەوە وەستام، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستی راستی لەسەر سەرم داناو لە پشتیەوە هێنامیە لای راستی خۆیەوەو دەستی هێنا بە گوێچکەمدا – بۆ ئەوەی وریای بکاتەوە - ، لەپاشدا دوو رکات دوو رکات دوانزە رکات نوێژی کرد، راوی فەرموودەکە قەعنەبی وتی: شەش جار، ئینجا نوێژی وەتری کرد، ئینجا راکشایەوە هەتا بانگبێژ هات لەکاتی نوێژی بەیانی ئاگاداری کردەوە، ئەوکاتە خێرا هەستا دوو رکات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی کرد، لەپاشدا دەرچوو بۆ مزگەوت بەرنوێژی کرد بۆ خەڵکەکە.

## باسی ئەوەی فەرمانی پێکراوە لە میانەڕەوی لەشەونوێژدا.

## ٣١٧ – باب مَا يُؤْمَرُ بِهِ مِنَ الْقَصْدِ فِي الصَّلاَةِ.

١٣٦٨ - (صحيح) عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (اكْلَفُوا مِنَ الْعَمَلِ مَا تُطِيقُونَ، فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا، وَإِنَّ أَحَبَّ الْعَمَلِ إِلَى اللَّهِ أَدْوَمُهُ وَإِنْ قَلَّ). وَكَانَ إِذَا عَمِلَ عَمَلاً أَثْبَتَهُ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کارو کردەوەیە بکەن کە لە تواناتاندا بێ و بەردەوام بن لەسەری، چونکە خوای گەورە ماندو نابێ لەوەرگرتنی کردەوەکانتان و پاداشت دانەوەتان هەتا ئێوە ماندو بێزار نەبن، خۆشەویسترین کارو کردەوە لەلای خوای گەورە بەردەوامترینیانە با کەمیش بێت). – چونکە کارو کردەوەی کەم و بەردەوام خۆشەویسترە لەلای خوا لە کارو کردەوەی زۆر و بەردەوام نەبوون لەسەری - پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەگەر کارو کردەوەیەکی بکردایە بەرێکوپێکی دەیکردو بەردەوام دەبوو لەسەری.

١٣٦٩ - (صحيح) عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ إِلَى عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ، فَجَاءَهُ، فَقَالَ: (يَا عُثْمَانُ، أَرَغِبْتَ عَن سُنَّتِي؟) قَالَ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَلَكِنْ سُنَّتَكَ أَطْلُبُ، قَالَ: (فَإِنِّي أَنَامُ وَأُصَلِّي، وَأَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأَنْكِحُ النِّسَاءَ، فَاتَّقِ اللَّهَ يَا عُثْمَانُ، فَإِنَّ لأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِضَيْفِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، فَصُمْ وَأَفْطِرْ وَصَلِّ وَنَمْ)

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە (عُثمَان)ی کوڕی (مَظعُون) خۆی یەکلایی کردبووەوە بۆ پەرستش، بۆیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناردی بەدوایا، کاتێ کە هات، پێی فەرموو: (ئەی (عُثمَان) ئەوە پشت هەڵدەکەیت لەسوننەتی من ؟). (عُثمَان) وتی: نەخێر سوێند بە خوا پشت لەسوننەتی تۆ هەڵناکەم ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەڵکو

شوێنکەوتنی سوننەتی تۆم مەبەستە، فەرمووی: (سوننەتی من ئەوەیە هەندێ لەشەو دەخەوم و هەندێ شەویش شەونوێژ دەکەم، هەندێ رۆژ هەیە بەرۆژوو دەبم و هەندێ رۆژیش هەیە بەرۆژوو نابم و دەیشکێنم، ژنیش دەهێنم، لەخوا بترسە ئەی (عُثمَان) خێزانەکەت حەقی لەسەرتە، میوانەکەت حەقی لەسەرتە، نەفست حەقی لەسەرتە - هەقی خێزان و میوان و نەفسی خۆت مەفەوتێنەو حەقی هەموو خاوەن حەقێ بدە - ، هەندێ رۆژ بەرۆژووبە هەندێ رۆژ هەیە بەرۆژوو مەبەو بیشکێنە، هەندێ لەشەو بخەوەو هەندێ لەشەویش نوێژ بکە.

١٣٧٠ - (صحيح) عَن عَلْقَمَةَ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ كَيْفَ كَانَ عَمَلُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ هَلْ كَانَ يَخُصُّ شَيْئًا مِنَ الأَيَّامِ؟ قَالَتْ: لاَ، كَانَ كُلُّ عَمَلِهِ دِيمَةً، وَأَيُّكُمْ يَسْتَطِيعُ مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتَطِيعُ.

واتە: عەلقەمە دەڵێت: لە عائیشەم رەزای خوای لێ بێ پرسی؟ کە ئایا کارو کردەوەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چۆن بوو؟ ئایا هەندێ رۆژی تایبەت کردبوو بۆ کاری چاکە؟ وتی: نەخێر، بەڵکو کارو کردەوەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەمیشەیی و بەردەوام بوو، بەڵام ئەوەی لەتوانای پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم هەیە کەی لەتوانای ئێوەدا هەیە.

# کۆباسەکانی مانگی رەمەزان.

# تفريع لأبواب شهر رمضان.

## باسی هەستان بۆ شەونوێژ لە مانگی رەمەزاندا.

## ٣١٨ - باب فِي قِيَامِ شَهْرِ رَمَضَانَ.

١٣٧١ - (صحيح) عَن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُرَغِّبُ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَأْمُرَهُمْ بِعَزِيمَةٍ، ثُمَّ يَقُولُ: (مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ) فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالأَمْرُ عَلَى ذَلِك، ثُمَّ كَانَ الأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ فِي خِلاَفَةِ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنـه، وَصَدْرًا مِنْ خِلاَفَةِ عُمَرَ رضي الله عنه. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَا رَوَاهُ عُقَيْلٌ وَيُونُسُ وَأَبُو أُوَيْسٍ: (مَنْ قَامَ رَمَضَانَ) وَرَوَى عُقَيْلٌ: (مَنْ صَامَ رَمَضَانَ وَقَامَهُ)

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم یارانی هاندەدا لەسەر شەونوێژی شەوانی رەمەزان بەڵام جەختی لێ نەکردن، لەپاشدا فەرمووی: (هەر کەسێك رەمەزان شەونوێژ بکات بە ئیمانەوە لەبەر رەزامەندی خوای گەورەو بەهیوای پاداشتی پەروەردگاری بێت لەسەر ئەو کارەی، خوا لە گوناهەکانی رابردووی خۆش دەبێت). - راوی فەرمودەکە زوهری دەڵێت: - ئیتر هەتا پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لەدنیا دەرچوو ئەم کارە هەر بەم شێوەیە بوو - واتە خەڵك وەك ئێستا نوێژی تەراویحیان لەمزگەوتدا بە کۆمەڵ ئەنجام نەئەدا - ، لەپاشدا لەسەردەمی خەلافەتی پێشەوا ئەبو بەکردا رەزای خوای لێ بێ ئەم کارە هەر بەم شێوەیە بوو، لەسەرەتای خەلافەتی پێشەوا عومەریشدا رەزای خوای لێ بێ ئەم کارە هەر بەم شێوەیە بوو- ، ئەبو داود دەڵێت: عوقەیل و یونوس و ئەبو ئوەیس فەرمودەی پێشویان بە هەمان شێوە بە: (مَنْ قَامَ رَمَضَانَ...)ە گێراوەتەوە، هەروەها عوقەیل بەم شێوەیە گێرایەوە : (مَنْ صَامَ رَمَضَانَ وَقَامَهُ...). واتە: هەر کەسێك رەمەزان بە رۆژوو بێت بە ئیمانەوە و شەونوێژ بکات....

**١٣٧٢ - (صحيح) عَن أَبِي هُرَيْرَةَ، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)**

واتە: ئەبو هورەیرە فەرمودەکەی بەرزکردەوە هەتا گەیاندیەوە بە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم کە فەرموویەتی: (هەر کەسێك رەمەزان بە رۆژوو بێت بە ئیمانەوە لەبەر رەزامەندی خوای گەورە و بەهیوای پاداشتی پەروەردگاری بێت لەسەر ئەو کارەی، خوا لە گوناهەکانی رابردووی خۆش

دەبێت، وە هەر کەسێك بە ئیمانەوە شەوانی (قَدْر) بە شەونوێژ زیندوبکاتەوە لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە و بەهیوای پاداشتی پەروەردگاری بێت لەسەر ئەو کارەی، خوا لە گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت).

١٣٧٣ - (صحيح) عَن عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى فِي الْمَسْجِدِ، فَصَلَّى بِصَلاَتِهِ نَاسٌ، ثُمَّ صَلَّى مِنَ الْقَابِلَةِ فَكَثُرَ النَّاسُ، ثُمَّ اجْتَمَعُوا مِنَ اللَّيْلَةِ الثَّالِثَةِ، فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا أَصْبَحَ قَالَ: (قَدْ رَأَيْتُ الَّذِي صَنَعْتُمْ، فَلَمْ يَمْنَعْنِي مِنَ الْخُرُوجِ إِلَيْكُمْ، إِلاَّ أَنِّي خَشِيتُ أَنْ يُفْرَضَ عَلَيْكُمْ) وَذَلِكَ فِي رَمَضَانَ.

واتە: لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: شەوێ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەمزگەوت دەستی کرد بە نوێژی تەراویح، چەند کەسێ ئیقتیدایان پێکردو لەدوایەوە بەکۆمەڵ نوێژیان کرد، ئینجا بۆ شەوی دواتر خەڵکەکە زۆربوون و پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەرنوێژی نوێژی تەراویحی بۆکردن، ئینجا بۆ شەوی سێیەم خەڵکێکی زۆرتر لەمزگەوت کۆبوونەوە بەڵام پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەماڵ نەهاتەدەرەوە بۆ ناویان بەرنوێژیان بۆ بکات، کاتێ کە ڕۆژبویەوە فەرمووی: (بێگومان زانیم لەمزگەوتدا کۆبونەتەوە بۆئەوەی بەرنوێژی نوێژی تەراویحتان بۆ بکەم، هیچ شتێ ڕێگری ئەوەی لێ نەکردم کە بێم بۆ ناوتان،

تەنها ئەوە نەبێت كە ئەترسام لەسەرتان فەرز ببێت – و لەسەرتان قورس و گران بێت - ). عائیشە وتی: ئەم بەسەرهاتە لەمانگی رەمەزاندا بوو.

١٣٧٤ - (حسن صحيح) عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ النَّاسُ يُصَلُّونَ فِي الْمَسْجِدِ فِي رَمَضَانَ أَوْزَاعًا، فَأَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَضَرَبْتُ لَهُ حَصِيرًا فَصَلَّى عَلَيْهِ - بِهَذِهِ الْقِصَّةِ - قَالَتْ فِيهِ: قَالَ:- (و) تَعْنِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - (أَيُّهَا النَّاسُ، أَمَا وَاللَّهِ مَا بِتُّ لَيْلَتِي هَذِهِ بِحَمْدِ اللَّهِ غَافِلاً، وَلاَ خَفِيَ عَلَيَّ مَكَانُكُمْ)

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: خەڵك لە مانگی رەمەزاندا لەمزگەوت بەجیا جیا نوێژی تەراوحیان دەكرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێكردم حەسیرێكی بۆ راخەم، منیش حەسیرێكم بۆ راخست و نوێژی لەسەر كرد – جا عائیشە بەسەرهاتی پێشوی گێرایەوە – لە فەرمودەكەیدا وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی خەڵكینە، سوێند بە خوای گەورە ئەم شەو غافڵ نەبووم سوپاس و ستایش بۆ خوا بە ئاگابووم، شوێنەكەتانم لێ ون نەبوو). - واتە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەخەبەر بوو ئاگاداری حاڵیان بوو، بەڵام ئەوكارەی نەكردو نەهاتەدەرەوە بۆ ناویان بەرنوێژیان بۆ بكات هەروەك دوو شەوەكەی تر بەرنوێژی بۆكردن، لەترسی ئەوەی نەوەكا نوێژی تەراویح فەرز ببێت لەسەریان - .

١٣٧٥ - (صحيح) عَن أَبِي ذَرٍّ قَالَ: صُمْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَمَضَانَ، فَلَمْ يَقُمْ بِنَا شَيْئًا مِنَ الشَّهْرِ، حَتَّى بَقِيَ سَبْعٌ، فَقَامَ بِنَا حَتَّى ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ، فَلَمَّا كَانَتِ السَّادِسَةُ لَمْ يَقُمْ بِنَا، فَلَمَّا كَانَتِ الْخَامِسَةُ قَامَ بِنَا، حَتَّى ذَهَبَ شَطْرُ اللَّيْلِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ نَفَّلْتَنَا قِيَامَ هَذِهِ اللَّيْلَةِ! قَالَ: فَقَالَ: (إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا صَلَّى مَعَ الإِمَامِ حَتَّى يَنْصَرِفَ حُسِبَ لَهُ قِيَامُ لَيْلَةٍ) قَالَ: فَلَمَّا كَانَتِ الرَّابِعَةُ لَمْ يَقُمْ، فَلَمَّا كَانَتِ الثَّالِثَةُ جَمَعَ أَهْلَهُ وَنِسَاءَهُ وَالنَّاسَ فَقَامَ بِنَا حَتَّى خَشِينَا أَنْ يَفُوتَنَا الْفَلَاحُ، قَالَ: قُلْتُ: مَا الْفَلَاحُ؟ قَالَ: السُّحُورُ، ثُمَّ لَمْ يَقُمْ بِنَا بَقِيَّةَ الشَّهْرِ.

واتە: (أبی ذر) دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم مانگی رەمەزان بەرۆژوو بووین، لە شەوانی مانگی رەمەزاندا جگە لە نوێژە فەرزەكان بەرنوێژی هیچ نوێژێكی تری بۆ نەكردین هەتا حەوت شەوی مابوو بۆ سەری مانگ، ئەوكاتە هەتا سێیەكی دوایی شەو بەرنوێژی بۆ كردین و بە پەرستش و قورئان خوێندن و یادی خواوە خەریك بوو، كاتێ كە شەش شەوی مابوو بۆ سەری مانگ هەڵنەسا بەرنوێژیمان بۆ بكات، كاتێ كە پێنج شەوی مابوو هەڵنەسا بەرنوێژیمان بۆ بكات هەتا نیوەی شەو تێپەڕی، (أبی ذر) وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆزگە ئەم شەو بۆت زیاد دەكردین واتە هەتا كۆتایی شەو بەرنوێژیت بۆ دەكردین، (أبی ذر) وتی:

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەگەر کەسێك لەگەڵ پێشنوێژ نوێژی عیشاو بەیانی بەکۆمەڵ بکات هەتا پێشنوێژ لەنوێژ دەبێتەوە ئەو شەوەی بە شەونوێژ بۆ حسابە واتە پاداشتی شەوێکی تەواو شەونوێژی بۆ دەنوسرێت). ( أَبِـــی ذَرّ ) وتی: کاتێ کە چوار شەوی ما هەڵنەسا بەرنوێژیمان بۆ بکات، کاتێ کە سێ شەوی ما خێزانەکانی کەسوکارەکەی و خەڵکی کۆکردەوە، ئەوەندە بەرنوێژی بۆ کردین ترساین لەوەی بگاتە کاتی (فلاح)، راوی فەرمودەکە جوبەیر وتی: وتم: کاتی (فلاح) کەیە؟ ( أَبِـــی ذَرّ) وتی: کاتی پارشێوە، ئیتر باقی شەوەکانی تری مانگەکە هەڵنەسا بەرنوێژیمان بۆ بکات.

١٣٧٦ - (صحيح) عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ أَحْيَا اللَّيْلَ، وَشَدَّ الْمِئْزَرَ، وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ.

واتە: عائیشە رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: کاتێ کە دە شەوی کۆتایی مانگی رەمەزان بهاتایە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم شەوەکانی بە پەرستش زیندو دەکردەوە، قۆڵی لێ هەڵئەکردو خۆی گورج دەکردەوەو کاری سەرجێی لەگەڵ خێزانەکانی نەئەکرد، وە خانەوادە و کەسوکارەکەی خەبەردەکردەوە.

١٣٧٧ - (ضعيف) عَن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإِذَا أُنَاسٌ فِي رَمَضَانَ يُصَلُّونَ فِي نَاحِيَةِ الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: (مَا هَؤُلَاءِ؟) فَقِيلَ: هَؤُلَاءِ نَاسٌ لَيْسَ مَعَهُمْ قُرْآنٌ، وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ يُصَلِّي، وَهُمْ يُصَلُّونَ

بِصَلاَتِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَصَابُوا، وَنِعْمَ مَا صَنَعُوا).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەماڵ دەرچوو بۆ مزگەوت خەڵکانێکی بینی لەدوای ئوبەی کوڕی کەعبەوە نوێژیان دەکرد، فەرمووی: (ئەوانە کێن؟). وترا: ئەوانە کەسانێکن قورئانیان لەبەر نیە کەمێ نەبێ، ئوبەی کوڕی کەعب بەرنوێژیان بۆ دەکات ئەوانیش لەدوایەوە نوێژ دەکەن، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (پێکایان، کارێکی زۆر باشیان کرد).

## سەبارەت بە شەوی قەدر

## ٣١٩ - باب فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ.

١٣٧٨ - (حسن صحيح) عَن زِرّ قَالَ: قُلْتُ لأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ: أَخْبِرْنِي عَن لَيْلَةِ الْقَدْرِ يَا أَبَا الْمُنْذِرِ، فَإِنَّ صَاحِبَنَا سُئِلَ عَنهَا، فَقَالَ: مَنْ يَقُمِ الْحَوْلَ يُصِبْهَا، فَقَالَ: رَحِمَ اللَّهُ أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمَ أَنَّهَا فِي رَمَضَانَ - زَادَ مُسَدَّدٌ: وَلَكِنْ كَرِهَ أَنْ يَتَّكِلُوا، أَوْ أَحَبَّ أَنْ لاَ يَتَّكِلُوا، ثُمَّ اتَّفَقَا - وَاللَّهِ إِنَّهَا لَفِي رَمَضَانَ لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ، لاَ يَسْتَثْنِي، قُلْتُ: يَا أَبَا الْمُنْذِرِ أَنَّى عَلِمْتَ

ذَلِكَ؟ قَالَ: بِالآيَةِ الَّتِى أَخْبَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قُلْتُ لِزِرٍّ: مَا الآيَةُ؟ قَالَ: تُصْبِحُ الشَّمْسُ صَبِيحَةَ تِلْكَ اللَّيْلَةِ مِثْلَ الطَّسْتِ، لَيْسَ لَهَا شُعَاعٌ حَتَّى تَرْتَفِعَ.

واتە: زیرِ - ی کوڕی حوبەیش - دەڵێت: بە ئوبەی کوڕی کەعبم وت: ئەی (أبَا الْمُنْذر) باسی شەوی قەدرم بۆ بکە؟ چونکە سەبارەت بە شەوی قەدر لە - (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی مەسعودیان - پرسیوە؟ ئەویش وتویەتی: هەرکەسێ سەرانسەری ساڵ بەردەوام شەونوێژ بکات ئەوساکە توشی شەوی قەدر دەبێت، ئوبەی کوڕی کەعب وتی: ڕەحمەتی خوا لە (أبَا عَبْد الرَّحْمَن) – کە نازناوی (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی مەسعودە – سوێند بە خوا دەزانێ کە ئەو شەوە دەکەوێتە ڕەمەزانەوە، - موسەددەد راوی فەرمودەکە ئەمەی بۆ زیاد کرد: بەڵام پێی ناخۆش بوو پاڵی لێ بدەنەوەو ساردببنەوە، یان پێی خۆش بوو کە پاڵی لێ نەدەنەوەو ساردنەبنەوە، لەپاشدا هەردووکیان هامەهەنگن - سوێند بە خوا دەزانێ ئەو شەوە دەکەوێتە ڕەمەزانەوەو شەوی بیست و حەوتیشە، نەیوت (إن شاء الله)،، وتم: ئەی (أبَا الْمُنْذِر) بە چیا دەزانی ئەو شەوەیە؟ وتی: بەو نیشانەو بەڵگەیەدا کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی راگەیاندین، بە زیرم وت: ئەو نیشانەو بەڵگەیە چییە؟ وتی: بەیانی ئەو شەوە کە خۆر هەڵدێت وەك تەشت وایە، تیشکی نییە هەتا بەرزدەبێتەوە.

١٣٧٩ – (حسن صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُنَيْسٍ قَالَ: كُنْتُ فِى مَجْلِسِ بَنِى سَلِمَةَ وَأَنَا أَصْغَرُهُمْ، فَقَالُوا: مَنْ يَسْأَلُ لَنَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ لَيْلَةِ الْقَدْرِ؟ - وَذَلِكَ صَبِيحَةَ إِحْدَى وَعِشْرِينَ مِنْ رَمَضَانَ - فَخَرَجْتُ فَوَافَيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلاَةَ الْمَغْرِبِ، ثُمَّ قُمْتُ بِبَابِ بَيْتِهِ، فَمَرَّ بِى فَقَالَ: (ادْخُلْ) فَدَخَلْتُ، فَأُتِىَ بِعَشَائِهِ فَرَآنِى أَكُفُّ عَنْهُ مِنْ قِلَّتِهِ، فَلَمَّا فَرَغَ قَالَ: (نَاوِلْنِى نَعْلِى) فَقَامَ وَقُمْتُ مَعَهُ، فَقَالَ: (كَأَنَّ لَكَ حَاجَةً!) قُلْتُ: أَجَلْ، أَرْسَلَنِى إِلَيْكَ رَهْطٌ مِنْ بَنِى سَلِمَةَ يَسْأَلُونَكَ عَنْ لَيْلَةِ الْقَدْرِ، فَقَالَ: (كَمِ اللَّيْلَةُ؟) فَقُلْتُ: اثْنَتَانِ وَعِشْرُونَ. قَالَ: (هِىَ اللَّيْلَةُ) ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: (أَوِ الْقَابِلَةُ) يُرِيدُ لَيْلَةَ ثَلاَثٍ وَعِشْرِينَ.

واتە: (عبد الله)ی كوڕی ئونەیس دەڵێت: لە كۆڕی بەنو سەلەمەدا دانیشتبووم بچوكی هەمووشیان بووم، وتیان: كێ سەبارەت بە شەوی قەدر پرسیارمان بۆ دەكات لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم – ئەوكاتە بەیانی بیست و یەكی مانگی رەمەزان بوو – دەرچووم نوێژی شێوانم هەماهەنگ بوو لەگەڵ نوێژی شێوانی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم، جا لەبەردەم ماڵەكەیدا وەستام، دای بەلامدا، فەرمووی: (وەرە ژوورەوە).

چومە ژوورەوە، نانیان بۆ هێنا بینی من دەست بۆ خواردنەکە نابەم لەبەر کەمی، کاتێ کە لەنان خواردن بویەوە فەرمووی: (ئەو نەعلانەم بدەرێ). نەعلەکانم دایە، هەستا منیش لەخزمەتیدا هەستام، فەرمووی: (وەك ئەوەی کە ئیشێ یان پێویستیەکت هەبێت!). وتم: بەڵێ، چەند کەسێ لە بەنو سەلەمە سەبارەت بە شەوی قەدر پرسیاریان لێت هەیە: کە ئایا دەکەوێتە چ شەوێکی مانگی رەمەزانەوە؟ بۆیە منیان ناردووە بۆلای تۆ هەتا پرسیاریان بۆ بکەم، فەرمووی: (ئەم شەو چەندی مانگە؟). وتم: شەوی بیست و دوو، فەرمووی: (ئەم شەوە). لەپاشدا لە وتەکەی گەڕایەوە فەرمووی: (یان شەوی دواترە). مەبەستی شەوی بیست و سێ بوو.

## باسی ئەوانەی کە دەڵێن: شەوی قەدر شەوی بیست و یەکی مانگە.

## ٣٢٠ - باب فِيمَنْ قَالَ: لَيْلَةُ إِحْدَى وَعِشْرِينَ.

١٣٨٠ - (ضعيف) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الأَوْسَطَ مِنْ رَمَضَانَ، فَاعْتَكَفَ عَامًا حَتَّى إِذَا كَانَتْ لَيْلَةُ إِحْدَى وَعِشْرِينَ - وَهِيَ اللَّيْلَةُ الَّتِي يَخْرُجُ فِيهَا مِنَ اعْتِكَافِهِ - قَالَ: (مَنْ كَانَ اعْتَكَفَ مَعِي فَلْيَعْتَكِفِ الْعَشْرَ الأَوَاخِرَ، وَقَدْ رَأَيْتُ هَذِهِ اللَّيْلَةَ ثُمَّ أُنْسِيتُهَا، وَقَدْ رَأَيْتُنِي أَسْجُدُ

مِنْ صَبِيحَتِهَا فِي مَاءٍ وَطِينٍ، فَالْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ، وَالْتَمِسُوهَا فِي كُلِّ وِتْرٍ) قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَمُطِرَتِ السَّمَاءُ مِنْ تِلْكَ اللَّيْلَةِ، وَكَانَ الْمَسْجِدُ عَلَى عَرِيشٍ فَوَكَفَ الْمَسْجِدُ، فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَأَبْصَرَتْ عَيْنَايَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَى جَبْهَتِهِ وَأَنْفِهِ أَثَرُ الْمَاءِ وَالطِّينِ مِنْ صَبِيحَةِ إِحْدَى وَعِشْرِينَ.

واتە: ئەبو سەعیدی خودری دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە دە شەوی ناوەڕاستی مانگی ڕەمەزاندا دەمایەوە ئیعتیکافی دەکرد، ساڵێ ئیعتیکافی کرد هەتا شەوی بیست و یەك مایەوە - ئەو شەوە ئیعتیکافەکەی تەواو کردو لە مزگەوت دەرچوو - فەرمووی: (ئەوەی دە شەوی ناوەڕاستی مانگی ڕەمەزان لەگەڵما لە مزگەوت مایەوە، با دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزانیش بمێنێتەوە، چونکە نیشانەی شەوی قەدرم نیشان درا زانیم کە ئەم شەوە، بەڵام لەپاشدا لەبیریان بردمەوە، هەروەها خۆمم نیشاندرا لە بەیانیەکەیدا لەسەر قوڕاو سەجدەم دەبرد، دەی کەواتە لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا بگەڕێن بەدوای شەوی قەدردا، وە لەشەوە تاکەکاندا بگەڕێن بەدوایدا). ئەبو سەعید وتی: ئەو شەوە واتە شەوی بیست و یەك باران باری و سەقفی مزگەوتەکە لە پەلکە خورما بوو بۆیە دڵۆپەی باران دەهاتەخوارەوە، هەروەها ئەبو سەعید وتی: بەیانی ڕۆژی بیست و یەکی مانگ بەچاوی خۆم شوێنەواری قوڕاوەکەم بینی بە لوت و تەوێڵی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم.

١٣٨١ - (حسن صحيح) عَن ابْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُنَيْسٍ الْجُهَنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لِي بَادِيَةً أَكُونُ فِيهَا وَأَنَا أُصَلِّي فِيهَا بِحَمْدِ اللَّهِ، فَمُرْنِي بِلَيْلَةٍ أَنْزِلُهَا إِلَى هَذَا الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: (انْزِلْ لَيْلَةَ ثَلاَثٍ وَعِشْرِينَ) فَقُلْتُ لاِبْنِهِ: كَيْفَ كَانَ أَبُوكَ يَصْنَعُ؟ قَالَ: كَانَ يَدْخُلُ الْمَسْجِدَ إِذَا صَلَّى الْعَصْرَ، فَلاَ يَخْرُجُ مِنْهُ لِحَاجَةٍ حَتَّى يُصَلِّيَ الصُّبْحَ، فَإِذَا صَلَّى الصُّبْحَ وَجَدَ دَابَّتَهُ عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ، فَجَلَسَ عَلَيْهَا فَلَحِقَ بِبَادِيَتِهِ.

واتە: لە (عَبْدُ الله)ی کوڕی ئونەیسی جوهەنییەوە، لە باوکیەوە هاتوو، کە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من لەو بیابانە دەژیم و جێگەو ڕێگەی خۆم هەیە سوپاس بۆ خوا هەر لەوێش نوێژ دەکەم، شەوی قەدرم پێ بڵێ هەتا ئەو شەوە دابەزم بۆ ئەم مزگەوتە - ی تۆ واتە مزگەوتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە مەدینە - ، فەرمووی: (شەوی بیست و سێ دابەزە). ڕاوی وتی: بە کوڕەکەیم وت: باوکت ئەو شەوە چی دەکات؟ وتی: — لەرۆژی بیست و دووی مانگی ڕەمەزان - کاتێ کە نوێژی عەسری کرد دەچێتە مزگەوتەوە مەگەر کارێکی زۆر زۆر زەروری هەبێ ئەگینا لە مزگەوت نایەتەدەرەوە هەتا نوێژی بەیانی دەکات هەر خەریکی پەرستشە، کاتێ کە لە نوێژی بەیانی بووەوە لەبەردەم دەرگای مزگەوتدا سواری وڵاخەکەی دەبێت و دەگەڕێتەوە بۆ بیابان.

١٣٨٢ - (صحيح) عَن ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، فِي تَاسِعَةٍ تَبْقَى، وَفِي سَابِعَةٍ تَبْقَى، وَفِي خَامِسَةٍ تَبْقَى)

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (لە دە شەوی کۆتایی مانگی رەمەزاندا بگەڕێن بەدوای شەوی قەدردا، هەروەها نۆ شەوی بمێنێ واتە شەوی بیست و یەك، یان حەوت شەوی بمێنێ واتە شەوی بیست و سێ، یا پێنج شەوی بمێنێ واتە شەوی بیست و پێنج، ئەمە ئەگەر مانگ بیست و نۆ رۆژ بوو.

١٣٨٣ - (صحيح) عَن أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، وَالْتَمِسُوهَا فِي التَّاسِعَةِ، وَالسَّابِعَةِ، وَالْخَامِسَةِ) قَالَ: قُلْتُ: يَا أَبَا سَعِيدٍ إِنَّكُمْ أَعْلَمُ بِالْعَدَدِ مِنَّا، قَالَ: أَجَلْ، قُلْتُ: مَا التَّاسِعَةُ، وَالسَّابِعَةُ، وَالْخَامِسَةُ؟ قَالَ: إِذَا مَضَتْ وَاحِدَةٌ وَعِشْرُونَ فَالَّتِي تَلِيهَا التَّاسِعَةُ، وَإِذَا مَضَى ثَلَاثٌ وَعِشْرُونَ فَالَّتِي تَلِيهَا السَّابِعَةُ، وَإِذَا مَضَى خَمْسٌ وَعِشْرُونَ فَالَّتِي تَلِيهَا الْخَامِسَةُ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریە هاتووە کەوتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى

الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە دە شەوی کۆتایی مانگی رەمەزاندا بگەڕێن بەدوای شەوی قەدردا، لە نۆیەم و حەوتەم و پێنجەمدا، راوی وتی: وتم: ئەی ئەبا سەعید ئێوە لە ئێمە شارەزاترن بە ژمارەکان، وتی: بەڵێ، وتم: دەی لە نۆیەم و حەوتەم و پێنجەم دا یانی چی؟ وتی: ئەگەر مانگ سی رۆژ بوو کە شەوی بیست و یەك تێپەڕی نۆیەم بەدوایدا دێت واتە نۆ رۆژی دەمێنێ بۆ سەری مانگ، کە شەوی بیست و سێ تێپەڕی حەوتەم بەدوایدا دێت واتە حەوت رۆژی دەمێنێ، کە شەوی بیست و پێنج تێپەڕی پێنجەم بەدوایدا دێت واتە پێنج رۆژی دەمێنێ.

## باسی ئەوانەی ریوایەتیان کردوە بە شەوی حەڤدەی مانگ.

## ٣٢١ – باب مَنْ رَوَى أَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعَ عَشْرَةَ.

١٣٨٤ - (ضعيف) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اطْلُبُوهَا لَيْلَةَ سَبْعَ عَشْرَةَ مِنْ رَمَضَانَ، وَلَيْلَةَ إِحْدَى وَعِشْرِينَ، وَلَيْلَةَ ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ). ثُمَّ سَكَتَ.

واتە: ئیبنو مەسعود دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووین: (لە شەوی حەڤدەو بیست و یەك و بیست و سێی مانگی رەمەزاندا بگەڕێن بەدوای شەوی قەدردا). لەپاشدا بێدەنگ بوو.

## باسی ئەوانەی ریوایەتیان کردوە بە حەوت شەوی کۆتایی مانگ.

## ٣٢٢ – باب مَنْ رَوَى فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ.

١٣٨٥ - (صحيح) عَن ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (تَحَرَّوْا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي السَّبْعِ الأَوَاخِرِ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لە حەوت شەوی کۆتایی مانگی رەمەزاندا بگەڕێن بەدوای شەوی قەدردا.

## ئەوانەی کە دەڵێن: شەوی قەدر بیست و حەوتی مانگە.

## ٣٢٣ – باب مَنْ قَالَ: سَبْعٌ وَعِشْرُونَ.

١٣٨٦ - (صحيح) عَن مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ قَالَ: (لَيْلَةُ الْقَدْرِ لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ)

واتە: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەبارەت بە شەوی قەدر فەرموویەتی: (شەوی قەدر شەوی بیست و حەوتی مانگە).

## باسی ئەوانەی کە دەڵێن: لە هەموو شەوێکی ڕەمەزاندایە.

## ٣٢٤ – باب مَنْ قَالَ: هِيَ فِي كُلِّ رَمَضَانَ.

١٣٨٧ - (ضعيف والصحيح موقوف) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا أَسْمَعُ عَنْ لَيْلَةِ الْقَدْرِ فَقَالَ: (هِيَ فِي كُلِّ رَمَضَانَ) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ سُفْيَانُ وَشُعْبَةُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، مَوْقُوفًا عَلَى ابْنِ عُمَرَ، لَمْ يَرْفَعَاهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە (عَبْدُ الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گوێم لێ بوو سەبارەت بە شەوی قەدر لە پێغەمبەری خوایان صلى الله عليه وسلم پرسی؟ ئەویش فەرمووی: (لە هەموو شەوێکی ڕەمەزاندایە). ئەبو داود دەڵێت: سوفیان و شوعبە لە ئەبو ئیسحاقەوە گێڕاویانەتەوە، لەسەر ئیبنو عومەر وەستاون، بەرزیان نەکردۆتەوە بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم.

# باسەکانی قورئان خوێندن بەڕەوانی و بەش بەشکردنی.

# أبواب قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ وَتَحْزِيبِهِ وَتَرْتِيلِهِ

## باسی لەماوەی چەند رۆژدا قورئان خەتم بکرێت.

## ٣٢٥ – باب فِي كَمْ يُقْرَأُ الْقُرْآنُ.

١٣٨٨ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُ: (اقْرَإِ الْقُرْآنَ فِي شَهْرٍ) قَالَ: إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً، قَالَ: (اقْرَأْ فِي عِشْرِينَ) قَالَ: إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً. قَالَ: (اقْرَأْ فِي خَمْسَ عَشْرَةَ) قَالَ: إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً. قَالَ: (اقْرَأْ فِي عَشْرٍ) قَالَ: إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً. قَالَ: (اقْرَأْ فِي سَبْعٍ وَلاَ تَزِيدَنَّ عَلَى ذَلِكَ).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەمرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووە: (مانگی جارێك دەوری قورئان بکەرەوەو خەتمی بکە). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! لەوە زیاتر توانام هەیە، فەرمووی: (لە ماوەی بیست رۆژدا جارێك دەوری قورئان بکەرەوەو

خەتمی بكە). وتی: لەوە زیاتر توانام هەیە، فەرمووی: (لەماوەی دە رۆژدا جارێك دەوری قورئان بكەرەوەو خەتمی بكە). وتی: لەوە زیاتر توانام هەیە. فەرمووی: (دەی هەفتەی جارێك قورئان بە تەواوی بخوێنە، لەوەش زیاتری مەكە واتە با ماوەی خەتمەكە لە هەفتەیە كەمتر نەبێت).

١٣٨٩ - (صحيح) عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (صُمْ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، وَاقْرَإِ الْقُرْآنَ فِي شَهْرٍ) فَنَاقَصَنِي وَنَاقَصْتُهُ فَقَالَ: (صُمْ يَوْمًا، وَأَفْطِرْ يَوْمًا) قَالَ عَطَاءٌ: وَاخْتَلَفْنَا عَنْ أَبِي فَقَالَ بَعْضُنَا: سَبْعَةَ أَيَّامٍ وَقَالَ بَعْضُنَا: خَمْسًا.

واتە: لە (عبدُ الله)ی كوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (مانگی سێ رۆژ بەرۆژوو بە، وە مانگی جارێك دەوری قورئان بكەرەوەو خەتمی بكە). ئەو دەیفەرموو لەو ماوە كەمتر خەتمی قورئان مەكە، منیش پێم رادەگەیاند كە توانای لەوە زیاترم هەیە، ئەویش بەرە بەرە ماوەكەی كەم دەكردەوە، هەتا گەیشتینە ئەوەی كە، فەرمووی: (رۆژێ بەرۆژوو بە، رۆژێ بە رۆژوو مەبە). (عَطاء) وتی: لەگەڵ باوكم جیاوازیمان هەبوو، هەندێكمان وتمان: حەوت رۆژ، هەندێكمان وتمان: پێنج رۆژ.

١٣٩٠ - (صحيح) عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فِي كَمْ أَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟ قَالَ: (فِي شَهْرٍ) قَالَ: إِنِّي أَقْوَى

مِنْ ذَلِكَ (رَدَّدَ الْكَلاَمَ أَبُو مُوسَى) وَتَنَاقَصَهُ، حَتَّى قَالَ: (اقْرَأْهُ فِي سَبْعٍ) قَالَ: إِنِّي أَقْوَى مِنْ ذَلِكَ. قَالَ: (لاَ يَفْقَهُ مَنْ قَرَأَهُ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلاَثٍ)

واتە: لە (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، لە ماوەی چەند ڕۆژدا دەوری قورئان بکەمەوەو خەتمی بکەم؟ فەرمووی: (لە مانگێکدا جارێك). وتی: من لەوە زیاتر توانام هەیە (ئەبو موسا وتەکەی (عَبْدُ اللّه)ی دووبارە دەکردەوە واتە وتەی: (من لەوە زیاتر توانام هەیە)، (عَبْدُ اللّه) داوای دەکرد کە ماوەکەی بۆ کەم بکاتەوە، هەتا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (حەوت ڕۆژ جارێك خەتمی بکە). وتی: من لەوە زیاتریش توانام هەیە، فەرمووی: (هەرکەس لەسێ ڕۆژ کەمتر دەوری قورئان بکاتەوە ئەوە لەمانای قورئان تێ ناگات و بە ڕەوانی نایخوێنێتەوەو بیر لەماناکەی ناکاتەوە).

١٣٩١ - (حسن صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ: لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (اقْرَإِ الْقُرْآنَ فِي شَهْرٍ) قَالَ: إِنَّ بِي قُوَّةً. قَالَ: (اقْرَأْهُ فِي ثَلاَثٍ).

واتە: لە (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (مانگی جارێك دەوری قورئان بکەرەوەو خەتمی بکە). وتی: من لەوە زیاتر توانام هەیە فەرمووی: (لە ماوەی سێ ڕۆژدا دەوری قورئان بکەرەوە).

# باسی بەش بەشكردنی قورئان و هەر رۆژەو خوێندنی بەشێ.

## ٣٢٦ - باب تَحْزِيبِ الْقُرْآنِ.

١٣٩٢ - (صحيح) عَن ابْنِ الْهَاد قَالَ: سَأَلَنِى نَافِعُ بْنُ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ فَقَالَ لِى: فِى كَمْ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟ فَقُلْتُ: مَا أُحَزِّبُهُ. فَقَالَ لِى نَافِعٌ: لاَ تَقُلْ مَا أُحَزِّبُهُ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (قَرَأْتُ جُزْءًا مِنَ الْقُرْآنِ).

واتە: (ابنِ الهاد) دەڵێت: نافعی كوڕی جوبەیری كوڕی (مُطعِم) لێی پرسیم و پێی وتم: لەماوەی چەند رۆژدا دەوری قورئان دەكەیتەوەو خەتمی دەكەیت؟ وتم: بەش بەشی ناكەم ئەوەی دەیخوێنم تایبەت و دیاریكراو نیە، نافع پێی وتم: ئینكاری بەش بەشكردنی قورئان مەكە، چونكە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (جوزئێ لە قورئانم خوێند).

١٣٩٣ - (ضعيف) عَن عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَوْسٍ، عَن جَدِّهِ - قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَعِيدٍ فِى حَدِيثِهِ: أَوْسُ بْنُ حُذَيْفَةَ - قَالَ: قَدِمْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى وَفْدِ ثَقِيفٍ قَالَ: فَنَزَلَتِ الأَحْلاَفُ عَلَى الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ،

وَأَنْزَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَنِى مَالِكٍ فِى قُبَّةٍ لَهُ. - قَالَ مُسَدَّدٌ: وَكَانَ فِى الْوَفْدِ الَّذِينَ قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ ثَقِيفٍ - . قَالَ: كَانَ كُلَّ لَيْلَةٍ يَأْتِينَا بَعْدَ الْعِشَاءِ يُحَدِّثُنَا، قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: - قَائِمًا عَلَى رِجْلَيْهِ، حَتَّى يُرَاوِحَ بَيْنَ رِجْلَيْهِ مِنْ طُولِ الْقِيَامِ - وَأَكْثَرُ مَا يُحَدِّثُنَا مَا لَقِىَ مِنْ قَوْمِهِ مِنْ قُرَيْشٍ، ثُمَّ يَقُولُ: (لاَ سَوَاءً) كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ مُسْتَذَلِّينَ - قَالَ مُسَدَّدٌ: بِمَكَّةَ - فَلَمَّا خَرَجْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ كَانَتْ سِجَالُ الْحَرْبِ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ: نُدَالُ عَلَيْهِمْ، وَيُدَالُونَ عَلَيْنَا). فَلَمَّا كَانَتْ لَيْلَةً أَبْطَأَ عَنِ الْوَقْتِ الَّذِى كَانَ يَأْتِينَا فِيهِ، فَقُلْنَا: لَقَدْ أَبْطَأْتَ عَنَّا اللَّيْلَةَ؟ قَالَ: (إِنَّهُ طَرَأَ عَلَىَّ جُزْئِى مِنَ الْقُرْآنِ، فَكَرِهْتُ أَنْ أَجِىءَ حَتَّى أُتِمَّهُ). قَالَ أَوْسٌ: سَأَلْتُ أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَيْفَ يُحَزِّبُونَ الْقُرْآنَ، قَالُوا ثَلاَثٌ، وَخَمْسٌ، وَسَبْعٌ، وَتِسْعٌ، وَإِحْدَى عَشْرَةَ، وَثَلاَثَ عَشْرَةَ، وَحِزْبُ الْمُفَصَّلِ وَحْدَهُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَحَدِيثُ أَبِى سَعِيدٍ أَتَمُّ.

واتە: لە (عثمان)ی کوڕی (عبدُ اللە)ی کوڕی ئەوسەوە، لە باپیریەوە، (عبدُ

اللـه)ی کوڕی سـەعید لـە فەرموودەکەیدا وتـی: ئەوسـی کـوڕی (حُذَيفَـة)ەوە — هـاتووە، کـە وتویـەتی: بـە نوێنەرایـەتی هـۆزی (ثَقِیـف) گەیشـتینە خزمـەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، - هۆزی (ثقِیـف)یش دوو بـەرەباب بـوون بـەرەی ئـەحلاف و بـەرەی بـەنی مالـك — ئـەوس وتـی: بـەرەی ئـەحلاف لـەلای مـوغیرەی کـوڕی شـوعبە دابـەزین، پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم خێمەیەکی هەبوو بەرەی بەنی مالـك لـەلای ئـەو خێمـە دابـەزین، - موسـەددەد وتـی: ئـەوس یـەکێك بـوو لـەو نوێنەرانـەی (ثقِیـف) کـە هاتنـە خزمـەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئـەوس وتـی: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم هـەموو شـەوێ لـەدوای نوێـژی عیشـا دەهاتـە لامـان قسـەی بـۆ دەکردین، ئەبو سەعید وتی: هەر جارەی هێزی خۆی دەدایـە سـەر قاچێکی بـۆ ئـەوەی قاچەکەی تـری ئیسـراحەت بکـات، بـەزۆری باسـی ئـەو هـەموو ئـازار و بەڵایـەی بـۆ دەکـردین کـە بەدەسـت قەومەکـەی قورەیشـەوە بەسـەریان هـات، لەپاشدا فەرمووی: (ئێمەو ئەوان وەك یەك نەبووین ئەوکاتە ئێمـە چەوساوەو بـێ دەسـەڵات و دامـاو بـووین، ئـەوانیش خـاوەنی دەسـەڵات و مـل هـوڕو بـوون، بەڵام ئێستاکە خوای گەورە سەرشۆڕی کردون، - موسـەددەد وتـی: لـە مەککـە — کاتێ کە کۆچمان کرد بۆ مەدینە جەنگ لەنێوانماندا بە نۆبە بـوو هـەر جارەو لایەکمان سـەردەکەوت، شـەوێ لەکاتەکـەی خـۆی دواکـەوت و نـەهات بـۆ لامـان، وتمـان: بەڕاسـتی ئـەم شـەو دواکـەوت؟ کـاتێ کـە هـات فـەرمووی: (خـەریکی خوێندنی ئەو بەشە قورئانە بووم کە ڕۆژانە دەیخوێنم، بۆیە پێم خۆش نەبوو هەتا تەواوی نەکەم بێم بۆ ناوتان). ئەوس وتی: سەبارەت بە بەش بەشـکردنی قورئـان لـە یـارانی پێغەمبـەری خـوام صـلی الله علیـە وسـلم پرسـی کـە چـۆن قورئانتـان بـەش بـەش دەکـرد؟ وتیـان: سـێ سـورەت لـە قورئـان بەشـێ- ئەگـەر سورەتی (فاتحـة) حسـاب بکرێـت ئـەوا: سـورەتی (فاتحـة) و سـورەتی (بقـرة) و سورەتی (وآل عمران) بەشێکە، ئەگەر حساب نەکرێت ئـەوا: سـورەتی (بقـرة) و

سورەتی (آل عمران) و سورەتی (نساء) بەشێكە، وە پێنج سورەت لە قورئان بەشێ، وە حەوت سورەت لە قورئان بەشێ، وە نۆ سورەت لە قورئان بەشێ، وە یانزە سورەت لە قورئان بەشێ، وە سیانزە سورەت لە قورئان بەشێ، لەدوای سورەتی قاف(ق)ەوە هەتا كۆتایی قورئان بەشێ، ئەبو داود دەڵێت: فەرمودەكەی ئەبو سەعید تەواوترە.

١٣٩٤ - (صحيح) عَن عَبْدِ اللَّهِ - يَعْنِي ابْنَ عَمْرٍو - قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ يَفْقَهُ مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلاَثٍ)

واتە: لە (عَبدُ اللە) — واتە ئیبنو عەمر - ەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەس لەسێ رۆژ كەمتر دەوری قورئان بكاتەوە ئەوە لەمانای قورئان تێ ناگات و بە رەوانی نایخوێنێتەوەو بیر لەماناكەی ناكاتەوە).

١٣٩٥ - (صحيح إلا قوله (لَمْ يَنْزِلْ مِنْ سَبْعٍ) عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي كَمْ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟ قَالَ: (فِي أَرْبَعِينَ يَوْمًا) ثُمَّ قَالَ: (فِي شَهْرٍ) ثُمَّ قَالَ: (فِي عِشْرِينَ) ثُمَّ قَالَ: (فِي خَمْسَ عَشْرَةَ) ثُمَّ قَالَ: (فِي عَشْرٍ) ثُمَّ قَالَ: (فِي سَبْعٍ) لَمْ يَنْزِلْ مِنْ سَبْعٍ.

واتە: لە (عَبدُ اللە)ی كوڕی عەمرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە

لە پێغەمبەری صلی الله علیە وسلم پرسیوە لە ماوەی چەند رۆژدا دەوری قورئان بكەمەوەو خەتمی بكەم؟ پێغەمبەری صلی الله علیە وسلم فەرمووی: (لەماوەی چل رۆژدا جارێك). لەپاشدا فەرمووی: (لەماوەی مانگێكدا). ئینجا فەرمووی: (لە ماوەی بیست رۆژدا). لەپاشدا فەرمووی: (لە ماوەی پانزە رۆژدا). ئینجا فەرمووی: (لە ماوەی دە رۆژدا). لەپاشدا فەرمووی: (لە ماوەی حەوت رۆژدا). ئیتر لە حەوت رۆژەكە نەهاتەخوارەوەو كەمی نەكردەوە .

١٣٩٦ - (صحيح دون سرد السور) عَن عَلْقَمَةَ وَالأَسْوَدِ قَالاَ: أَتَى ابْنَ مَسْعُودٍ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنِّي أَقْرَأُ الْمُفَصَّلَ فِي رَكْعَةٍ، فَقَالَ: أَهَذًّا كَهَذِّ الشِّعْرِ؟!، وَنَثْرًا كَنَثْرِ الدَّقَلِ؟!، لَكِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْرَأُ النَّظَائِرَ: السُّورَتَيْنِ فِي رَكْعَةٍ: (الرَّحْمَنَ وَالنَّجْمَ) فِي رَكْعَةٍ: وَاقْتَرَبَتْ وَالْحَاقَّةَ: فِي رَكْعَةٍ، وَالطُّورَ وَالذَّارِيَاتِ: فِي رَكْعَةٍ، وَإِذَا وَقَعَتْ وَنُونَ: فِي رَكْعَةٍ، وَسَأَلَ سَائِلٌ وَالنَّازِعَاتِ: فِي رَكْعَةٍ، وَوَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ وَعَبَسَ: فِي رَكْعَةٍ، وَالْمُدَّثِّرَ وَالْمُزَّمِّلَ: فِي رَكْعَةٍ، وَهَلْ أَتَى وَلاَ أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ: فِي رَكْعَةٍ، وَعَمَّ يَتَسَاءَلُونَ وَالْمُرْسَلاَتِ: فِي رَكْعَةٍ، وَالدُّخَانَ وَإِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ: فِي رَكْعَةٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا تَأْلِيفُ ابْنِ مَسْعُودٍ رَحِمَهُ اللَّهُ.

واتە: عەلقەمەو ئەسوەد دەڵێن: پیاوێ هاتە لای ئیبنو مەسعود وتی: من لە رکاتێکدا سورەتە (مُفَصَّل)ەکان دەخوێنم، ئیبنو مەسعود وتی: ئایا بە پەلە دەیخوێنیتەوە وەك خوێندنەوەی شیعر؟!، یان وەك خوێندنەوەی پەخشان کە دەڵێی خورما لە دارخورما دەتەکێنی؟! بەڵام پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ئەم جۆرە سورەتانەی دەخوێند کە لەدرێژیدا لەیەکەوە نزیك بوون: دوو سورەت لە رکاتێکدا، سورەتی (الرَّحْمَنَ وَالنَّجْمَ) لە رکاتێکدا، سورەتی (وَاقْتَرَبَتْ وَالْحَاقَّةَ) لە رکاتێکدا، سورەتی (وَالطُّورَ وَالذَّارِيَاتِ) لە رکاتێکدا، سورەتی (إِذَا وَقَعَتْ وَنون) لە رکاتێکدا، سورەتی (سَأَلَ سَائِلٌ وَالنَّازِعَاتِ) لە رکاتێکدا، سورەتی (وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ وَعَبَسَ) لە رکاتێکدا، سورەتی (وَالْمُدَّثِّرَ وَالْمُزَّمِّلَ) لە رکاتێکدا، سورەتی (هَلْ أَتَى وَلاَ أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ) لە رکاتێکدا، سورەتی (وَعَمَّ يَتَسَاءَلُونَ وَالْمُرْسَلاَتِ) لە رکاتێکدا، سورەتی (وَالدُّخَانَ وَإِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ) لە رکاتێکدا، ئەبو داود دەڵێت: ئەم رێکخستن(تەرتیب)ە هی ئیبنو مەسعودە.

**١٣٩٧ - عَن عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا مَسْعُودٍ وَهُوَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ قَرَأَ الآيَتَيْنِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ)**

واتە: لە (عَبدُ الرَحمَن)ی کوڕی یەزیدەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئەبو مەسعود تەوافی دەکرد بەدەوری کەعبەدا لێم پرسی؟ وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی (البقرة) بەشەو بخوێنێ ئەو شەوە ئەوەی بەسە). – هەندێ لە زانایان دەڵێن:

لەجیاتی شەونوێژ بەسیەتی، هەندێکی تریان دەڵێن: خوێندنی ئەو دوو ئایەتەی بەسە بۆ ئەوەی خوای گەورە بیپارێزێت بەلاو لەشەڕی شەیتان و لەهەموو خراپەیە - .

١٣٩٨ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ قَامَ بِعَشْرِ آيَاتٍ لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ، وَمَنْ قَامَ بِمِائَةِ آيَةٍ كُتِبَ مِنَ الْقَانِتِينَ، وَمَنْ قَامَ بِأَلْفِ آيَةٍ كُتِبَ مِنَ الْمُقَنْطَرِينَ).

واتە: لە (عبدُ الله)ی کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێك لەشەونوێژدا دە ئایەت بخوێنێ ئەوە ناوی تۆمار ناکرێ لە ریزی بێ ئاگاو لە خوا غافڵەکان، هەرکەسێ سەد ئایەت بخوێنێ ئەوا ناوی لە ریزی ئەو کەسانە دەنوسرێت کە لە فەرمانبەرداری خوای گەورە دەرناچن و مل کەچن بۆی و لە شەو نوێژدا زۆر بەپێوە رادەوەستن، ئەگەر کەسێ هەزار ئایەت بخوێنێ ئەوا ناوی لە ریزی ئەوانەدا تۆمار دەکرێ کە پاداسشت و خێری بێ شوماریان بۆ نوسراوە، بۆ نمونە بەئەندازەی دنیاو ئەوەشی لە ناویدایە).

١٢٩٩ - (ضعيف) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: أَتَى رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: أَقْرِئْنِي يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: (اقْرَأْ ثَلاَثًا مِنْ ذَوَاتِ (الرَّاءِ)، فَقَالَ: كَبِرَتْ

سِنِّي، وَاشْتَدَّ قَلْبِي، وَغَلُظَ لِسَانِي! قَالَ: (فَاقْرَأْ ثَلاثًا مِنْ ذَوَاتِ (حم)، فَقَالَ: مِثْلَ مَقَالَتِهِ، فَقَالَ: (اقْرَأْ ثَلاثًا مِنَ الْمُسَبِّحَاتِ)، فَقَالَ: مِثْلَ مَقَالَتِهِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَقْرِئْنِي سُورَةً جَامِعَةً، فَأَقْرَأَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ﴾) حَتَّى فَرَغَ مِنْهَا، فَقَالَ الرَّجُلُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لاَ أَزِيدُ عَلَيْهَا أَبَدًا، ثُمَّ أَدْبَرَ الرَّجُلُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَفْلَحَ الرُّوَيْجِلُ) مَرَّتَيْنِ.

واتە: لە (عَبْدُ الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم شتێ لەقورئانم فێر بکە، فەرمووی: (سێ سورەت لەو سورەتانە بخوێنە کە سەرەتا بە (رٰاءِ) دەستیان پێکردوە). وتی: بەساڵاچووم بۆیە توانای لەبەرکردنم نەماوە، دڵم گیراوەو هێزی لەبەرکردنی نەماوەو زوو شتم لەبیردەچێتەوە، زمانم قورس بووە بە باشی قورئانم بۆ ناخوێنرێتەوە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (سێ سورەت لەو سورەتانە بخوێنە کە سەرەتا بە (حم) دەستیان پێکردوە). - و لەوان کورت ترن -، پیاوەکە وتەکەی پێشوی دووبارە کردەوە، فەرمووی: (سێ سورەت لەو سورەتانە بخوێنە کە سەرەتا بە تەسبیحات(سبح) دەستیان پێکردوە). - و لەوان کورت ترن - ، پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سورەتێکی گشتگیرم فێر بکە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم (﴿إِذَا

زُلۡزِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ ) بۆ خوێندەوە هەتا کۆتایی سورەتەکە کاتێ کە لێ بووەوە، پیاوەکە وتی: بەوکەسەی کە تۆی بەهەق رەوانەکردوە هەرگیز لەوە زیاتری ناکەم، لەپاشدا رۆشت، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دووجار فەرمووی: ((الرُّوَيْجِلُ) سەرکەوت و سەرفراز بوو).-(الرُّوَيْجِلُ) بچوککراوەی ناوی (رجل)ە واتە: پیاو.-

## باسی سەبارەت بە ژمارەی ئایەتەکان.

## ٣٢٧ - باب فِي عَدَدِ الآيِ.

١٤٠٠ - عَن أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (سُورَةٌ مِنَ الْقُرْآنِ ثَلاثُونَ آيَةً تَشْفَعُ لِصَاحِبِهَا حَتَّى يُغْفَرَ لَهُ: (تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: سورەتێ لە قورئاندا هەیە ژمارەی ئایەتەکانی سی ئایەتە شەفاعەت دەکات بۆ ئەو کەسانەی کە لەبەری دەکەن و دەیخوێنن هەتا بەهۆی خوێندنەوەیانەوە خوا لێیان خۆش دەبێت ئەویش سورەتی: (تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ )ە.

# باسەكانی سەجدەی قورئان خوێندن و چەند سەجده له قورئاندا هەیه؟

# ٣٢٨ – تَفْرِيعِ أَبْوَابِ السُّجُودِ، وَكَمْ سَجْدَةٍ فِي الْقُرْآنِ.

١٤٠١ - (ضعيف) عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقْرَأَهُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَجْدَةً فِي الْقُرْآنِ: مِنْهَا ثَلَاثٌ فِي الْمُفَصَّلِ، وَفِي سُورَةِ الْحَجِّ سَجْدَتَانِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رُوِيَ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، إِحْدَى عَشْرَةَ سَجْدَةً، وَإِسْنَادُهُ وَاهٍ.

(المشكاة:١٠٢٩).

واته: له عەمری كوڕی عاصەوه ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوه، كه پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم له قورئاندا پانزه سەجدەی پێ خوێندوه: سێ سەجده له سورەته (مُفصَّل)ەكاندا - كه لەم سێ سورەتەدان: سورەتی (نجم) و سورەتی (إنشقاق) و سورەتی (اقرأ) - ، سورەتی (الحج)یش دوو سەجدەی تێدایه. ئەبو داود دەڵێت: له ئەبو (درداء)ەوه یانزه سەجده هاتووه، ئەویش له پێغەمبەرەوه صلی الله علیه وسلم گێڕاویەتیەوه، سەنەدەكەی لاوازه.

١٤٠٢ - (صحيح دون قوله: (وَمَن لَمْ يَسجُدهُمَا...)) عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ قَالَ: قُلْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَفِي سُورَةِ الْحَجِّ سَجْدَتَانِ؟)، قَالَ: (نَعَمْ، وَمَنْ لَمْ يَسْجُدْهُمَا فَلاَ يَقْرَأْهُمَا).

واتە: عوقبەی کوڕی عامر دەڵێت: وتم بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم! سورەتی حەج دوو ئایەتی سەجدەی تێدایە؟ فەرمووی: (بەڵێ، هەرکەس لەکاتی خوێندنی ئەو دوو ئایەتەدا سەجدە نەبات با سورەتی سەجدە نەخوێنێت).

## باسی ئەوانەی کە پێیان وایە سورەتە (مفصل)کان سەجدەی قورئان خوێندنیان تێدا نیە.

## ٣٢٩ – باب مَنْ لَمْ يَرَ السُّجُودَ فِي الْمُفَصَّلِ.

١٤٠٣ - (ضعيف) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَسْجُدْ فِي شَيْءٍ مِنَ الْمُفَصَّلِ مُنْذُ تَحَوَّلَ إِلَى الْمَدِينَةِ.

(المشكاة: ١٠٣٤).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەوەتی کۆچی کردوە بۆ مەدینە لەهیچ سورەتێ لە سورەتە (مفصل)کاندا سەجدەی قورئان خوێندنی نەبردوە.

١٤٠٤ - (صحيح) عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: قَرَأْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّجْمَ، فَلَمْ يَسْجُدْ فِيهَا.

واتە: زەیدی کوڕی (ثابت) دەڵێت: سورەتی نەجمم خوێندەوە بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، سەجدەی تێدا نەبرد.

١٤٠٥ - (ضعيف) عَنْ خَارِجَةَ بْنِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِمَعْنَاهُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: كَانَ زَيْدٌ الإِمَامَ فَلَمْ يَسْجُدْ فِيهَا.

واتە: فەرمودەی پێشو بە هەمان مانا هاتووە، لە خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی (ثابت)ەوە، لە باوکیەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم.
ئەبو داود دەڵێت: زەید پێشنوێژ بوو سەجدەی تێدا نەبرد.

# باسی ئەوانەی کە پێیان وایە سورەتە(مفصل)کان سەجدەی قورئان خوێندنیان تێدایە.

## ٣٣٠ – باب مَنْ رَأَى فِيهَا السُّجُودَ.

١٤٠٦ - (صحيح) عَن عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَرَأَ سُورَةَ النَّجْمِ، فَسَجَدَ فِيهَا، وَمَا بَقِيَ أَحَدٌ مِنَ الْقَوْمِ إِلاَّ سَجَدَ، فَأَخَذَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ كَفًّا مِنْ حَصًى أَوْ تُرَابٍ فَرَفَعَهُ إِلَى وَجْهِهِ، وَقَالَ: يَكْفِينِي هَذَا. قَالَ: عَبْدُ اللَّهِ فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ بَعْدَ ذَلِكَ قُتِلَ كَافِرًا.

واتە: (عَبْدُ اللّه) - ی کوڕی مەسعود - دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سورەتی نەجمی خوێندو، سەجدەی تێدا برد، لەو خەڵكانەی كە لەوێ بوون هیچ كەسێ نەما سەجدە نەبات، تەنیا پیاوێ نەبێت كە مشتێ ورده بەرد یان خۆڵی هەلگرت و بەرزی كردەوە بۆ تەوێڵی و وتی: ئەمەم بەسە. (عَبْدُ اللّه) وتی: لەدواییدا ئەو پیاوەم بە چاوی خۆم دی بەكافری كوژرا.

# باسی سەجدەی قورئان خوێندن

## لەسورەتی: (إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ) و (إقْرأ)دا.

## ٣٣١ – باب السُّجُودِ فِي (إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ) وَ (اقْرَأْ)

**١٤٠٧ - (صحيح) عَن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَجَدْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي (إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ) وَ (ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسورەتی (إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ)دا - لەکاتی خوێندنی ئایەتی (وَإِذَا قُرِئَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقُرۡءَانُ لَا يَسۡجُدُونَ )دا، وە لە کۆتایی سورەتی (ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ)دا، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم سەجدەی قورئان خوێندنمان برد.

**١٤٠٨ - (صحيح) عَن أَبِي رَافِعٍ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ الْعَتَمَةَ فَقَرَأَ: (إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ) فَسَجَدَ، فَقُلْتُ: مَا هَذِهِ السَّجْدَةُ؟! قَالَ: سَجَدْتُ بِهَا خَلْفَ أَبِي الْقَاسِمِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلاَ أَزَالُ أَسْجُدُ بِهَا حَتَّى أَلْقَاهُ.**

واتە: ئەبو رافیع وتی: لەتەك ئەبو هورەیرەدا نوێژی عیشام کرد واتە ئەبو هورەیرە بەرنوێژی بۆ کردون، سورەتی: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾ی خوێند کە گەیشتە ئایەتی سەجدە سەجدەی برد، وتم: ئەم سەجدە چی بوو؟ وتی: لەدوای ئەبو قاسمەوە صلی الله علیه وسلم نوێژم کردوە لەکاتی خوێندنی ئەم ئایەتەدا لەناو نوێژدا سەجدەی قورئان خوێندنم بردووە، لەبەر ئەوە بەردەوام لەکاتی خوێندنی ئەم ئایەتەدا سەجدە دەبەم هەتا بەدیداری ئەبو قاسم صلی الله علیه وسلم شاد دەبم.

## باسی سەجدەی قورئان خوێندن

## لەسورەتی: (ص)دا.

## ٣٣٢ – باب السُّجُودِ فِي (ص)

١٤٠٩ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَيْسَ (ص) مِنْ عَزَائِمِ السُّجُودِ، وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْجُدُ فِيهَا.

واتە: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: ئایەتەکەی سورەتی: (ص) لە ئایەتە دامەزراوەکانی سەجدەی قورئان خوێندن نیە، بەڵام بە چاوی خۆم دیم پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەجدەی تێدا برد.

١٤١٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ (ص)، فَلَمَّا بَلَغَ السَّجْدَةَ نَزَلَ فَسَجَدَ وَسَجَدَ النَّاسُ مَعَهُ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمٌ آخَرُ قَرَأَهَا فَلَمَّا بَلَغَ السَّجْدَةَ تَشَزَّنَ النَّاسُ لِلسُّجُودِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّمَا هِيَ تَوْبَةُ نَبِيٍّ، وَلَكِنِّي رَأَيْتُكُمْ تَشَزَّنْتُمْ لِلسُّجُودِ) فَنَزَلَ فَسَجَدَ وَسَجَدُوا.

واتە: ئەبو سەعیدی خودری دەڵێت: ڕۆژێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر مینبەر سورەتی: (ص)ی خوێند، كاتێ كە گەیشتە ئایەتی سەجدە دابەزی سەجدەی برد، خەڵكەكەش لەتەكیا سەجدەیان برد، ڕۆژێكی تر هەمان سورەتی دەخوێند كاتێ كە گەیشتەوە سەر ئایەتی سەجدە خەڵكەكە خۆیان ئامادەكرد بۆ سەجدە بردن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەم سەجدەیە سەجدەی تەوبەی داود پەیامبەرە، بەڵام وا دەبینم ئێوە خۆتان ئامادەكردوە بۆ سەجدە بردن). جا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەسەر مینبەرەكە دابەزی و سەجدەی برد، خەڵكەكەش سەجدەیان برد.

## باسی کەسیٚ گوێی لە ئایەتی سەجدە بێت لەکاتێکدا کە سوار بیٚ، یان لەنوێژدا نەبێت.

## ٣٣٣ - باب فِي الرَّجُلِ يَسْمَعُ السَّجْدَةَ وَهُوَ رَاكِبٌ (أو فِي غَيْرِ الصَّلاَةِ).

١٤١١ - (ضعيف) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَرَأَ عَامَ الْفَتْحِ سَجْدَةً، فَسَجَدَ النَّاسُ كُلُّهُمْ: مِنْهُمُ الرَّاكِبُ، وَالسَّاجِدُ فِي الأَرْضِ، حَتَّى إِنَّ الرَّاكِبَ لَيَسْجُدُ عَلَى يَدِهِ.

(المشكاة:١٠٣٣).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەساڵی رزگارکردنی مەککەدا ئایەتی سەجدەی خوێند، خەڵکەکە هەموویان سەجدەیان برد: هەیان بوو سواربوو، هەشیان بوو پیادە بوو لەسەر زەوی سەجدەی دەبرد، هەتا سوار هەبوو دەستی لەسەر کۆپانی وڵاخەکەی دائەنا جا لەسەر دەستی سەجدەی دەبرد.

١٤١٢ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ عَلَيْنَا السُّورَةَ - قَالَ ابْنُ نُمَيْرٍ: فِي غَيْرِ

الصَّلاَةِ، ثُمَّ اتَّفَقَا -: فَيَسْجُدُ وَنَسْجُدُ مَعَهُ، حَتَّى لاَ يَجِدُ أَحَدُنَا مَكَانًا لِمَوْضِعِ جَبْهَتِهِ.

واتە: ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم سورەتێك لەو سورەتانەی پێ خوێندین كە ئایەتی سەجدەیان تێدایە - ئیبنو نومەیر وتی: لەناو نوێژدا نەبوو، لەپاشدا هەردوو راوی فەرمودەكە یەحیاو ئیبنو نومەیر هەماهەنگن لەسەر ئەوەی - كە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم سەجدەی برد، ئێمەش لە تەكیا سەجدەمان برد لەبەر زۆری خەڵكەكە هەندێكمان جێگەی دەست نەدەكەوت هەتا تەوێڵی لەسەر دابنێ و سەجدە ببات.

١٤١٣ - (منكر بذكر التكبير، والمحفوظ دونه كما في الذي قبله (١٤١٢))

عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ عَلَيْنَا الْقُرْآنَ فَإِذَا مَرَّ بِالسَّجْدَةِ كَبَّرَ وَسَجَدَ وَسَجَدْنَا. قَالَ: عَبْدُ الرَّزَّاقِ وَكَانَ الثَّوْرِيُّ يُعْجِبُهُ هَذَا الْحَدِيثُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: يُعْجِبُهُ لأَنَّهُ كَبَّرَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم قورئانی پێ دەخوێندین، كاتێ كە ئایەتی سەجدەی دەخوێند (الله أكبر)ی كردو سەجدەی دەبرد، ئێمەش سەجدەمان دەبرد.(عَبْدُ الرَّزَّاق) دەڵێت: (ثَوری) موعجیب بووە بەم فەرمودەوە. ئەبو داود دەڵێت: موعجیب بووە چونكە باسی (الله أكبر) كردنی تێدایە.

## باسی کەسیٚ سەجدەی قورئان خوێندنی برد چی بڵێت.

## ٣٣٤ – باب مَا يَقُولُ إِذَا سَجَدَ.

١٤١٤ - (صحيح) عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ فِي سُجُودِ الْقُرْآنِ بِاللَّيْلِ، يَقُولُ فِي السَّجْدَةِ مِرَارًا: (سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەشەو لەسەجدەی قورئان خوێندندا چەند جار لەسەریەك دەیفەرموو: (رووی من سەجدەی برد، بۆ ئەو زاتەی کە دروستی کردوە، وێنەی کێشاوە، گویٚ و چاوی تێدا رواندوووە، بە گۆڕانکاری خۆی و توانایی ئەو پاك و بیٚ عەیب و خاوەن خەیری زۆر).

# باسی کەسێ کاتێ کە ئایەتی سەجدەی خوێند لەدوای نوێژی بەیانی و پێش خۆر هەڵاتنەوە سەجدە بەرێت یان نا؟

## ٣٣٥ – باب فِيمَنْ يَقْرَأُ السَّجْدَةَ بَعْدَ الصُّبْحِ.

١٤١٥ - (ضعيف) عَن أَبو تَمِيمَةَ الْهُجَيْمِيُّ قَالَ: لَمَّا بَعَثْنَا الرَّكْبَ - قَالَ أَبو دَاوُدَ: يَعْنِي إِلَى الْمَدِينَةِ قَالَ: - كُنْتُ أَقُصُّ بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ فَأَسْجُدُ فيها، فَنَهَانِي ابْنُ عُمَرَ فَلَمْ أَنْتَهِ - ثَلاَثَ مِرَارٍ – ثُمَّ عَادَ فَقَالَ: إِنِّي صَلَّيْتُ خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَعَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ رَضِيَ اللهُ عَنهُم فَلَمْ يَسْجُدُوا حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ.

واتە: ئەبو تەمیمەی هوجەیمی دەڵێت: کاتێ کە لەگەڵ کۆمەڵێ سوارچاکدا ناردینیان - ئەبو داود دەڵێت: واتە ناردینیان بۆ مەدینە ئەبو تەمیمە وتی: – منیش لەدوای نوێژی بەیانیەوە ئامۆژگاری خەڵکم دەکرد کاتێ کە سورەتێکم دەخوێند ئایەتی سەجدەی تێدا بوایە سەجدەم دەبرد، ئیبنو عومەر - سێ جار - رێگری ئەو کارەی لێ کردم کە لەدوای نوێژی بەیانی و پێش خۆر هەڵاتنەوە

سەجدە بەرم، بەڵام من هەر سەجدەم دەبرد، لەپاشدا ئیبنو عومەر گەڕایەوە چوارەم جار وتی: لەدوای پێغەمبەری خواوە صلی الله علیە وسلم و ئەبو بەکرو عومەر و (عثمان)ەوە ڕەزای خوایان لێ بێ نوێژی بەیانیم کردوە لەدوای نوێژی بەیانیەوە نوێژیان نەدەکردو سەجدەیان نەدەبرد هەتا دوای خۆر هەڵهاتن.

# باسەکانی نوێژی وەتر

# باب تفريع أبواب الوتر

## باسی باش(مستحب)ی نوێژی وەتر.

## ٣٣٦ – باب اسْتِحْبَابِ الْوِتْرِ.

١٤١٦ - (صحيح) عَن عَلِيّ رَضِيَ اللهُ عَنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا أَهْلَ الْقُرْآنِ أَوْتِرُوا، فَإِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ).

واتە: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (ئەی قورئان خوێنەکان! - شەونوێژ و - نوێژی وەتر بکەن کە ژمارەی ڕکاتەکانی تاکە، چونکە خوای گەورە خۆی تاك و تەنیایە – لە زات و لە سیفاتەکانی و لە ناوەکانیدا، لە (ألوهیة) و لە (ربوبیة)دا - ، تاکیشی خۆشدەوێت.

١٤١٧ - (صحيح) عَن عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - بِمَعْنَاهُ – زَادَ: فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ: مَا تَقُولُ؟ فَقَالَ: (لَـيْسَ لَكَ وَلاَ لأَصْحَابِكَ)

واتە: لە (عَبْدُ الله)ەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم، فەرمودەی پێشو هاتووە، راوی فەرمودەكە ئەمەی بۆ زیاد كرد: پیاوێكی دەشتەكی وتی: چی دەڵێ؟ (عَبْدُ الله) وتی: ئەم حوكمە بۆ تۆ و كەسانی وەك تۆ نیە). - واتە (يَا أَهْلَ الْقُرْآنِ أَوْتِرُوا). تایبەتە بەوانەوە كە قورئان خوێنن، بۆ كەسی عەوام نیە، بێگومان ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ كە شەونوێژو نوێژی وەتر سوننەت نیە بۆ هەموو موسوڵمانێ - .

١٤١٨ - (ضعيف) عَن خَارِجَةَ بْنِ حُذَافَةَ - قَالَ أَبُو الْوَلِيدِ الْعَدَوِيُّ - قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ أَمَدَّكُمْ بِصَلاَةٍ وَهِيَ خَيْرٌ لَكُمْ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ، وَهِيَ الْوِتْرُ، فَجَعَلَهَا لَكُمْ فِيمَا بَيْنَ الْعِشَاءِ إِلَى طُلُوعِ الْفَجْرِ).

(المشكاة: ١٢٦٧).

واتە: لە خاریجەی كوڕی (حذافة)ەوە هاتووە، كە وتویەتی: - ئەبو وەلیدی عەدەوی وتی: - پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەماڵ دەرچوو هات بۆ لامان فەرمووی: (خوای گەورە سەرەڕای نوێژە فەرزەكان نوێژی تری سوننەتی

بۆ زیادكردون، ئەو نوێژەش لە گەلە وشتری سور چاكترە بۆتان، ئەویش نوێـژی وەتره، لەدوای نوێژی عیشاوە دەست پێ دەكات هەتا شەبەق دەدات.

## باسی كەسێ نوێژی وەتر نەكات.

## ٣٣٧ – باب فِيمَنْ لَمْ يُوتِرْ.

١٤١٩ - (ضعيف) عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَن أَبِيـهِ قَـالَ: سَـمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُـولُ (الْـوِتْرُ حَـقٌّ، فَمَنْ لَمْ يُوتِرْ فَلَيْسَ مِنَّا، الْوِتْرُ حَـقٌّ، فَمَـنْ لَـمْ يُـوتِرْ فَلَيْسَ مِنَّا، الْوِتْرُ حَقٌّ، فَمَنْ لَمْ يُوتِرْ فَلَيْسَ مِنَّا).

(المشكاة: ١٢٧٨).

واتە: لە عبدالله ی كوڕی بورەیدەوە، لە باوكیەوە دەگێڕنـەوە، كـە وتویـەتی: بیستم لـە پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـه وسـلم دەیفـەرموو: (نوێـژی وەتـر حەقە، ئـەوەی نوێـژی وەتـر نـەكات لـە مـن نیـە، نوێـژی وەتـر حەقە، ئـەوەی نوێژی وەتر نەكات لە من نیە، نوێژی وەتر حەقە، ئەوەی نوێژی وەتـر نـەكات لە من نیە).

١٤٢٠ - (صحيح) عَنِ ابْنِ مُحَيْرِيزٍ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ بَنِي كِنَانَةَ يُـدْعَى الْمُخْدَجِيَّ - سَمِعَ رَجُلاً بِالشَّامِ يُدْعَى أَبَـا مُحَمَّـدٍ - يَقُولُ: إِنَّ الْوِتْرَ وَاجِبٌ. قَـالَ الْمُخْـدَجِيُّ: فَرُحْـتُ إِلَـى

عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ عُبَادَةُ: كَذَبَ أَبُو مُحَمَّدٍ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (خَمْسُ صَلَوَاتٍ كَتَبَهُنَّ اللَّهُ عَلَى الْعِبَادِ، فَمَنْ جَاءَ بِهِنَّ لَمْ يُضَيِّعْ مِنْهُنَّ شَيْئًا اسْتِخْفَافًا بِحَقِّهِنَّ كَانَ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ عَهْدٌ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، وَمَنْ لَمْ يَأْتِ بِهِنَّ فَلَيْسَ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ عَهْدٌ: إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ، وَإِنْ شَاءَ أَدْخَلَهُ الْجَنَّةَ).

واتە: لە ئیبنو موحەیریزەوە هاتووە، کە پیاوێکی بەنی کینانە بەناوی موخدەجییەوە – گوێی لە پیاوێکی خەڵکی شام بوو بەناوی ئەبو موحەممەد – دەیوت: نوێژی وەتر واجبە. موخدەجی وتی: چووم بۆلای عوبادەی کوڕی صامیت قسەکەیم پێ راگەیاند، عوبادەی وتی: ئەبو موحەممەد درۆی کرد، من بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (ئەو پێنج نوێژەی کە خوای گەورە فەرزی کردوە لەسەرتان، هەرکەس بەچاکی و بە رێکوپێکی دەستنوێژ بگرێ، لەکاتی خویدا بەخشوعەوە نوێژەکانی بکات، سەجدەکانیان و رکوعەکانیان بەتەواوی ئەنجام بدات، هیچی لێ نەفەوتاندن بەوەی بە سوکیان بزانێت، ئەو کەسە خوای گەورە پەیمانی داوە لێی خۆش ببێ و بیخاتە بەهەشتەوە، بەڵام ئەگەر وای نەکرد ئەوا هیچ بەڵێنێ لە نێوان خوای گەورە و ئەودا نیە: خوا گەورە ئارەزووی خۆیەتی: ئەگەر ویستی سزای دەدات و تۆڵەی لێ دەسێنێ، یان لێی خۆش دەبێ و دەیخاتە بەهەشتەوە).

## باسی نوێژی وەتر چەند رکاتە.

## ٣٣٨ - باب كَمِ الْوِتْرُ.

١٤٢١ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَن صَلاَةِ اللَّيْلِ؟ فَقَالَ: بِأُصْبُعَيْهِ هَكَذَا: (مَثْنَى مَثْنَى، وَالْوِتْرُ رَكْعَةٌ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پیاوێکی دەشتەکی سەبارەت بە شەونوێژ لە پێغەمبەری خوای صلى الله عليه وسلم پرسی؟ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە پەنجەی ئاماژەی کردو فەرمووی: (شەونوێژ دوو رکات دوو رکاتە، نوێژی وەتر یەك رکاتە لە کۆتایی شەوەوە).

١٤٢٢ - (صحيح) عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الْوِتْرُ حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ، فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِخَمْسٍ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِثَلاَثٍ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِوَاحِدَةٍ فَلْيَفْعَلْ).

واتە: لە ئەبو ئەیوبی ئەنصارییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (نوێژی وەتر حەقە لەسەر هەموو موسڵمانێك، جا هەر کەسێك پێی خۆشە پێنج رکات نوێژی وەتر بکات با

بیكات، هەر كەسێك پێی خۆشە سێ ركات نوێژی وەتر بكات با بیكات، وە هەر كەسێك پێی خۆشە یەك ركات نوێژی وەتر بكات با بیكات).

## باسی لە نوێژی وەتردا چ سورەتێ دەخوێنرێت.

## ٣٣٩- باب مَا يُقْرَأُ فِي الْوِتْرِ.

**١٤٢٣ - (صحيح) عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُوتِرُ بِ (سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى) وَ: (قُلْ لِلَّذِينَ كَفَرُوا)، وَ: اللَّهُ الْوَاحِدُ الصَّمَدُ.**

واتە: لە ئوبەی كوڕی كەعبەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم لەركاتی یەكەمی نوێژی وەتردا لەدوای سورەتی فاتیحەوە: (سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى)ی دەخوێند، لەركاتی دووەمدا: (قُلْ لِلَّذِينَ كَفَرُوا) واتە: (قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ )ی دەخوێند، لەركاتی سێیەمدا: (قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ )ی دەخوێند.

**١٤٢٤ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ: بِأَيِّ شَيْءٍ كَانَ يُوتِرُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرَ مَعْنَاهُ، قَالَ: وَفِي الثَّالِثَةِ بِ (قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ). وَالْمُعَوِّذَتَيْنِ.**

واتە: (عَبْدُ الْعَزِيزِ)ی کوڕی جورەیج دەڵێت: سەبارەت بەو سورەتەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەنوێژی وەتردا دەیخوێند لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانم پرسی؟ بە هەمان مانا فەرمودەکەی پێشوی گێڕایەوە، (عَبْدُ الْعَزِيزِ) وتی: لەرکاتی سێیەمدا: (قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ)ی دەخوێند.

## باسی خوێندنی قونوت لە نوێژی وەتردا.

## ٣٤٠ - باب الْقُنُوتِ فِي الْوِتْرِ.

١٤٢٥ - (صحيح) عَنْ أَبِي الْحَوْرَاءِ قَالَ: قَالَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِي رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ فِي الْوِتْرِ - قَالَ ابْنُ جَوَّاسٍ: فِي قُنُوتِ الْوِتْرِ- : (اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، إِنَّكَ تَقْضِي وَلاَ يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لاَ يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ، وَلاَ يَعِزُّ مَنْ عَادَيْتَ، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ).

واتە: لە ئەبو حەورائەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: حەسەنی کوڕی پێشەوا عەلی ڕەزای خوایان لێ بێ وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چەند

وشەیەکی فێرکردوم لە نوێژی وەتردا پێیان بپاڕێمەوە - ئیبنو جەواس وتی لە قنوتی نوێژی وەتردا - : (خودایە! ڕێنموونیم بکە لەگەڵ ئەوانەدا ڕێنمونیت کردون، پارێزراو و لەش ساغم بکە لەگەڵ پارێزراواندا، پشتم بگرە لەگەڵ پشتگیری لێکراواندا، لەوەی کە دەیبەخشیت پێم بەرەکەتی تێبخە، لەخراپەی ئەوەی بڕیارت لەسەری داوە بمپارێزە، بەڕاستی تۆ بڕیار دەدەیت و کەس بڕیار نادات بەسەرتا، ئەوەی تۆ پشتگیری بکەیت هەرگیز ریسواو زەبون نابێت، ئەوەی تۆ دوژمنایەتی بکەیت هەرگیز بە عیزەت و بەدەسەڵات نابێ، پاکی و بێگەردی و بەرزی و بڵندی بۆ تۆیە پەروەردگارمان).

١٤٢٦ - (صحيح) عَن أُبو إِسْحَاق، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ، قَالَ فِى آخِرِهِ قَالَ: هَذَا يَقُولُ: فِى الْوِتْرِ فِى الْقُنُوتِ، وَلَمْ يَذْكُرْ: أَقُولُهُنَّ فِى الْوِتْرِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: أَبُو الْحَوْرَاءِ رَبِيعَةُ بْنُ شَيْبَانَ.

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە بە هەمان سەنەدو مانا فەرمودەی پێشو هاتووە، بەڵام (أَقُولُهُنَّ فِي الْوِتْرِ)ی تێدا نیە، بەڵکو وتی: لە کۆتایی فەرمودەکەوە، وتی: ئەمە دەڵێت: لە پاڕانەوەی قنوتی نوێژی وەتردا. ئەبو داود دەڵێت: ئەبو (حَوْرَاء) ڕەبیعەی کوڕی شەیبانە.

١٤٢٧ - (صحيح) عَن عَلِيٍّ بْنِ أَبِى طَالِبٍ رَضِىَ اللهُ عَنهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ فِى آخِرِ

وِتْـرِهِ: (اللَّهُـمَّ إِنِّـى أَعُـوذُ بِرِضَـاكَ مِـنْ سَـخَطِكَ، وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ، لاَ أُحْصِـى ثَنَاءً عَلَيْكَ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ).

واته: له پێشەوا عەلی کوڕی (أبی طالِب)ەوه رەزای خوای لێ بێ هاتووه، كه پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم له كۆتایی پاڕانەوەی قنوتی نوێژی وەتردا دەیفەرموو: (خودایه ! من پەنا به رازیبوونت دەگرم له خەشم و قینت، پەنا به لێبوردنەكانت دەگرم له سزاكانت، پەنا دەگرم بەخۆت له خۆت، من نازانم سوپاس و ستایشی تۆ بكەم، تۆ ئاوای كه ستایشی خۆتت كردوه).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هِشَامٌ أَقْدَمُ شَيْخٍ لِحَمَّادٍ، وَبَلَغَنِى عَنْ يَحْيَى بْـنِ مَعِـينٍ أَنَّهُ قَالَ: لَمْ يَرْوِ عَنْهُ غَيْرُ حَمَّادِ بْـنِ سَـلَمَةَ. قَـالَ أَبُـو دَاوُدَ: رَوَى عِيسَى بْـنُ يُـونُسَ، عَـنْ سَـعِيدِ بْـنِ أَبِـى عَرُوبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْـنِ عَبْـدِ الـرَّحْمَنِ بْـنِ أَبْزَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أُبَىِّ بْنِ كَعْبٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ قَنَـتَ - يَعْنِـى فِـى الْـوِتْرِ - قَبْـلَ الرُّكُوعِ.

ئەبو داود دەڵێت: له ئوبەی كوڕی كەعبەوه دەگێڕنەوه، كه پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم له نوێژی وەتردا لەپێش ركوعدا قنوتی دەخوێند.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَى عِيسَى بْنُ يُونُسَ هَذَا الْحَدِيثَ أَيْضًا عَنْ فِطْرِ بْنِ خَلِيفَةَ، عَنْ زُبَيْدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أُبَىٍّ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ. وَرُوِىَ عَنْ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ، عَنْ مِسْعَرٍ، عَنْ زُبَيْدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أُبَىِّ بْنِ كَعْبٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَنَتَ فِى الْوِتْرِ قَبْلَ الرُّكُوعِ.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: حَدِيثُ سَعِيدٍ عَنْ قَتَادَةَ رَوَاهُ يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ عَنْ سَعِيدٍ عَنْ قَتَادَةَ عَنْ عَزْرَةَ عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى عَنْ أَبِيهِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَذْكُرِ الْقُنُوتَ وَلاَ ذَكَرَ أُبَيًّا وَكَذَلِكَ رَوَاهُ عَبْدُ الأَعْلَى وَمُحَمَّدُ بْنُ بِشْرٍ الْعَبْدِىُّ وَسَمَاعُهُ بِالْكُوفَةِ مَعَ عِيسَى بْنِ يُونُسَ وَلَمْ يَذْكُرُوا الْقُنُوتَ وَقَدْ رَوَاهُ أَيْضًا هِشَامٌ الدَّسْتَوَائِىُّ وَشُعْبَةُ عَنْ قَتَادَةَ وَلَمْ يَذْكُرَا الْقُنُوتَ وَحَدِيثُ زُبَيْدٍ رَوَاهُ سُلَيْمَانُ الأَعْمَشُ وَشُعْبَةُ وَعَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ أَبِى سُلَيْمَانَ وَجَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ كُلُّهُمْ عَنْ زُبَيْدٍ لَمْ يَذْكُرْ أَحَدٌ مِنْهُمُ الْقُنُوتَ إِلاَّ مَا رُوِىَ عَنْ حَفْصِ بْنِ غِيَاثٍ عَنْ مِسْعَرٍ عَنْ زُبَيْدٍ فَإِنَّهُ قَالَ فِى حَدِيثِهِ إِنَّهُ قَنَتَ قَبْلَ الرُّكُوعِ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەو راویانەی سەرەوە کەسیان باسی قنوتیان نەکردوە، جگە لە حەفصی کوڕی (غِیاث)، ئەویش لە میسعەرەوە، لە زوبەیدەوە کە لە فەرمودەکەیدا وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەپێش رکوعدا قنوتی دەخوێند.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَلَيْسَ هُوَ بِالْمَشْهُورِ مِنْ حَدِيثِ حَفْصٍ نَخَافُ أَنْ يَكُونَ عَنْ حَفْصٍ عَنْ غَيْرِ مِسْعَرٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَيُرْوَى أَنَّ أُبَيًّا كَانَ يَقْنُتُ فِي النِّصْفِ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ.

ئەبو داود دەڵێت: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەگێڕنەوە، کە لە نیوەی مانگی رەمەزاندا لەنوێژی وەتردا قنوتی دەخوێند.

١٤٢٨ - (ضعيف) عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِهِ، أَنَّ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ أَمَّهُمْ - يَعْنِي فِي رَمَضَانَ - وَكَانَ يَقْنُتُ فِي النِّصْفِ الآخِرِ مِنْ رَمَضَانَ.

واتە: لە موحەممەد - ی کوڕی سیرین - ەوە، لە هەندێ لە هاوەڵانیەوە هاتووە، کە ئوبەی کوڕی کەعب بەرنوێژی بۆ کردن - واتە لە مانگی رەمەزاندا - لە نیوەی کۆتایی مانگی رەمەزاندا لەنوێژی وەتردا قنوتی دەخوێند.

١٤٢٩ - (ضعيف) عَنِ الْحَسَنِ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ جَمَعَ النَّاسَ عَلَى أُبَىِّ بْنِ كَعْبٍ فَكَانَ يُصَلِّى لَهُمْ عِشْرِينَ لَيْلَةً، وَلاَ يَقْنُتُ بِهِمْ إِلاَّ فِى النِّصْفِ الْبَاقِى، فَإِذَا كَانَتِ الْعَشْرُ الأَوَاخِرُ تَخَلَّفَ فَصَلَّى فِى بَيْتِهِ، فَكَانُوا يَقُولُونَ: أَبَقَ أُبَىٌّ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا يَدُلُّ عَلَى أَنَّ الَّذِى ذُكِرَ فِى الْقُنُوتِ لَيْسَ بِشَىْءٍ، وَهَذَانِ الْحَدِيثَانِ يَدُلاَّنِ عَلَى ضَعْفِ حَدِيثِ أُبَىٍّ، أَنَّ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قَنَتَ فِى الْوِتْرِ.

واتە: لە حەسەن – ی بەصری - ەوە هاتووە، کە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) ڕەزای خوای لێ بێ خەڵکی کۆکردەوە - بۆ ئەوەی نوێژی تەراویح بە کۆمەڵ بکەن - ئوبەی کوڕی کەعب بیست شەو بەرنوێژی بۆ کردن هەتا نیوەی کۆتایی مانگی ڕەمەزان قنوتی پێ نەخوێندن، کاتێ کە گەیشتنە دە ڕۆژی کۆتایی ئوبەی نەهات بۆ مزگەوت بەرنوێژییان بۆ بکات لەماڵی خۆی نوێژی دەکرد، خەڵکەکەش وتیان: ئوبەی هەڵهاتوە. ئەبو داود دەڵێت: ئەمەش واتە قنوت خوێندنی ئوبەی لە باقی نیوەی مانگی ڕەمەزاندا بەڵگەیە لەسەر ئەوکەسەی کە باسی قنوتی کردوە لە پێش ڕکوعدا شتێ نیە، وە ئەم دوو فەرمودەش بەڵگەن لەسەر لاوازی فەرمودەکەی ئوبەی، بێگومان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەنوێژی وەتردا قنوتی خوێندوە.

## باسی پاڕانەوە لەدوای نوێژی وەتر.

## ٣٤١ - باب فِي الدُّعَاءِ بَعْدَ الْوِتْرِ.

١٤٣٠ - (صحيح) عَن أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا سَلَّمَ فِي الْوِتْرِ قَالَ: (سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ).

واتە: ئوبەی كوڕی كەعب دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كاتێ كە سەلامی دەدایەوە لە نوێژی وەتر دەیفەرموو: (پاكی و گەورەیی بۆ خوای پاك و پیرۆز لەهەموو ناتەوییەك).

١٤٣١ - (صحيح) عَن أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ نَامَ عَن وِتْرِهِ أَوْ نَسِيَهُ، فَلْيُصَلِّهِ إِذَا ذَكَرَهُ).

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (هەركەسێك خەوی لێكەوت لە نوێژی وەترەكەیدا یان لە یادی چوو، هەركاتێ یادیكەوتەوە با بیكاتەوە).

# باسی ئەنجامدانی نوێژی وەتر لەپێش خەوتندا.

## ٣٤٢ – باب فِي الْوِتْرِ قَبْلَ النَّوْمِ.

١٤٣٢ - (صحيح دون قوله: (فِي سَفَرٍ وَلاَ حَضَرٍ)) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِثَلاَثٍ لاَ أَدَعُهُنَّ (فِي سَفَرٍ وَلاَ حَضَرٍ): رَكْعَتَيِ الضُّحَى، وَصَوْمِ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ مِنَ الشَّهْرِ، وَأَنْ لاَ أَنَامَ إِلاَّ عَلَى وِتْرٍ).

واتە: لە ئەبو هوریرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئامۆژگاری کردوم بە ئەنجامدانی سێ شت کە تەرکیان نەکەم نە لەماڵ و نە لەسەفەردا: دوو رکات نوێژی چێشتەنگاو، وە سێ رۆژ رۆژوو لە مانگێکدا، وە نوێژی وتریش بکەم پێش ئەوەی بخەوم.

١٤٣٣ - (صحيح دون قوله: (فِي الحَضَرِ وَالسَّفَرِ)) عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِثَلاَثٍ لاَ أَدَعُهُنَّ بِشَيْءٍ: أَوْصَانِي بِصِيَامِ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَلاَ أَنَامُ إِلاَّ عَلَى وِتْرٍ، وَبِسُبْحَةِ الضُّحَى فِي الْحَضَرِ وَالسَّفَرِ.

واتە: لە ئەبو هوریرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئامۆژگاری کردوم بە کردنی سێ شت بە هیچ شێوەیە تەرکیان نەکەم: سێ رۆژ رۆژوو لە مانگێکدا، نوێژی وتریش بکەم پێش ئەوەی بخەوم. وە دوو رکات نوێژی چێشتەنگاو لەماڵ و لەسەفەردا.

١٤٣٤ - (صحيح) عَن أَبِي قَتَادَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لأَبِي بَكْرٍ: (مَتَى تُوتِرُ؟) قَالَ: أُوتِرُ مِنْ أَوَّلِ اللَّيْلِ. وَقَالَ لِعُمَرَ: (مَتَى تُوتِرُ؟) قَالَ: آخِرَ اللَّيْلِ. فَقَالَ لأَبِي بَكْرٍ: (أَخَذَ هَذَا بِالْحَزْمِ) وَقَالَ لِعُمَرَ: (أَخَذَ هَذَا بِالْقُوَّةِ)

واتە: لە ئەبو قەتادەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە ئەبو بەکری فەرموو: (کەی نوێژی وەتر دەکەیت؟)، ئەویش وتی: لەسەرەتای شەوەوە. وە بە عومەریشی فەرموو: (کەی نوێژی وەتر دەکەیت؟)، ئەویش وتی: لە کۆتایی شەوەوە. جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کردەوەی هەردووکیانی بە باش زانی و بە ئەبو بەکری فەرموو: (ئەمە لایەنی دڵنیایی گرتووە، بە عومەریشی فەرموو: ئەمە لایەنی هێزی گرتووە).

## باسی کاتی نوێژی وەتر.

## ٣٤٣ - باب فِي وَقْتِ الْوِتْرِ.

١٤٣٥ - (صحيح) عَن مَسْرُوقٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ: مَتَى كَانَ يُوتِرُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَتْ: كُلَّ ذَلِكَ قَدْ فَعَلَ، أَوْتَرَ أَوَّلَ اللَّيْلِ، وَوَسَطَهُ وَآخِرَهُ، وَلَكِنِ انْتَهَى وِتْرُهُ حِينَ مَاتَ إِلَى السَّحَرِ.

واتە: لە مەسروقەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بە عائیشەم وت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کەی نوێژی وەتری دەکرد؟ ئەویش وتی: لەهەموو کاتێکی شەودا نوێژی وەتری دەکرد: لەسەرەتای شەودا، لە ناوەڕاستی شەودا، لە کۆتایی شەودا، بەڵام لەپێش مردنیدا هەر بەرەبەیان نوێژی وەتری دەکرد واتە لەپێش نوێژی بەیانیدا.

١٤٣٦ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (بَادِرُوا الصُّبْحَ بِالْوِتْرِ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (پەلە بکەن لەپێش شەبەقدا نوێژی وەتر بکەن).

١٤٣٧ - (صحيح) عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَيْسٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَن وِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَتْ: رُبَّمَا أَوْتَرَ أَوَّلَ اللَّيْلِ، وَرُبَّمَا أَوْتَرَ مِنْ آخِرِهِ، قُلْتُ: كَيْفَ كَانَتْ قِرَاءَتُهُ، أَكَانَ يُسِرُّ بِالْقِرَاءَةِ أَمْ يَجْهَرُ؟ قَالَتْ: كُلَّ ذَلِكَ كَانَ يَفْعَلُ، رُبَّمَا أَسَرَّ، وَرُبَّمَا جَهَرَ، وَرُبَّمَا اغْتَسَلَ فَنَامَ، وَرُبَّمَا تَوَضَّأَ فَنَامَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَقَالَ غَيْرُ قُتَيْبَةَ تَعْنِي فِي الْجَنَابَةِ.

واتە: (عَبْدُ الله)ی كوڕی ئەبو قەیس دەڵێت: سەبارەت بە نوێژی وەتری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە عائیشەم پرسی؟ عائیشە وتی: هەندێ جار لەسەرەتای شەوەوە نوێژی وەتری دەكرد، هەندێ جاری تریش لە كۆتایی شەودا نوێژی وەتری دەكرد. وتم: ئەی قورئان خوێندنی چۆن بوو، دەنگی بەرز دەكردەوە یان بەبێ دەنگی دەیخوێند؟ وتی: بە هەردوو شێوەكە قورئانی دەخوێند، جاری وابوو بەبێ دەنگی دەیخوێند، وە جاری واشبوو دەنگی بەرز دەكردەوە، وە جاری وابوو خۆی دەشت ئینجا دەخەوت، جاری واش بوو دەستنوێژی دەگرت ئینجا دەخەوت. ئەبو داود دەڵێت: جگە لە قوتەیبە دەڵێن: واتە لە لەشگرانی خۆی دەشت.

١٤٣٨ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (اجْعَلُوا آخِرَ صَلَاتِكُمْ بِاللَّيْلِ وِتْرًا).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نوێژی وەتر بکەن بە کۆتا نوێژی شەوتان).

## باسی هەڵوەشانەوەی نوێژی وەتر.

## ٣٤٤ – باب فِي نَقْضِ الْوِتْرِ.

١٤٣٩ - (صحيح) عَن قَيْسِ بْنِ طَلْقٍ قَالَ: زَارَنَا طَلْقُ بْنُ عَلِيّ فِي يَوْمٍ مِنْ رَمَضَانَ وَأَمْسَى عِنْدَنَا وَأَفْطَرَ، ثُمَّ قَامَ بِنَا تِلْكَ اللَّيْلَةَ وَأَوْتَرَ بِنَا، ثُمَّ انْحَدَرَ إِلَى مَسْجِدِهِ فَصَلَّى بِأَصْحَابِهِ، حَتَّى إِذَا بَقِيَ الْوِتْرُ قَدَّمَ رَجُلاً فَقَالَ: أَوْتِرْ بِأَصْحَابِكَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ وِتْرَانِ فِي لَيْلَةٍ)

واتە: قەیسی کوڕی (طلق) دەڵێت: رۆژێ لە مانگی رەمەزاندا (طلق)ی کوڕی عەلی سەردانی کردین ئێوارە لای ئێمە بەربانگی کردەوە، لەپاشدا ئەو شەوە بەرنوێژی نوێژی تەراویحی بۆ کردین نوێژی وەتری بۆ کردن، ئینجا گەڕایەوە بۆ مزگەوتەکەی و بەرنوێژی کرد بۆ هاوەڵەکانی واتە خەڵکی مزگەوتەکە هەتا نوێژی وەتر مابوو بیکەن، پیاوێ چووە پێشەوە وتی: ئەوە بەرنوێژی نوێژی وەتر دەکەیت بۆ هاوەڵەکانت، بێگومان من لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیستووە دەیفەرموو: (لەیەك شەودا دوو جار نوێژی وەتر نابێ).

## باسی قنوت خوێندن لەنوێژە فەرزەکاندا.

## ٣٤٥ – باب الْقُنُوتِ فِي الصَّلَوَاتِ.

١٤٤٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَاللَّهِ لأُقَرِّبَنَّ بِكُمْ صَلاَةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ! قَالَ: فَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يَقْنُتُ فِي الرَّكْعَةِ الآخِرَةِ مِنْ صَلاَةِ الظُّهْرِ، وَصَلاَةِ الْعِشَاءِ الآخِرَةِ، وَصَلاَةِ الصُّبْحِ، فَيَدْعُو لِلْمُؤْمِنِينَ وَيَلْعَنُ الْكَافِرِينَ.

واتە: ئەبو هوریرەوە وتی: سوێند بە خوا کە بەرنوێژیەکتان بۆ دەکەم نزیك بێت لە نوێژی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم یان وەك نوێژی ئەو بێت، راوی وتی: ئەبو هوریرەوە لەرکاتی کۆتایی نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی عیشاو نوێژی بەیانیدا قنوتی خوێند، بۆ باوەڕداران پاڕایەوەو، نەفرەتی لە بێ باوەڕان کرد.

١٤٤١ - (صحيح) عَنِ الْبَرَاءِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْنُتُ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ، زَادَ ابْنُ مُعَاذٍ: وَصَلاَةِ الْمَغْرِبِ.

واتە: لە بەرائەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەنوێژی بەیانیدا قنوتی دەخوێند، ئیبنو (مُعاذ) ئەمەی بۆ زیاد کرد: لەنوێژی شێوانیشدا.

١٤٤٢ - (صحيح) عَن أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: قَنَتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى صَلاَةِ الْعَتَمَةِ شَهْرًا، يَقُولُ فِى قُنُوتِهِ: (اللَّهُمَّ نَجِّ الْوَلِيدَ بْنَ الْوَلِيدِ، اللَّهُمَّ نَجِّ سَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ، اللَّهُمَّ نَجِّ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، اللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ، اللَّهُمَّ اجْعَلْهَا عَلَيْهِمْ سِنِينَ كَسِنِى يُوسُفَ). قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَأَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ يَوْمٍ فَلَمْ يَدْعُ لَهُمْ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: (وَمَا تَرَاهُمْ قَدْ قَدِمُوا) .

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ماوەی مانگێ لە نوێژی عیشادا قنوتی خوێند: لە قنوتەکەیدا دەیفەرموو: (خودایە! وەلیدی کوڕی وەلیدو سەلەمەی کوڕی هیشام و هەموو باوەڕدارە بێ دەسەلات و چەوساوەکان رزگار بکە لەدەستی بێ باوەڕەکان لە دیلی، خودایە! سزای سەختی هۆزی (مُضَر) بدەیت تووشی قات و قڕی و گرانیەکی وایان بکەی، وەك حەوت ساڵ گرانیی و وشکە ساڵیەکەی سەردەمی یوسف سلاوی خوای لێ بێ). ئەبو هوریرەوە وتی: رۆژێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوعای لێ نەکردن، منیش لەو بارەوە لێم پرسی کە بۆچی دوعات لێ نەکردن؟ فەرمووی: (دوعاکانم بۆ ئەوە بوو کە ئەو دیلانە رزگار ببن لەژێر دەستی ئەو کافرانەدا ئێستا رزگاریان بووەو گەڕاونەتەوە بۆ مەدینە ئیتر پێویست ناکات دوعایان لێ بکەم).

١٤٤٣ - (حسن) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَنَتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَهْرًا مُتَتَابِعًا فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ وَصَلاَةِ الصُّبْحِ، فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ إِذَا قَالَ: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ). مِنَ الرَّكْعَةِ الآخِرَةِ، يَدْعُو عَلَى أَحْيَاءٍ مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ، عَلَى رِعْلٍ وَذَكْوَانَ وَعُصَيَّةَ، وَيُؤَمِّنُ مَنْ خَلْفَهُ.

واتە: ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەردەوام ماوەی مانگێ لەنوێژی نیوەڕۆ و عەسرو شێوان و عیشاو بەیانیدا لە رکاتی کۆتایی هەموو نوێژێکەوە لەدوای رکوع کاتێ کە دەیفەرموو: (سَمِعَ اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ). دەپاڕایەوەو دوعای دەکرد لە هۆزی بەنی سولەیم و ریعل و (ذكوان) و عوصەییە، کاتێ کە دەپاڕایەوە ئەوانەی لەدوایەوە بوون (آمین)یان دەکرد.

١٤٤٤ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّهُ سُئِلَ: هَلْ قَنَتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ؟ فَقَالَ: نَعَمْ. فَقِيلَ لَهُ: قَبْلَ الرُّكُوعِ أَوْ بَعْدَ الرُّكُوعِ؟ قَالَ: بَعْدَ الرُّكُوعِ. قَالَ مُسَدَّدٌ: بِيَسِيرٍ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە لێیان پرسیوە: ئایا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەنوێژی بەیانیدا قنوتی دەخوێند؟ وتی: بەڵێ: پێی

وتـرا: لـەپێش چـوونە رکوعـەوە یـان لـەدوای رکـوع؟ وتـی: لـەدوای رکـوع.
موسەددەد وتی: کەمێ لەدوای رکوعەوە.

**١٤٤٥ - (صحيح) عَن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَنَتَ شَهْرًا، ثُمَّ تَرَكَهُ.**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مانگێ لەسەریەك لەنوێژی بەیانیدا قنوتی خوێند؟ لەپاشدا تەرکی کرد.

**١٤٤٦ - (صحيح) عَن مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: حَدَّثَنِي مَنْ صَلَّى مَـعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلاَةَ الْغَدَاةِ، فَلَمَّـا رَفَـعَ رَأْسَهُ مِنَ الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ قَامَ هُنَيَّةً.**

واتە: موحەممەدی کوڕی سیرین دەڵێت: کەسێ کـە لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیه وسلم نوێژی بەیانی کردبوو بۆی گێڕامەوە وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کاتێ کە سەری بەرزکردەوە لەرکاتی دووەمـدا کـەمێ وەسـتا جا قنوتی خوێند.

## باسی فەزڵی نوێژی سوننەت لەماڵەوە.

## ٣٤٦ – باب فِي فَضْلِ التَّطَوُّعِ فِي الْبَيْتِ.

١٤٤٧ - (صحيح). عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ أَنَّهُ قَالَ: احْتَجَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَسْجِدِ حُجْرَةً، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْرُجُ مِنَ اللَّيْلِ فَيُصَلِّي فِيهَا، قَالَ: فَصَلَّوْا مَعَهُ بِصَلَاتِهِ - يَعْنِي رِجَالاً - وَكَانُوا يَأْتُونَهُ كُلَّ لَيْلَةٍ، حَتَّى إِذَا كَانَ لَيْلَةً مِنَ اللَّيَالِي لَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَتَنَحْنَحُوا وَرَفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ، وَحَصَبُوا بَابَهُ، قَالَ: فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُغْضَبًا فَقَالَ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ، مَا زَالَ بِكُمْ صَنِيعُكُمْ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنْ سَتُكْتَبَ عَلَيْكُمْ، فَعَلَيْكُمْ بِالصَّلَاةِ فِي بُيُوتِكُمْ، فَإِنَّ خَيْرَ صَلَاةِ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلاَّ الصَّلَاةَ الْمَكْتُوبَةَ).

واته: لە زەیدی کوڕی (ثابت)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کوخێکی دروست کردبوو بە حەسیر لە مزگەوت، شەو لەماڵ دەردەچوو نوێژی تێدا دەکرد، زەید وتی: کۆمەڵێ لە یارانی لەدوایە

بەكۆمەڵ نوێژی تەراویحیان كرد – واتە پیاوان – هەموو شەوێ دەهاتن، هەتا شەوێ لەشەوان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەماڵ دەرنەچوو بۆ لایان، ئەوانیش بۆ ئەوەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئاگادار بكەنەوە دەكۆكن و دەنگ هەڵدەبڕن و زیخ و چەو دەگرنە دەرگای ماڵەكەی، زەید وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەتووڕەییەوە لەماڵ دەردەچێت بۆ لایان و دەفەرموێت: (ئەی خەڵكینە! دەزانم زۆر بە پەرۆشن بۆ ئەوەی نوێژی تەراویح بە كۆمەڵ بكەن، من ئەمەم لەیادە، هیچ شتێ ڕێگری ئەوەی لێ نەكردم كە بێم بۆ لاتان و بەرنوێژیتان بۆ بكەم تەنها ئەوە نەبێت دەترسم فەرز ببێت لەسەرتان، لەماڵەوە نوێژی سوننەت بكەن، چونكە خێرترین نوێژی سوننەتی پیاو ئەو نوێژەیە كە لەماڵەوە دەیكات جگە لەنوێژە فەرزەكان).

**١٤٤٨ - (صحيح). عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اجْعَلُوا فِى بُيُوتِكُمْ مِنْ صَلاَتِكُمْ وَلاَ تَتَّخِذُوهَا قُبُورًا).**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەشێ لە نوێژە سوننەتەكانتان ماڵەوە بكەن، ماڵەكانتان مەكەن بە گۆڕستان).

## باسی زۆر مانەوە بە پێوە لەنوێژدا.

## ٣٤٧ – باب طول القيام.

١٤٤٩ - (صحيح). عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُبْشِيّ الْخَثْعَمِيِّ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُئِلَ أَيُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (طُولُ الْقِيَامِ). قِيلَ فَأَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (جُهْدُ الْمُقِلِّ). قِيلَ فَأَيُّ الْهِجْرَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (مَنْ هَجَرَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ). قِيلَ فَأَيُّ الْجِهَادِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (مَنْ جَاهَدَ الْمُشْرِكِينَ بِمَالِهِ وَنَفْسِهِ). قِيلَ فَأَيُّ الْقَتْلِ أَشْرَفُ؟ قَالَ: (مَنْ أُهْرِيقَ دَمُهُ وَعُقِرَ جَوَادُهُ).

واتە: لە(عَبْدُ اللّٰه)ی كوڕی حوبشی (خَثْعَمِیَ)ەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لە پێغەمبەریان صلی الله علیه وسلم پرسی، كام كردەوە چاكترین كردەوەیە؟ فەرمووی: (زۆر مانەوە بە پێوە لەنوێژدا). وتیان: كام خێرو سەدەقە چاكترین خێرو سەدەقەیە؟ فەرمووی: (ئەوەی لەسەر كەم دەرامەتی و دەستكورتیەوە بكرێت). وتیان: كام كۆچكردن چاكترین كۆچكردنە؟ فەرمووی: (كۆچكردن لەو شتانەی كە خوا حەرامی كردون). وتیان: كام جیهادو تێكۆشان چاكترین جیهادو تێكۆشانە؟ فەرمووی: (جیهادو تێكۆشانێ بەنەفس و بە ماڵ دژی هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەران بكرێت). وتیان: كام كوژران شەریفانەترین كوژرانە؟ فەرمووی: (كەسێك خوێنی بڕژێت و ورگی بدڕێت).

## باسی هاندان لەسەر شەونوێژ.

## ٣٤٨ - باب الْحَثِّ عَلَى قِيَامِ اللَّيْلِ.

١٤٥٠ - (حسن صحيح) عَنْ هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ: (رَحِمَ اللَّهُ رَجُلاً قَامَ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّى وَأَيْقَظَ امْرَأَتَهُ فَصَلَّتْ، فَإِنْ أَبَتْ نَضَحَ فِي وَجْهِهَا الْمَاءَ، رَحِمَ اللَّهُ امْرَأَةً قَامَتْ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّتْ وَأَيْقَظَتْ زَوْجَهَا، فَإِنْ أَبَى نَضَحَتْ فِي وَجْهِهِ الْمَاءَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (ڕەحمەتی خوا لەو پیاوەی کەشەو هەستا بۆ شەونوێژ ژنەکەشی هەڵئەسێنێ، ئەگەر بەگوێی نەکردو تەمەڵی کردو هەڵنەسا ئاو دەپژێنێ لەدەم و چاوی، هەروەها ڕەحمەتی خوا لەو ژنەی کە هەڵئەسێ شەونوێژ دەکات و مێردەکەشی هەڵئەسێنێ، ئەگەر بەگوێی نەکردو تەمەڵی کردو هەڵنەسا ئاو دەپژێنێ لە دەم و چاوی هەتا خەبەری دەبێتەوە).

١٤٥١ - (صحيح). عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ وَأَبِي هُرَيْرَةَ قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنِ اسْتَيْقَظَ مِنَ اللَّيْلِ وَأَيْقَظَ امْرَأَتَهُ، فَصَلَّيَا رَكْعَتَيْنِ جَمِيعًا، كُتِبَا مِنَ الذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ).

واته: ئەبو سەعید و ئەبو هورەیره دەڵێن: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (ئەگەر پیاو لەشەودا خێزانەكەی خۆی خەبەركاتەوه یەكی دوو ركات شەونوێژ بكەن، ئەوا ناویان لە ناو ریزی ئەو ژن و پیاوانەدا دەنوسرێت كه هەمیشه و بەردەوام زیكر و یادی خوا دەكەن).

## باسی پاداشتی قورئان خوێندن.

## ٣٤٩ - باب فِي ثَوَابِ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ.

**١٤٥٢ - (صحيح) عَنْ عُثْمَانَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ).**

له (عثمان)ەوه دەگێڕنەوه، كه پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (چاكترین كەستان ئەوەیه فێری قورئان خوێندن دەبێ بەڕەوانی وه خەڵكیش فێری قورئان خوێندن دەكات).

**١٤٥٣ - (ضعيف) عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذٍ الْجُهَنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ وَعَمِلَ بِمَا فِيهِ أُلْبِسَ وَالِدَاهُ تَاجًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ ضَوْؤُهُ أَحْسَنُ مِنْ ضَوْءِ الشَّمْسِ فِي بُيُوتِ الدُّنْيَا لَوْ كَانَتْ فِيكُمْ، فَمَا ظَنُّكُمْ بِالَّذِي عَمِلَ بِهَذَا؟!).**

واتە: لە سەهلی كوڕی (مُعَاذ)ی جوهەنیەوە، لەباوكیەوە، دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (ئەوەی قورئان بخوێنێ و كردەوەی پێ بكات لەڕۆژی قیامەتدا تاجێ دەكرێتە سەری دایك و باوكی شەوقەكەی لەشەوقی ئەو خۆرە جوانتر و پرشنگدار ترە لەكاتێكدا كە لە دنیادا لەناو ماڵەكانتان دەدات، ئەبێ ئەو كەسەی كە بیخوێنێ و كردەوەی پێ بكات پلەو پایەو پاداشتی چۆن بێ و چی بێت؟!).

١٤٥٤ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَهُوَ مَاهِرٌ بِهِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ، وَالَّذِي يَقْرَؤُهُ وَهُوَ يَشْتَدُّ عَلَيْهِ فَلَهُ أَجْرَانِ).

واتە: لە عائشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (ئەو كەسەی كە بەڕەوانی قورئان دەخوێنێ و كردەوەی پێ دەكات خوای گەورە دەیخاتە ریزی مەلائیكە بەڕێزو پایەبەرزەكانی، وە ئەو كەسەش كە بەگران و بەزەحمەت قورئانی بۆ دەخوێنرێت ئەوە دووجار پاداشتی لەسەر وەردەگرێت). - پاداشتێ لەسەر قورئان خوێندنەكەی، پاداشتێ لەسەر ئەوەی كە بەگران و بەزەحمەت بۆی دەیخوێنێت -.

١٤٥٥ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ تَعَالَى يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ، وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ إِلاَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ

السَّــكِينَةُ، وَغَشِــيَتْهُمُ الرَّحْمَــةُ، وَحَفَّــتْهُمُ الْمَلاَئِكَــةُ، وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەر کۆمەڵێك لەبەر رەزامەندی خوا کۆببنەوە لەماڵێك لە ماڵەکانی خوای گەورەدا قورئان بخوێنن ولەناو خۆیاندا دەوری بکەنەوەو واتاو ماناکەی لێك بدەنەوە، ئەوا بێگومان ئارامی و دڵنیایی بەسەریاندا دادەبارێت و، رەحمەت و میهرەبانی دایان دەپۆشێت، مەلائیکە دەوریان لێدەدەن و، خودایش لە بارەگای بەرزو باڵای خۆی لای (مەلەئی ئەعلا) باسیان دەکات).

١٤٥٦- (صحيح) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِــيِّ قَــالَ: خَــرَجَ عَلَيْنَــا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْــنُ فِــى الصُّــفَّةِ، فَقَالَ: (أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يَغْدُوَ إِلَى بُطْحَــانَ أَوِ الْعَقِيــقِ، فَيَأْخُذَ نَاقَتَيْنِ كَوْمَاوَيْنِ زَهْرَاوَيْنِ بِغَيْرِ إِثْمٍ بِاللَّــهِ عَــزَّ وَجَلَّ وَلاَ قَطْعِ رَحِمٍ؟). قَالُوا: كُلُّنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: (فَلأَنْ يَغْدُوَ أَحَدُكُمْ كُلَّ يَــوْمٍ إِلَــى الْمَسْــجِدِ فَيَــتَعَلَّمَ آيَتَيْنِ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ خَيْرٌ لَــهُ مِــنْ نَــاقَتَيْنِ، وَإِنْ ثَلاَثٌ فَثَلاَثٌ مِثْلُ أَعْدَادِهِنَّ مِنَ الإِبِلِ).

واتە: عوقبەی کوڕی عامری جوهەنیی دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەماڵ دەردەچوو بۆ لامان ئێمە لە خەڵکی (صُفّة) بووین - خەڵکی (صُفّة) لە هەژارانی کۆچکەران بوون لەمزگەوتی مەدینەدا — فەرمووی: (کێ

لەئێوە حەز دەکات هەموو رۆژێ بڕوات بۆ (بُطحَان) یان (عَقِیق) – کە دوو شیون لە نزیك شاری مەدینەوە - ، دوو وشتری کۆپارە گەورەی - کۆپارە بریتیە لە بەرزییەکەی پشتی وشتر – قەڵەوی مەیلەو سپی بێنێتەوە بۆ خۆی بەبێ ئەوەی کە بەهۆی ئەوەوە توشی تاوان ببێ لای خوای گەورە، یان توشی پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی ببێت؟). وتیان: هەموومان حەز دەکەین،، فەرمووی: (دەی ئەگەر یەکێ لەئێوە هەموو رۆژێ بڕوات بۆ مزگەوت دوو ئایەت لە قورئان فێر ببێت ئەوە لە دوو وشتر چاکترە بۆی، ئەگەر سێ ئایەت بوو ئەوا لە سێ وشتر چاکترە بۆی، هەروەها بە قەد ژمارەی ئەو ئایەتانەی کە فێر دەبێت لە ئەوەندە وشتر چاکترە بۆی).

## باسی ئەوەی کە دەربارەی فەزڵ و گەورەیی سورەتی فاتیحە هاتووە.

## ٣٥٠ – باب فَاتِحَةِ الْكِتَابِ.

١٤٥٧ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾. أُمُّ الْقُرْآنِ، وَأُمُّ الْكِتَابِ، وَالسَّبْعُ الْمَثَانِى).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: سورەتی ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾. دایکی قورئان و نامەکەی خوایە سەرچاوە و بنەڕەتی قورئانە، وە حەوت ئایەتی دووبارە بووەوەیە، لەهەموو نوێژەکاندا دەخوێنرێت و دوو بارە دەبێتەوە.

١٤٥٨ - (صحيح) عَن أَبِى سَعِيدِ بْنِ الْمُعَلَّى، أَنَّ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ بِهِ وَهُوَ يُصَلِّى، فَدَعَاهُ، قَالَ: فَصَلَّيْتُ ثُمَّ أَتَيْتُهُ قَالَ: فَقَالَ: (مَا مَنَعَكَ أَنْ تُجِيبَنِى؟). قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّى. قَالَ: (أَلَمْ يَقُلِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ﴾ ؟! لأُعَلِّمَنَّكَ أَعْظَمَ سُورَةٍ مِنَ (الْقُرآنِ) - أَوْ فِى الْقُرْآنِ - شَكَّ خَالِدٌ - (قَبْلَ أَنْ أَخْرُجَ مِنَ الْمَسْجِدِ). قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَوْلَكَ، قَالَ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾. وَهِىَ السَّبْعُ الْمَثَانِى الَّتِى أُوتِيتُ، وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ).

واتە: ئەبو سەعیدی رافعی کوڕی موعەللاوە هاتووە، کە لە مزگەوت نوێژی کردوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم داویەتی بەلایدا بانگی کردوە، یەکسەر وەڵامی نەداوەتەوە، ئەبو سەعید وتی: نوێژەکەم تەواوکرد، لەپاشدا چوومە خزمەتی، ئەبو سەعید وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (چی رێگری لێکردی کە وەڵامم نەدەیتەوە؟). وتی: نوێژم دەکرد بۆیە وەڵامم نەدایەوە، فەرمووی: (مەگەر خوای گەورە نا فەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴾ الأنفال: ٢٤. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! بە دەم بانگەوازی خوا و پێغەمبەرەوە بچن کاتێك بانگتان دەکات بۆ بەرنامەو

ڕێبازێك كە دەتان ژێنێتەوە و ژیان بەخشە؟! جا فەرمووی: (پێش ئەوەی لە مزگەوت بچیتە دەرەوە گەورەترین سورەتت پێ نیشاندەم لە قورئاندا ؟). وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمودەكەت لەبەر دەكەم، فەرمووی: ئەو سورەتە سورەتی: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ە كە ناویشی حەوت ئایەتی دووبارە بوەوەیە، هەروەها ناویشی قورئانی گەورەیە كە بە من بەخشراوە.

## باسی ئەوانەی كە دەڵێن: لە سورەتە درێژەكانە.

## ٣٥١ – باب مَنْ قَالَ: هِيَ مِنَ الطُّوَلِ.

١٤٥٩ - (صحيح). عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أُوتِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَبْعًا مِنَ الْمَثَانِي الطُّوَلِ، وَأُوتِيَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ سِتًّا، فَلَمَّا أَلْقَى الأَلْوَاحَ رُفِعَتْ ثِنْتَانِ وَبَقِيَ أَرْبَعٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: حەوت ئایەتی دووبارە بوەوە كە لە سورەتە درێژەكانە بەخشراوە بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، بەخشراوە بە موساش شەش لەوحە كە تەوراتی تێدا بوو، كاتێ - كە لە كێوی (طور) هاتەوە بینی قەومەكەی كۆلك دەپەرستن - تورە بوو لەوحەكانی فڕێدا چواریان مانەوە و دوانیان بەرزبونەوە – لەوانەیە مەبەستی نەسخ بوونەوە بێت - .

# باسی ئەوەی کە دەربارەی فەزڵ و گەورەیی سورەتی (آيَةِ الْكُرْسِيِّ) هاتووە.

## ٣٥٢ - باب مَا جَاءَ فِي آيَةِ الْكُرْسِيِّ.

١٤٦٠ - (صحيح). عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَبَا الْمُنْذِرِ أَيُّ آيَةٍ مَعَكَ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ أَعْظَمُ؟). قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: (أَبَا الْمُنْذِرِ أَيُّ آيَةٍ مَعَكَ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ أَعْظَمُ). قَالَ: قُلْتُ: ( ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ ). قَالَ: فَضَرَبَ فِي صَدْرِي وَقَالَ: (لِيَهْنِ لَكَ يَا أَبَا الْمُنْذِرِ الْعِلْمُ).

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (باوکی (مُنذِر) ئایا دەزانی لەو قورئانەی لەبەرتە کام ئایەتەی گەورەترە؟). وتی: وتم: خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن، وتی: فەرمووی: (ئەی باوکی (مُنذِر) ئایا دەزانی لەو قورئانەی لەبەرتە کام ئایەتەی گەورەترە؟). وتی: وتم: ( ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ ). باوکی (مُنذِر) وتی: دەستی کێشا بە سنگمداو فەرمووی: (زانست و زانیاریت نۆش بێت ئەی باوکی (مُنذِر) ؟). - واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بڕیاریدا لەسەر زانیارییەکەی و شایەتی بۆدا کە پێکاویەتی - .

# باسی ئەوەی كە دەربارەی فەزڵ و گەورەیی سورەتی (الصَّمَد) هاتووە.

## ٣٥٣ - باب فِي سُورَةِ الصَّمَدِ.

١٤٦١ -(صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، أَنَّ رَجُلاً سَمِعَ رَجُلاً يَقْرَأُ: (قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ). يُرَدِّدُهَا، فَلَمَّا أَصْبَحَ جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، وَكَانَ الرَّجُلُ يَتَقَالُّهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهَا لَتَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، كە شەوێ پیاوێ گوێی لە پیاوێ بوو هەر سورەتی: (قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ )ی دەخوێندو دووبارەی دەكردەوە، كاتێ كە رۆژ بوویەوە هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەسەرهاتەكەی بۆ گێڕایەوە، پیاوەكە پێی وابوو خوێندنی سورەتی: (قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ) بە تەنیا كەمە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە كە خوایە ئەم سورەتە هاوتای سێیەكی قورئان دەكات).

# باسی ئەوەی کە دەربارەی فەزڵ و گەورەیی سورەتی (المُعَوِّذَتَيْنِ). هاتووە.

## ٣٥٤ - باب فِي الْمُعَوِّذَتَيْنِ.

١٤٦٢ - (صحيح) عَن عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: كُنْتُ أَقُودُ بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَاقَتَهُ فِي السَّفَرِ، فَقَالَ لِي: (يَا عُقْبَةُ أَلاَ أُعَلِّمُكَ خَيْرَ سُورَتَيْنِ قُرِئَتَا). فَعَلَّمَنِي: (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ). وَ: (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ). قَالَ: فَلَمْ يَرَنِي سُرِرْتُ بِهِمَا جِدًّا، فَلَمَّا نَزَلَ لِصَلاَةِ الصُّبْحِ صَلَّى بِهِمَا صَلاَةَ الصُّبْحِ لِلنَّاسِ، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الصَّلاَةِ الْتَفَتَ إِلَيَّ فَقَالَ: (يَا عُقْبَةُ كَيْفَ رَأَيْتَ؟).

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەفەرێکدا ڕەشمەی وشترەکەی پێغەمبەری خودام صلى الله عليه وسلم رادەکێشا، پێی فەرمووم: (ئەی عوقبە! ئاگاداربە، دوو سورەتت فێر دەکەم کە گەورەترین و چاکترین سورەتن بخوێنرێن؟). — سەبارەت بە پەناگرتن بەخوا - جا سورەتی: (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ). و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ )ی فێرکردم، عوقبە وتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەیدی زۆر دڵخۆش بم پێیان - واتە خۆشی و رووگەشی لێ دەرنەکەوت وەك بڵێی پێی وابوو دوو سورەتی درێژی فێردەکات،

کەچی ئەو دوو سورەتە کورتەی فێرکرد - ، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەسەر وشترەکەی دابەزی بۆ نوێژی بەیانی لەدوای سورەتی فاتیحەوە ئەو دوو سورەتەی خوێند، کە لەنوێژ بوویەوە ئاوڕی دایەوە بەلاما فەرمووی: (ئەی عوقبە پێت چۆن بوو ویستی گەورەیی ئەو دوو سورەتە بۆ عوقبە رونکاتەوە).

١٤٦٣ - (صحيح) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: بَيْنَا أَنَا أَسِيرُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ الْجُحْفَةِ وَالأَبْوَاءِ، إِذْ غَشِيَتْنَا رِيحٌ وَظُلْمَةٌ شَدِيدَةٌ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَعَوَّذُ بِ (أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ). وَ (أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ). وَيَقُولُ (يَا عُقْبَةُ تَعَوَّذْ بِهِمَا فَمَا تَعَوَّذَ مُتَعَوِّذٌ بِمِثْلِهِمَا). قَالَ: وَسَمِعْتُهُ يَؤُمُّنَا بِهِمَا فِي الصَّلاَةِ.

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم لە نیوان (جُحْفَة) و (أبْواء)[١]دا بەدەم ڕێوە دەڕۆیشتین، بایەکی توند هەڵیکردو بوو بە شەوەزەنگ و دنیا تاریك بوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی: (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ). و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ). فەرمووی: (ئەی عوقبە ئەم دوو

---

١- (جُحْفَة) شوێنێکە لەسەر ڕێگەی مەککەو مەدینە میقاتی خەڵکی شام و مغریب و میصرە و، (أبْواء) کێوێکە لەنیوان مەککەو مەدینەدا. لە (عون المعبود) وەرگیراوە.

سورەتە بخوێنە، چونکە هیچ پەناگرێ پەنای نەگرتووە بە هاوشێوەیان). وتی: جارێ بەرنوێژی بۆ کردین گوێم لێی بوو لەنوێژەکەیدا لەدوای سورەتی فاتیحەوە ئەم دوو سورەتەی خوێند.

## باسی چۆن باشە قورئان بەتەرتیل بخوێنرێت.

## ٣٥٥ – باب كيف يستحب الترتيل في القراءة.

١٤٦٤ - (صحيح) عن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يُقَالُ لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ: اقْرَأْ وَارْتَقِ، وَرَتِّلْ كَمَا كُنْتَ تُرَتِّلُ فِي الدُّنْيَا، فَإِنَّ مَنْزِلَكَ عِنْدَ آخِرِ آيَةٍ تَقْرَؤُهَا).

واتە: لە (عبْدُ اللە)ی کوڕی عەمرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (لەبەهەشتدا بە قورئان خوێن دەڵێن لەسەرخۆ بخوێنە و بە پلەکانی بەهەشدا سەرکەوە هەروەك چۆن لەدنیادا بەتەرتیل و بەڕەوانی دەتخوێند، چونکە پلەو پایەی تۆ دوا ئایەت دیاریی دەکات کە دەیخوێنی).

١٤٦٥ - (صحيح) عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسًا عَنْ قِرَاءَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ: كَانَ يَمُدُّ مَدًّا.

واتە: قەتادە دەڵێت: سەبارەت بە قورئـان خوێنـدنی پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیە وسلم لـە ئەنەسـم پرسـی؟ وتـی: بـە تـەرتیل و بـەرەوانی دەیخوێنـدو مەدەكانی درێژدەكردەوەو حەقی خۆی دەدانێ.

١٤٦٦ - (ضعيف) عَن يَعْلَى بْنِ مَمْلَكٍ، أَنَّهُ سَأَلَ أُمَّ سَلَمَةَ عَن قِـرَاءَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ وَصَـلاَتِهِ؟ فَقَالَـتْ: وَمَا لَكُمْ وَصَلاَتَهُ؟! كَانَ يُصَلِّي وَيَنَامُ قَدْرَ مَـا صَـلَّى، ثُمَّ يُصَلِّي قَدْرَ مَا نَامَ، ثُمَّ يَنَامُ قَدْرَ مَـا صَـلَّى، حَتَّـى يُصْبِحَ، وَنَعَتَتْ قِرَاءَتَهُ، فَإِذَا هِيَ تَنْعَتُ قِرَاءَتَـهُ حَرْفًـا حَرْفًا.

واتە: لە یـەعلای كـوڕی مەملەكەوە هـاتووە، كـە سـەبارەت بـە نوێـژكردن و قورئـان خوێنـدنی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم لـە ئـوم سـەلەمەی پرسیوە؟ ئوم سەلەمە وتی: ئێوە ناتوان وەك ئەوە بكەن كە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم دەیكـات ئـەو نوێـژی دەكـرد جـا ئەوەنـدەی مـاوەی نوێژكردنەكەی دەخەوت، لەپاشدا هەڵئەسا ئەوەندەی ماوەی خەوتنەكەی نوێژی دەكرد، ئینجا دەخەوت ئەوەندەی ماوەی نوێژكردنەكەی، ئـەم حاڵەتـە درێـژەی دەكێشا هـەتا بەیانی، جـا وەسـفی قورئـان خوێندنەكـەی كـرد، ئـوم سـەلەمە وەسـفی قورئـان خوێندنەكـەی كـردو وتـی: پیـت بـە پیـت بـە تـەرتیل و بـەرەوانی دەیخوێنـدو حەقی خۆی دەدایە.

١٤٦٧ - (صحيح) عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ وَهُوَ عَلَى نَاقَةٍ يَقْرَأُ بِسُورَةِ الْفَتْحِ وَهُوَ يُرَجِّعُ.

واتە: (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی موغەففەل دەڵێت: لەرۆژی رزگارکردنی شاری مەککەدا پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بەسواری وشترێکەوە بینی بەدەنگی خۆش و بەڕەوانی سورەتی (فتح)ی دەخوێند.

١٤٦٨ - (صحيح) عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (زَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ).

واتە: بەرائی کوڕی عازب دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوێندنەوەی قورئان برازێننەوە بە بەدەنگتان). واتە بەدەنگی خۆش بیخوێنن.

١٤٦٩ - (صحيح) عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالْقُرْآنِ).

واتە: سەعیدی کوڕی ئەبو سەعید دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی بەدەنگی خۆش قورئان نەخوێنێ لە ئێمە نیە). واتە لەسەر رێباز و بەرنامەی ئێمە نیە.

١٤٧٠ -(صحيح) عَن سَعْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ، مِثْلَهُ.

واتـە: سـەعد دەڵێت: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم فەرموویـەتی، راوی فەرمودەکەی پێشوی بە هەمان مانا گێڕایەوە.

١٤٧١ -(صحيح) عَن ابْنَ أَبِي مُلَيْكَةَ، قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي يَزِيدَ: مَرَّ بِنَا أَبُو لُبَابَةَ فَاتَّبَعْنَاهُ حَتَّى دَخَـلَ بَيْتَـهُ، فَـدَخَلْنَا عَلَيْهِ، فَإِذَا رَجُـلٌ رَثُّ الْبَيْـتِ، رَثُّ الْهَيْئَـةِ، فَسَـمِعْتُهُ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُـولُ: (لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالْقُرْآنِ). قَـالَ: فَقُلْـتُ لابْـنِ أَبِي مُلَيْكَةَ: يَا أَبَا مُحَمَّدٍ أَرَأَيْتَ إِذَا لَـمْ يَكُـنْ حَسَـنَ الصَّوْتِ قَالَ: يُحَسِّنُهُ مَا اسْتَطَاعَ.

واتە: لە ئیبنو ئەبو مولەیکەوە هاتووە، کە (عَبَدُ الله)ی کوڕی ئـەبو یـەزیـد وتویـەتی: ئـەبو لوبابـە دای بەلاماندا ئێمـەش شـوێنی کـەوتین هـەتا رۆشـتەوە ماڵەکەی خۆی، ئێمەش چووینە ژوورەوە بۆلای، گوێم لێ بوو پیـاوێکی رووت و رەجاڵ دەیوت: لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیستووە دەیفـەرموو: (ئەو کەسەی بەدەنگی خۆش قورئـان نـەخوێنێ لـە ئێمـە نیـە). راوی وتـی: بـە ئەبو مولەیکەم وت: ئـەی ئـەبا موحەممـەد ئـەی ئەگـەر دەنگی خـۆش نـەبوو، وتی: هەتا دەتوانێ با دەنگی خۆش بکات.

١٤٧٢ - (صحيح) عَن مُحَمَّدُ بْنُ سُلَيْمَانَ الأَنْبَارِيُّ قَالَ: قَالَ وَكِيعٌ وَابْنُ عُيَيْنَةَ: يَعْنِي: يَسْتَغْنِي.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی سولەیمانی ئەنبارییەوە هاتووە، کە وتویەتی: وەکیعی کوڕی عویەینە سەبارەت بە مانای (مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ) وتویەتی: واتە: بەدەنگی خۆش بیخوێنێ.

١٤٧٣ -(صحيح) عَن أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَا أَذِنَ اللَّهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِنَبِيٍّ حَسَنِ الصَّوْتِ يَتَغَنَّى بِالْقُرْآنِ، يَجْهَرُ بِهِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە لە هیچ شتێ گوێ ناگرێت وەك ئەوەی کە گوێ دەگرێت لە پێغەمبەرێکی دەنگ خۆش یان قورئان خوێنێکی دەنگ خۆش کە بەڕەوانی و بەدەنگی خۆش قورئان بخوێنێ و دەنگی بەرزبکاتەوە). – پێغەمبەرێکی دەنگ خۆش مەبەستی لە پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم چونکە پێغەمبەرانی تر نامەکانی خۆیان خوێندۆتەوە -

# باسی هەڕەشەی توند لەوەی کە قورئان لەبەربکات و لەپاشدا لەبیری بچێتەوە.

# ٣٥٦- باب التَّشْدِيدِ فِيمَنْ حَفِظَ الْقُرْآنَ ثُمَّ نَسِيَهُ.

١٤٧٤ - (ضعيف) عن سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا مِنِ امْرِئٍ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ يَنْسَاهُ إِلاَّ لَقِيَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَجْذَمَ).

واتە: لە سەعدی کوڕی عوبادەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ قورئانی لەبەربێ و بخوێنێ و تەرکی خوێندنەوەی بکات هەتا لەبیری چێت، ئەوە رۆژی قیامەت بە گولی بەدیداری خوای گەورە دەگات). - (أجذم) بە چەند مانایە راڤەیان کردوە، هەندێ دەڵێن: بەگولی، هەندێ دەڵێن: بە دەست براوی و ددان کەوتویی، هەندێکی تر دەڵێن: بەبێ بەڵگە - .

# باسی قورئانە بە حەوت شێوە هاتۆتەخوارەوە.

## ٣٥٧ – باب أُنْزِلَ الْقُرْآنُ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ.

١٤٧٥ - (صحيح) عَن عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ قَالَ: سَمِعْتُ هِشَامَ بْنَ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ يَقْرَأُ سُورَةَ الْفُرْقَانِ عَلَى غَيْرِ مَا أَقْرَؤُهَا، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقْرَأَنِيهَا، فَكِدْتُ أَنْ أَعْجَلَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَمْهَلْتُهُ حَتَّى انْصَرَفَ، ثُمَّ لَبَّبْتُهُ بِرِدَائِهِ، فَجِئْتُ بِهِ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي سَمِعْتُ هَذَا يَقْرَأُ سُورَةَ الْفُرْقَانِ عَلَى غَيْرِ مَا أَقْرَأْتَنِيهَا. فَقَالَ: لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (اقْرَأْ). فَقَرَأَ الْقِرَاءَةَ الَّتِي سَمِعْتُهُ يَقْرَأُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هَكَذَا أُنْزِلَتْ). ثُمَّ قَالَ لِي: (اقْرَأْ). فَقَرَأْتُ فَقَالَ: (هَكَذَا أُنْزِلَتْ). ثُمَّ قَالَ: (إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ أُنْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ، فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ).

واتە: لە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە هیشامی کوڕی حیزام بوو لەنوێژدا سورەتی فورقانی

دەخوێنـد، شـێوەی خوێندنەكـەی جیـا بـوو لـە خوێندنەكـەی مـن، منـیش قورئانەكـەم لـەلای پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم خـۆی خوێنـد بـوو، خەریك بوو نوێژەكەی پـێ ببڕم، بـەلام مۆڵـەتم دا هـەتا لەنوێـژ بـوەوە، ئینجا توند یەخەیم گرت و بەرۆكی پۆشاكەكەیم لەسەر سنگی كۆكردەوە لەسەر ئـەو شێوەیە بە راكێشان بردم بۆلای پێغەمبەر صلی الله علیـە وسلم وتم: گـوێم لـێ بوو ئەمە بە شێوەیە سورەتی فورقانی دەخوێند جیایە لەگـەڵ ئـەوەدا كـە مـن لای تـۆ خوێندوومـە، پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم فـەرمووی: (ئـەی عومـەر یەخـەی بـەردە، ئـەی هیشـام! ئـادەی بخوێنـە). هیشـام بـەو شـێوەیە خوێنـدی كـە مـن گـوێم لێـی بـوو، پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم فـەرمووی: (ئـا بـەم شـێوەیەش هاتۆتـەخوارەوە). لەپاشـدا بەمنیشـی فـەرموو: (ئـادەی تـۆش بیخوێنـە). منـیش خوێنـدم، پێغەمبـەر صـلی الله علیـە وسـلم فەرمووی: (ئـا بـەم شـێوەیەش هاتۆتـەخوارەوە، ئـەم قورئانـە بـە حـەوت شـێوە هاتۆتەخوارەوە، جا ئێوە بەكام شێوە بە ئاسانی بۆتان دەخوێنرێت بەو شێوەیە بیخوێنن).

**١٤٧٦ -(صحيح) عَن مَعْمَرٌ قَالَ: قَالَ الزُّهْرِيُّ: إِنَّمَا هَذِهِ الأَحْرُفُ فِي الأَمْرِ الْوَاحِدِ، لَيْسَ تَخْتَلِفُ فِي حَلاَلٍ وَلاَ حَرَامٍ.**

واتە: مەعمەر دەڵێت: زوهری وتی: هاتنەخوارەوەی قورئان بە حەوت شێوە هەمان فەرمان و حوكمیـان هەیـە بـۆ حـەلاڵ و حـەرام حوكمەكـەیان جیـاوازی نیـە. - واتـە جیـاوازی خوێندنـەوەی قورئـان نابێتـە هـۆی گـۆڕینی ماناكـەی و حوكمەكەی - .

١٤٧٧ - (صحيح). عن أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا أُبَيُّ، إِنِّي أُقْرِئْتُ الْقُرْآنَ، فَقِيلَ لِي: عَلَى حَرْفٍ أَوْ حَرْفَيْنِ؟ فَقَالَ الْمَلَكُ الَّذِي مَعِي: قُلْ: عَلَى حَرْفَيْنِ. قُلْتُ: عَلَى حَرْفَيْنِ، فَقِيلَ لِي: عَلَى حَرْفَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةٍ. فَقَالَ الْمَلَكُ الَّذِي مَعِي: قُلْ: عَلَى ثَلاَثَةٍ. قُلْتُ: عَلَى ثَلاَثَةٍ، حَتَّى بَلَغَ سَبْعَةَ أَحْرُفٍ، ثُمَّ قَالَ: لَيْسَ مِنْهَا إِلاَّ شَافٍ كَافٍ، إِنْ قُلْتَ: سَمِيعًا عَلِيمًا، عَزِيزًا، حَكِيمًا، مَا لَمْ تَخْتِمْ آيَةَ عَذَابٍ بِرَحْمَةٍ، أَوْ آيَةَ رَحْمَةٍ بِعَذَابٍ).

واتە: ئوبەی كوڕی كەعب دەڵێت: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەی ئوبەی جوبرەئیل قورئانی بۆ خوێندمەوە، پێم وترا: ئەی موحەممەد بە یەك شێوە دەیخوێنی یان بە دوو شێوە، ئەو مەلائیكەیەی لەگەڵم بوو وتی: بڵێ: بە دوو شێوە، وتم: بە دوو شێوە، پێی فەرمووم: بە دوو شێوە یان بەسێ شێوە، ئەو مەلائیكەیەی لەگەڵم بوو وتی: بڵێ: بەسێ شێوە، وتم: بەسێ شێوە، هەتا گەیشتە حەوت شێوە، لەپاشدا فەرمووی: خوێندنەوەی قورئان بەو حەوت شێوەیە شیفان بۆ دڵی موسوڵمانان و بۆ نەخۆشی نەزانی، بەسن بۆ ئەوەی كە بەڵگە بن لەسەر راستگۆیی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و، دەرخستنی بەلاغەو رەوانبێژیی، بەسە بۆ موعجیزەی قورئان، ئەی موحەممەد ئەگەر: (سميعًا عليمًا) بخوێنی لە جیاتی: (عزيزًا حكيمًا) ئەوا پێكاوتەو زیانت پێ ناگەیەنێت- واتە سیفەتێ بە سیفەتێكی تر بگۆڕی دروستە

- ، بەڵام ئەوەندە هەیە کۆتایی ئایەتی ئایەتی سزا بە ئایەتی رەحمەت نەهێنی، یان بە ئایەتی رەحمەت کۆتایی بە ئایەتی سزا نەهێنیت.

**١٤٧٨ - (صحيح) عَن أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ عِنْدَ أَضَاةِ بَنِي غِفَارٍ، فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَأْمُرُكَ أَنْ تُقْرِئَ أُمَّتَكَ عَلَى حَرْفٍ. قَالَ: (أَسْأَلُ اللَّهَ مُعَافَاتَهُ وَمَغْفِرَتَهُ، إِنَّ أُمَّتِي لاَ تُطِيقُ ذَلِكَ). ثُمَّ أَتَاهُ ثَانِيَةً فَذَكَرَ نَحْوَ هَذَا، حَتَّى بَلَغَ سَبْعَةَ أَحْرُفٍ، قَالَ: إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكَ أَنْ تُقْرِئَ أُمَّتَكَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ فَأَيُّمَا حَرْفٍ قَرَءُوا عَلَيْهِ فَقَدْ أَصَابُوا.**

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەلای حەوز و گۆماوێکی بەنی غیفاردا بوو، جوبرەئیل هات بۆلای فەرمووی: خوای گەورە فەرمانی پێکردوی بە یەك شێوە قورئان بخوێنیتەوە بۆ ئومەتەکەت، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (داوام کرد لە خوای گەورە بە لێبوردەیی و لێخۆشبوونی خۆی، ئومەتەکەم توانای ئەوەیان نیە). لەپاشدا جوبرەئیل بۆ جاری دووەم هاتەوە بۆلای، راوی بەهەمان شێوە گێڕایەوە، هەتا گەیشتە ئەوەی کە بە حەوت شێوە بیخوێنێت، فەرمووی: خوای گەورە فەرمانی پێکردوی کە ئومەتەکەت بە حەوت شێوە قورئان بخوێننەوە بە هەر شێوەیەکیان بیخوێننەوە پێکاویانە.

## باسی فەزڵ و ئادابی نزاو پاڕانەوە.

## ٣٥٨ - باب الدُّعَاءِ.

١٤٧٩ - (صحيح). عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الدُّعَاءُ هُوَ الْعِبَادَةُ، ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴾ غافر: ٦٠.

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (نزاو پاڕانەوە عیبادەت و پەرستشە،﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴾. واتە: پەروەردگارتان فەرموویەتی لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە.

١٤٨٠ - (صحيح) عَنِ ابْنٍ لِسَعْدٍ أَنَّهُ قَالَ: سَمِعَنِي أَبِي وَأَنَا أَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ وَنَعِيمَهَا وَبَهْجَتَهَا، وَكَذَا وَكَذَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ وَسَلاَسِلِهَا وَأَغْلاَلِهَا، وَكَذَا وَكَذَا فَقَالَ: يَا بُنَيَّ! إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (سَيَكُونُ قَوْمٌ يَعْتَدُونَ فِي الدُّعَاءِ). فَإِيَّاكَ أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ، إِنْ أُعْطِيتَ الْجَنَّةَ أُعْطِيتَهَا وَمَا فِيهَا مِنَ الْخَيْرِ، وَإِنْ أُعِذْتَ مِنَ النَّارِ أُعِذْتَ مِنْهَا وَمَا فِيهَا مِنَ الشَّرِّ.

واتە: کوڕێکی سەعد - ی کوڕ ئەبی وەقاص — وتی: باوکم گوێی لێ بوو وتم: خودایە! من داوای بەهەشت و خۆشی و نازو نیعمەتی و شتە جوان و رازاوەکانیت لێ دەکەم، پەنادەگرم بە تۆ لە ئاگری دۆزەخ و کۆت و زنجیرە ئاگرینەکانی - کە دەکرێنە گەردنی بێ بڕوایان - ، وە داوای ئەمەو ئەوەت لێ دەکەم، سەعد وتی: ئەی کوڕی خۆم! گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (کۆمەڵێ پەیدا دەبن لە نزاو پاڕانەوەکانیاندا زێدەڕۆیی دەکەن). هۆشیاربە تۆش نەبیت بە یەکێ لەمانە، ئەگەر خوای گەورە بەهەشتی پێ بەخشیت ئەوا بە خۆی و بە نازو نیعمەتە جوان و رازاوەکانیەوە پێت دەبەخشێت، ئەگەر پەنات بدات لە ئاگری دۆزەخ و بتپارێزێ ئەوا دەتپارێزێ لە خۆی و لەو سزا خراپانەی کە تیایەتی.

١٤٨١ -(صحيح) عَن فَضَالَةَ بْنَ عُبَيْدٍ صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: سَمِعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلاً يَدْعُو فِي صَلاَتِهِ لَمْ يُمَجِّدِ اللَّهَ تَعَالَى، وَلَمْ يُصَلِّ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (عَجِلَ هَذَا). ثُمَّ دَعَاهُ فَقَالَ لَهُ أَوْ لِغَيْرِهِ: (إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِتَمجِيدِ رَبِّهِ جَلَّ وَعَزَّ وَالثَّنَاءِ عَلَيْهِ، ثُمَّ يُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ يَدْعُو بَعْدُ بِمَا شَاءَ).

واتە: (فضالة)ی کوڕی عوبەید کە یەکێ بوو لە یارانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گوێی لە

پیاوێك بوو لە نوێژەکەیدا دەپاڕایەوە، نە سوپاس و ستایشی خوای کرد، نە سەڵاواتی دا لەسەر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەمە بە پەلەیە). لەپاشدا پیاوەکەی بانگ کردو بە ئەو و بە کەسانی تری فەرموو: (ئەگەر کەسێ لە ئێوە پاڕایەوە با بە سوپاس و ستایشی خوای گەورە دەست پێ بکات، لەپاشدا سەڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، ئینجا لەپاش ئەوە هەر نزاو پاڕانەوەیە ئارەزوو دەکات بۆ خۆی لە خێرو چاکەی دنیاو قیامەت با داوای بکات.

١٤٨٢ - (صحيح) عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتَحِبُّ الْجَوَامِعَ مِنَ الدُّعَاءِ، وَيَدَعُ مَا سِوَى ذَلِكَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم حەزی لە پاڕانەوەی پڕ واتا دەکرد واتە وشەی کەم بێ و مانای زۆر بدات بەدەستەوە، وازی لە جگە پاڕانەوەی پڕ واتا دەهێنا.

١٤٨٣ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي إِنْ شِئْتَ، اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي إِنْ شِئْتَ، لِيَعْزِمِ الْمَسْأَلَةَ فَإِنَّهُ لاَ مُكْرِهَ لَهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: با کەسێ لە ئێوە نەڵێ خودایە! ئەگەر خۆت ئارەزوو

دەکەی لێم خۆشبە، خودایە ئەگەر خۆت ویستت رەحمم پێ بکە، بە عەزمەوە بپاڕێنەوە چونکە کەس زۆری لەسەر خوا نیە.

١٤٨٤ - (صحيح) عَن أَبِى هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (يُسْتَجَابُ لأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ فَيَقُولُ: قَدْ دَعَوْتُ فَلَمْ يُسْتَجَبْ لِى).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە وەڵامی نزاو پاڕانەوەی کەسێکتان دەداتەوە بە مەرجێ پەلەپەل نەکات وەك بڵێ: هەر دەپاڕێمەوە بەلام پاڕانەوەکەم گیرانەبوو).

١٤٨٥ - (ضعيف) عَن عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ تَسْتُرُوا الْجُدُرَ، مَنْ نَظَرَ فِى كِتَابِ أَخِيهِ بِغَيْرِ إِذْنِهِ فَإِنَّمَا يَنْظُرُ فِى النَّارِ، سَلُوا اللَّهَ بِبُطُونِ أَكُفِّكُمْ، وَلاَ تَسْأَلُوهُ بِظُهُورِهَا، فَإِذَا فَرَغْتُمْ فَامْسَحُوا بِهَا وُجُوهَكُمْ).

واتە: لە (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (پەردە بۆ دارو دیوار مەکەن - چونکە لەکردەوە خۆبەزل زانەکانەو بەفیرۆدانی سامان و داراییە - هەرکەس نامەی برا موسوڵمانەکەی خۆی بخوێنێتەوە بەبێ رەزامەندی خۆی وەك ئەوە وایە لەنزیکەوە سەیری ئاگر بکات - بێگومان زیان بەچاو

دەگەیەنێت، لێرەدا مەبەست ئەوەیە ئەمانەتە خۆتانی لێ بپارێزن وەك چۆن چاوتان لە ئاگر دەپارێزن، خواش بۆ خۆی دەیزانێ - ، کاتێ کە دەپاڕێنەوە بە بەری دەستان بپاڕێنەوە واتە بەری دەستان رووبکەنە ئاسمان، بە پشتی دەست مەپاڕێنەوە، کاتێ کە لەنزاو پاڕانەوە بوونەوە بەری دەستان بهێنن بەرووی خۆتاندا).

١٤٨٦ – (حسن صحيح) عَنْ مَالِكِ بْنِ يَسَارٍ السَّكُونِيِّ ثُمَّ الْعَوْفِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ فَاسْأَلُوهُ بِبُطُونِ أَكُفِّكُمْ، وَلاَ تَسْأَلُوهُ بِظُهُورِهَا).

واتە: مالیکی کوڕی یەسار سەکونی لەپاشدا عەوفی دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ کە دەپاڕێنەوە لە خوای گەورە بە بەری دەستان لێی بپاڕێنەوە، بە پشتی دەست لێی مەپاڕێنەوە).

١٤٨٧ - (صحيح بلفظ: (جعل ظاهر كفيه مما يلي وجهه، وباطن كفيه مما يلي الأرض)) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدْعُو هَكَذَا: بِبَاطِنِ كَفَّيْهِ وَظَاهِرِهِمَا.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی بەم شێوەیە دەپاڕایەوە: بە بەری دەستی و بە پشتی دەستی.

١٤٨٨ - (صحيح) عَن سَلْمَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ رَبَّكُمْ تَبَارَكَ وَتَعَالَى حَيِيٌّ كَـرِيمٌ يَسْـتَحْيِي مِنْ عَبْدِهِ إِذَا رَفَعَ يَدَيْهِ إِلَيْهِ أَنْ يَرُدَّهُمَا صِفْرًا).

واتە: لە سەلمانەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسلم فەرموویەتی: (پەروەردگاری بەرز و شکۆمەندتان زۆر بەحەیاو بـەڕێزە و نازو نیعمەت بەخشە بە بەندەکانی، حـەیا دەکا ئەگـەر بەندەیـەکی بـاوەڕداری دەستەکانی بۆ بەرزبکاتەوە بە خاڵی بیانگێڕێتەوە).

١٤٨٩ - (صحيح) عَن ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: الْمَسْأَلَةُ: أَنْ تَرْفَعَ يَدَيْكَ حَذْوَ مَنْكِبَيْكَ أَوْ نَحْوَهُمَا، وَالاِسْـتِغْفَارُ: أَنْ تُشِـيرَ بِأُصْـبُعٍ وَاحِدَةٍ، وَالاِبْتِهَالُ: أَنْ تَمُدَّ يَدَيْكَ جَمِيعًا.

واتە: لە ئیبنو عەباسـەوە ڕەزای خوایـان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، کـە وتویـەتی: ئادابی پاڕانەوە ئەوەیە: دەستەکانت بەرزکەیتەوە هەتا ڕێکی شانت یان نزیکی شان، ئەدەبی داوای لێ خۆشبوون ئەوەیە: بە پەنجەیە ئاماژە بکەیت، لالانـەوەو کڕوزانەوەش ئەوەیە: دەستەکانت بەتەواوی بەرزبکەیتـەوە هـەتا بـن باڵـەکانت دەبینرێت.

١٤٩٠ - (صحيح) عَن عَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَعْبَـدِ بْـنِ عَبَّـاسٍ، بِهَذَا الْحَدِيثِ ، قَالَ فِيهِ: وَالاِبْتِهَالُ هَكَذَا: وَرَفَعَ يَدَيْهِ، وَجَعَلَ ظُهُورَهُمَا مِمَّا يَلِي وَجْهَهُ.

واتە: لە عەباسی کوڕی (عَبدُ اللـه)ی کوڕی مەعبەدی کوڕی عەباسەوە هاتووە، راوی بە هەمان شێوە فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە، تێیدا وتی: لاڵانەوەو کڕوزانەوەش ئەوەیە: دەستەکانی بەتەواوی بەرزبکاتەوە، پشتی دەستەکانی روبکاتە روومەتی خۆی.

١٤٩١ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی، راوی بە هەمان شێوە فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە.

١٤٩٢ - (ضعيف) عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا دَعَا فَرَفَعَ يَدَيْهِ، مَسَحَ وَجْهَهُ بِيَدَيْهِ.

واتە: لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە، لە باوکیەوە، هاتووە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەپاڕایەوە دەستەکانی بەرزدەکردەوە دوای ئەوەی کە تەواو دەبوو دەیهێنان بە روومەتی خۆیدا.

١٤٩٣ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَمِعَ رَجُلاً يَقُولُ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ أَنِّي أَشْهَدُ أَنَّكَ أَنْتَ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، الأَحَدُ

الصَّمَدُ، الَّذِى لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ. فَقَالَ: (لَقَدْ سَأَلْتَ اللَّهَ بِالاِسْمِ الَّذِى إِذَا سُئِلَ بِهِ أَعْطَى، وَإِذَا دُعِىَ بِهِ أَجَابَ).

واتە: لە (عَبدُ اللـه)ی كوڕی بورەیدەوە، لە باوكیەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم گوێ لە پیاوێ بوو دەیوت: (خودایە من داوات لێ دەكەم شایەتی دەدەم كە هیچ خودایەكی تر نیە جگە لەتۆ، تاك و تەنیای و جێی نیازی، ئەو خوایەی نەكەست لێ بووەو نە لەكەس بوویت، كەس لە هاو وێنەو هاوتای تۆ نیە. پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (دڵنیابە تۆ بەو ناوە لە خوا پاڕایتەوە كە هەركەس بەو ناوەوە داوای لێ بكات ئەیدرێتێ، هەركەسێ پێی بپاڕێتەوە نائومێدی ناكات و پاڕانەوەكەی گیرا دەكات).

١٤٩٤ - (صحيح) عَنْ مَالِكِ بْنِ مِغْوَلٍ، بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ فِيهِ: (لَقَدْ سَأَلْتَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ بِاسْمِهِ الأَعْظَمِ).

واتە: لە مالیكی كوڕی میغوەلەوە هاتووە، ڕاوی بە هەمان شێوە فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە، تێیدا وتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (دڵنیابە تۆ بە ناوە گەورەكەی خوا داوات لە خوا ی گەورە كرد).

١٤٩٥ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ، أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسًا، وَرَجُلٌ يُصَلِّى، ثُمَّ دَعَا: اللَّهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ بِأَنَّ لَكَ الْحَمْدَ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ الْمَنَّانُ، بَدِيعُ

السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، يَا ذَا الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ، يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَقَدْ دَعَا اللَّهَ بِاسْمِهِ الْعَظِيمِ، الَّذِي إِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ، وَإِذَا سُئِلَ بِهِ أَعْطَى).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دانیشتووە، پیاوێ نوێژی دەکرد، لەپاشدا پاڕایەوە دەیوت: خودایە من داوات لێ دەکەم سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە، هیچ خودایەکی تر نیە جگە لەتۆ بەخشندەو خاوەن چاکەی، دروستکەری ئاسمانەکان و زەویت ئەی گەورەی خاوەن شکۆی خاوەن ڕێز، ئەی زیندووی نەمر، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بە ناوە گەورەکەی خوا پاڕایەوە، کە هەرکەسێ بەو ناوەوە لێی بپاڕێتەوە نائومێدی ناکات و پاڕانەوەکەی گیرا دەکات، هەرکەسێ بەو ناوەوە داوای لێ بکات ئەیدرێتێ).

١٤٩٦ - (حسن) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (اسْمُ اللَّهِ الأَعْظَمُ فِي هَاتَيْنِ الآيَتَيْنِ: (وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ). وَفَاتِحَةُ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ: (الٓمٓ اللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ).

واتە: لە ئەسمائی کچی یەزیدەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ناوە گەورەکەی خوا لەم دوو ئایەتەدایە: (وَإِلَٰهُكُمْ

﴿إِلَٰهٌ وَاحِدٌ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ﴾. (البقرة:١٦٣). واتە: پەرستراوی ئێوە پەرسیراوێکی تاك و تەنیایە، هیچ پەرستراوێکی راست نی یە تەنیا ئەو نەبێ کە بەخشندەی میهرەبانە. وە سەرەتای سورەتی (آلِ عِمْرَان): (﴿الٓمٓ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾). (آلِ عِمْرَان ١-٢). واتە: خوا ئەو خوایەیە کە هیچ پەرستراوێکی راست نی یە جگە لە ئەو زیندووی راگری بوونەوەرە.

١٤٩٧ - (صحيح) عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها قَالَتْ: سُرِقَتْ مِلْحَفَةٌ لَهَا، فَجَعَلَتْ تَدْعُو عَلَى مَنْ سَرَقَهَا، فَجَعَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ تُسَبِّخِي عَنهُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: لاَ تُسَبِّخِي أَيْ لاَ تُخَفِّفِي عَنهُ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە داپۆشەرێکی هەبوو دزییان، عائیشەش دوعای دەکرد لەو کەسەی کە دزیویەتی، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەو سزایەی کە دزەکە شایستەیەتی بە دوعاکردن لێی لەسەری سوك مەکە). ئەبو داود دەڵێت: واتە سزای لەسەر سوك مەکە. دواتر بە ژمارە: (٤٩٠٩) دێت.

١٤٩٨ - (ضعيف) عَن عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنه قَالَ: اسْتَأْذَنْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْعُمْرَةِ، فَأَذِنَ لِي وَقَالَ: (اَتَنْسَنَا يَا أُخَيَّ مِنْ دُعَائِكَ). فَقَالَ: كَلِمَةً مَا يَسُرُّنِي

أَنَّ لِي بِهَا الدُّنْيَا، قَالَ شُعْبَةُ: ثُمَّ لَقِيتُ عَاصِمًا بَعْدُ بِالْمَدِينَةِ فَحَدَّثَنِيهِ، وَقَالَ: (أَشْرِكْنَا يَا أُخَيَّ فِي دُعَائِكَ).

واتە: لە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: داوای مۆڵەتم کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە بڕۆم بۆ عومرە، ڕێگەی پێدام و فەرمووی: (ئەی براله! لە نزاو پاڕانەوەکانتدا فەرامۆشم مەکە). عومەر وتی: ئەو وشەیەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ناگۆڕمەوە بە هەموو دنیا، شوعبە راوی فەرموودەکە وتی: لەپاشدا لەمەدینە گەیشتم بە (عاصم) قسەی بۆ کردم وتی: (ئەی براله! لە نزاو پاڕانەوەکانتدا بەشدارم بکە).

١٤٩٩ - عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: مَرَّ عَلَيَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا أَدْعُو بِأُصْبُعَيَّ فَقَالَ: (أَحِّدْ أَحِّدْ) وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ.

واتە: لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دای بەلامدا لەو کاتەدا دەپاڕامەوە بە دوو پەنجە ئیشارەتم دەکرد، فەرمووی: (بە یەك پەنجە بە یەك پەنجە). بە پەنجەی شایەتمان ئاماژەی کرد کە لەکاتی پاڕانەوەدا بەو پەنجەیە ئاماژە بکەم.

## باسی تەسبیحات بە بەرد.

## ٢٤ – بَاب التَّسْبِيحِ بِالْحَصَى.

١٥٠٠ – (ضعيف) عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ أَبِيهَا، أَنَّهُ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى امْرَأَةٍ وَبَيْنَ يَدَيْهَا نَوًى – أَوْ: حَصًى - تُسَبِّحُ بِهِ، فَقَالَ: (أُخْبِرُكِ بِمَا هُوَ أَيْسَرُ عَلَيْكِ مِنْ هَذَا، أَوْ أَفْضَلُ؟). فَقَالَ: (سُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ مَا خَلَقَ فِي السَّمَاءِ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ مَا خَلَقَ فِي الأَرْضِ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ مَا خَلَقَ بَيْنَ ذَلِكَ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ مَا هُوَ خَالِقٌ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ مِثْلُ ذَلِكَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ مِثْلُ ذَلِكَ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ مِثْلُ ذَلِكَ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ مِثْلُ ذَلِكَ).

واتە: لە عائیشەی کچی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە، لە باوکیەوە، دەگێڕنەوە، کە جارێ لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم چوون بۆلای ئافرەتێك هەندێ ناوکە خورما - یان وردە بەردی - لەبەردەستدا بوو تەسبیحاتی دەکرد بە ناوکە خورماکە دەیژماردن، فەرمووی: (شتێکت پێ دەڵێم لەمە ئاسانترە بۆت، یان فەرمووی: چاکترە بۆت؟). فەرمووی: (بە قەد ژمارەی ئەوەی کە خوا دروستی کردوە لە ئاسمان (سُبْحَانَ الله)، بە قەد ژمارەی

ئەوەی کە خوا دروستی کردوە لە زەوی دا (سُبْحَانَ اللّه)، بە قەد ژمارەی ئەوەی کە خوا دروستی کردوە لەنێوان ئاسمان و زەوی دا (سُبْحَانَ اللّه)، بە قەد ژمارەی ئەوەی کە خوا لەمەولا دروستی دەکات - لەئەزەلەوە هەتا ئەبەد دروستی کردون و دروستیان دەکات - (سُبْحَانَ اللّه)، هەروەها (اللّهُ أكْبَر)یش ئەوەندە، (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ)یش ئەوەندە، (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللّهِ)یش ئەوەندە.

**١٥٠١ - (حسن) عَنْ يُسَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَهُنَّ أَنْ يُرَاعِينَ بِالتَّكْبِيرِ وَالتَّقْدِيسِ وَالتَّهْلِيلِ، وَأَنْ يَعْقِدْنَ بِالأَنَامِلِ فَإِنَّهُنَّ مَسْئُولاَتٌ مُسْتَنْطَقَاتٌ.**

واتە: لە یوسەیرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێکردون واتە بە ئافرەتان کە ئاگاداری تەکبیر(اللّهُ أكْبَر)و تەقدیس(سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُوسِ) یان (سُبُوحٌ قُدُوسٌ رَبُّ الْمَلاَئِكَةِ وَالرُوحِ) و تەهلیل(لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ) بن، بە سەری پەنجەکان ئەنجامیان بدەن چونکە لەرۆژی قیامەتدا پرسیاریان لێ دەکرێت و دەهێنرێنە گۆو دەبنە شایەت - وەك باقی ئەندامەکانی تر - .

**١٥٠٢ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعْقِدُ التَّسْبِيحَ، قَالَ ابْنُ قُدَامَةَ: بِيَمِينِهِ.**

واتە: لە (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی عەمرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی تەسبیحاتی دەکرد، ئیبنو قودامە وتی: بە دەستی راستی.

فێرم بكە، فەرمووی: (لەدوای هەموو نوێژێكی فەرزەوە: سی و سێ جار بڵێ: (اللهُ أكْبَر) ، سی و سێ جار بڵێ: (الحَمدُ لله) ، سی و سێ جار بڵێ: (سُبحَانَ الله) ، كۆتایی ئەم وشانە بهێنە بە: (لاَ إلهَ إلاَّ اللهُ وَحدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ، وَهوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدِيرٌ). واتە: هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە (الله) تاكی بێ هاوبەشە، موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێكدا بە توانایە، هەركەس ئەم وشانە بڵێ خوای گەورە لە گوناهەكانی خۆشدەبێت با بەقەد كەفی دەریا زۆربن.

## باسی كەسێ كە سەلامی دایەوە لەنوێژە فەرزەكان چی بڵێت.

## ٢٥ – باب مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا سَلَّمَ.

١٥٠٥ – (صحيح) عَنْ وَرَّادٍ مَوْلَى الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ: كَتَبَ مُعَاوِيَةُ إِلَى الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، أَيُّ شَيْءٍ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ إِذَا سَلَّمَ مِنَ الصَّلاَةِ؟ فَأَمْلاَهَا الْمُغِيرَةُ عَلَيْهِ، وَكَتَبَ إِلَى مُعَاوِيَةَ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ).

واتە: لە وەڕادی خزمەتكاری موغیرەی كوڕی شوعبەوە، لە موغیرەی كوڕی شوعبەوە هاتووە: كە موعاویە نامەی نوسی بۆ موغیرەی كوڕی شوعبە لێی پرسی: ئایا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەدوای سەلامدانەوە لەنوێژە فەرزەكان چی دەفەرموو؟ موغیرە وەڵامی نامەكەی بە وەڕاد نوسی، ئەم فەرموودەی پێ نوسی بۆ موعاویە، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ). واتە: هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە (الله) تاكی بێ هاوبەشە، موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێكدا بە توانایە، خودایە! رێگر نیە لەو شتەی كە تۆ دەیبەخشی، بەخشەر نیە بۆ ئەو شتەی كە تۆ دەیگریتەوە، هیچ خاوەن دەسەڵاتێك دەسەڵاتەكەی سودی نیە بۆی لەرۆژی قیامەتدا لەسزای تۆ -بەڵكو فەرمانبەرداری و پەرستش سودی پێ دەگەیەنێ-)

١٥٠٦ - (صحيح) عَنْ أَبِى الزُّبَيْرِ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا انْصَرَفَ مِنَ الصَّلاَةِ يَقُولُ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ، أَهْلُ النِّعْمَةِ وَالْفَضْلِ وَالثَّنَاءِ الْحَسَنِ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ).

واتە: ئەبو زوبەیر دەڵێت: گوێم لێ بوو (عَبْدُ اللهِ)ی كوڕی زوبەیر لەسەر مینبەر وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كاتێ كە سەلامی دەدایەوە

لەنوێژە فەرزەکان دەیفەرموو: (هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە (الله) تاکی بێ هاوبەشە، موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە، هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە (الله) بە دڵسۆزی و بەپاکیی دینداریت بۆ دەکەین هەرچەندە بێ باوەڕانیش پێیان ناخۆش بێ، تۆ خاوەنی نیعمەت و چاکەو ستایشی چاکی، هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە (الله)، بە دڵسۆزی و بەپاکی دینداریت بۆ دەکەین هەرچەندە بێ باوەڕانیش پێیان ناخۆش بێ.

١٥٠٧ - (صحيح) عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ قَالَ: كَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الزُّبَيْرِ يُهَلِّلُ (بهنَّ) فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ، فَذَكَرَ نَحْوَ هَذَا الدُّعَاءِ، زَادَ فِيهِ: (وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ لاَ نَعْبُدُ إِلاَّ إِيَّاهُ، لَهُ النِّعْمَةُ). وَسَاقَ بَقِيَّةَ الْحَدِيثِ.

واتە: لە ئەبو زوبەیرەوە هاتووە، کە (عَبدُ اللـه)ی کوڕی زوبەیر لەدوای نوێژە فەرزەکانەوە تەلیلەی بەم وشانە دەکرد، جا راوی هەمان پاڕانەوەی فەرموودەی پێشوی گێڕایەوە، ئەمەشی بۆ زیادکرد: (هیچ گۆڕان و هێزێك نیە مەگەر بەخوای گەورەوە، هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە (الله) جگە لەو کەس ناپەرستین، نیعمەت هەمووی بۆ ئەوە). جا راوی باقی فەرموودەکەی گێڕایەوە.

١٥٠٨ - (ضعيف) عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ قَالَ: سَمِعْتُ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ، وَقَالَ سُلَيْمَانُ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ فِي دُبُرِ صَلاَتِهِ: (اللَّهُم رَبَّنَا

وَرَبَّ كلِّ شيءٍ، أنا شَهيدٌ أنَّكَ أنـتَ الـرَّبُّ وحـدَكَ لا شريك لك، اللهمَّ رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شيءٍ، أنَـا شَـهيدٌ أَنَّ محمدا عبدُكَ ورسولُك، اللَّهُمَّ رَبَّنَا ورَبَّ كلِّ شـيءٍ أنـا شهيدٌ أنَّ العِبَادَ كُلَّهـم إِخْـوَةٌ، اللـهمَّ رَبَّنـا ورَبَّ كـلِّ شيءٍ، اجعلني مُخْلصا لَكَ وأهلي في كل سـاعةٍ مـن الدنيا والآخرةِ، يا ذا الجَلال والإكرامِ، اسْمَعْ واستَجِبْ، اللهُ أكبرُ الأكبرُ، اللهمَّ نُـورَ السـموات والأرضِ - وفي روايــةٍ : رَبَّ الســموات والأرضِ - الله أكـبرُ الأكـبرُ، حَسبيَ اللهُ ونِعمَ الْوَكيـلُ، الله أكـبرُ الأكـبرُ). - قَـالَ سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ: (رَبَّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ- اللَّهُ أَكْبَـرُ الأَكْبَرُ، حَسْبِيَ اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ، اللَّهُ أَكْبَرُ الأَكْبَرُ).

واتـە: لـە زەیـدی کـوڕی ئەرقەمـەوە هـاتووە، کـە وتویـەتی: گـوێم لـێ بـوو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی، سولەیمان وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسـلم لـەدوای نوێـژە - فـەرزە - کەیـەوە فـەرمووی: (خودایـە! ئـەی پەروەردگاری ئێمەو هەموو شتێك، من شایەتی دەدەم کە تۆ پەروەردگاری تـاك و بـێ هاوبەشـی، خودایـە! ئـەی پـەروەردگاری ئێمـەو هـەموو شـتێك، شـایەتی دەدەم کـە موحەممـەد بەنـدەو پێغەمبـەر و نێـردراوی تۆیـە، خودایـە! ئـەی پـەروەردگاری ئێمـەو هـەموو شـتێك، شـایەتی دەدەم کـە بەنـدەکان هـەموویان بـرای یـەکن، خودایـە! ئـەی پـەروەردگاری ئێمـەو هـەموو شـتێك، خـۆم و خانەوادەو کەسوکارەکەم بکەیتـە بەنـدەی ملکەچ و دڵسۆزی خـۆت لـە هـەموو

كاتێكی ژیانی دنیاو قیامەتدا، ئەی گەورەی خاوەن شكۆی خاوەن ڕێز، خودایە پاڕانەوەكەم گیرا بكەو وەڵامم بدەرەوە، ئەی گەورەی هەموو گەورەكان، نور و روناكی ئاسمانەكان و زەوی ، - لەریوایەتێكی تردا - پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوی، ئەی گەورەی هەموو گەورەكان، خودام بەسە باشترین پشت و پەنامەو بەس، گەورەی هەموو گەورەكان). سولەیمانی كوڕی داود وتی: (ئەی پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوی، گەورەی هەموو گەورەكان، خودام بەسە باشترین پشت و پەنامەو بەس، گەورەی هەموو گەورەكان).

١٥٠٩ - (صحيح) عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا سَلَّمَ مِنَ الصَّلاَةِ قَالَ: (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، وَمَا أَسْرَفْتُ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ).

واتە: لە پێشەوا عەلی كوڕی (أبی طالب)ەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كاتێ كە سەلامی دەدایەوە لەنوێژ دەیفەرموو: (ئەی خودایە! لێم خۆشبە، لەو گوناهانەم خۆشبە كە پێشم خستووە لەوانەش كەدوام خستووە، ئەوەی كە بە پەنهانی ئەنجامم داوەو ئەوەی ئاشكرام كردوە، لەو گوناهانەی كە لەخۆمم كردوە، لەو گوناهانەیش كە تۆ لەمن باشتر دەیانزانی، تۆ پێشخەری و تۆ دواخەری، هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لەتۆ).

١٥١٠ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدْعُو: (رَبِّ أَعِنِّي وَلاَ تُعِنْ عَلَيَّ، وَانْصُرْنِي وَلاَ تَنْصُرْ عَلَيَّ، وَامْكُرْ لِي وَلاَ تَمْكُرْ عَلَيَّ، وَاهْدِنِي وَيَسِّرْ هُدَايَ إِلَيَّ، وَانْصُرْنِي عَلَى مَنْ بَغَى عَلَيَّ، اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي لَكَ شَاكِرًا، لَكَ ذَاكِرًا، لَكَ رَاهِبًا، لَكَ مِطْوَاعًا، إِلَيْكَ مُخْبِتًا - أَوْ مُنِيبًا - رَبِّ تَقَبَّلْ تَوْبَتِي، وَاغْسِلْ حَوْبَتِي، وَأَجِبْ دَعْوَتِي، وَثَبِّتْ حُجَّتِي، وَاهْدِ قَلْبِي، وَسَدِّدْ لِسَانِي، وَاسْلُلْ سَخِيمَةَ قَلْبِي).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەپاڕیەوە دەیفەرموو: (خودایە یارمەتیم بدە – واتە یارمەتیم بدە یادی تۆ بکەم، سوپاست بکەم بە چاکی بت پەرستم - یارمەتی کەس مەدە دژی من – واتە یارمەتی کەسێ مەدە رێگریم لێ بکا لە فەرمانبەرداری و گوێڕایەڵیت لە شەیاتینی ئادەمیزاد و جنۆکە - ، سەرم بخە – بەسەر کافراندا - سەریان مەخە بەسەرما - یان سەرم بخە بەسەر نەفسمدا کە سەرسەخت ترین دوژمن مە نەفسی فەرماندەر بە خراپە سەرمەخە بەسەرمدا کە شوێن هەواو ئارەزوو بکەوم و واز لە هیدایەت و رێنمایی بهێنم – مەکرم بۆ بکە مەکرم بەسەردا مەکە، رێنمایم بۆ ئاسان بکە، سەرم بخە بەسەر ئەوانەدا زوڵم و ستەمم لێ دەکەن، وام لێ بکە هەمیشە سوپاسگوزارت بم، یادت بکەم، زۆر لەتۆ بترسم، گوێڕیەڵ و فەرمانبەردارت بم، زۆر ملکەچت بم، زۆر بۆلای تۆ بگەڕێمەوە، خودایە وام لێ بکە شکایەتی حاڵم هەر لای تۆ بکەم، پەروەردگار تەوبەو پەشیمانیم لێ وەربگرە، تاوانەکانم بسڕەوە،

پاڕانەوەکانم لێ قبوڵ بکە، بەڵگەکانم بچەسپێنە، دڵم ڕێنمایی بکە، زمانم ڕاست بێژ بکە، ڕق و کینەی سینەم لابەرەو دڵم ساف و بێگەرد بکە).

١٥١١ - (صحيح) عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: سَمِعْتُ عَمْرَو بْنَ مُرَّةَ بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ، قَالَ: (وَيَسِّرِ الْهُدَى إِلَيَّ) وَلَمْ يَقُلْ (هُدَاىَ).

واتە: سوفیان دەڵێت: گوێم لێ بوو عەمری کوڕی موڕڕە بە هەمان سەنەدو مانا فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە، بەڵام لەجیاتی (هُدَاىَ). وتی: (وَيَسِّرِ الْهُدَى إِلَيَّ). واتە: ڕێنمایم بۆ ئاسان بکە.

١٥١٢ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا سَلَّمَ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلاَمُ، وَمِنْكَ السَّلاَمُ، تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ».

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کاتێ کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم سەلامی دەدایەوە دەیفەرموو: (خودایە تۆ سەلامی و ئاشتی و سەلامەتی، سەلامەتیش لەتۆوەیە، بەڕاستی تۆ زۆر پیرۆز و گەورەیت ئەی گەورەی خاوەن شکۆی خاوەن ڕێز).

١٥١٣ - (صحيح) عَنْ ثَوْبَانَ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنْصَرِفَ مِنْ صَلاَتِهِ اسْتَغْفَرَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ قَالَ: (اللَّهُمَّ) فَذَكَرَ مَعْنَى حَدِيثِ عَائِشَةَ رضى الله عنها.

واتە: لە (ثوبان)ی خزمەتکاری پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم دەگێڕنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بیویستایە لە نوێژەکەی ببێتەوە، سێ جار (أستغفر الله)ی دەکرد، لەپاشدا دەیفەرموو: (خودایە...). جا راوی بە هەمان مانا فەرموودەکەی عائیشەی گێڕایەوە.

## باسی داوای لێخۆشبوون کردن.

## ٢٦ – باب فِي الاِسْتِغْفَارِ.

١٥١٤ - (ضعيف) عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا أَصَرَّ مَنِ اسْتَغْفَرَ وَإِنْ عَادَ فِي الْيَوْمِ سَبْعِينَ مَرَّةً).

واتە: لە پێشەوا ئەبە بەکری (صَدّيق)ەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس داوای لێخۆشبوون بکات بەردەوام نیە لەسەر گوناهو تاوان ئەگەر لەرۆژێکدا حەفتا جار بگەرێتەوە سەر گوناهو تاوانەکەی).

١٥١٥ - (صحيح) عَنِ الأَغَرِّ الْمُزَنِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّهُ لَيُغَانُ عَلَى قَلْبِي، وَإِنِّي لأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ فِي كُلِّ يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ).

واتە: ئەغەری موزەنی دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم

فەرمووی: (تارمایی دێت بەسەر دڵمدا و بیرم دەچێ، وە من لەرۆژێكدا سەد جار داوای لێخۆشبوون لەخوای گەورە دەكەم).

**١٥١٦ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: إِنْ كُنَّا لَنَعُدُّ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَجْلِسِ الْوَاحِدِ مِائَةَ مَرَّةٍ: (رَبِّ اغْفِرْ لِي، وَتُبْ عَلَيَّ، إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ).**

واتە: پێشەوا عومەری كوڕی (خطاب) رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەیەك كۆڕی دانیشتندا دەمانژمارد سەد جار دەیفەرموو: (ئەی پەروەردگارم لێم خۆشبە، تەوبەو گەڕانەوەم لێ وەربگرە، بەڕاستی هەر تۆ تەوبە وەرگری و میهرەبانی و لێ بوردەیت).

**١٥١٧ - (صحيح) عن يَسَارِ بْنِ زَيْدٍ مَوْلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ (مَنْ قَالَ: أَسْتَغْفِرُ اللهَ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومَ، وَأَتُوبُ إِلَيْهِ، غُفِرَ لَهُ وَإِنْ كَانَ فَرَّ مِنَ الزَّحْفِ).**

واتە: یەساری كوڕی زەیدی خزمەتكاری پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەڵێت: باوكم بۆی گێڕامەوە، كە گوێی لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بووە فەرموویەتی: (ئەوەی بڵێ: داوای لێخۆشبوون دەكەم لەو خوایەی كە هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لەو زیندوی هەڵسوڕێنەری بونەوەرە، دەگەڕێمەوە بۆلای، ئەوا خوای گەورە لە تاوانەكانی رابردووی

خۆشدەبێت ئەگەرچی لەکاتی بەرەنگاربوونەوەی دوژمنانی ئیسلامدا پشتی هەڵکردبێ و رای کردبێت).

١٥١٨ - (ضعيف) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ لَزِمَ الاِسْتِغْفَارَ: جَعَلَ اللَّهُ لَهُ مِنْ كُلِّ ضِيقٍ مَخْرَجًا، وَمِنْ كُلِّ هَمّ فَرَجًا، وَرَزَقَهُ مِنْ حَيْثُ لاَ يَحْتَسِبُ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ خو بگرێ بە داوای لێخۆشبوون کردنەوە لە خوای گەورە: خودا لەهەموو تەنگانەیەکا دەروی خێری لێ دەکاتەوە، لەهەموو خەم و پەژارەیە رزگاری دەکات، بە شێوەیە رۆزی دەدات بە خەیاڵی خۆیدا نەیەت).

١٥١٩ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ قَالَ: سَأَلَ قَتَادَةُ أَنَسًا أَيُّ دَعْوَةٍ كَانَ يَدْعُو بِهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَكْثَرَ؟ قَالَ: كَانَ أَكْثَرُ دَعْوَةٍ يَدْعُو بِهَا: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ). وَزَادَ زِيَادٌ: وَكَانَ أَنَسٌ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَدْعُوَ بِدَعْوَةٍ دَعَا بِهَا، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَدْعُوَ بِدُعَاءٍ دَعَا بِهَا فِيهَا.

واتە: لە (عَبْد العَزِيز)ی کوڕی صوهەیبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: قەتادە لە ئەنەسی پرسی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زۆرترین کات بە کام پاڕانەوە دەپاڕایەوە؟ وتی: زۆرترین پاڕانەوەی ئەمە بوو: (خودایە! ئەی پەروەردگاری ئێمە لەدنیاو دوارۆژدا چاکەمان پێ ببەخشەو لەسزای دۆزەخ بمانپارێزە). راوی فەرمودەکە زیاد ئەمەی بۆ زیاد کرد: ئەنەس ئەگەر بیویستایە یەك جار بپارێتەوە یان کۆمەڵێ دوعا بکات لەهەردوو حاڵەتەکەدا ئەم دوعایەی هەر دەکرد: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ).

**١٥٢٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ سَأَلَ اللَّهَ الشَّهَادَةَ صَادِقًا بَلَّغَهُ اللَّهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ).**

واتە: لە ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیفەوە، لەباوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ بەڕاستی و بەنیەتی پاکەوە لەدڵەوە داوای شەهیدبوون بکات - لە پێناوی بەرزکردنەوەی وشەی (لا الە الا اللە)دا - خوای گەورە دەیگەیەنێ بە پلەی بەرزی شەهیدان ئەگەر لەسەر جێگەی خۆیشی بمرێت).

**١٥٢١ - (صحيح) عَنْ أَسْمَاءَ بْنِ الْحَكَمِ الْفَزَارِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيًّا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ: كُنْتُ رَجُلاً إِذَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَدِيثًا نَفَعَنِي اللَّهُ**

مِنْهُ بِمَا شَاءَ أَنْ يَنْفَعَنِي، وَإِذَا حَدَّثَنِي أَحَدٌ مِنْ أَصْحَابِهِ اسْتَحْلَفْتُهُ، فَإِذَا حَلَفَ لِي صَدَّقْتُهُ، قَالَ: وَحَدَّثَنِي أَبُو بَكْرٍ - وَصَدَقَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ - أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَا مِنْ عَبْدٍ يُذْنِبُ ذَنْبًا فَيُحْسِنُ الطُّهُورَ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللَّهَ إِلاَّ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ). ثُمَّ قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ ..﴾ إِلَى آخِرِ الآيَةِ.

واتە: لە ئەسمائی كچی حەكەمی فەزارییەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: گوێم لەپێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ بوو دەیوت: من كەسێ بووم كاتێ كە فەرموودەیەكم دەبیست لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوەندەی خوا بیەوێ سودی پێ دەگەیاندم بەكردەوە، ئەگەر یەكێ لە یارانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموودەیەكی بۆ بگێڕامایەتەوە سوێندم دەدا ئەگەر سوێندی بۆ بخواردمایە باوەڕم پێ دەكردو لێم وەردەگرت – ئەمە بۆ زیاتر دڵنیا بوون بووە ئەگینا یارانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەر هەموویان ڕاستگۆ بوون – ئەبو بەكر بۆی گێڕامەوە – ئەبو بەكر ڕەزای خوای لێ بێ ڕاستی وت، - پێشەوا عەلی ئەبو بەكری سوێند نەدا ئەمەش بۆ گەورەیی پلەو پایەی ئەبو بەكر دەگەڕێتەوە - ئەبو بەكر وتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (هەر بەندەیەك تاوانێ یان خراپەیە بكات

دەستنوێژێکی چاك بگرێ، لەپاشدا هەستێ دوو رکات نوێژ بکات، ئینجا (أستغفر الله) بکات و داوای لێ خۆشبوون لە خوای گەورە بکات، خوای گەورەش لێی خۆشدەبێ، لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە هەتا کۆتایی: ﴿ وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَىٰ مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾ آل عمـــــران: ١٣٥.

واتە: وە ئەوانەی کاتێك کە کردەوەیەکی ناشیرین دەکەن یان ستەم لە خۆیان دەکەن، کە یادی خوایان کردەوە ئینجا داوای لێ بووردن دەکەن بۆ گوناهەکانیان، ئایا کێ دەبووریٚ لە گوناهەکان بێجگە لە خوا؟ وە بەردەوام نابن لەسەر ئەوەی کە کردویانە لە کاتێکدا بزانن گوناهە.

١٥٢٢ - (صحيح) عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَذَ بِيَدِهِ وَقَالَ: (يَا مُعَاذُ، وَاللَّهِ إِنِّي لأُحِبُّكَ، وَاللَّهِ إِنِّي لأُحِبُّكَ)، فَقَالَ: (أُوصِيكَ يَا مُعَاذُ: لاَ تَدَعَنَّ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ تَقُولُ: اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ). وَأَوْصَى بِذَلِكَ مُعَاذٌ الصُّنَابِحِيَّ وَأَوْصَى بِهِ الصُّنَابِحِيُّ أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ.

واتە: (مُعاذ)ی کوڕی جەبەل دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستی گرتم فەرمووی: (ئەی (مُعاذ) سوێند بە خوا تۆم خۆشدەوێت، سوێند بە خوا تۆم خۆشدەوێت)، - ئەمەش فەزڵێکی گەورە بوو بۆ (مُعاذ) - وە فەرمووی: (ئەی (مُعاذ) ئامۆژگاریت دەکەم: — ئەگەر دەتەوێت ئەم

خۆشەویستیە بەردەوام بێت - لەدوای نوێژە فەرزەكانەوە هەرگیز واز لەم پاڕانەوەیە نەهێنی: (اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ). واتە: خودایە كۆمەكیم بكەو یارمەتیم بدە لەسەر یادكردنت و سوپاس و ستایش كردنت و چاك پەرستنت. (مُعاذ) ئامۆژگاری راوی فەرموودەكە(صُنابحِیَ) كرد بەوەی كە ئەو دوعایە بخوێنیّ لەدوای نوێژە فەرزەكان و تەركی نەكات، (صُنابحِیَ)ش بەهەمان شێوە ئامۆژگاری (أبا عَبد الرَّحمَن)ی كرد.

**١٥٢٣ - (صحيح) عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أَقْرَأَ بِالْمُعَوِّذَاتِ دُبُرَ كُلِّ صَلاَةٍ.**

واتە: لە عوقبەی كوڕی عامیرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پیّ كردم بە خوێندنی هەردوو سورەتی: (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ). لەدوای هەموو نوێژێكەوە.

**١٥٢٤ - (ضعيف) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُعْجِبُهُ أَنْ يَدْعُوَ ثَلاَثًا، وَيَسْتَغْفِرَ ثَلاَثًا.**

واتە: (عَبدُ اللە) - ی كوڕی مەسعود - دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی چاك بوو یان حەزی لەوە بوو كە دوعایەكی دەكرد سیّ جار دووبارەی بكاتەوە، وە كە داوای لێخۆشبوونی دەكرد سیّ جار دووبارەی بكاتەوە.

١٥٢٥ - (صحيح) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَلاَ أُعَلِّمُكِ كَلِمَاتٍ تَقُولِينَهُنَّ عِنْدَ الْكَرْبِ - أَوْ فِي الْكَرْبِ -: اللَّهُ، اللَّهُ رَبِّي لاَ أُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا).

واتە: لە ئەسمائی کچی عومەیسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرمووم: (چەند وشەیەکت فێر بکەم لەکاتی بەڵاو ناخۆشیدا بیانڵێی: یا (الله) ، یا (الله) لەم بەڵاو ناخۆشیە رزگارم بکە، تۆ پەروەردگاری منی و هیچ شتێ ناکەمە هاوبەشت.

١٥٢٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ، أَنَّ أَبَا مُوسَى الأَشْعَرِيَّ قَالَ: كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ فَلَمَّا دَنَوْا مِنَ الْمَدِينَةِ كَبَّرَ النَّاسُ وَرَفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ، فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّكُمْ لاَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلاَ غَائِبًا، إِنَّ الَّذِي تَدْعُونَهُ بَيْنَكُمْ، وَبَيْنَ أَعْنَاقِ رِكَابِكُمْ)، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا أَبَا مُوسَى أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى كَنْزٍ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ؟). فَقُلْتُ: وَمَا هُوَ؟ قَالَ: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ). (ق دون قوله: (إِنَّ الَّذِي تَدْعُونَهُ بَيْنَكُمْ، وَبَيْنَ أَعْنَاقِ رِكَابِكُمْ). وهو: منكر).

واتە: لـە ئـەبو (عُثمَان)ی نەهدییـەوە هـاتووە، كـە ئـەبو موسـای ئەشـعەری وتویەتی: لەسەفەرێكدا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بـووم كاتێ كە نزیك بووەوە لـە مەدینـە خەڵكەكـە بـەدەنگی بـەرز (الله أكبر)یـان كـرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسـلم فـەرمووی: (ئـەی خەڵكینـە! ئێـوە بـانگی كەسێ ناكەن كە نەبیستێ یان غائیـب بێـت، بـانگی خوایـە دەكـەن كـە دەنگتـان دەبیسـتێ و دەتـانبینێ). لەپاشـدا فـەرمووی: (ئـەی ئـەبو موسـا! هۆشـیاربە بـا وشەیەكت نیشان بدەم كـە یەكێكـە لـە گەنجینـەكانی بەهەشـت، وتم: ئـەو وشـە كامەیە؟ فەرمووی: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ باللّـهِ)یـە. واتـە: هـیچ گـۆڕان و هێزێـك نیە مەگەر بەخوای گەورەوە.

١٥٢٧ - (صحيح) عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ، أَنَّهُمْ كَانُوا مَعَ النَّبِـيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُمْ يَتَصَعَّدُونَ فِي ثَنِيَّةٍ، فَجَعَلَ رَجُلٌ كُلَّمَا عَلاَ الثَّنِيَّةَ نَـادَى: لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ، وَاللَّـهُ أَكْبَرُ. فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّكُـمْ لاَ تُنَادُونَ أَصَمَّ وَلاَ غَائِبًا)، ثُمَّ قَالَ: (يَا عَبْـدَ اللَّـهِ بْـنَ قَيْسٍ). فَذَكَرَ مَعْنَاهُ.

واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە هاتووە، كە لەخزمەت پێغەمبەری خـوادا صلی الله علیه وسلم بە ڕێگایـەكی پێچاوپێچـی بـەرزدا سـەردەكەوتن، هـەركاتێ پێچێكیان دەبڕی پیاوێ بەدەنگی بەرز هاواری دەكـردو دەیـوت: (لاَ إِلـهَ إِلاَّ اللّـهُ، وَاللّهُ أَكْبَرُ). پێغەمبـەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئێوە بانگی كەسێ ناكەن كـە نەبیسـتێ یـان غائیـب بێـت). لەپاشـدا فـەرمووی: (ئـەی ئـەبو (عَبْـدُ

الله)ی کوڕی قەیس واتە ئەی ئەبو موسای ئەشعەری). جا راوی بە هەمان مانا فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە.

١٥٢٨ - (صحيح) عَنْ أَبِي عثمان، عَنْ أَبِي مُوسَى، بِهَذَا الْحَدِيثِ، وَقَالَ فِيهِ: فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ).

واتە: لە ئەبی (عُثمان)ەوە، لە ئەبو موساوە، فەرمودەی پێشو هاتووە، راوی لە فەرمودەکەیدا وتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەی خەڵکینە! بەزەییتان بێتەوە بە خۆتاندا دەنگتان نزم بکەنەوە).

١٥٢٩ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ قَالَ: رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: هەرکەس بڵێ: (رَضِيتُ باللهِ رَبًا، وَبالإسْلامِ دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً). واتە: رازیم بە (الله) پەروەردگارم بێ و، ئیسلام دین و بەرنامەم بێ و، موحەممەد صلى الله عليه و سلم پێغەمبەرم بێ، ئەو کەسە بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت.

١٥٣٠ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنْ صَلَّى عَلَيَّ وَاحِدَةً، صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ عَشْرًا).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس سەڵاوتێکم لەسەر بدات، خوای گەورە دە جار رەحمەت و بەرەکەتی خۆی دەرژێنێ بەسەریا).

١٥٣١ - (صحيح) عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلاَةِ فِيهِ، فَإِنَّ صَلاَتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ). قَالَ: فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ: وَكَيْفَ تُعْرَضُ صَلاَتُنَا عَلَيْكَ وَقَدْ أَرِمْتَ؟ قَالَ: يَقُولُونَ: بَلِيتَ. قَالَ (إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى حَرَّمَ عَلَى الأَرْضِ أَجْسَادَ الأَنْبِيَاءِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِمْ)

واتە: لە ئەوسی کوڕی ئەوسەوە، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی؛ (رۆژی هەینی یەکێکە لە رۆژە هەرە چاکەکانتان، لەو رۆژەدا ئادەم دروست بوو، هەر لەو رۆژەدا وەفاتی کرد، لەو رۆژەدا فوو دەکرێ بە کەرِنادا، هەر لەو رۆژەشدا نەعرەتە گەورەکە دەبێ و مەرگی سەرتاسەری پەیدا دەبێ، جا ئێوەش لەو رۆژەدا سەڵاواتی زۆرم لەسەر بدەن، چونکە سەڵاواتەکانتانم پێ دەگات و راەدنوێرێ بۆم، وتیان: ئەی

پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم چۆن سەلاٌواتەكانمانت پێ دەگات لە كاتێكدا كە تۆ جەستەت رزی لە گۆڕدا؟ فەرمووی: (خوای گەورە جەستەی پێغەمبەرانی حەرام كردوە لە زەوی، جەستەیان لە خاكا نارزێت).

## باسی نەهی كردن لەوەی كە ئینسان دوعای خراپ بكات لە خانەوادەو ماڵ و سامانی.

## ٣٦٣ - باب النَّهْيِ عَنْ أَنْ يَدْعُوَ الإِنْسَانُ عَلَى أَهْلِهِ وَمَالِهِ.

١٥٣٢ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، وَلاَ تَدْعُوا عَلَى أَوْلاَدِكُمْ، وَلاَ تَدْعُوا عَلَى خَدَمِكُمْ، وَلاَ تَدْعُوا عَلَى أَمْوَالِكُمْ، ولاَ تُوَافِقُوا مِنَ اللَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى سَاعَةَ نَيْلٍ فِيهَا عَطَاءٌ فَيَسْتَجِيبَ لَكُمْ).

واتە: لە جابری كوڕی (عَبْدُ الله)ەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (دوعای خراپ لەخۆتان مەكەن، دوعای خراپ لەخۆتان مەكەن، دوعای خراپ لەمنداڵەكانتان مەكەن، دوعای خراپ لەخزمەتكارەكەتان مەكەن، دوعای خراپ لەماڵ و سامانتان مەكەن، نەوەكا رێكەوتی ئەو كاتە بكات كە خوای گەورە دوعای تێدا گیرا دەكات ئەوكاتە پاڕانەوەكەتان گیرا ببێ).

## باسی سەڵاواتدان لەسەر غەیری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم.

## ٣٦٤ – باب الصَّلاَةِ عَلَى غَيْرِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

**١٥٣٣ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: صَلِّ عَلَيَّ وَعَلَى زَوْجِي، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْكِ وَعَلَى زَوْجِكِ).**

واتە: لە جابری کوڕی (عَبدُ اللّه)ەوە دەگێڕنەوە، کە ئافرەتێ وتی بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: بپاڕێرەوە بۆ خۆم و بۆ مێردەکەم، داوای رەحمەت و بەرەکەتمان بۆ بکە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (خوای گەورە رەحمەت و بەرەکەتی خۆی بڕژێنێ بەسەر خۆت و مێردەکەتدا).

– زانایان رایان جیاوازە لەسەر سەڵاواتدان لەسەر غەیری پێغەمبەران سەلات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، پێشەوایان مالیك و شافیعی و ئەبو حەنیفەو زۆرینە دەڵێن: دروست نیە سەربەخۆ سەڵاواتدان لەسەر غەیری پێغەمبەران، ناوترێ سەڵاوات لەسەر ئەبو بەکر یان لەسەر عومەر... یان غەیری ئەوان، بەڵام دروستە لەدوای پێغەمبەرەوە وەك ئەوەی بڵێ سلاوات

لەسەر موحەممەد و خێزانەکانی و نەوەکانی و یارانی...[١] - .

- موحەممەدی کوڕی (عبد الوهاب) لە کتێبی: (أدب المشي إلى الصلاة)دا دەڵێت: سەڵاواتدان لەسەر غەیری پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دروستە ئەگەر بەزۆری نەدرێت و نەبێتە دروشم و شیعاری هەندێ کەس، یان مەبەستی هەندێ لە یارانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بێ جگە لە هەندێکی تریان - [٢].

## باسی دوعای خێر لەپاشملە.

## ٣٦٥ – باب الدُّعَاءِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ.

١٥٣٤ - (صحيح) عَنْ أَبُو الدَّرْدَاءِ أَنَّهُ، سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِذَا دَعَا الرَّجُلُ لأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ، قَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ: آمِينَ، وَلَكَ بِمِثْلٍ)

واتە: لە ئەبو دەردائەوە هاتووە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بووە فەرموویەتی: (ئەگەر موسوڵمانێك دوعای خێری کرد بۆ برا موسوڵمانەکەی لەپاشملە، مەلائیکەیە دەڵێت: (آمین). وێنەی پاڕانەوەکەی خۆت بۆ تۆش بێت).

---

[١] - شرح سنن أبي داود: لبدر الدين العينى (المتوفى: ٨٥٥هـ) المحقق : أبو المنذر خالد بن إبراهيم المصري، الناشر: مكتبة الرشد – الرياض، الطبعة الأولى ، ١٤٢٠ هـ - ١٩٩٩م.

[٢] - شرح سنن أبي داود: عبدالمحسن العباد البدر.

١٥٣٥ - (ضعيف) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (إِنَّ أَسْرَعَ الدُّعَاءِ إِجَابَةً دَعْوَةُ غَائِبٍ لِغَائِبٍ».

واتـە: لـە (عَبْدُ اللـه)ی کـوڕی عـومری کـوڕی عاصـەوە دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم فەرموويـەتی: (خێراتـرین پاڕانـەوە لەگیرابووندا پاڕانەوەی نادیارە بۆ نادیار).

١٥٣٦ - (حسن) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَالَ: (ثَلاَثُ دَعَوَاتٍ مُسْتَجَابَاتٌ لاَ شَكَّ فِيهِنَّ: دَعْـوَةُ الْوَالِدِ، وَدَعْوَةُ الْمُسَافِرِ، وَدَعْوَةُ الْمَظْلُومِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتی: (سێ پاڕانەوە بە بێ گومان گیرادەبن: پاڕانەوەی باوك و دایك بـۆ منداڵی خۆیان، پاڕانەوەی موسافیر، پاڕانەوەی ستەم لێکراو).

## باسی ئەگەر کەسێ ترسی لەقەومێ هەبوو چ دوعایە بخوێنێت.

## ٣٦٥ - باب مَا يَقُولُ إِذَا خَافَ قَوْمًا.

١٥٣٧ - (صحيح) عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا خَافَ قَوْمًا قَالَ: (اللَّهُمَّ إِنَّا نَجْعَلُكَ فِي نُحُورِهِمْ، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شُرُورِهِمْ).

واتە: ئەبو بوردەی کوڕی (عَبْدُ الله)وە هاتووە، کە باوکی بۆی گێڕاوەتەوە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەگەر ترسی لەقەومێ ببوایە دەیفەرموو: (خودایە خۆت بچۆ بە گژیاندا بەشێوەیە کە شایستەی بن، وە پەنادەگرم بە تۆ لە شەڕ و خراپەکانیان).

## باسی نوێژی ئیستیخارە.

## ٣٦٦ - باب فِي الاِسْتِخَارَةِ.

١٥٣٨ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَلِّمُنَا الاِسْتِخَارَةَ كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، يَقُولُ لَنَا: (إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالأَمْرِ فَلْيَرْكَعْ

رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الْفَرِيضَةِ، وَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّى أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ، وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ، وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلاَ أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ وَلاَ أَعْلَمُ، وَأَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ - يُسَمِّيهِ بِعَيْنِهِ الَّذِى يُرِيدُ - خَيْرٌ لِى فِى دِينِى وَمَعَاشِى وَمَعَادِى وَعَاقِبَةِ أَمْرِى فَاقْدُرْهُ لِى وَيَسِّرْهُ لِى، وَبَارِكْ لِى فِيهِ، اللَّهُمَّ وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُهُ شَرًّا لِى - مِثْلَ الأَوَّلِ - فَاصْرِفْنِى عَنْهُ، وَاصْرِفْهُ عَنِّى، وَاقْدُرْ لِىَ الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ، ثُمَّ رَضِّنِى بِهِ). أَوْ قَالَ: (فِى عَاجِلِ أَمْرِى وَآجِلِهِ).

واته: لە جابری کوڕی (عبدُ الله)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فێری نوێژی ئیستیخارەی دەکردین وەك چۆن فێری سورەتێکی قورئانی دەکردین، پێی فەرمووین: (ئەگەر کەسێك لە ئێوە ویستی کارێك بکات با دوو رکات نوێژی سوننەت بکات، لەپاشدا بڵێ: خوایە من بەزانستی خۆت داوای خێر و چاکەت لێ دەکەم، داوای هێز و توانات لێ دەکەم بە هێز و توانای خۆت، وە لە فەزڵی گەورەت داوات لێ دەکەم، بەڕاستی تۆ دەتوانی و من ناتوانم، تۆ دەزانی و من نازانم، تۆ زانای هەموو شاراوەو نادیارەکانی، خوایە ئەگەر ئەم کارە - لێرەدا ناوی کارەکەی بهێنێ — ئەگەر چاکەو خێری تێدایە بۆ دین و ژیان و بژێوی و کۆتای تەمەنم ئەوا خوایە بەنسیبم بکەیت و ئاسانی بکەیت لەسەرم و ببێتە بەرەکەت بۆم، وە ئەگەر ئەم کارە خراپە بۆ دین و ژیان و بژێوی و کۆتای تەمەنم ئەوا خوایە لێم

دووربخەرەوە و وام لێ بکە وازی لێ بهێنم، خێر و چاکەم بەنسیب بکە لەهەر شوێنێکە لەپاشدا رازیم بکە لەسەری). یان فەرمووی: (بۆ ئێستاو کۆتایم).

## باسی سەبارەت بە پەناگرتن بە خوا.

## ٣٦٧ - باب فِي الاِسْتِعَاذَةِ.

١٥٣٩ - (ضعيف) عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَعَوَّذُ مِنْ خَمْسٍ: مِنَ الْجُبْنِ، وَالْبُخْلِ، وَسُوءِ الْعُمْرِ، وَفِتْنَةِ الصَّدْرِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ.

واتە: پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پەنای دەگرت بە خوای گەورە لە پێنج شت: لە ترسنۆکی، لەبەخیلی و ڕەزیلی و ڕژدی و چروکی، لە تەمەنی خراپ و کەسیفی - مەبەست لەپیری خەڵەفاوە کە شتی لەبیر دەچێتەوەو وەك منداڵی لێ دێتەوە - ، لە بەڵاو فیتنەی سینە - مەبەست لە دڵ ڕەش و وەسوەسەی دڵە - ، وە لەسزای گۆڕ.

١٥٤٠ - (صحيح) عن أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ، وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ، وَالْبُخْلِ، وَالْهَرَمِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوایە! پەنا دەگرم بە تۆ لە کۆڵەواری و بێکارەیی، لەتەمەڵی و تەوەزەلی،، لەترسنۆکی، لە چروکی و رەزیلی، لەتەمەنی پەککەوتەیی و گرفتاری، وە پەنا دەگرم بە تۆ لەسزای گۆڕ، وە پەنا دەگرم بە تۆ لەبەلاو فیتنەی ژیان و مردن).

**١٥٤١ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كُنْتُ أَخْدُمُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكُنْتُ أَسْمَعُهُ كَثِيرًا يَقُولُ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ، وَضَلْعِ الدَّيْنِ، وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ).**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: من لە خزمەتی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم بووم زۆر جار گوێم لێی دەبوو دەیفەرموو: (خوایە! پەنا دەگرم بە تۆ لە خەم و خەفەت، لە کەڵەکەبوونی قەرز، لە بوون بەژێر پێی دوژمنانەوە).

**١٥٤٢ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُعَلِّمُهُمْ هَذَا الدُّعَاءَ كَمَا يُعَلِّمُهُمُ السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، يَقُولُ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ).**

واتە: لە (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی عەباسەوە ڕەزای خوایان لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم پاڕانەوەی فێر دەکردن وەك چۆن فێری سورەتێکی قورئانی دەکردن، دەیفەرموو: (خوایە! پەنا دەگرم بە تۆ لەسزای دۆزەخ، وە پەنا دەگرم بە تۆ لەسزای گۆڕ، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە بەلاّو فیتنەی دەججال، پەنا دەگرم بە تۆ لە بەلاّو فیتنەی ژیان و مردن).

**١٥٤٣ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَدْعُو بِهَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ النَّارِ، وَعَذَابِ النَّارِ، وَمِنْ شَرِّ الْغِنَى وَالْفَقْرِ)**

[(خ ٨٣٢) (م ٥٨٩)].

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەندیّ جار بەم وشانە دەپاڕایەوە: (خوایە! پەنا دەگرم بە تۆ لە بەلاّو فیتنەی ئاگری دۆزەخ، لەسزای ئاگر، وە لەخراپەی دەوڵەمەندی و هەژاری).

**١٥٤٤ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْفَقْرِ، وَالْقِلَّةِ، وَالذِّلَّةِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوایە! پەنا دەگرم بە تۆ لە هەژاری و نەداری و کەمی سامان و

دارایی و بێ خێری لەکەساسی و بێ ڕێزی، وە پەنا دەگرم بە تۆ کە زوڵم و ستەم لەکەس بکەم و کەس زوڵم و ستەمم لێ بکات — واتە پەنا دەگرم بە تۆ لەوەی کە زاڵم بم یان مەزڵوم - ).

١٥٤٥ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ مِنْ دُعَاءِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ زَوَالِ نِعْمَتِكَ، وَتَحْوِيلِ عَافِيَتِكَ، وَفُجَاءَةِ نِقْمَتِكَ، وَجَمِيعِ سَخَطِكَ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: یەکێ لە پاڕانەوەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەمەبوو دەیفەرموو: (خوایە! پەنا دەگرم بە تۆ لە نەمانی نازو نیعمەتەکانت —وەك نیعمەتی ئیسلام و ئیمان-، لە نەمانی ئاسوودەیی - گۆڕینی تەندروستی بە نەخۆشی یان دەوڵەمەندی بە هەژاری و نەداری-، وە پەنا دەگرم بەتۆ لەوەی لەپڕ توشی تۆڵەی سەختی تۆ ببم، وە لەهەرچی شتێ کە دەبێت بەهۆی توڕیی تۆ).

١٥٤٦ - (ضعيف) عَنْ أَبُو صَالِحٍ السَّمَّانُ قَالَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَدْعُو يَقُولُ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الشِّقَاقِ، وَالنِّفَاقِ، وَسُوءِ الأَخْلاَقِ).

واتە: لە ئەبو صاڵحی سەممانەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئەبو هورەیرە وتی:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەندێ جار دەپاڕایەوە دەیفەرموو: (خوایە! پەنا دەگرم بە تۆ لە موخالەفەی حەق – (شقاق) بریتیە لەدەمەدەمێی ناحەق بەرامبەر بە کەسی خاوەن حەق - ، وە لە دووڕوویی واتە دەرخستنی ئیمان و شاردنەوەی کوفر، وە لە بەدڕەوشتی و هەموو کردەوەیەکی خراپ).

١٥٤٧ - (حسن) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُوعِ فَإِنَّهُ بِئْسَ الضَّجِيعُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخِيَانَةِ فَإِنَّهَا بِئْسَتِ الْبِطَانَةُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوایە! پەنا دەگرم بە تۆ لە برسێتی چونکە هاونوێنێکی خراپە- ئینسان کە برسی بوو تواناى کارکردنی نامێنێ و ناتوانێت ئەرکەکانی خۆی راپەڕێنێت ناچار لەجێگەدا بۆی دەکەوێت - وە پەنا دەگرم بە تۆ لەخیانەت و ناپاکی چونکە خراپترین سیفەتە کە ئینسان پێی بناسرێت – وشەی (بطانة) پێچەوانەی خاوێنیە).

١٥٤٨ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنَ الأَرْبَعِ: مِنْ عِلْمٍ لاَ يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لاَ يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لاَ تَشْبَعُ، وَمِنْ دُعَاءٍ لاَ يُسْمَعُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله

عليه وسلم فەرموویەتی: (خوایە پەنا دەگرم بە تۆ لە چوارشت: لەزانست و زانیاری بێ سوود، لەدڵێ ملكەچ نەبێت و بێ ئاگا بێت، لە نەفسێ كە تێر نەخوات، لە پاڕانەوەیە كە گیرا نەبێت).

١٥٤٩ - (ضعيف) عَنْ أَبِي الْمُعْتَمِرِ، قَالَ: أُرَى أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ حَدَّثَنَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم كَانَ يَقُولُ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ صَلاَةٍ لاَ تَنْفَعُ). وَذَكَرَ دُعَاءً آخَرَ.

واتە: لە ئەبو موعتەمیرەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێم وایە ئەنەسی كوڕی مالیك بۆی گێڕاینەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوایە پەنا دەگرم بە تۆ لەپاڕانەوەی بێ سوود). لەگەڵ ئەوەشدا باسی پاڕانەوەیەكی تری كرد.

١٥٥٠ - (صحيح) عَنْ فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ الأَشْجَعِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ عَمَّا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدْعُو بِهِ؟ قَالَتْ: كَانَ يَقُولُ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ، وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ).

واتە: فەروەی كوڕی نەوفەلی ئەشجەعی دەڵێت: سەبارەت بە پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە عائیشەی دایكی باوەڕدارانم ڕەزای خوای لێ بێ پرسی؟ ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو:(خوایە! پەنا دەگرم بە تۆ لەخراپەی ئەو كارو كردەوانەی كە لەڕابردوودا كردومن، وە لەخراپەی ئەو كارو كردەوانەی كە لەداهاتوودا

نەیانکەم).

١٥٥١ - (صحيح) عن شَكَلِ بن حُمَيدٍ قَـالَ: قلـتُ: يَـا رسـولَ الله، علِّمْنِي دعاءً أَدْعُو بِهِ، قَالَ: (قُلْ : اللَّهُمَّ إِنِّـي أعُـوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ سَـمْعِي ، وَمِـنْ شَـرِّ بَصَـرِي ، وَمِـنْ شَـرِّ لِسَانِي ، وَمِنْ شَرِّ قَلْبِي ، وَمِنْ شَرِّ مَنِيِّي).

واتە: شەکەلی کوڕی حومەید دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دوعایەکم فێربکە پێی بپاڕێمەوە، فەرمووی:(بڵێ: خوایە پەنا دەگرم بە تۆ لەخراپەی گوێم، لەخراپەی چاوم، لەخراپەی زمانم، لەخراپەی دڵم، لەخراپەی تۆماو(مەنی)م ).

١٥٥٢ - (صحيح) عَنْ أَبِي الْيَسَـر، قَـالَ: أَنَّ رَسُـولَ الله صـلى الله عليه وسلم كَانَ يَدْعُو: (اللَّهُـمَّ إِنِّـي أَعُـوذُ بِـكَ مِـنَ التَّرَدِّي ، وَالْهَدْمِ ، وَالْغَرَقِ ، وَالْحَرِيقِ ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ يَتَخَبَّطَنِي الشَّـيْطَانُ عِنْـدَ الْمَـوْتِ ، وَأَعُـوذُ بِـكَ أَنْ أَمُوتَ فِي سَـبِيلِكَ مُـدْبِرًا ، وَأَعُـوذُ بِـكَ أَنْ أَمُـوتَ لَدِيغًا).

واتە: لە ئەبو یەسەرەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دەپاڕایەوە دەیفەرموو: (خودایە پەنا دەگرم بە تۆ لە بەربوونەوە لە کێو یان لە سەربان یان هەر شوێنێکی بەرز، وە لەڕوخانی بینایەک یان دیوارێک

بەسەرمدا، وە لە نقوم بوون و خنكاندن لە ئاوی دەریا یان لەبیر و كاریز، وە لە سوتان بە ئاگر، وە پەنا دەگرم بە تۆ كە شەیتان ریگەم لیّ هەڵە بكات و سەرم لیّ تیك بدات پیش مردنم، وە پەنا دەگرم بە تۆ لەوەی لەكاتی غەزادا پشت هەڵكەم و لەو كاتەدا بمرم، وە پەنا دەگرم بە تۆ كە بە پیوەدانی مار و دوپشك و هەرشیكی لەو جۆرە بمرم).

**١٥٥٣- (صحيح) عَنْ أَبِي الْيَسَرِ، زَادَ فِيهِ: (وَالْغَمِّ).**

واتە: لە ئەبو یەسەرەوە هاتووە، راوی ئەمەی بۆ زیاد كرد: (وە پەنا دەگرم بە تۆ لە خەم و پەژارە).

**١٥٥٤ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبَرَصِ، وَالْجُنُونِ، وَالْجُذَامِ، وَمِنْ سَيِّئِ الأَسْقَامِ).**

واتە: لە ئەنەس - ی كوری مالیك — ەوە دەگیرنەوە، كە پیغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (خوایە! پەنا دەگرم بە تۆ لەبەڵەكیی، لەشیتیی، لەگولیی، وە لەخراپەی هەموو دەردیكی پیس — واتە هەر نەخۆشیە كە ببیتە هۆی شیواندنی جەستەو زیان پیّ گەیاندنی - ).

**١٥٥٥ - (ضعيف) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ يَوْمٍ الْمَسْجِدَ، فَإِذَا هُوَ بِرَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ أَبُو أُمَامَةَ فَقَالَ: (يَا أَبَا أُمَامَةَ، مَا لِي أَرَاكَ جَالِسًا فِي الْمَسْجِدِ فِي غَيْرِ**

وَقْتِ الصَّلاَةِ؟). قَالَ هُمُومٌ لَزِمَتْنِي وَدُيُونٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ! قَالَ: (أَفَلاَ أُعَلِّمُكَ كَلاَمًا إِذَا أَنْتَ قُلْتَهُ أَذْهَبَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ هَمَّكَ، وَقَضَى عَنْكَ دَيْنَكَ). قَالَ: قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ! قَالَ: (قُلْ: إِذَا أَصْبَحْتَ وَإِذَا أَمْسَيْتَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ وَالْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ غَلَبَةِ الدَّيْنِ وَقَهْرِ الرِّجَالِ). قَالَ: فَفَعَلْتُ ذَلِكَ فَأَذْهَبَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ هَمِّي، وَقَضَى عَنِّي دَيْنِي.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە، کە وتویەتی: رۆژێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چووە بۆ مزگەوت، پیاوێکی بینی لەیاریدەداران کە ناوی ئەبو ئومامە بوو: فەرمووی: (ئەی ئەبو ئومامە ئەوە بۆچی لەمزگەوت دەتبینم لەکاتێکدا کە وەختی نوێژ نیە؟). وتی: خەم و پەژارەو بوون بەژێر قەرزەوە ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (وشەیەکت فێربکەم ئەگەر بیلێیت خەم و پەژارەت نەمێنێ و قەرزەکانت بدەیتەوە؟). وتی: وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! فەرمووی: (کە بەیانی و ئێوارەت لێهات بڵێ: خوایە! پەنا دەگرم بە تۆ لە خەم و پەژارە، لە کۆڵەواری و پەککەوتەیی و تەمەڵی، لە ترسنۆکی و چروکی و رەزیلی، لە کەڵەکەبوونی قەرز و بوون بەژێر پێی دوژمنانەوە). ئەبو ئومامە وتی: ئەم دوعانەم کرد خوای گەورە خەم و پەژارەی نەهێشتم و قەرزەکانی بۆ قەرەبووە کردمەوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

# پەرتوکی ئەحکامەکانی زەکات دەرکردن.

# ٣ – كتاب الزكاة.

١٥٥٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاسْتُخْلِفَ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَهُ، وَكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ الْعَرَبِ، قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ لأَبِي بَكْرٍ: كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، فَمَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ وَنَفْسَهُ إِلاَّ بِحَقِّهِ وَحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ)؟! فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَاللَّهِ لأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلاَةِ وَالزَّكَاةِ، فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ، وَاللَّهِ لَوْ مَنَعُونِي عِقَالاً كَانُوا يُؤَدُّونَهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهِ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلاَّ أَنْ رَأَيْتُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ شَرَحَ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ لِلْقِتَالِ،

**قَالَ: فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَـقُّ. (ق، لكـن قولـه: (عِقَـالاً)، شاذ، والمحفوظ: (عناقاً)[١].**

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دنیای بەجێ هێشت و لەدوای ئەو پێشەوا ئەبوبەکر خوای لێ رازی بێ بوو بە جێنشینی، کۆمەڵێ عەرەبی دەشتەکی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، پێشەوا ئەبوبەکر خوای لێ رازی بێ بڕیاریدا لەگەڵیان بجەنگێت، پێشەوا عومەری کوڕی (خَطَّابِ) خوای لێ رازی بێ فەرمووی: چۆن دەجەنگی لەگەڵ ئەو خەڵکەدا؟ لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (من فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکدا بجەنگم هەتا دەڵێن: (لا إله إلا الله)، جا هەرکەسێك بیڵێت ئەوە ماڵ و نەفسی پارێزراوە، مەگەر بەحەقی خۆی، لێپرسینەوەیان لەلای خوای گەورەیە؟!. جا ئەبوبەکر فەرمووی: سوێند بە خوای گەورە دەجەنگم دژ بەوانەی نوێژو زەکات لەیەك جیادەکەنەوە، لە راستیدا زەکات حەق و مافی ماڵ و سامانە، سوێند بێت بە خوای گەورە ئەگەر ئەو حەبلەی کە وشتری پێ دەبەستنەوە پێم نەدەن کە لەوەو پێش دەیاندا بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەوە لەدژیان دەجەنگم لەسەر نەدانی، جا عومەر فەرمووی: سوێند بە خوای گەورە هەرکە خوای گەورە دڵی ئەبوبەکری بۆ جەنگین رێنموونی کرد ئیتر منیش زانیم کە ئەبوبەکر راستەو لەسەر حەقە.

---

[١] - قَالَ أَبُو دَاوُد: قَالَ أَبُو عُبَيْدَةَ مَعْمَرُ بْنُ الْمُثَنَّى: الْعِقَالُ صَدَقَةُ سَنَةٍ وَالْعِقَالانِ صَدَقَةُ سَنَتَيْنِ.
واتە: ئەبو داود دەڵێت: ئەبو عوبەیدە مەعمەری کوڕی (مُثَنّى) وتی: (عقال) سەدەقەی ساڵێکە، (عقالان) سەدەقەی دوو ساڵە.

(صحيح) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَاهُ رَبَاحُ بْنُ زَيْدٍ وَعَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ بِإِسْنَادِهِ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: عِقَالاً. وَرَوَاهُ ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ يُونُسَ قَالَ: عَنَاقًا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَقَالَ شُعَيْبُ بْنُ أَبِي حَمْزَةَ وَمَعْمَرٌ وَالزُّبَيْدِيُّ: عَنِ الزُّهْرِيِّ فِي هَذَا الْحَدِيثِ: لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقًا. وَرَوَى عَنْبَسَةُ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، فِي هَذَا الْحَدِيثِ قَالَ: عَنَاقًا.

ئەبو داود رەحمەتی خوای لێ بێ لە چەند رێگەیەکەوە ئەم فەرمودەی هێناوە لەرێگەیەکەوە بە وشەی: (عَناق) ، لەرێگەیەکی ترەوە بە وشەی: (عقال). کە هەردووکیان هەر راستن.

١٥٥٧ - (صحيح ولكن شاذ بهذا اللفظ كما تقدم) عَنِ الزُّهْرِيِّ (هَذَا الْحَدِيثِ) قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّ حَقَّهُ أَدَاءُ الزَّكَاةِ، وَقَالَ: عِقَالاً.

واتە: لە زوهریەوە فەرمودەی پێشو هاتووە کەوتویەتی: ئەبو بەکر وتی: حەقەکەی ئەوەیە زەکاتەکەی دەربکرێت، هەروەها وتی: (عِقالاً).

# باسى ئەوەى واجبە زەكاتى لىٚ دەربكرێت.

## ١ - باب مَا تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ.

١٥٥٨ - (صحيح) أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ).

واتە: لە ئەبو سەعيدى خودريەوە هاتووە، كە وتويەتى: پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتى: (لە پێنج وشتر كەمتر زەكات نيە، لەپێنج ئۆقيە زيويش كەمتر زەكات نيە، وە لەدانەوێڵەو خورمادا پێنج ويسق كەمتر زەكات نيە).

- ويسق بەكيلۆى ئەمڕۆ دەكاتە: ( ٦٥٢ ) كيلۆو لەدەيا هەشت، ئۆقيەيە دەكاتە: چل درهەمى زيو - .

١٥٥٩ - (ضعيف) عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ، يَرْفَعُهُ إِلَى النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ زَكَاةٌ). وَالْوَسْقُ: سِتُّونَ مَخْتُومًا.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە، فەرموودەکەی بەرزکردەوە بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە فەرموویەتی: (لە پێنج ویسق کەمتر زەکات نیە). ویسقیش: شەست (صاع)ە[1].

**١٥٦٠ - (صحيح مقطوع) عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: الْوَسْقُ: سِتُّونَ صَاعًا مَخْتُومًا بِالْحَجَّاجِيِّ.**

واتە: ئیبراهیمی - نەخەعی - دەڵێت: ویسق: بریتیە لە شەست (صاع)ی حەجاجی مۆر لێدراو[2].

**١٥٦١ - (ضعيف). عَنْ حَبِيبٍ الْمَالِكِيِّ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِعِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ: يَا أَبَا نُجَيْدٍ! إِنَّكُمْ لَتُحَدِّثُونَنَا بِأَحَادِيثَ مَا نَجِدُ لَهَا أَصْلاً فِي الْقُرْآنِ؟ فَغَضِبَ عِمْرَانُ وَقَالَ لِلرَّجُلِ : أَوَجَدْتُمْ فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ دِرْهَمًا دِرْهَمٌ ، وَمِنْ كُلِّ كَذَا وَكَذَا شَاةً شَاةٌ ، وَمِنْ كُلِّ كَذَا وَكَذَا بَعِيرًا كَذَا وَكَذَا، أَوَجَدْتُمْ هَذَا فِي الْقُرْآنِ ؟ قَالَ : لاَ ، قَالَ :**

---

[1] - ئەو (صاع)ەی کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەکاری هێناوە، بریتی بووە لە چوار مشت ئەم چوار مشتەش دادەنرێت بەسێ لیتر بە پێوانە، یەکسانیشە بە ٢٤٠٠ غرام بە کێشانە. (فقه المنهجي للإمام شافعي رحمه الله).

[2] - بەناوی حەجاجی کوڕی یوسفی (ثقفي)ەوە ناو نراوە، وە مۆری دەوڵەتی لێ درابوو.

فَعَمَّنْ أَخَذْتُمْ هَذَا ؟ أَخَذْتُمُوهُ عَنَّا ، وَأَخَذْنَاهُ عَنْ نَبِيِّ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، وَذَكَرَ أَشْيَاءَ نَحْوَ هَذَا.

واتە: حەبیبی مالیكی دەڵێت: پیاوێ بە عیمرانی كوڕی حوصەینی وت: ئەی ئەبا نوجەیدا ئێوە شتی وەهامان بۆ باس دەكەن بە هیچ شێوەیە لە قورئاندا باسی نەكراوە؟ عیمران توڕە بوو بە پیاوەكەی وت: ئایا حوكمی زەكاتتان دەست كەوتووە لە قورئاندا كە لەهەموو چل درهەمێ درهەمێك زەكاتی لێ دەكەوێت، وە لە هەموو ئەوەندەو ئەوەندە سەر مەڕ مەڕێ زەكاتی لێ دەكەوێت، وە لە هەموو ئەوەندەو ئەوەندە سەر وشتر وشترێ زەكاتی لێ دەكەوێت، ئایا حوكمی ئەمەتان دەست كەوتووە لە قورئاندا؟ وتی: نەخێر، وتی: ئەی ئەمەتان لەكێوە وەرگرتووە؟ بێگومان لە ئێمەتان وەرگرتووە، ئێمەش لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم وەرمانگرتووە - دەی ئەمەش وەك ئەوە وایە لە قورئاندا هاتبێت، چونكە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە هەوا و هەوسەوە قسە ناكات، هەرچی دەیڵێ (قورئانەو) سرووش دەكرێ بۆی: ( وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ). النجم: ٣ — ٤.
جا عیمران باسی هەندێ شتی تریشی لەو جۆرە كرد.

# باسی كالاٌو كەل و پەل ئەگەر بۆ بازرگانی بوو زەكاتی لیٚ دەكەویٚت یان نا؟

# ٢ – باب الْعُرُوضِ إِذَا كَانَتْ لِلتِّجَارَةِ هَلْ فِيهَا مِنْ زَكَاةٍ.

١٥٦٢ - (ضعيف). عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَأْمُرُنَا أَنْ نُخْرِجَ الصَّدَقَةَ مِنَ الَّذِى نُعِدُّ لِلْبَيْعِ.

واتە: سەمورەی كوڕی جوندوب دەڵیٚت: لەدوای ئەوە، پیٚغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پیٚ دەداین زەكاتی ئەوەش دەربكەین كە ئامادەمان كردوە بۆ فرۆشتن.

## باسی کەنز چیە؟ وە حوکمی زەکاتی خشل[١٧].

## ٣ - باب الْكَنْزِ مَا هُوَ؟ وَزَكَاةِ الْحُلِيِّ.

١٥٦٣ - (حسن). عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ امْرَأَةً أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَعَهَا ابْنَةٌ لَهَا، وَفِي يَدِ ابْنَتِهَا مَسَكَتَانِ غَلِيظَتَانِ مِنْ ذَهَبٍ، فَقَالَ لَهَا: (أَتُعْطِينَ زَكَاةَ هَذَا؟). قَالَتْ: لاَ. قَالَ: (أَيَسُرُّكِ أَنْ يُسَوِّرَكِ اللَّهُ بِهِمَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ سِوَارَيْنِ مِنْ نَارٍ؟). قَالَ: فَخَلَعَتْهُمَا فَأَلْقَتْهُمَا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَقَالَتْ: هُمَا لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لەباپیریەوە هاتووە، کە ئافرەتێك و کچێکی هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم،

---

[١٧]- خەزنە (کەنز) ئەو ماڵ و سامانەیە کە کۆدەکرێتەوە و لە سەریەك دەنرێت و زەکاتی لێ دەرناکرێت، بەڵام ئەگەر زەکاتی لێ دەرکرا بە کەنز دانانرێت، (حَلِیْ)یش ئەو خشڵ و زێڕ و زیوانەیە کە ئافرەتان خۆیانی پێ دەڕازێننەوە.

دوو بازنی گەورەی ئاڵتون لەدەستی کچەکەیدا بوو، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (زەکاتی ئەم بازنانە دەدەیت؟). وتی: نەخێر، فەرمووی: (پێت خۆشە بە هۆی ئەم بازنانەوە خوای گەورە لەرۆژی قیامەتدا دوو بازنی ئاگر بکاتە دەستت؟). راوی وتی: هەردوو بازنەکەی لەدەستی داکەندو فڕێیدان بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و وتی: هەردووکیان بۆ خواو پێغەمبەرەکەی.

١٥٦٤ – (مرفوع منه حسن) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أَلْبَسُ أَوْضَاحًا مِنْ ذَهَبٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَكَنْزٌ هُوَ؟ فَقَالَ: (مَا بَلَغَ أَنْ تُؤَدَّى زَكَاتُهُ فَزُكِّيَ فَلَيْسَ بِكَنْزٍ).

(الصحيحة: ٥٥٩).

واتە: ئوم سەلەمە دەڵێت: ملوانکەیەکی ئاڵتونم لەمل دەکرد، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئایا ئەمە کەنزە؟ فەرمووی: (ئەگەر گەیشتە رادەی زەکات و زەکاتەکەی دەرکرا ئەوە کەنز نیە).

١٥٦٥ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَدَّادِ بْنِ الْهَادِ أَنَّهُ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرَأَى فِي يَدِي فَتَخَاتٍ مِنْ وَرِقٍ، فَقَالَ: (مَا هَذَا يَا عَائِشَةُ؟). فَقُلْتُ: صَنَعْتُهُنَّ أَتَزَيَّنُ لَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ.

قَالَ (أَتُؤَدِّينَ زَكَاتَهُنَّ؟). قُلْتُ: لاَ، أَوْ مَا شَاءَ اللَّهُ. قَالَ: (هُوَ حَسْبُكِ مِنَ النَّارِ).

واتە: (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی شەددادی كوڕی هاد دەڵێ: چووین بۆ خزمەتی عائیشەی خێزانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم جارێ هاتە ژوورەوە بۆلام بینی چەند ئەنگوستیلەیەكی زیو لە دەستم دایە، فەرمووی: (ئەمە چی یە ئەی عائیشە؟). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دروستم كردون بۆ ئەوەی خۆم بڕازێنمەوە پێیان بۆ تۆ، فەرمووی: (ئەی زەكاتەكەیان دەدەیت؟). وتم: نەخێر، یان شتێكی تر وت كە خوا ویستی لێی بوو، فەرمووی: (ئەگەر زەكاتەكەی نەدەیت تەنیا سزای ئەوەت بەسە لە دۆزەخدا).

١٥٦٦ - (ضعيف). عَنْ عُمَرَ بْنِ يَعْلَى، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ نَحْوَ حَدِيثِ الْخَاتَمِ. قِيلَ لِسُفْيَانَ: كَيْفَ تُزَكِّيهِ؟ قَالَ: تَضُمُّهُ إِلَى غَيْرِهِ.

واتە: لە عومەری كوڕی یەعلاوە، بە رێگەیەكی تر باسی ئەنگوستیلەكە وەك فەرمودەكەی پێشو هاتووە، وتیان بە سوفیان: چۆن زەكاتەكەی دەربكەین كە شتێكی كەمە و نەگەیشتۆتە رادەی زەكات دەركردن؟ وتی: لەگەڵ ئاڵتون و زیوی تردا كۆیكەرەوە جا زەكاتەكەی دەربكە.

## باسی زەکاتی مەڕ و ماڵاتێ کە خۆیان بلەوەڕێن.

## ٤ – باب فِي زَكَاةِ السَّائِمَةِ.

١٥٦٧ - (صحيح) عن حَمَّادٌ قَالَ: أَخَذْتُ مِنْ ثُمَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَنَسٍ كِتَابًا زَعَمَ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ كَتَبَهُ لأَنَسٍ، وَعَلَيْهِ خَاتَمُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، حِينَ بَعَثَهُ مُصَدِّقًا، وَكَتَبَهُ لَهُ فَإِذَا فِيهِ: (هَذِهِ فَرِيضَةُ الصَّدَقَةِ الَّتِي فَرَضَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بِهَا نَبِيَّهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَمَنْ سُئِلَهَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ عَلَى وَجْهِهَا فَلْيُعْطِهَا، وَمَنْ سُئِلَ فَوْقَهَا فَلاَ يُعْطِهِ، فِيمَا دُونَ خَمْسٍ وَعِشْرِينَ مِنَ الإِبِلِ. الْغَنَمُ: فِي كُلِّ خَمْسٍ ذَوْدٍ شَاةٌ. فَإِذَا بَلَغَتْ خَمْسًا وَعِشْرِينَ فَفِيهَا بِنْتُ مَخَاضٍ، إِلَى أَنْ تَبْلُغَ خَمْسًا وَثَلاَثِينَ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهَا بِنْتُ مَخَاضٍ فَابْنُ لَبُونٍ ذَكَرٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتًّا وَثَلاَثِينَ فَفِيهَا بِنْتُ لَبُونٍ، إِلَى خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتًّا وَأَرْبَعِينَ فَفِيهَا حِقَّةٌ طَرُوقَةُ الْفَحْلِ، إِلَى سِتِّينَ، فَإِذَا

بَلَغَتْ إِحْدَى وَسِتِّينَ فَفِيهَا جَذَعَةٌ، إِلَى خَمْسٍ وَسَبْعِينَ، فَإِذَا بَلَغَتْ سِتًّا وَسَبْعِينَ فَفِيهَا ابْنَتَا لَبُونٍ، إِلَى تِسْعِينَ، فَإِذَا بَلَغَتْ إِحْدَى وَتِسْعِينَ فَفِيهَا حِقَّتَانِ طَرُوقَتَا الْفَحْلِ، إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ فَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ بِنْتُ لَبُونٍ، وَفِي كُلِّ خَمْسِينَ حِقَّةٌ، فَإِذَا تَبَايَنَ أَسْنَانُ الإِبِلِ فِي فَرَائِضِ الصَّدَقَاتِ: فَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ الْجَذَعَةِ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ جَذَعَةٌ، وَعِنْدَهُ حِقَّةٌ فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ، وَأَنْ يَجْعَلَ مَعَهَا شَاتَيْنِ: إِنِ اسْتَيْسَرَتَا لَهُ، أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَمًا، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ الْحِقَّةِ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ حِقَّةٌ وَعِنْدَهُ جَذَعَةٌ فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ وَيُعْطِيهِ الْمُصَدِّقُ عِشْرِينَ دِرْهَمًا أَوْ شَاتَيْنِ، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ الْحِقَّةِ وَلَيْسَ عِنْدَهُ حِقَّةٌ وَعِنْدَهُ ابْنَةُ لَبُونٍ فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ. - قَالَ أَبُو دَاوُدَ: مِنْ هَا هُنَا لَمْ أَضْبِطْهُ عَنْ مُوسَى كَمَا أُحِبُّ - . وَيَجْعَلُ مَعَهَا شَاتَيْنِ إِنِ اسْتَيْسَرَتَا لَهُ عِشْرِينَ دِرْهَمًا، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ بِنْتِ لَبُونٍ وَلَيْسَ عِنْدَهُ إِلاَّ حِقَّةٌ فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ - . قَالَ أَبُو دَاوُدَ: إِلَى هَا هُنَا، ثُمَّ أَتْقَنْتُهُ - وَيُعْطِيهِ

الْمُصَدِّقُ عِشْرِينَ دِرْهَمًا أَوْ شَاتَيْنِ، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ ابْنَةِ لَبُونٍ وَلَيْسَ عِنْدَهُ إِلاَّ بِنْتُ مَخَاضٍ فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ وَشَاتَيْنِ أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَمًا، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ ابْنَةِ مَخَاضٍ وَلَيْسَ عِنْدَهُ إِلاَّ ابْنُ لَبُونٍ ذَكَرٌ فَإِنَّهُ يُقْبَلُ مِنْهُ، وَلَيْسَ مَعَهُ شَيْءٌ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ إِلاَّ أَرْبَعٌ فَلَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا. وَفِي سَائِمَةِ الْغَنَمِ إِذَا كَانَتْ أَرْبَعِينَ فَفِيهَا شَاةٌ إِلَى عِشْرِينَ وَمِئَةٍ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِئَةٍ فَفِيهَا شَاتَانِ، إِلَى أَنْ تَبْلُغَ مِئَتَيْنِ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى مِائَتَيْنِ فَفِيهَا ثَلاَثُ شِيَاهٍ إِلَى أَنْ تَبْلُغَ ثَلاَثَ مِئَةٍ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى ثَلاَثِ مِئَةٍ فَفِي كُلِّ مِائَةِ شَاةٍ شَاةٌ، وَلاَ يُؤْخَذُ فِي الصَّدَقَةِ هَرِمَةٌ، وَلاَ ذَاتُ عَوَارٍ مِنَ الْغَنَمِ، وَلاَ تَيْسُ الْغَنَمِ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ الْمُصَّدِّقُ، وَلاَ يُجْمَعُ بَيْنَ مُفْتَرِقٍ، وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ، وَمَا كَانَ مِنْ خَلِيطَيْنِ فَإِنَّهُمَا يَتَرَاجَعَانِ بَيْنَهُمَا بِالسَّوِيَّةِ، فَإِنْ لَمْ تَبْلُغْ سَائِمَةُ الرَّجُلِ أَرْبَعِينَ فَلَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ، إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ رَبُّهَا. وَفِي الرِّقَةِ رُبْعُ الْعُشْرِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنِ الْمَالُ

واتە: حەماد دەڵێت: ئەمە ئەو نامەیە کە وەرم گرت لە (ثمَامَة)ی کوڕی (عَبْدِ اللَّهِ)ی کوڕی ئەنەس، (ثمَامَة) پێی وابوو کە پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ نوسیویەتی بۆ ئەنەس کاتێ کە ناردی بۆ بەحرەین سەرپەرشتی زەکات کۆکردنەوە بکات، نامەکە مۆری پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم لەسەر بوو، ئەبو بەکر نوسراوێکی بەم شێوەیە نوسی بۆ ئەنەس بۆ ئەوەی کاری پێ بکات: (ئەمە ئەو زەکاتە فەرزەیە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دایناوە لەسەر موسوڵمانان، ئەوەیە کە خوای گەورە فەرمانی کردوە بە پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم، جا دایناوە، هەرکەسێ لە موسوڵمانان بەو شێوە ڕێکوپێکە داوای لێکرا ئەوە با بیدات، هەرکەسێ لەمە زیاتری لێ داواکرا ئەوا با زیادەکە نەدات، وشتر لەیەك سەرەوە هەتا دەگاتە بیست و چوار سەر زەکاتەکەی لە مەڕ دەدرێت، بۆ هەر پێنج سەر وشترێ مەڕێ دەدرێت، ئەگەر ژمارەی وشترەکان گەیشتە بیست و پێنج سەر هەتا سی و پێنج سەر ئەوە یەك بەچکە وشتری مێینەی تەمەن یەك ساڵ زەکاتیان لێ دەکەوێت، ئەگەر نەیبوو ئەوا بەچکە وشترێکی نێرینەی دوو ساڵ، ئەگەر بوون بە سی و شەش سەر هەتا دەبن بە چل و پێنج سەر بەچکە وشترێکی مێینەی دوو ساڵە زەکاتیان لێ دەکەوێت، کە بوون بە چل و شەش سەر هەتا دەبن بە شەست سەر بەچکە وشترێکی مێینەی سێ ساڵەی بەرکەڵ زەکاتیان لێ دەکەوێت، کە بوون بە شەست و یەك سەر هەتا دەبن بە حەفتاو پێنج سەر وشترێکی مێینەی چوار ساڵ زەکاتیان لێ دەکەوێت، کە بوون بە حەفتاو شەش سەر هەتا دەبن بە نەوەد سەر دوو بەچکە وشتری مێینەی دوو ساڵ زەکاتیان لێ دەکەوێت، کە بوون بە نەوەدو یەك هەتا دەبن بە سەدو بیست سەر دوو وشترە مێینەی سێ ساڵەی بەرکەڵ زەکاتیان لێ دەکەوێت، بەڵام ئەگەر لە سەدو بیست سەر زیاتر بوون ئەوا لەهەموو چل سەرێ بەچکە وشترێکی

مێینەی دوو ساڵ زەكاتیان لێ دەكەوێت، وە لەهەموو پەنجا سەرێ بەچكە وشترێكی سێ ساڵە زەكاتیان لێ دەكەوێت، ئەگەر تەمەنی جیاواز بوو لەگەورە و بچوكیدا: هەركەسێ زەكاتی وشترەكانی دەیكردە وشترێكی مێی چوار ساڵە، بەڵام ئەم وشترەی نەبوو، بەچكە وشترێ مێی سێ ساڵەی هەبوو، ئەوا ئەو بەچكەی لێ وەردەگیرێ لەگەڵ دوو مەڕ، ئەگەر مەڕی هەبوو، یان لەگەڵ بیست درهەم زیوی رووتدا، وە هەركەسێ زەكاتی وشترەكانی دەیكردە بەچكە وشترێكی مێی سێ ساڵە بەڵام ئەوەی نەبوو، بەڵكو وشترێكی مێی چوار ساڵەی هەبوو، ئەوا ئەوەی لێ وەردەگیرێ، بەڵام ئەو كەسەی كە زەكاتەكە وەردەگرێ دەبێت بیست درهەم یان دوو مەڕ یا دوو بزن باقی بداتەوە، هەركەسێ زەكاتی وشترەكانی دەیكردە بەچكە وشترێكی سێ ساڵە بەڵام ئەمەی نەبوو، بەڵكو بەچكە وشترێكی مێی دوو ساڵەی هەبوو، ئەوا ئەوەی لێ وەردەگیرێ، بەڵام ئەو كەسەی كە زەكاتەكە وەردەگرێ دەبێت دوو مەڕ یا بیست درهەم باقی بداتەوە، وە هەركەسێ زەكاتی وشترەكانی دەیكردە بەچكە وشترێكی مێی دوو ساڵە بەڵام ئەمەی نەبوو، بەڵكو بەچكە وشترێكی سێ ساڵەی هەبوو، ئەوا ئەوەی لێ وەردەگیرێ، - ئەبو داود دەڵێت: ئالێرەدا فەرمودەكەم لە موساوە شێخەكەم لەبەر نەكردوە وەك پێم خۆشە - بەڵام ئەو كەسەی كە زەكاتەكە وەردەگرێ دەبێت بیست درهەم یان دوو سەر مەڕ باقی بداتەوە، وە هەركەسێ زەكاتی وشترەكانی دەیكردە بەچكە وشترێكی مێی دوو ساڵە بەڵام ئەمەی نەبوو، بەڵكو بەچكە وشترێكی مێی یەك ساڵەی هەبوو، ئەوا ئەوەی لێ وەردەگیرێ، - ئەبو داود دەڵێت: هەتا ئێرە لێی دڵنیا نەبووم، لەپاشدا دڵنیام - بەڵام ئەو كەسەی كە زەكاتەكە وەردەگرێ دەبێت بیست درهەم یان دوو سەر مەڕ باقی بداتەوە، وە هەركەسێ زەكاتی وشترەكانی دەیكردە بەچكە وشترێكی مێی یەك ساڵە بەڵام ئەمەی نەبوو، بەڵكو بەچكە وشترێكی مێی دوو ساڵەی هەبوو، ئەوا ئەوەی لێ وەردەگیرێ، بەڵام ئەو كەسەی كە زەكاتەكە وەردەگرێ دەبێت بیست

درهەم یان دوو سەر مەڕ باقی بداتەوە، وە هەركەسێ زەكاتی وشترەكانی دەیكردە بەچكە وشترێكی مێی یەك ساڵە بەلاّم ئەمەی نەبوو، بەڵكو بەچكە وشترێكی مێی دوو ساڵەی هەبوو، ئەوا ئەوەی لێ وەردەگیرێ، بەلاّم ئەو كەسەی كە زەكاتەكە وەردەگرێ دەبێت بیست درهەم یان دوو سەر مەڕ باقی بداتەوە، ئەگەر كەسێ لە چوار وشتر زیاتری نەبوو ئەوە زەكاتی لێ دەرناكرێت مەگەر خاوەنەكەی خۆی بیەوێ لەڕێی خوا بیبەخشێ، لەو مەڕانەدا كە خۆیان دەلەوەڕێن: لە چل سەر مەڕ شەكێ، هەتا دەگاتە سەدو بیست سەر، ئەگەر لە سەدو بیست زیادی كرد با یەك مەڕیش بێت هەتا دەگاتە دوو سەد سەر ئەوە دوو شەك زەكاتیان لێ دەكەوێت، ئەگەر لە دوو سەد سەر زیادی كرد هەتا دەگاتە سێ سەد سەر ئەوە سێ شەك زەكاتیان لێ دەكەوێت، ئەگەر لە سێ سەد سەر زیادی كرد ئەوە بۆ هەموو سەد سەر مەڕێ شەكێ زەكاتیان لێ دەكەوێت، ئاژەڵی پیر و كوێر و عەیبدار وەرناگیرێت لە زەكاتدا، نێریش وەرناگیرێت مەگەر زەكات وەرگر خۆی بیەوێت، نابێت ئاژەڵی كۆ جیابكرێتەوە، وە نابێت ئاژەڵی جیا كۆبكرێتەوە لەترسی زەكات لێكەوتن، وە هاوبەشانیش لەناو خۆیاندا بەرێكوپێكی كەم و زیادی دەگێڕنەوە بۆ یەكتری، ئەو ئاژەڵانەی - كە هی دوو كەس یان زیاترن – پێكەوە تێكەڵن ئەوە بێگومان بە یەكسانی دەیگێڕنەوە - دابەشی دەكەنەوە بەسەر خۆیاندا هەركەس بەئەندازەی بەشی خۆی بەشە زەكاتی دەكەوێتە سەر، ئەگەر كەسێ لەو مەڕانەی هەبوو كە خۆیان دەلەوەڕێن هەتا ژمارەیان نەگاتە چل سەر زەكاتیان لێ دەرناكرێت، مەگەر خاوەنەكەیان خۆی بیەوێت، وە لەزیودا چارەكی دە یەك دەكەوێت، ئەگەر درهەم نەگەیشتە سەدو حەفتا ئەوە زەكاتی لێ دەرناكرێت، مەگەر خاوەنەكەیان خۆی بیەوێت).

١٥٦٨ - (صحيح) عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَتَبَ رَسُولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كِتَابَ الصَّدَقَةِ فَلَمْ يُخْرِجْهُ إِلَى عُمَّالِهِ حَتَّى قُبِضَ، فَقَرَنَهُ بِسَيْفِهِ، فَعَمِلَ بِهِ أَبُو بَكْرٍ حَتَّى قُبِضَ، ثُمَّ عَمِلَ بِهِ عُمَرُ حَتَّى قُبِضَ، فَكَانَ فِيهِ: (فِي خَمْسٍ مِنَ الإِبِلِ شَاةٌ، وَفِي عَشْرٍ شَاتَانِ، وَفِي خَمْسَ عَشَرَةَ ثَلاَثُ شِيَاهٍ، وَفِي عِشْرِينَ أَرْبَعُ شِيَاهٍ، وَفِي خَمْسٍ وَعِشْرِينَ ابْنَةُ مَخَاضٍ، إِلَى خَمْسٍ وَثَلاَثِينَ، فَإِنْ زَادَتْ وَاحِدَةً فَفِيهَا ابْنَةُ لَبُونٍ، إِلَى خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ، فَإِذَا زَادَتْ وَاحِدَةً فَفِيهَا حِقَّةٌ إِلَى سِتِّينَ فَإِذَا زَادَتْ وَاحِدَةً فَفِيهَا جَذَعَةٌ، إِلَى خَمْسٍ وَسَبْعِينَ، فَإِذَا زَادَتْ وَاحِدَةً فَفِيهَا ابْنَتَا لَبُونٍ، إِلَى تِسْعِينَ، فَإِذَا زَادَتْ وَاحِدَةً فَفِيهَا حِقَّتَانِ، إِلَى عِشْرِينَ وَمِئَةٍ، فَإِنْ كَانَتِ الإِبِلُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَفِي كُلِّ خَمْسِينَ حِقَّةٌ، وَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ ابْنَةُ لَبُونٍ، وَفِي الْغَنَمِ فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ شَاةً شَاةٌ، إِلَى عِشْرِينَ وَمِئَةٍ، فَإِنْ زَادَتْ وَاحِدَةً فَشَاتَانِ، إِلَى مِائَتَيْنِ، فَإِنْ زَادَتْ وَاحِدَةً عَلَى الْمِائَتَيْنِ فَفِيهَا ثَلاَثُ شِيَاهٍ، إِلَى ثَلاَثِمِائَةٍ، فَإِنْ كَانَتِ الْغَنَمُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَفِي كُلِّ مِائَةِ شَاةٍ شَاةٌ، وَلَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ حَتَّى تَبْلُغَ

الْمِائَةَ، وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ، وَلاَ يُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ، مَخَافَةَ الصَّدَقَةِ، وَمَا كَانَ مِنْ خَلِيطَيْنِ فَإِنَّهُمَا يَتَرَاجَعَانِ بَيْنَهُمَا بِالسَّوِيَّةِ، وَلاَ يُؤْخَذُ فِي الصَّدَقَةِ: هَرِمَةٌ، وَلاَ ذَاتُ عَيْبٍ). قَالَ: وَقَالَ الزُّهْرِيُّ: إِذَا جَاءَ الْمُصَدِّقُ قُسِمَتِ الشَّاءُ أَثْلاَثًا: ثُلُثًا شِرَارًا، وَثُلُثًا خِيَارًا، وَثُلُثًا وَسَطًا، فَأَخَذَ الْمُصَدِّقُ مِنَ الْوَسَطِ، وَلَمْ يَذْكُرِ الزُّهْرِيُّ الْبَقَرَ.

واتە: لە سالم - ی كوڕی (عَبْدُ الله)ی كوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ - لەباوكیەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمانی كرد بە نوسینی نامەیە سەبارەت بە زەكات و پێچای بە شمشێرەكەیەوە، دەری نەهێنا بۆ ئەوانەی كە ئیشیان ئەوە بوو زەكات كۆبكەنەوە هەتا وەفاتی كرد، پێشەوا ئەبو بەكر ڕەزای خوای لێ بێ كاری پێ كرد هەتا لەدنیا دەرچوو، هەروەها پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ كاری پێ كرد هەتا لەدنیا دەرچوو، لە نامەكەدا ئەمە هاتبوو: (لە پێنج وشتر شەكێ، لە دە وشتر دوو شەك، لە پانزە وشتر سێ شەك، لەبیست وشتر چوار شەك، لەبیست و پێنج سەر وشترەوە هەتا دەگاتە سی و پێنج سەر ئەوە یەك بەچكە وشتری مێینەی تەمەن یەك ساڵ زەكاتیان لێ دەكەوێت، ئەگەر یەك سەر زیادی كرد واتە لە سی و شەش سەرەوە هەتا دەگەنە چل و پێنج سەر بەچكە وشترێكی مێینەی دوو ساڵە زەكاتیان لێ دەكەوێت، ئەگەر یەك سەر زیادی كرد واتە لە چل و شەش سەر هەتا دەبن بە شەست سەر بەچكە وشترێكی مێینەی سێ ساڵەی بەركەڵ زەكاتیان لێ دەكەوێت، ئەگەر یەك سەر زیادی كرد واتە لە

شەست و یەك سەر هەتا دەبن بە حەفتاو پێنج سەر وشترێکی مێینەی چوار ساڵ زەکاتیان لێ دەکەوێت،، کە بوون بە حەفتاو شەش سەر هەتا دەبن بە نەوەد سەر دوو بەچکە وشتری مێینەی دوو ساڵ زەکاتیان لێ دەکەوێت، کە بوون بە نەوەدو یەك هەتا دەبن بە سەدو بیست سەر دوو وشتری مێینەی سێ ساڵەی بەرکەڵ زەکاتیان لێ دەکەوێت، ئەگەر ژمارەی وشترەکان لەوە زیاتری کرد ئەوە بۆ هەموو پەنجا سەر وشترێ بەچکە وشترێکی سێ ساڵە زەکاتیان لێ دەکەوێت، وە بۆ هەموو چل سەرێ بەچکە وشترێکی مێینەی دوو ساڵە زەکاتیان لێ دەکەوێت، لەمەڕدا: لە چل سەر مەڕ شەکێ، هەتا دەگاتە سەدو بیست سەر، ئەگەر لە سەدو بیست زیادی کرد با یەك مەڕیش بێت هەتا دەگاتە دوو سەد سەر ئەوە دوو شەك زەکاتیان لێ دەکەوێت، ئەگەر لە دوو سەد سەر زیادی کرد هەتا دەگاتە سێ سەد سەر ئەوە سێ شەك زەکاتیان لێ دەکەوێت، ئەگەر لە سێ سەد سەر زیادیان کرد ئەوە بۆ هەموو سەد سەر مەڕێ شەکێ زەکاتیان لێ دەکەوێت، هەتا ژمارەیان نەگاتە سەد سەر هیچ زەکاتیان ناکەوێت، نابێت ئاژەڵی کۆ جیابکرێتەوە، وە نابێت ئاژەڵی جیا کۆبکرێتەوە لەترسی زەکات لێکەوتن، هاوبەشانیش لەناو خۆیاندا بەڕێکوپێکی کەم و زیادی دەگێڕنەوە بۆ یەکتری، ئەو ئاژەڵانەی - کە هی دوو کەس یان زیاترن – پێکەوە تێکەڵن ئەوە بێگومان بە یەکسانی دەیگێڕنەوە - دابەشی دەکەنەوە بەسەر خۆیاندا هەرکەس بەئەندازەی بەشی خۆی بەشە زەکاتی دەکەوێتە سەر، وە ئاژەڵی پیر و کوێر و عەیبدار وەرناگیرێت لە زەکاتدا). راوی فەرموودەکە سوفیانی کوڕی حوسەین دەڵێت: زوهری وتی: کاتێ کە زەکات وەرگر هات جەڵەبە مەڕەکان دەکرێن بەسێ بەشەوە: بەشێکی خراپ، بەشێکی چاك، بەشێکی مام ناوەندی، جا زەکات وەرگرەکە لە بەشە مام ناوەندیەکە دەبات، زوهری لە نوسراوی زەکاتەکەدا باسی مانگای نەکرد.

١٥٦٩ - (صحيح). عن سُفْيَانُ بْنُ حُسَيْنٍ، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ قَالَ: (فَإِنْ لَمْ تَكُنِ ابْنَةُ مَخَاضٍ، فَابْنُ لَبُونٍ). وَلَمْ يَذْكُرْ كَلاَمَ الزُّهْرِيِّ.

واتە: لە سوفیانی کوڕی حوسەینەوە فەرمودەی پێشو بەهەمان سەنەد و مانا هاتووە، راوی ئەمەی بۆ فەرمودەکە زیاد کرد: (ئەگەر بەچکە وشترێکی مێینەی یەك ساڵ نەبوو، ئەوە بەچکە وشترێکی نێرینەی دوو ساڵ زەکاتیان لێ دەکەوێت). راوی باسی وتەکەی زوهری نەکرد.

١٥٧٠ - (صحيح). عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: هَذِهِ نُسْخَةُ كِتَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الَّذِى كَتَبَهُ فِى الصَّدَقَةِ، وَهِىَ عِنْدَ آلِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: أَقْرَأَنِيهَا سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ فَوَعَيْتُهَا عَلَى وَجْهِهَا، وَهِىَ الَّتِى انْتَسَخَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ وَسَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ قَالَ: (فَإِذَا كَانَتْ إِحْدَى وَعِشْرِينَ وَمِائَةً فَفِيهَا ثَلاَثُ بَنَاتِ لَبُونٍ، حَتَّى تَبْلُغَ تِسْعًا وَعِشْرِينَ وَمِائَةً، فَإِذَا كَانَتْ ثَلاَثِينَ وَمِائَةً فَفِيهَا بِنْتَا لَبُونٍ وَحِقَّةٌ، حَتَّى تَبْلُغَ تِسْعًا وَثَلاَثِينَ وَمِائَةً، فَإِذَا كَانَتْ أَرْبَعِينَ وَمِائَةً فَفِيهَا حِقَّتَانِ وَبِنْتُ لَبُونٍ، حَتَّى تَبْلُغَ

تِسْعًا وَأَرْبَعِينَ وَمِائَةً، فَإِذَا كَانَتْ خَمْسِينَ وَمِائَةً فَفِيهَا ثَلاَثُ حِقَاقٍ، حَتَّى تَبْلُغَ تِسْعًا وَخَمْسِينَ وَمِائَةً، فَإِذَا كَانَتْ سِتِّينَ وَمِائَةً فَفِيهَا أَرْبَعُ بَنَاتِ لَبُونٍ، حَتَّى تَبْلُغَ تِسْعًا وَسِتِّينَ وَمِائَةً، فَإِذَا كَانَتْ سَبْعِينَ وَمِائَةً فَفِيهَا ثَلاَثُ بَنَاتِ لَبُونٍ وَحِقَّةٌ ، حَتَّى تَبْلُغَ تِسْعًا وَسَبْعِينَ وَمِائَةً، فَإِذَا كَانَتْ ثَمَانِينَ وَمِائَةً فَفِيهَا حِقَّتَانِ وَابْنَتَا لَبُونٍ، حَتَّى تَبْلُغَ تِسْعًا وَثَمَانِينَ وَمِائَةً، فَإِذَا كَانَتْ تِسْعِينَ وَمِائَةً فَفِيهَا ثَلاَثُ حِقَاقٍ وَبِنْتُ لَبُونٍ، حَتَّى تَبْلُغَ تِسْعًا وَتِسْعِينَ وَمِائَةً، فَإِذَا كَانَتْ مِائَتَيْنِ فَفِيهَا أَرْبَعُ حِقَاقٍ، أَوْ خَمْسُ بَنَاتِ لَبُونٍ، أَيُّ السِّنَّيْنِ وُجِدَتْ أُخِذَتْ. وَفِي سَائِمَةِ الْغَنَمِ). فَذَكَرَ نَحْوَ حَدِيثِ سُفْيَانَ بْنِ حُسَيْنٍ وَفِيهِ: (وَلاَ يُؤْخَذُ فِي الصَّدَقَةِ: هَرِمَةٌ، وَلاَ ذَاتُ عَوَارٍ مِنَ الْغَنَمِ، وَلاَ تَيْسُ الْغَنَمِ، إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ الْمُصَّدِّقُ).

واتە: ئیبنو شیهاب دەڵێت: ئەمە نوسخەی ئەو نامەیەیە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی کردوە بە نوسینی سەبارەت بە زەکات، لای بنەماڵەی پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) بووە رەزای خوایان لێ بێ، ئیبنو شیهاب وتی: سالمی کوڕی (عبدُ الله)ی کوڕی عومەر رەزای خوایان لێ بێ بۆی خوێندمەوە بە بەرچاویەوە لەبەرم کرد، ئەو نامەیە بوو کە عومەری کوڕی

(عبد العزيز) فەرمانی كردبوو واتە لەبەری بنوسنەوە - كۆپی بكەن — لە (عَبدُ الله)ى كوڕی (عَبدُ الله)ى كوڕی عومەر و سالمی كوڕی (عَبدُ الله)ى كوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ، راوی فەرمودەكە زوهری فەرمودەكەی گێڕایەوە، وتی: (ئەگەر ژمارەی وشترەكان گەیشتە سەدو بیست و یەك سێ بەچكە وشتری مێینەی دوو ساڵە زەكاتیان لێ دەكەوێت، هەتا ژمارەیان دەگاتە سەدو بیست و نۆ، كە بوون بە سەدو سی سەر دوو بەچكە وشتری مێینەی دوو ساڵە لەگەڵ بە چكە وشترێكی مێینە سێ ساڵە زەكاتیان لێ دەكەوێت، ئەگەر بوون بە سەدو چل سەر دوو بەچكە وشتری مێینەی سێ ساڵە لەگەڵ بە چكە وشترێكی مێینەی دوو ساڵە زەكاتیان لێ دەكەوێت، هەتا ژمارەیان دەگاتە سەدو چل و نۆ، ئەگەر بوون بە سەدو پەنجا سەر سێ بەچكە وشتری مێینەی سێ ساڵە زەكاتیان لێ دەكەوێت، هەتا ژمارەیان دەگاتە سەدو پەنجاو نۆ، ئەگەر بوون بە سەدو شەست سەر چوار بەچكە وشتری مێینەی دوو ساڵە زەكاتیان لێ دەكەوێت، هەتا ژمارەیان دەگاتە سەدو شەست و نۆ، ئەگەر بوون بە سەدو حەفتا سەر سێ بەچكە وشتری مێینەی دوو ساڵە لەگەڵ بە چكە وشترێكی مێینەی سێ ساڵە زەكاتیان لێ دەكەوێت، هەتا ژمارەیان دەگاتە سەدو حەفتاو نۆ، ئەگەر بوون بە سەدو هەشتا سەر دوو بەچكە وشتری مێینەی سێ ساڵە لەگەڵ بە چكە وشترێكی مێینەی دوو ساڵە زەكاتیان لێ دەكەوێت، هەتا ژمارەیان دەگاتە سەدو هەشتاو نۆ، ئەگەر بوون بە سەدو نەوەد سەر سێ بەچكە وشتری مێینەی سێ ساڵە لەگەڵ بە چكە وشترێكی مێینەی دوو ساڵە زەكاتیان لێ دەكەوێت، هەتا ژمارەیان دەگاتە سەدو نەوەدو نۆ، ئەگەر بوون بە دوو سەد سەر چوار بەچكە وشتری مێینەی سێ ساڵە لەگەڵ پێنج بە چكە وشتری مێینەی دوو ساڵە زەكاتیان لێ دەكەوێت، هەر تەمەنێكی دەستكەوت با بیدات لە زەكاتدا. لەو مەڕانەدا كە خۆیان دەلەوەڕێن، راوی فەرمودەكەی پێشوی وەك سوفیانی كوڕی حوسەین گێڕایەوە: (وە ئاژەڵی پیر و كوێر و نێر وەرناگیرێت لە زەكاتدا مەگەر زەكات وەرگر خۆی بیەوێت).

١٥٧١ - (صحيح مقطوع) عن عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ قَالَ: قَالَ مَالِكٌ: وَقَوْلُ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضى الله عنه: لاَ يُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ، وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ، هُوَ أَنْ يَكُونَ لِكُلِّ رَجُلٍ أَرْبَعُونَ شَاةً، فَإِذَا أَظَلَّهُمُ الْمُصَدِّقُ جَمَعُوهَا لِئَلاَّ يَكُونَ فِيهَا إِلاَّ شَاةٌ، وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ. أَنَّ الْخَلِيطَيْنِ إِذَا كَانَ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةُ شَاةٍ وَشَاةٌ، فَيَكُونُ عَلَيْهِمَا فِيهَا ثَلاَثُ شِيَاهٍ، فَإِذَا أَظَلَّهُمَا الْمُصَدِّقُ فَرَّقَا غَنَمَهُمَا، فَلَمْ يَكُنْ عَلَى كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا إِلاَّ شَاةٌ، فَهَذَا الَّذِى سَمِعْتُ فِى ذَلِكَ.

واتە: (عبدُ الله)ى کوڕی مەسلەمە دەڵێت: مالك وتی: مانای وتەکەی پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) ڕەزای خوایان لێ بێ کە بەرزی کردەوە بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەم شێوەیە: (ئاژەڵی کۆ جیاناکرێتەوەو، ئاژەڵی جیاش کۆناکرێتەوە، لەترسی زەکات) ئەوەیە: ئەگەر سێ کەس یەکی خاوەنی چل سەر مەڕ بن بەجیا ئەوە یەکی شەکێ زەکاتیان دەکەوێت، بەڵام زەکات وەرگر بێت کۆیانکاتەوە ئەوە یەك سەر زیاتر زەکاتیان ناکەوێت، ڕاڤەی: (کە ئاژەڵی کۆ جیاناکرێتەوە) ئەوەیە: ئەگەر یەکی خاوەنی سەدو یەك مەڕ بوون ئەوە یەکی سێ شەك زەکاتیان دەکەوێت، بەڵام زەکات وەرگر بێت جیایانکاتەوە ئەوە یەکی یەك شەك زیاتریان ناکەوێت. مالیك وتی: ئەمە ئەوە بوو لەڕاڤەی ئەم فەرموودەدا بیستومە.

١٥٧٢ - (صحيح) عَنْ عَلِيّ رَضِيَ اللهُ عَنه، قَالَ زُهَيْرٌ: أَحْسَبُهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: (هَاتُوا رُبْعَ الْعُشُورِ، مِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ دِرْهَمًا دِرْهَمٌ، وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ شَيْءٌ حَتَّى تَتِمَّ مِائَتَيْ دِرْهَمٍ، فَإِذَا كَانَتْ مِائَتَيْ دِرْهَمٍ فَفِيهَا خَمْسَةُ دَرَاهِمَ، فَمَا زَادَ فَعَلَى حِسَابِ ذَلِكَ، وَفِي الْغَنَمِ فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ شَاةً شَاةٌ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ إِلاَّ تِسْعًا وَثَلاَثِينَ، فَلَيْسَ عَلَيْكَ فِيهَا شَيْءٌ). وَسَاقَ صَدَقَةَ الْغَنَمِ مِثْلَ الزُّهْرِيِّ قَالَ: (وَفِي الْبَقَرِ فِي كُلِّ ثَلاَثِينَ تَبِيعٌ، وَفِي الأَرْبَعِينَ مُسِنَّةٌ، وَلَيْسَ عَلَى الْعَوَامِلِ شَيْءٌ. وَفِي الإِبِلِ فَذَكَرَ صَدَقَتَهَا كَمَا ذَكَرَ الزُّهْرِيُّ قَالَ: (وَفِي خَمْسٍ وَعِشْرِينَ خَمْسَةٌ مِنَ الْغَنَمِ فَإِذَا زَادَتْ وَاحِدَةً فَفِيهَا ابْنَةُ مَخَاضٍ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ بِنْتُ مَخَاضٍ فَابْنُ لَبُونٍ ذَكَرٌ إِلَى خَمْسٍ وَثَلاَثِينَ، فَإِذَا زَادَتْ وَاحِدَةً فَفِيهَا بِنْتُ لَبُونٍ إِلَى خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ، فَإِذَا زَادَتْ وَاحِدَةً فَفِيهَا حِقَّةٌ طَرُوقَةُ الْجَمَلِ إِلَى سِتِّينَ). ثُمَّ سَاقَ مِثْلَ حَدِيثِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: (فَإِذَا زَادَتْ وَاحِدَةً - يَعْنِي وَاحِدَةً وَتِسْعِينَ - فَفِيهَا حِقَّتَانِ طَرُوقَتَا الْجَمَلِ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَإِنْ كَانَتِ الإِبِلُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَفِي كُلِّ

خَمْسِينَ حِقَّةٌ، وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ، وَلاَ يُجْمَعُ بَيْنَ مُفْتَرِقٍ، خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ، وَلاَ تُؤْخَذُ فِي الصَّدَقَةِ: هَرِمَةٌ، وَلاَ ذَاتُ عَوَارٍ، وَلاَ تَيْسٌ، إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ الْمُصَدِّقُ، وَفِي النَّبَاتِ: مَا سَقَتْهُ الأَنْهَارُ أَوْ سَقَتِ السَّمَاءُ الْعُشْرُ، وَمَا سَقَى الْغَرْبُ فَفِيهِ نِصْفُ الْعُشْرِ). وَفِي حَدِيثِ عَاصِمٍ وَالْحَارِثِ (الصَّدَقَةُ فِي كُلِّ عَامٍ). قَالَ زُهَيْرٌ: أَحْسَبُهُ قَالَ: (مَرَّةً). وَفِي حَدِيثِ عَاصِمٍ: (إِذَا لَمْ يَكُنْ فِي الإِبِلِ ابْنَةُ مَخَاضٍ وَلاَ ابْنُ لَبُونٍ، فَعَشَرَةُ دَرَاهِمَ أَوْ شَاتَانِ).

واتە: لە پێشەوا عەلی كوڕی (أبی طالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، زوهەیر وتی: وا ئەزانم كە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (هەموو ساڵێ چوار یەكی دە یەك زەكاتی زیوەكەتان دەربكەن، لە هەموو چل درهەمێ درهەمێ، هەتا نەگاتە دوو سەد درهەم زەكاتتان لەسەر نیە، بەڵام كاتێ كە بوو بە دوو سەد درهەم پێنج درهەم زەكاتی لێ دەكەوێت، جا ئەگەر زیاتر بوو هەر بەم شێوە حساب دەكرێت، لە مەڕدا: بۆ هەموو چل سەرێ شەكێ، ئەگەر تەنها سی و نۆ سەر بوون ئەوە زەكاتتان لەسەر نیە). ڕاوی فەرمودەكە ئەبو ئیسحاق باسی زەكاتی مەڕی وەك فەرمودەكەی زوهری گێڕایەوە. ئەبو ئیسحاق وتی: لە مانگادا: بۆ هەموو سی سەرێ گوێرەكەیەكی یەك ساڵەی نێر زەكات دەدرێت، وە لەهەموو چل سەر مانگایە نێونێكی دوو ساڵ دەدرێ، ئەوانەی كە ئیشیان پێ دەكرێت زەكاتیان لێ نادرێت وەك گای جوت و وشتری بارەبەر. لە وشتردا: ڕاوی فەرمودەكە ئەبو ئیسحاق باسی

زەكاتی وشتری وەك فەرموودەكەی زوهری گێڕایەوە. وتی: بۆ هەر بیست و پێنج سەر وشترێ پێنج مەڕ، ئەگەر ژمارەی وشترەكان یەك سەر زیادی كرد واتە لە بیست و شەش سەرەوە هەتا دەبن بە سی و پێنج سەر ئەوە بەچكە وشترێكی مێینەی تەمەن یەك ساڵ زەكاتیان لێ دەكەوێت، ئەگەر نەبوو ئەوا بەچكە وشترێكی نێرینەی دوو ساڵ، ئەگەر ژمارەی وشترەكان یەك سەر زیادی كرد واتە لە سی و شەش سەرەوە هەتا دەبن بە چل و پێنج سەر ئەوە بەچكە وشترێكی مێینەی دوو ساڵە زەكاتیان لێ دەكەوێت، ئەگەر ژمارەی وشترەكان یەك سەر زیادی كرد واتە لە چل و شەش سەرەوە هەتا دەبن بە شەست سەر بەچكە وشترێكی مێینەی سێ ساڵەی بەركەڵ زەكاتیان لێ دەكەوێت، راوی فەرموودەكە ئەبو ئیسحاق باسی زەكاتی مەڕی وەك فەرموودەكەی زوهری گێڕایەوە. ئەبو ئیسحاق وتی: ئەگەر ژمارەی وشترەكان یەك سەر زیادی كرد واتە لە نەود و یەك سەرەوە هەتا دەبن بە سەدو بیست سەر دوو وشترە مێینەی سێ ساڵەی بەركەڵ زەكاتیان لێ دەكەوێت، بەڵام ئەگەر لە سەدو بیست سەر زیاتر بوون ئەوە لەهەموو پەنجا سەرێ بەچكە وشترێكی سێ ساڵە زەكاتیان لێ دەكەوێت، نابێت ئاژەڵی كۆ جیابكرێتەوە، وە نابێت ئاژەڵی جیا كۆبكرێتەوە لەترسی زەكات لێكەوتن، هەرچی بە ئاوی ئاسمان و دەریاو كانیاوەكان ئاو بدرێت یان بەڕیشكی خۆی ئاو بخواتەوە دە یەكی دەكەوێت، وە هەرچی بە ولاخی ئاوهەڵكێش ئاوبدرێ نیوەی دە یەكی دەكەوێت، لە فەرموودەكەی (عَاصِم) و (حَارِث)دا (زەكات دەركردن بۆ هەموو ساڵێكە). زوهەیر وتی: وا ئەزانم ئەبو ئیسحاق وتی: لەهەموو ساڵێكدا جارێكە. لە فەرموودەكەی (عَاصِم)دا: (لە زەكاتی وشتردا ئەگەر بەچكە وشتری مێینەی تەمەن یەك ساڵ و بەچكە وشتری نێرینەی تەمەن دوو ساڵ نەبوو ئەوە لەجیاتیاندا دە درهەم یان دوو شەك دەدرێت).

١٥٧٣ - (صحيح) عَنْ عَلِيّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِبَعْضِ أَوَّلِ هَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: (فَإِذَا كَانَتْ لَكَ مِائَتَا دِرْهَمٍ وَحَالَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ فَفِيهَا خَمْسَةُ دَرَاهِمَ، وَلَيْسَ عَلَيْكَ شَيْءٌ - يَعْنِي فِي الذَّهَبِ - حَتَّى يَكُونَ لَكَ عِشْرُونَ دِينَارًا، فَإِذَا كَانَ لَكَ عِشْرُونَ دِينَارًا وَحَالَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ فَفِيهَا نِصْفُ دِينَارٍ، فَمَا زَادَ فَبِحِسَابِ ذَلِكَ). قَالَ: فَلاَ أَدْرِي أَعَلِيٌّ يَقُولُ: (فَبِحِسَابِ ذَلِكَ). أَوْ رَفَعَهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ (وَلَيْسَ فِي مَالٍ زَكَاةٌ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ).، إِلاَّ أَنَّ جَرِيرًا - قَالَ ابْنُ وَهْبٍ - يَزِيدُ فِي الْحَدِيثِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَيْسَ فِي مَالٍ زَكَاةٌ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ).

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەرتای بەشێ لەم فەرموودەدا، فەرمووی: (ئەگەر دوو سەد درهەمت هەبوو ساڵی بەسەردا تێپەڕی ئەوە پێنج درهەم زەكاتی لێ دەكەوێت، هیچت لەسەر نیە – واتە لە ئاڵتون – هەتا نەگاتە بیست دینار – مسقاڵ –ت نەبێ، واتە ئاڵتون هەتا نەگاتە بیست مسقاڵ زەكاتی لێ ناكەوێت، جا ئەگەر بیست دینار – مسقاڵ –ت هەبوو ساڵی بەسەردا تێپەڕی ئەوە نیو دینار – نیو مسقاڵ – زەكاتی لێ دەكەوێت، ئەگەر زیاتر بوو هەر بەم شێوە حساب دەكرێت). ڕاوی فەرموودەكە ئەبو ئیسحاق وتی: ئیتر نازانم پێشەوا عەلی

وتی: (فَبِحِسَابِ ذَلِكَ). یان بەرزیکردەوە بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم؟ (هیچ ماڵ و سامانێ زەکاتی لێ ناکەوێت هەتا ساڵی بەسەردا تێپەڕ نەبێ). - راوی فەرمودەکە ئیبنو وەهەب وتی: جەریر راوی فەرمودەکە ئەمەی بۆ زیاد کرد، بەرزی کردەوە بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم: (هیچ ماڵ و سامانێ زەکاتی لێ ناکەوێت هەتا ساڵی بەسەردا تێپەڕ نەبێ).

**١٥٧٤ - (صحيح). عَنْ عَلِيّ عَلَيْهِ السَّلاَمُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (قَدْ عَفَوْتُ عَنِ الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ، فَهَاتُوا صَدَقَةَ الرِّقَةِ مِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ دِرْهَمًا دِرْهَمٌ، وَلَيْسَ فِي تِسْعِينَ وَمِائَةٍ شَيْءٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ مِائَتَيْنِ فَفِيهَا خَمْسَةُ دَرَاهِمَ).**

واتە: پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (لەزەکاتی ئەسپ و بەندەکانتان بوراوم، ئێوەش زەکاتی زیو بدەن لەچل درهەم درهەمێك، لە سەدو نەوەد درهەمدا هیچ زەکات نیە، جا کاتێ کە گەیشتە دوو سەد درهەم ئەوە پێنج درهەم زەکاتی لێ دەکەوێت).

- (خطابي) دەڵێ: ئەسپ ئەگەر بۆ سواری و خزمەتکردن بوو بەندەش بۆ خزمەتکردن بوو ئەوە زەکاتیان ناکەوێت، بەڵام ئەگەر بۆ بازرگانی بوون ئەوە زەکاتی نرخەکەیان دەدرێت، زانایان رایان جیاوازە لەسەر زەکاتی ئەسپ زۆربەی شەرع ناسان رایان وایە زەکاتی ئەسپ نادرێت، بەڵام حەمادی کوڕی سولەیمان دەڵێ: زەکاتی ئەسپ دەردرێت[١] - .

[١] - عون المعبود شرح سنن أبي داود لمحمد آبادي.

١٥٧٥ - (حسن) عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (فِي كُلِّ سَائِمَةِ إِبِلٍ: فِي أَرْبَعِينَ بِنْتُ لَبُونٍ، وَلاَ يُفَرَّقُ إِبِلٌ عَنْ حِسَابِهَا، مَنْ أَعْطَاهَا مُؤْتَجِرًا - قَالَ ابْنُ الْعَلاَءِ: مُؤْتَجِرًا بِهَا - ، فَلَهُ أَجْرُهَا، وَمَنْ مَنَعَهَا فَإِنَّا آخِذُوهَا وَشَطْرَ مَالِهِ، عَزْمَةً مِنْ عَزَمَاتِ رَبِّنَا عَزَّ وَجَلَّ، لَيْسَ لآلِ مُحَمَّدٍ مِنْهَا شَيْءٌ).

واتە: لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەموو ئەو وشترانەی کە خۆیان کە لەدەشت و دەر بۆ خۆیان دەلەوەڕێن لە چل سەر بەچکە وشترێکی مێینەی تەمەن دوو ساڵ زەکاتیان لێ دەکەوێت، ئەگەر وشترەکان هی دوو کەس بوون تێکەڵ بوون نابێ جیابکرێنەوە لەترسی زەکات، هەرکەس زەکاتەکەی بۆ پاداشت بدات ئەوە بە پاداشتی خۆی دەگات — راوی فەرمودەکە (ابنُ العَلاءِ) لە جیاتی (مُؤتجرًا) وتی: (مُؤتجرًا بها) - ، هەرکەسێ رێگری بکات و زەکاتی سامانەکەی نەدات ئەوە ئێمە زەکاتەکەی لێ دەسێنین لەگەڵ نیوەی ماڵ و سامانەکەی، چونکە زەکات فەرزێکە خوای گەورە و پەروەردگارمان داینـاوە حەق و مافی خۆیەتی، هیچی بۆ خانەوادە(ئال و بەیت)ی موحەممەد حەڵاڵ نیە.

١٥٧٦ - (صحيح) عَنْ مُعَاذٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا وَجَّهَهُ إِلَى الْيَمَنِ أَمَرَهُ أَنْ يَأْخُذَ مِنَ الْبَقَرِ مِنْ كُلِّ ثَلاَثِينَ: تَبِيعًا أَوْ تَبِيعَةً، وَمِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ: مُسِنَّةً، وَمِنْ كُلِّ حَالِمٍ – يَعْنِي: مُحْتَلِمًا - دِينَارًا أَوْ عِدْلَهُ مِنَ الْمَعَافِرِ ثِيَابٌ تَكُونُ بِالْيَمَنِ.

واتە: لە (مُعَاذ)ەوە هاتووە، كاتێ كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ناردى بۆ يەمەن فەرمانى پێ كرد: لەهەموو سى سەر مانگايە گوێرەكەيەكى يەك ساڵەى نێر يان مێ زەكات وەربگرێ، وە لەهەموو چل سەر مانگايە نێونێكى دوو ساڵ وەربگرێ، وە لەهەموو باڵغێكى – نێرى (أهل الذمة) - دينارێ سەرانە(جزيە) وەربگرێ، يان بە ئەندازەى ئەو دينارە جل و بەرگى(معافِر) وەربگرێ. - المعافر: هۆزێكە لە يەمەن - .

- ئەم سەرانە(جزيە) لە گاور و جولەكە دەسەنرێت، كاتێ كە موسوڵمانان ولاتێكيان رزگار كرد نەجەنگن لە گەڵ سوپاى ئيسلامداو، لەسەر دينى خۆيان بمێننەوە، ئەو كاتە سەرانە(جزيە)يان لێ دەسەنرێت لەبرێتى پاراستنى سەر و ماڵيان لەلايەن موشسوڵمانانەوە، برەكەشى دينارێكە بۆ هەر باڵغێكى نێر[١] - .

١٥٧٧ - (صحيح). عَنْ مُعَاذٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ.

واتە: (مُعَاذ) بە هەمان شێوە فەرمودەى پێشوى گێڕايەوە، لە پێغەمبەرى خواوە صلى الله عليه وسلم.

---

[١]- شرح سنن أبي داود لعبد المحسن العباد.

١٥٧٨ - (صحيح). عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ قَالَ: بَعَثَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْيَمَنِ، فَذَكَرَ مِثْلَهُ، لَمْ يَذْكُرْ ثِيَابًا تَكُونُ بِالْيَمَنِ. وَلاَ ذَكَرَ: (يَعْنِي: مُحْتَلِمًا).

واتە: لە (مُعَاذ)ی کوڕی جەبەلەوە هاتووە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ناردی بۆ یەمەن، راوی بە هەمان شێوە فەرموودەی پێشوی گێڕایەوە، بەڵام باسی ئەو جل و بەرگەی نەکرد کە لە یەمەن هەبووە بەناوی (معافير)ەوە، هەروەها باسی (يَعْنِي: مُحْتَلِمًا)یشی نەکرد.

١٥٧٩ - (حسن) عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ قَالَ: سِرْتُ - أَوْ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَنْ سَارَ - مَعَ مُصَدِّقِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإِذَا فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَنْ لاَ تَأْخُذْ مِنْ رَاضِعِ لَبَنٍ، وَلاَ تَجْمَعْ بَيْنَ مُفْتَرِقٍ، وَلاَ تُفَرِّقْ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ). وَكَانَ إِنَّمَا يَأْتِي الْمِيَاهَ حِينَ تَرِدُ الْغَنَمُ، فَيَقُولُ: أَدُّوا صَدَقَاتِ أَمْوَالِكُمْ، قَالَ: فَعَمَدَ رَجُلٌ مِنْهُمْ إِلَى نَاقَةٍ كَوْمَاءَ – قَالَ: قُلْتُ: يَا أَبَا صَالِحٍ مَا الْكَوْمَاءُ قَالَ عَظِيمَةُ السَّنَامِ – قَالَ: فَأَبَى أَنْ يَقْبَلَهَا، قَالَ: إِنِّي أُحِبُّ أَنْ تَأْخُذَ خَيْرَ إِبِلِي، قَالَ: فَأَبَى أَنْ يَقْبَلَهَا، قَالَ: فَخَطَمَ لَهُ أُخْرَى دُونَهَا فَأَبَى أَنْ يَقْبَلَهَا،

ثُمَّ خَطَمَ لَهُ أُخْرَى دُونَهَا فَقَبِلَهَا، وَقَالَ: إِنِّي آخِذُهَا وَأَخَافُ أَنْ يَجِدَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يَقُولُ: عَمَدْتَ إِلَى رَجُلٍ فَتَخَيَّرْتَ عَلَيْهِ إِبِلَهُ!. قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَرَوَاهُ هُشَيْمٌ عَنْ هِلاَلِ بْنِ خَبَّابٍ، نَحْوَهُ إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: (لاَ يُفَرِّقْ).

واتە: سوەیدی کوڕی غەفەلە دەڵێت: لە خزمەت – یان وتی ئەوەی لە خزمەت - زەکات کۆکەرەوەی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم بوو پێی وتم: لێرەدا مەبەست لەوشەی: (عهد) نوسراوەکەی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم کە باسی ئەحکامی زەکاتی تێدا بوو هاتووە: (زەکات لە ئاژەڵی شیر خۆر – یان شیردەر - وەرناگرین ، نابێت ئاژەڵی کۆ جیابکرێتەوە، وە نابێت ئاژەڵی جیاش کۆبکرێتەوە لەترسی زەکات لێکەوتن). زەکات وەرگر ئەهات بۆ سەر ئەو کانی و ئاوانەی کە خەڵکەکە مەڕو ماڵاتیان لێ ئاودەدا، کاتێ کە ئاژەڵەکانیان دەهێنا بە خاوەنەکانیانی دەوت: زەکاتی مەڕو ماڵاتەکەتان بدەن، پیاوێ وشترێکی قەڵەوی هێنا بەرزی سەر پشتی(کۆپارە)کەی بەرز بوو، سوەید یان ئەوەی لەخزمەت زەکات کۆکەرەوەکەدا بوو وتی: وتم بە راوی فەرموودەکە مەیسەرە: ئەی ئەبا (صالح) وشەی (کَوْمَاء) یانی چی؟ وتی: واتە کۆپارە بەرز، سوەید یان ئەوەی لەخزمەت زەکات کۆکەرەوەکەدا بوو وتی: زەکات کۆکەرەوەکە ئەو وشترەی وەرنەگرت، خاوەن وشترەکە وتی: من دەمەوێت لە چاکترین وشتری خۆم بدەم لە زەکاتدا، وتی: هەر وەری نەگرت – چونکە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم رێگری لێ کردبوو لەچاکترینی ماڵ وەربگرێت - ، راوی وتی: پیاوەکە چوو رەشمەی وشترێکی تری گرت نرخی لەو کەمتر بوو

هێنای ئەویشی هەر وەرنەگرت، جا ڕۆشت یەكێكی تری هێنا نرخی لەو كەمتر بوو زەكات كۆكەرەوەكە وەریگرت و وتی: من وەریدەگرم بەڵام ئەترسم پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لێم توڕە ببێ و پێم بفەرموێت: ئەوەندە یەخەی كابرات گرت هەتا چاكترین وشتری خۆی هێنا بۆت تۆش وەرتگرت.
ئەبو داود دەڵێت: هەشیم لە هیلالی كوڕی خەبابەوە بە هەمان شێوە فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە، تەنها ئەوەندە نەبێت كە لە جیاتی وشەی: (لاَ تُفَرِّقْ) وتی: (لاَ يُفَرِّقْ). - واتە بە (صيغة النائب المجهول) بەڵام لە ریوایەتی یەكەمدا بە (صيغة الحاضر المعروف) هاتووە. خوا خۆی دەیزانێ - .

**١٥٨٠ - (حسن) عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ قَالَ: أَتَانَا مُصَدِّقُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخَذْتُ بِيَدِهِ، وَقَرَأْتُ فِي عَهْدِهِ: (لاَ يُجْمَعُ بَيْنَ مُفْتَرِقٍ، وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ، خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ). وَلَمْ يَذْكُرْ: (رَاضِعَ لَبَنٍ).**

واتە: سوەیدی كوڕی غەفەلە دەڵێت: زەكات كۆكەرەوەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هات بۆ ناومان ئەو نوسراوەی كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی كردبو بە نوسینی لەدەستیم وەرگرت و خوێندمەوە، لە نوسراوەكەدا هاتبوو: (نابێت ئاژەڵی كۆ جیابكرێتەوە، وە نابێت ئاژەڵی جیاش كۆبكرێتەوە لەترسی زەكات لێكەوتن). بەڵام باسی حوكمی زەكاتی ئاژەڵی (شیردەر - یان شیرە خۆری - ) نەكرد.

١٥٨١ - (ضعيف) عَن مُسْلِمِ بْن شُعْبَةَ قَالَ: اسْتَعْمَلَ نَافِعُ بْنُ عَلْقَمَةَ أَبِي عَلَى عِرَافَةِ قَوْمِهِ، فَأَمَرَهُ أَنْ يُصَدِّقَهُمْ، قَالَ: فَبَعَثَنِي أَبِي فِي طَائِفَةٍ مِنْهُمْ، فَأَتَيْتُ شَيْخًا كَبِيرًا يُقَالُ لَهُ: سَعْرُ بْنُ دَيْسَمٍ، فَقُلْتُ: إِنَّ أَبِي بَعَثَنِي إِلَيْكَ – يَعْنِي: لأُصَدِّقَكَ – قَالَ: ابْنَ أَخِي، وَأَيَّ نَحْوٍ تَأْخُذُونَ؟ قُلْتُ: نَخْتَارُ، حَتَّى إِنَّا نَتَبَيَّنُ ضُرُوعَ الْغَنَمِ، قَالَ: ابْنَ أَخِي فَإِنِّي أُحَدِّثُكَ: أَنِّي كُنْتُ فِي شِعْبٍ مِنْ هَذِهِ الشِّعَابِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَنَمٍ لِي، فَجَاءَنِي رَجُلاَنِ عَلَى بَعِيرٍ، فَقَالاَ لِي: إِنَّا رَسُولاَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْكَ لِتُؤَدِّيَ صَدَقَةَ غَنَمِكَ، فَقُلْتُ: مَا عَلَيَّ فِيهَا، فَقَالاَ: شَاةٌ، فَأَعْمِدُ إِلَى شَاةٍ قَدْ عَرَفْتُ مَكَانَهَا مُمْتَلِئَةً مَحْضًا وَشَحْمًا، فَأَخْرَجْتُهَا إِلَيْهِمَا، فَقَالاَ هَذِهِ شَاةُ الشَّافِعِ! وَقَدْ نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نَأْخُذَ شَافِعًا، قُلْتُ: فَأَيَّ شَيْءٍ تَأْخُذَانِ؟ قَالاَ: عَنَاقًا: جَذَعَةً، أَوْ ثَنِيَّةً، قَالَ فَأَعْمِدُ إِلَى عَنَاقٍ مُعْتَاطٍ - وَالْمُعْتَاطُ الَّتِي لَمْ تَلِدْ وَلَدًا، وَقَدْ حَانَ وِلاَدُهَا - فَأَخْرَجْتُهَا إِلَيْهِمَا، فَقَالاَ: نَاوِلْنَاهَا، فَجَعَلاَهَا مَعَهُمَا عَلَى بَعِيرِهِمَا، ثُمَّ انْطَلَقَا.

واتە: موسلیمی کوڕی شوعبە دەڵێت: نافعی کوڕی عەلقەمە باوکمی کرد بە بەرپرسی هۆزەکەی و فەرمانی پێ کرد زەکەتەکەیان لێ وەربگرێت، موسلیم وتی: جا باوکم منی نارد بۆ لای کۆمەڵێکیان، چووم بۆ لای پیاوێکی پیریان بەناوی: سەعری کوڕی دەیسەم پێم وت: باوکم ناردومی بۆلات — واتە بۆ ئەوەی زەکاتی ماڵ سامانەکەت لێ وەربگرم — وتی: ئەی کوڕی برام لە چ جۆرێ وەردەگرن؟ وتم: لە باشترین جۆری وەردەگرین سەرنج دەدەین بزانین کامەیان قەڵەوەو شیری زۆرە، سەعر وتی: عەرزی برازای خۆشەویستی خۆم بکەم: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیە وسلم لەشیوێ لەم شیوانەدا بەلای کۆمەڵێ مەڕو ماڵاتی خۆمەوە بووم، دوو پیاو بەسواری وشتر هاتن بۆلام وتیان: ئێمە نێردراوی پێغەمبەری خوادین صلی الله علیە وسلم ناردوینی بۆ لای تۆ بۆ ئەوەی زەکاتی مەڕو ماڵاتەکەتمان بدەیتێ، وتم: چەند سەرم لەسەر واجبە کە بیدەم؟ وتیان: (شاة)ێ واتە بەرخێ کە تەمەنی یەك ساڵ بێت، یان بەچکەی بزنێ کە دوو ساڵی تەواو کردبێت، چووم (شاة)ێکم بۆم هێنان قەڵەو شیری زۆر بوو خۆم دەمزانی لەناو مەڕو ماڵاتەکەدا چەند چاکە، وتیان ئەوە بەچکەی هەیەو شیردەدات، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم رێگری لێ کردوین کە شیردەر وەبگرین، وتم: ئەی لە چ جۆرێ وەردەگرن؟ وتیان: کارە مێینەیە کە ساڵێکی تەواو نەکردبێت، یان بەچکەی بزنێ کە ساڵێکی تەواو کردبێت، یا بەرخێکی شەش مانگ، منیش بەچکە بزنێکی قسرم بۆ هێنان ئەوەی کە نازێت، بۆم بەرزکردنەوەو دامە دەستیان چونکە ئەوان سوار بوون، لەپاشدا بردیان و رۆشتن.

١٥٨٢ - (ضعيف) عَن رَوْحٌ حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ بْنُ إِسْحَاقَ، بِإِسْنَادِهِ بِهَـذَا الْحَدِيثِ: قَالَ: مُسْلِمُ بْنُ شُعْبَةَ. قَـالَ فِيـهِ: وَالشَّـافِعُ: الَّتِى فِى بَطْنِهَا الْوَلَدُ.

واتـە: رەوح فـەرمودەی پێشـوی گێڕایـەوە، بـە هـەمان سـەنەدی (زكَرِیَـاء)ی كـوڕی ئیسـحاق، روح لـە فەرمودەكەیـدا وتـی: موسـلیمی كـوڕی شـوعبە وتـی: (زكَرِیَاء) لە فەرمودەكەیدا وتی: (شَّـافِع) ئەوەیـە كـە ئـاوس بێـت واتـە بەچـكە لەسكیدا بێت.

١٥٨٣ - (ضعيف). عَنْ عَبْـدِ اللَّـهِ بْـنِ مُعَاوِيَـةَ الْغَاضِـرِيِّ - مِـنْ غَاضِرَةِ قَيْسٍ – قَالَ: قَـالَ النَّبِـىُّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ: (ثَلاَثٌ مَنْ فَعَلَهُنَّ فَقَدْ طَعِمَ طَعْمَ الإِيمَانِ: مَـنْ عَبَدَ اللَّهَ وَحْدَهُ وَأَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَعْطَى زَكَاةَ مَالِهِ طَيِّبَةً بِهَا نَفْسُهُ، رَافِـدَةً عَلَيْـهِ كُـلَّ عَـامٍ، وَلاَ يُعْطِـى الْهَرِمَـةَ، وَلاَ الدَّرِنَـةَ، وَلاَ الْمَرِيضَـةَ، وَلاَ الشَّـرَطَ اللَّئِيمَةَ، وَلَكِنْ مِـنْ وَسَـطِ أَمْـوَالِكُمْ، فَـإِنَّ اللَّـهَ لَـمْ يَسْأَلْكُمْ خَيْرَهُ، وَلَمْ يَأْمُرْكُمْ بِشَرِّهِ).

واتـە: لـە (عَبـدُ اللـە)ی كـوڕی (غَاضِـرِیَ)یـەوە – لـە (غَاضِـرِیَ) قـەیس – دەگێڕنەوە، كە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـه وسـلم فەرمویـەتی: (سێ شت هەن هەركەس بیانكات تامی ئیمانی چەشتووە: كەسێك بە تەنیا خوا

بپەرستێت، شاهیدی بدات جگە لەو هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە، وە زەکاتی ماڵ و سامانەکەی بەدڵێکی فراوانەوە بدات، هەموو ساڵێك یارمەتی بەخشینەکەی بدات - چونکە بەو بەخشینە زیات دەکات و بەرەکەتی تێ دەکەوێت - ، ئاژەڵی پیر و گەرِۆڵ و نەخۆش و خراپ و شیرنەدەر و هیچ لەبارا نەبوو نەدات بە زەکات، بەڵکو لە مام ناوەندی ماڵ و سامانەکەتان بدەن. چونکە خوای گەورە داوای لێ نەکردون کە چاکترینی ماڵ و سامانەکەتان بدەن، وە داوایشی لێ نەکردون کە خراپترینی ماڵەکەتان بدەن).

١٥٨٤ - (حسن) عَنْ أُبَىِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: بَعَثَنِى النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُصَدِّقًا فَمَرَرْتُ بِرَجُلٍ، فَلَمَّا جَمَعَ لِى مَالَهُ لَمْ أَجِدْ عَلَيْهِ فِيهِ إِلاَّ ابْنَةَ مَخَاضٍ، فَقُلْتُ لَهُ: أَدِّ ابْنَةَ مَخَاضٍ فَإِنَّهَا صَدَقَتُكَ، فَقَالَ: ذَاكَ مَا لاَ لَبَنَ فِيهِ وَلاَ ظَهْرَ، وَلَكِنْ هَذِهِ نَاقَةٌ فَتِيَّةٌ عَظِيمَةٌ سَمِينَةٌ فَخُذْهَا، فَقُلْتُ لَهُ: مَا أَنَا بِآخِذٍ مَا لَمْ أُومَرْ بِهِ، وَهَذَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْكَ قَرِيبٌ، فَإِنْ أَحْبَبْتَ أَنْ تَأْتِيَهُ فَتَعْرِضَ عَلَيْهِ مَا عَرَضْتَ عَلَىَّ فَافْعَلْ، فَإِنْ قَبِلَهُ مِنْكَ قَبِلْتُهُ وَإِنْ رَدَّهُ عَلَيْكَ رَدَدْتُهُ، قَالَ: فَإِنِّى فَاعِلٌ. فَخَرَجَ مَعِى، وَخَرَجَ بِالنَّاقَةِ الَّتِى عَرَضَ عَلَىَّ، حَتَّى قَدِمْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ لَهُ: يَا نَبِىَّ اللَّهِ، أَتَانِى رَسُولُكَ لِيَأْخُذَ مِنِّى

صَدَقَةَ مَالِي وَايْمُ اللَّهِ، مَا قَامَ فِي مَالِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلاَ رَسُولُهُ قَطُّ قَبْلَهُ، فَجَمَعْتُ لَهُ مَالِي فَزَعَمَ أَنَّ مَا عَلَيَّ فِيهِ ابْنَةُ مَخَاضٍ، وَذَلِكَ مَا لاَ لَبَنَ فِيهِ وَلاَ ظَهْرَ، وَقَدْ عَرَضْتُ عَلَيْهِ نَاقَةً فَتِيَّةً عَظِيمَةً لِيَأْخُذَهَا، فَأَبَى عَلَيَّ، وَهَا هِيَ ذِهِ، قَدْ جِئْتُكَ بِهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، خُذْهَا، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ذَاكَ الَّذِي عَلَيْكَ، فَإِنْ تَطَوَّعْتَ بِخَيْرٍ آجَرَكَ اللَّهُ فِيهِ، وَقَبِلْنَاهُ مِنْكَ). قَالَ: فَهَا هِيَ ذِهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ جِئْتُكَ بِهَا فَخُذْهَا، قَالَ: فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقَبْضِهَا، وَدَعَا لَهُ فِي مَالِهِ بِالْبَرَكَةِ.

واتە: ئوبەی كوڕی كەعب دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناردمی بۆ زەكات كۆكردنەوە، دام بەلای پیاوێكدا جەڵەبێ وشتری هەبوو، وشترەكانی كۆكردەوە، سەرنجمدا نەمدی لە بەچكە وشترێكی مێینەی یەك ساڵ زیاتر زەكاتی لەسەر واجب بێت، پێم وت: بەچكە وشترێكی مێینەی یەك ساڵ بدە ئەوە زەكاتەكەتە، وتی: ئەوە سودی نیە نە شیر دەدات نە بە كەڵكی سواریش دێت، بەڵام ئەوە وشترێكی تازە پێگەیشتووی گەورەو قەڵەو و بەهێزە سودی لێ دەبینرێت ئەوە ببە، پێم وت: من ئەمە نابەم بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەتا خۆی فەرمانم پێ نەكات، ئەوە پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم لێتەوە نزیكە، ئەگەر حەز دەكەیت بڕۆ بۆ لای ئەوەی كە

نیشانی منت دا نیشانی ئەویش بدە، ئەگەر قبوڵی كرد ئەوە منیش لێت وەردەگرم، ئەگەر رەدی كردەوە ئەوە منیش وەری ناگرم، وتی: باشە وادەكەم، لەتەكما هات بۆ لای پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم ئەو وشترەشی هێنا كە نیشانی منی دا، رۆشتین هەتا گەیشتینە خزمەت پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم! نێردراوەكەت هات بۆلام بۆ ئەوەی زەكاتی ماڵ و سامانەكەم لێ وەربگرێت، پیاوەكە سوێندی خوارد كە نە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم و نە نێردراوەكە پێشتر نەهاتوون زەكات لە ماڵی من بەرن هەتا ئێستا، ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم! ماڵەكەم بۆ زەكات وەرگرەكە كۆكردەوە، پێی وابوو كە بەچكە وشترێكی مێینەی یەك ساڵە زەكاتم دەكەوێت، كە نە شیر دەدات نە بە كەڵكی سواریش دێت، وشترێكی لاوی گەورەو قەڵەو و بەهێزم نیشاندا بۆ ئەوەی بیبات وەری نەگرت، ئا ئەوەیە هێناومە بۆت ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم وەریبگرە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم پێی فەرموو: ( تۆ تەنیا ئەوەندەت لەسەر واجبە، ئەگەر زیاتر دەدەیت خوای گەورە پاداشتت بەخێر دەداتەوەو، ئێمەش لێت وەردەگرین). وتی: ئا ئەوەیە ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم هێناومە بۆت وەری بگرە، ئوبەی كوڕی كەعب وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمانی كرد بە وەرگرتنی، دوعای خێری بۆ كرد كە بەرەكەت بكەوێتە ماڵ و سامانەكەیەوە.

١٥٨٤ - (صحيح) [١] عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ مُعَاذًا إِلَى الْيَمَنِ، فَقَالَ: (إِنَّكَ تَأْتِي قَوْمًا أَهْلَ كِتَابٍ، فَادْعُهُمْ إِلَى شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ لِذَلِكَ، فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ لِذَلِكَ، فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً فِي أَمْوَالِهِمْ، تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ وَتُرَدُّ فِي فُقَرَائِهِمْ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ لِذَلِكَ، فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ فَإِنَّهَا لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم (معاذ)ی نارد بۆ یەمەن فەرمووی: (ئەوا تۆ دەچیت بۆ ناو گەلێك کە خاوەنی نامەی ئاسمانین، بانگیان بکە شایەتی بدەن: کە هیچ پەرستراوێك نیە بەحەق جگە لە (الله)، وە شایەتی بدەن کە من نێردراوی خوام، جا ئەگەر بەگوێیان کردی، لەپاشدا پێیان بڵێ: خوای گەورە لەهەموو شەو و رۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر فەرزکردون، جا ئەگەر ئەمەشیان بەگوێ کردی، پێیان بڵێ: کە خوای گەورە فەرزی کردوە لەسەریان زەکاتی سامان و داراییان دەربکەن، ئەویش لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێ و

[١] - لە کتێبی (سنن أبی داود)دا بە هەمان شێوە هاتووە بۆیە ئێمەش وەك خۆی هەمان رەقەممان بۆ دانا.

دەدرێتەوە بە هەژارو نەدارەکانیان، جا ئەگەر ئەمەشیان بەگوێ کردی، نەکەی نایاب ترینی سامانەکانیان هەڵبژێری لەجیاتی زەکات، خۆت بپارێزە لە دوعاو ئاهو نزولەی ستەم لێ کراو چونکە لەنێوان خوای گەورەو ئاهو نزولەی ستەم لێ کراودا پەردە نیە).

**١٥٨٥ - (حسن) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الْمُعْتَدِي فِي الصَّدَقَةِ كَمَانِعِهَا).**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەو زەکات وەرگرەی کە زیاد لە ئەندازە زەکاتی واجب وەردەگرێت وەك ئەو خاوەن ماڵ و سامانە گوناهبارە کە زەکات نادات). — (المُعتدِی) ئەومیە زەکاتەکەی بداتە بە کەسانێ کە شایستە نەبن، دەڵێن: ئەگەر زەکات وەرگر لەچاکترینی ماڵ و سامانەکەی وەرگرت لەوانەیە ساڵی ئایندە نەیدات، ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە خاوەن ماڵ و سامان زەکاتەکەی نەدات ئەوکاتە هەردوکیان وەك یەك تاوانبار دەبن[1] - .

---

[1]-٢ عون المعبود شرح سنن أبي داود لمحمد آبادي.

## باسی رەزامەندی زەكات وەرگر.

## ٥ - باب رِضَا الْمُصَدِّقِ.

١٥٨٦ - (ضعيف) عَنْ بَشِيرِ بْنِ الْخَصَاصِيَةِ، قَالَ ابْنُ عُبَيْدٍ فِي حَدِيثِهِ: وَمَا كَانَ اسْمُهُ بَشِيرًا وَلَكِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَمَّاهُ بَشِيرًا، قَالَ: قُلْنَا: إِنَّ أَهْلَ الصَّدَقَةِ يَعْتَدُونَ عَلَيْنَا، أَفَنَكْتُمُ مِنْ أَمْوَالِنَا بِقَدْرِ مَا يَعْتَدُونَ عَلَيْنَا؟ فَقَالَ: (لاَ).

واتە: لە بەشیری كوڕی (خَصَاصِيَة)وە هاتووە - ئیبنو عوبەید لە فەرمودەكەیدا وتی: ناوی بەشیر نەبوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ناوی گۆڕی و ناوی نا بەشیر- راوی وتی: وتمان بە بەشیر: ئەوانەی كە زەكات وەردەگرن زوڵم و ستەممان لێ دەكەن: زیاد لەو ئەندازەمان لێ وەردەگرن كە واجبە لەسەرمان، ئایا بە ئەندازەی ئەو زیادەیەی كە لێمانی وەردەگرن لە ماڵ و سامانەكەمان نەشارینەوە؟ وتی: نەخێر. - (عبد الملك) دەڵێت: بۆیە روخسەتی نەدان چونكە شاردنەوەی هەندێ لە ماڵ و سامان (خيانة) ناپاكی و فرِوفێڵە، هەروەها ئەگەر روخسەتی پێ بدانایە لەوانەیە هەندێكیان لەو زەكات وەرگرانەش بیانشاردایەتەوە كە زوڵم و ستەم ناكەن[٢]-.

١٥٨٧ - (ضعيف) عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ أَيُّوبَ، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَصْحَابَ الصَّدَقَةِ يَعْتَدُونَ.

واتە: لە مەعمەرەوە، لە ئەیوبەوە، فەرمودەی پێشو بەهەمان سەنەدو مانا هاتووە، تەنها ئەوەندە نەبێت كە مەعمەر وتی: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەوانەی كە زەكات وەردەگرن زوڵم و ستەممان لێ دەكەن زیاد لە ئەندازەی ئەو زەكاتەی كە واجبە لەسەرمان لێمانی وەردەگرن.

| |
|---|
| ١٥٨٨ - (ضعيف) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ جَابِرِ بْنِ عَتِيكٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (سَيَأْتِيكُمْ رَكْبٌ مُبَغَّضُونَ، فَإِذَا جَاءُوكُمْ فَرَحِّبُوا بِهِمْ، وَخَلُّوا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَبْتَغُونَ، فَإِنْ عَدَلُوا فَلأَنْفُسِهِمْ، وَإِنْ ظَلَمُوا فَعَلَيْهَا، وَأَرْضُوهُمْ، فَإِنَّ تَمَامَ زَكَاتِكُمْ رِضَاهُمْ، وَلْيَدْعُوا لَكُمْ). |

واتە: لە (عَبدُ الرَحمَن)ی كوڕی جابری كوڕی عەتیكەوە، لە باوكیەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (پێڕێ سوارەی ڕەزاگران دێنە لاتان، مەبەست لە زەكات وەرگرەكانە - بە تەبیعەت ڕەزاگرانن لەبەرچاویان نەك شەرعەن چونكە خۆشەویستی دڵەكانیان دەبەن - ، جا كاتێ كە هاتن دڵخۆش بن بە هاتنیان و بە خۆشی و شادیەوە پێشوازییان لێ بكەن، وازیان لێ بهێنن چیان داواكرد بیان دەنێ و ڕێگریان لێ مەكەن، ئەگەر دادپەروەر بوون ئەوە پاداشتەكەی بۆ خۆیانە، وە ئەگەر زوڵم و ستەمیشیان كرد گوناهیان لە ئەستۆی خۆیانە، ڕازییان بكەن، زەكاتیان بەتەواوی بدەنێ چونكە ئەوە دەبێتە هۆی ڕەزامەندییان و دوعای خێریشتان بۆ دەكەن).

١٥٨٩ - (صحيح) عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: جَاءَ نَاسٌ - يَعْنِي مِنَ الأَعْرَابِ - إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالُوا: إِنَّ نَاسًا مِنَ الْمُصَدِّقِينَ يَأْتُونَا فَيَظْلِمُونَا، قَالَ: فَقَالَ: (أَرْضُوا مُصَدِّقِيكُمْ). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَإِنْ ظَلَمُونَا؟ قَالَ: (أَرْضُوا مُصَدِّقِيكُمْ). زَادَ عُثْمَانُ: (وَإِنْ ظُلِمْتُمْ). قَالَ أَبُو كَامِلٍ فِي حَدِيثِهِ: قَالَ جَرِيرٌ: مَا صَدَرَ عَنِّي مُصَدِّقٌ بَعْدَ مَا سَمِعْتُ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلاَّ وَهُوَ عَنِّي رَاضٍ.

واتە: جەریری کوڕی (عَبدُ الله) دەڵێت: خەڵك هاتن — واتە لە عەرەبە دەشتەکیەکان — بۆ لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سکاڵایان کردو وتیان: هەندێ لەزەکات وەرگرەکان کاتێ کە دێنە لامان بۆ زەکات وەرگرتن زوڵم و ستەممان لێ دەکەن، راوی وتی: فەرمووی: (زەکات وەرگرەکانتان رازی بکەن). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەگەر زوڵم و ستەمیشمان لێ بکەن؟ فەرمووی: (زەکات وەرگرەکانتان رازی بکەن). راوی فەرمودەکە (عُثمَان) ئەمەی بۆ زیاد کرد: (ئەگەر زوڵم و ستەمیشیان لێ کردن). جەریر وتی: لەوەتەی ئەم فەرمودەم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بیستووە هیچ زەکات وەرگرێکم بەڕێ نەکردوە لێم ناڕازی بێت.

## باسی پاڕانەوه زەكات وەرگر بۆ ئەو خاوەن ماڵ و سامانانەی كە زەكاتەكەیان دەردەكەن.

## ٦ - باب دُعَاءِ الْمُصَدِّقِ لأَهْلِ الصَّدَقَةِ.

١٥٩٠ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِى أَوْفَى قَالَ: كَانَ أَبِى مِنْ أَصْحَابِ الشَّجَرَةِ، وَكَانَ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَتَاهُ قَوْمٌ بِصَدَقَتِهِمْ، قَالَ: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ فُلاَنٍ). قَالَ فَأَتَاهُ أَبِى بِصَدَقَتِهِ، فَقَالَ: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِى أَوْفَى).

واتە: (عَبْدُ الله)ی كوڕی ئەبی ئەوفا كە یەكێ بوو لە (أصْحَابِ الشَّجَرَةِ) ئەو یارانەی كە لەژێر درەختی (رضوان)دا پەیمانیان دا بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، دەڵێت: كاتێ كە هۆزێك دەهاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە خۆیان و زەكاتەكانیانەوە، دەیفەرموو: (خوایە ڕەحمەتی خۆت بڕژێنە بەسەر فلانە بنەماڵەدا). (عَبْدُ الله) وتی: جارێ باوكم بە خۆی و زەكاتەكەیەوە چووە خزمەتی، فەرمووی: (خوایە ڕەحمەتی خۆت بڕژێنە بەسەر بنەماڵەی ئەبی ئەوفادا).

## باسی راڤەی تەمەنی وشتر.

## ٧ – باب تَفْسِيرِ أَسْنَانِ الإِبِلِ.

١٥٩١ - قَالَ أَبُو دَاوُدَ سَمِعْتُهُ مِنَ الرِّيَاشِيِّ، وَأَبِي حَاتِمٍ وَغَيْرِهِمَا، وَمِنْ (كِتَابِ النَّضْرِ بْنِ شُمَيْلٍ)، وَمِنْ (كِتَابِ أَبِي عُبَيْدٍ)،، وَرُبَّمَا ذَكَرَ أَحَدُهُمُ الْكَلِمَةَ، قَالُوا: يُسَمَّى الْحُوَارَ، ثُمَّ الْفَصِيلَ إِذَا فَصَلَ، ثُمَّ تَكُونُ بِنْتَ مَخَاضٍ لِسَنَةٍ إِلَى تَمَامِ سَنَتَيْنِ، فَإِذَا دَخَلَتْ فِي الثَّالِثَةِ: فَهِيَ ابْنَةُ لَبُونٍ، فَإِذَا تَمَّتْ لَهُ ثَلاَثُ سِنِينَ فَهُوَ حِقٌّ وَحِقَّةٌ، إِلَى تَمَامِ أَرْبَعِ سِنِينَ، لأَنَّهَا اسْتَحَقَّتْ أَنْ تُرْكَبَ وَيُحْمَلَ عَلَيْهَا الْفَحْلُ وَهِيَ تَلْقَحُ، وَلاَ يُلْقِحُ الذَّكَرُ حَتَّى يُثَنِّيَ، وَيُقَالُ لِلْحِقَّةِ: طَرُوقَةُ الْفَحْلِ، لأَنَّ الْفَحْلَ يَطْرُقُهَا إِلَى تَمَامِ أَرْبَعِ سِنِينَ، فَإِذَا طَعَنَتْ فِي الْخَامِسَةِ، فَهِيَ جَذَعَةٌ حَتَّى يَتِمَّ لَهَا خَمْسُ سِنِينَ، فَإِذَا دَخَلَتْ فِي السَّادِسَةِ وَأَلْقَى ثَنِيَّتَهُ، فَهُوَ حِينَئِذٍ ثَنِيٌّ حَتَّى يَسْتَكْمِلَ سِتًّا، فَإِذَا طَعَنَ فِي السَّابِعَةِ سُمِّيَ الذَّكَرُ رَبَاعِيًا، وَالأُنْثَى رَبَاعِيَةً، إِلَى تَمَامِ السَّابِعَةِ، فَإِذَا دَخَلَ فِي الثَّامِنَةِ وَأَلْقَى السِّنَّ السَّدِيسَ الَّذِي بَعْدَ

الرَّبَاعِيَةِ، فَهُوَ سَدِيسٌ وَسَدَسٌ، إِلَى تَمَامِ الثَّامِنَةِ، فَإِذَا دَخَلَ فِي التِّسْعِ وَطَلَعَ نَابُهُ فَهُوَ بَازِلٌ، أَيْ بَزَلَ نَابُهُ، يَعْنِي طَلَعَ، حَتَّى يَدْخُلَ فِي الْعَاشِرَةِ، فَهُوَ حِينَئِذٍ مُخْلِفٌ، ثُمَّ لَيْسَ لَهُ اسْمٌ، وَلَكِنْ يُقَالُ: بَازِلُ عَامٍ، وَبَازِلُ عَامَيْنِ، وَمُخْلِفُ عَامٍ، وَمُخْلِفُ عَامَيْنِ، وَمُخْلِفُ ثَلاثَةِ أَعْوَامٍ، إِلَى خَمْسِ سِنِينَ، وَالْخَلِفَةُ: الْحَامِلُ، قَالَ أَبُو حَاتِمٍ: وَالْجَذُوعَةُ وَقْتٌ مِنَ الزَّمَنِ لَيْسَ بِسِنٍّ، وَفُصُولُ الأَسْنَانِ عِنْدَ طُلُوعِ سُهَيْلٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَأَنْشَدَنَا الرِّيَاشِيُّ:

إِذَا سُهَيْلٌ أَوَّلَ اللَّيْلِ طَلَعْ
فَابْنُ اللَّبُونِ الْحِقُّ وَالْحِقُّ جَذَعْ
لَمْ يَبْقَ مِنْ أَسْنَانِهَا غَيْرُ الْهُبَعْ

وَالْهُبَعُ: الَّذِي يُولَدُ فِي غَيْرِ حِينِهِ.

ئەبو داود دەڵێت: لە ڕەیاشی ئەبو حاتیم و جگە لەوانیشم بیستووە، وە لە کتێبەکەی (نضر)ی کوڕی شومەیل، لە کتێبەکەی ئەبو عوبەیددا خوێندومەتەوە، هەندێ جار لەسەر ڕاڤەی وشەیەك هەماهەنگن، هەندێ وشەش هەیە تەنیا یەکێکیان باسی کردوە، دەڵێن: بەچکەی وشتر سەرەتای لەدایك بوونی پێی دەوترێت: (حوار)، لەپاشدا کە لەدایکی جیادەبێتەوە پێی دەوترێت: (فصیل)، ئینجا لەتەمەنی یەك ساڵیەوە هەتا دوو ساڵ تەواو دەکات

پێی دەوترێت: (بِنْتُ مَخَاض)، کە پێی نایە تەمەنی سێ ساڵیەوە پێی دەوترێت: (ابْنَةُ لَبُـونٍ)، کاتێ کە سێ ساڵی تەواو کرد ئەگەر نێر بوو پێی دەوترێت: (حِق)، ئەگەر مێ بوو پێی دەوترێت: (حِقّة)، هەتا چوار ساڵ، چونکە شایستەی ئەوەن کە بۆ سواری بەکاربێن، مێیەکەش شایستەی ئەوەیە کە کەڵ بگرێت و ئاوس ببێت، نێرەکەش ناپەڕێنرێت هەتا تەمەنی دەگاتە شەش ساڵ ئەوکاتە ئەویش پێی دەوترێت: (ثَنِیَّتَه)، بە (حِقّـة)ش دەوترێت: (طَرُوقَـةُ الْفَحْـلِ) هەتا چوار ساڵ تەواو دەکات، کاتێ کە پێی نایە تەمەنی پێنج ساڵییەوە پێی دەوترێت: (جَذَعَةً) هەتا پێنج ساڵ تەواو دەکات، کاتێ کە پێی نایە تەمەنی شەش ساڵییەوەو دوو ددانەکانی پێشەوەی لەسەر و لەخوارەوە کە پێیان دەوترێت: (ثَنِیّة) کەوتن، ئەگەر نێر بوو پێی دەوترێت: (ثَنِيّ)، ئەگەر مێ بوو پێی دەوترێت: (ثنِیَـة) هەتا شەش ساڵ تەواو دەکات، کاتێ کە پێی نایە تەمەنی حەوت ساڵییەوە ئەگەر نێر بوو پێی دەوترێت:: (رَبَاعِي)، ئەگەر مێ بوو پێی دەوترێت: (رَبَاعِیَّةً) هەتا حەوت ساڵ تەواو دەکات، کاتێ کە پێی نایە تەمەنی هەشت ساڵییەوەو ددانە شەشیەکانی کە لەدوای چواریەکانەوە دێن کەوتن ئەگەر نێر بوو پێی دەوترێت:: (ثَنِيّ)، ئەگەر مێ بوو پێی دەوترێت: (ثَنِیّـة) هەتا شەش ساڵ تەواو دەکات، کاتێ کە پێی نایە تەمەنی حەوت ساڵییەوە پێیان دەوترێت: (سدِیس) و (سدَس)، کاتێ کە پێی نایە تەمەنی نۆ ساڵییەوەو کەڵبەکانی کەوتن پێی دەوترێت: (بَازِل)، واتە کەڵبەکانی کەوتون، کاتێ کە پێی نایە تەمەنی دە ساڵییەوە ئەوە (مُخْلِف)ە، لەپاشدا ناوی نیە: بەڵام پێی دەوترێت: (بَازِل)ی یەك ساڵ، (بَـازِل)ی دوو ساڵ، (مُخْلِف)ی یەك ساڵ، (مُخْلِف)ی دوو ساڵ، (مُخْلِف)ی سێ ساڵ، هەتا پێنج ساڵ، وە (خَلِفَـةُ): ئاوسە، ئەبو حاتیم دەڵێت: (الْجَذُوعَة) کاتێکە لە زەمەن تەمەن نیە، حسابی تەمەنی وشتر لەکاتی هەڵهاتنی ئەستێرەی (سُهَیْلٍ)ەوە دەست پێ دەکات چونکە

زۆرینەی وشتر لەو کاتەدا دەزێن. ئەبو داود دەڵێت: ڕەیاشی ئەم هۆنراوەی بۆ خوێندینەوە:

إِذَا سُهَيْلٌ أَوَّلَ اللَّيْلِ طَلَعْ فَابْنُ اللَّبُونِ الْحِقُّ وَالْحِقُّ جَذَعْ

لَمْ يَبْقَ مِنْ أَسْنَانِهَا غَيْرُ الْهُبَعْ.

واتە: کە ئەستێرەی (سُهَيل) لەسەرەتای شەوەوە هەڵهات، (ابْنَ لَبُون) دەبێتە (حِق)، (حِق)یش دەبێتە (جَذَعَ) ... ، ئیتر تەمەنی وشتر نامێنێت بە دیاری نەکراوی جگە لە (هُبَعْ). (هُبَعْ)یش ئەوەیە لەکاتی دیاری نەکراودا لەدایك دەبێت.

## باسی زەکات وەرگر لە چ شوێنێ زەکات وەردەگرێت.

## ٨ - باب أَيْنَ تُصَدَّقُ الأَمْوَالُ.

**١٥٩٢ - (حسن صحيح) عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ جَلَبَ، وَلاَ جَنَبَ، وَلاَ تُؤْخَذُ صَدَقَاتُهُمْ إِلاَّ فِي دُورِهِمْ).**

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (ئاژەڵ نابرێ بۆ لای زەکات کۆکەرەوە، هەتا بەشە زەکاتی لێ جیا بکاتەوە، بەڵکو هەموو کەسێ زەکاتەکەی لەماڵی خۆیدا لێ وەردەگیرێ).

١٥٩٣ - (صحيح مقطوع) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ فِي قَوْلِهِ: (لاَ جَلَبَ وَلاَ جَنَبَ). قَالَ: أَنْ تُصَدَّقَ الْمَاشِيَةُ فِي مَوَاضِعِهَا، وَلاَ تُجْلَبُ إِلَى الْمُصَدِّقِ. وَالْجَنَبُ عَنْ غَيْرِ هَذِهِ الْفَرِيضَةِ أَيْضًا: لاَ يُجْنَبُ أَصْحَابُهَا، يَقُولُ: وَلاَ يَكُونُ الرَّجُلُ بِأَقْصَى مَوَاضِعِ أَصْحَابِ الصَّدَقَةِ فَتُجْنَبُ إِلَيْهِ، وَلَكِنْ تُؤْخَذُ فِي مَوْضِعِهِ.

واتە: موحەممەدی کوڕی ئیسحاق سەبارەت بە راڤەی: (لاَ جَلَبَ وَلاَ جَنَبَ) دەڵێت: دەبێت ئاژەڵەکان نەبرێن بۆ لای زەکات کۆکەرەوە، هەتا بەشە زەکاتی لێ جیا بکاتەوە، بەڵکو دەبێ لە شوێنی خۆیاندا زەکاتیان لێ دەربکرێت، وە (جَنَب)یش هەروەها: وە نابێت خاوەن ماڵ ماڵ و سامانەکەی دووربخاتەوە لە زەکات کۆکەرەوەو بڕوات بۆ جێگایەکی تر بەڵکو دەبێت لەجێگای خۆی بمێنێتەوە، موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێت: نابێت زەکات کۆکەرەوە لە شوێنێکی دوور دابەزێت خەڵك ماڵ و سامانەکەیان بەرن بۆ لای بۆ ئەوەی زەکاتەکەیان لێ وەربگرێت، بەڵکو دەبێت لەجێگای خۆیاندا زەکاتەکەیان لێ وەربگرێت.

## باسی ئایا دروستە کەسێ زەکاتە دەرکراوەکەی خۆی بکڕێتەوە یان نا؟

## ٩ - باب الرَّجُلِ يَبْتَاعُ صَدَقَتَهُ.

| |
|---|
| ١٥٩٤ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنهُ حَمَلَ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَوَجَدَهُ يُبَاعُ، فَأَرَادَ أَنْ يَبْتَاعَهُ، فَسَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: (لاَ تَبْتَعْهُ وَلاَ تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ). |

واتە: لە (عبدُ اللە)ی کوڕی عومەرەوە دەگێڕنەوە، کە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) ڕەزای خوای لێ بێ ئەسپێکی چاکی هەبوو بەخشی بە کەسێ لەڕێی خوا بۆ ئەوەی جیهادی پێ بکات و ئامادەی غەزاکردن بێت، پاش ماوەیە بینی ئەفرۆشرێت، پێشەوا عومەر ویستی بیکڕێتەوە، لەوبارەوە پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم؟ ئەویش فەرمووی: (نە بیکڕەو نە هیچ بەخشینێکی خۆت هەڵبگرەوە، لە زەکاتەکەت پەشیمان مەبەرەوە).

## باسی زەکاتی بەندە.

## ١٠ – باب صَدَقَةِ الرَّقِيقِ.

١٥٩٥ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لَيْسَ فِى الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ زَكَاةٌ، إِلاَّ زَكَاةُ الْفِطْرِ فِى الرَّقِيقِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەندەو ئەسپی موسوڵمان زەکاتیان لێ دەرناکرێت، تەنها زەکاتی سەرفیترەی بەندەکەی نەبێت واتە دەبێت خاوەنەکەی زەکاتی سەرفیترەی بۆ بدات).

- ئەگەر کەسێ بەندە بکڕێ و بیفرۆشێتەوە واتە بازرگانی پێوە بکات، ساڵی بەسەردا هات ئەوە پێویستە زەکاتی بازرگانیەکەی دەربکات.

١٥٩٦ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِى عَبْدِهِ، وَلاَ فِى فَرَسِهِ صَدَقَةٌ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بەندەو ئەسپ و ماینی موسوڵمان زەکاتیان لێ دەرناکرێت بەو مەرجەی کە هی بازرگانی نەبن).

## باسی زەکاتی کشتوکاڵ.

## ١١ - باب صَدَقَةِ الزَّرْعِ.

١٥٩٦ - (صحيح)[١] عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّـهِ، عَـنْ أَبِيـهِ قَـالَ، قَـالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالأَنْهَارُ وَالْعُيُونُ، أَوْ كَانَ بَعْلاً: الْعُشْرُ، وَفِيمَـا سُـقِيَ بِالسَّوَانِي أَوِ النَّضْحِ نِصْفُ الْعُشْرِ).

واتە: لە سالمی کوڕی (عَبْدُ اللـه)وە، لەباوکیـەوە دەگێڕنـەوە، کـە وتویـەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرچی بـە بـاران و روبـار و کانیاوەکان ئاو بدرێت، یان بەڕیشکی خۆی ئاو بخواتـەوە دە یـەکی دەکـەوێت، وە هەرچی بە وڵاخی ئاوهەڵکێش ئاوبدرێ نیوەی دە یەکی دەکەوێت).

١٥٩٧ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (فِيمَا سَقَتِ الأَنْهَارُ وَالْعُيُونُ، الْعُشْرُ، وَمَا سُقِيَ بِالسَّوَانِي، فَفِيهِ نِصْفُ الْعُشْرِ).

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ الله)وە دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرچی بە ئاوی ئاسمان و دەریاو کانیاوەکان ئـاو

---

[١] - لە کتـێبی (سـنن أبـی داود)دا بـە هـەمان شێوە هاتووە بۆیـە ئێمـەش وەك خۆی هـەمان رەقەممان بۆ دانا.

بدرێت دە یەکی دەکەوێت، وە هەرچی بە وڵاخی ئاوهەڵکێش ئاوبدرێ نیوەی دە یەکی دەکەوێت).

١٥٩٨ - (صحيح مقطوع) عَنِ الْهَيْثَمُ بْنُ خَالِدٍ الْجُهَنِيُّ وَحُسَيْنُ بْنُ الأَسْوَدِ الْعِجْلِيُّ، قَالاَ: قَالَ وَكِيعٌ: الْبَعْلُ: الْكَبُوسُ الَّذِي يَنْبُتُ مِنْ مَاءِ السَّمَاءِ. قَالَ ابْنُ الأَسْوَدِ: وَقَالَ يَحْيَى - يَعْنِي ابْنَ آدَمَ - سَأَلْتُ أَبَا إِيَاسٍ الأَسَدِيَّ؟ عَنِ الْبَعْلِ: فَقَالَ الَّذِي يُسْقَى بِمَاءِ السَّمَاءِ. وَقَالَ النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ: الْبَعْلُ: مَاءُ الْمَطَرِ.

واتە: (هیثم)ی کوڕی خالیدی جوهەنی و حوسەینی کوڕی ئەسوەدی عیجلیی دەڵێن: وەکیع دەڵێت: (بَعْل) بریتیە لەو رووەکەی کە بە ئاوی باران سەوز ببێت. ئیبنو ئەسوەد دەڵێت: یەحیا— واتە ئیبنو ئادەم — وتی: سەبارەت بە مانای (بَعْل) لە ئەبو ئەیادی ئەسەدیم پرسی؟ وتی: ئەو رووەکەیە بە ئاوی ئاسمان سەوز ببێت. (نَضر)ی کوڕی شومەیل دەڵێت: (بَعْل) ئاوی بارانە.

١٥٩٩ - (ضعيف) عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَهُ إِلَى الْيَمَنِ فَقَالَ: (خُذِ الْحَبَّ مِنَ الْحَبِّ، وَالشَّاةَ مِنَ الْغَنَمِ، وَالْبَعِيرَ مِنَ الإِبِلِ، وَالْبَقَرَةَ مِنَ الْبَقَرِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: شَبَّرْتُ قِثَّاءَةً بِمِصْرَ ثَلاَثَةَ عَشَرَ

شِبْرًا، وَرَأَيْتُ أُتْرُجَّةً عَلَى بَعِيرٍ بِقِطْعَتَيْنِ قُطِعَتْ وَصُيِّرَتْ عَلَى مِثْلِ عِدْلَيْنِ.

واتە: لە (مُعَاذ)ی کوڕی جەبەلەوە هاتووە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ناردی بۆ یەمەن فەرمووی: (دانەوێڵە لەزەکاتی دانەوێڵەدا وەربگرە، شەك لە زەکاتی مەڕ و بزندا وەربگرە، وشتر لەزەکاتی وشتردا وەربگرە، ڕەشەوڵاخ لە زەکاتی ڕەشەوڵاخدا وەربگرە). ئەبو داود دەڵێت: لە میسر (قِثاءَة)کالیارێکم پێوا سیانزە بست(شِبْر) بوو - کە دەکاتە سێ مەتر و چارەکێ - ، (أتْرُجَّة)نارنجێکم بە سەر وشترێکەوە بینی کرابوو بە دوو کەرتی وەك یەکەوە هەر لایەکی کرابوو بە تایەکی باری وشترەکە.

## باسی زەکاتی هەنگوین.

## ١٢ – باب زَكَاةِ الْعَسَلِ.

١٦٠٠ – (حسن) عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: جَاءَ هِلَالٌ – أَحَدُ بَنِي مُتْعَانَ – إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعُشُورِ نَحْلٍ لَهُ، وَكَانَ سَأَلَهُ أَنْ يَحْمِيَ لَهُ وَادِيًا يُقَالُ لَهُ سَلَبَةُ، فَحَمَى لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَلِكَ الْوَادِي، فَلَمَّا وُلِّيَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنهُ كَتَبَ سُفْيَانُ بْنُ وَهْبٍ إِلَى عُمَرَ بْنِ

الْخَطَّابِ يَسْأَلُهُ عَنْ ذَلِكَ؟ فَكَتَبَ عُمَرُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: إِنْ أَدَّى إِلَيْكَ مَا كَانَ يُؤَدِّي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ عُشُورِ نَحْلِهِ لَهُ فَاحْمِ لَهُ سَلَبَةَ، وَإِلاَّ فَإِنَّمَا هُوَ ذُبَابُ غَيْثٍ يَأْكُلُهُ مَنْ يَشَاءُ.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە هاتووە، کە وتویەتی: هیلال کە یەکێ بوو لەنەوەی موتعان دە یەکی هەنگوینەکەی هێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە پێشتر داوای لێکردبوو شیوێکی بۆ بپارێزێ پێی دەوترا سەلەبە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شیوەکەی بۆ پاراست، کاتێ کە عومەر بوو بە خەلیفە، سوفیانی کوڕی وەهەب بۆ عومەری نوسی پرسیاری لەبارەی ئەوەوە لێکرد؟ ئەویش وتی: ئەگەر ئەوەی پێدای کە بە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم دەدا لە دە یەکی هەنگوینەکەی ئەوە شیوەکەی بۆ بپارێزە، ئەگەر دە یەکی هەنگوینەکەی نەدا ئەوە مێشە بارانەیەو هەرکەس حەز بکات لە هەنگوینەکەی دەخوات.

١٦٠١ - (حسن) عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ: أَنَّ شَبَابَةَ - بَطْنٌ مِنْ فَهْمٍ - فَذَكَرَ نَحْوَهُ، قَالَ: مِنْ كُلِّ عَشْرِ قِرَبٍ قِرْبَةٌ، وَقَالَ سُفْيَانُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الثَّقَفِيُّ، قَالَ: وَكَانَ يُحَمِّي لَهُمْ وَادِيَيْنِ، زَادَ فَأَدَّوْا إِلَيْهِ مَا كَانُوا يُؤَدُّونَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَحَمَّى لَهُمْ وَادِيَيْهِمْ.

واته: له عەمری كوڕی شوعەیبەوە، له باوكیەوە، لە باپیریـەوە هاتووە، كـه (شَبَابَة) تیرەیەكی بچوك بوون - سەربە هۆزی (فَهْم) — راوی فەرمودەكه (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی (حَارِثِ)ی مەخزومی فەرمودەی پێشوی بـه هەمان شێوە گێڕایەوە، (عَبْدُ الرَّحْمَن)وتی: له هەنگوین لـه هەموو دە كوندەیە كوندەیـەك زەكاتی دەكەوێت، وە سوفیانی كوڕی (عَبْدُ اللَّهِ الثَّقَفِيَ) دەڵێت: (عَبْدُ الرَّحْمَن)وتی: دوو شێوی بۆ دەپاراستن، وە ئەمەشی بۆ زیاد كـرد: ئـەوەیان دەدایە كە دەیاندا بە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم، ئیتر ئەویش دوو شیوەكەی بۆ دەپاراستن.

١٦٠٢ - (حسن) عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ بَطْنًا مِنْ فَهْمٍ - بِمَعْنَى الْمُغِيرَةِ — قَالَ: مِنْ عَشْرِ قِرَبٍ قِرْبَةٌ، وَقَالَ: وَادِيَيْنِ لَهُمْ.

واته: له عەمری كوڕی شوعەیبەوە، له باوكیەوە، لە باپیریـەوە هاتووە، كـه تیرەیەكی سەربە هۆزی (فهم) راوی فەرمودەی پێشوی بە هەمان مانا گێڕایەوە وەك فەرمودەكەی موغیرە، ئوسامەی كوڕی زەید وتی: لـه هەموو دە كوندەیـە كوندەیەكی دەكەوێت، وە وتی: دوو شیوەكەیان. — ئەمەش وەك فەرمودەكەی پێشو وایە - .

# باسی خەملاندنی تریێ.

## ١٣ – باب فِي خَرْصِ الْعِنَبِ.

١٦٠٣ - (ضعيف) عَنْ عَتَّابِ بْنِ أَسِيدٍ قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُخْرَصَ الْعِنَبُ كَمَا يُخْرَصُ النَّخْلُ، وَتُؤْخَذُ زَكَاتُهُ زَبِيبًا، كَمَا تُؤْخَذُ زَكَاةُ النَّخْلِ تَمْرًا.

واتە: عەتتابی کوڕی ئوسەید دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی داوە کە رەزیش وەك باخی خورما بخەملێنرێت: زەکاتەکەی بە مێوژ وەربگیرێ، وەك چۆن خورما وەردەگیرێت لە زەکاتی باخە خورما.

١٦٠٤ - (ضعيف) عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَسَعِيدٌ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ عَتَّابٍ شَيْئًا.

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە، فەرمودەی پێشوی بە هەمان سەنەد و مانا هاتووە، ئەبو داود دەڵێت: راوی فەرمودەکە سەعید هیچ شتێکی لە عەتتاب نەبیستووە.

## باسی سەبارەت بە خەملاندن.

## ١٤ – باب فِي الْخَرْصِ.

١٦٠٥ - (ضعيف) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: جَاءَ سَهْلُ بْنُ أَبِي حَثْمَةَ إِلَى مَجْلِسِنَا قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا خَرَصْتُمْ فَخُذُوا وَدَعُوا الثُّلُثَ، فَإِنْ لَمْ تَدَعُوا أَوْ تَجِدُوا الثُّلُثَ، فَدَعُوا الرُّبُعَ).

واتە: (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی مەسعود دەڵێت: سەهلی كوڕی (حَثمَة) هات بۆ كۆڕ و دانیشتنەكەمان وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێكردین فەرمووی: (كاتێ شتێكتان خەملاند ئیتر لێی ببەن، بەلام سێ یەكێكی زەكاتەكە بهێڵنەوە، ئەگەر سێ یەكتان نەهێشتەوە دەبێ چواریەكی هەر بهێڵنەوە – بۆ ئەوەی خاوەن موڵك خۆی ببەخشێ بە هەژاران).

# باسی کەی خورما دەخەملێنرێت.

## ١٥ - باب مَتَى يُخْرَصُ التَّمْرُ.

١٦٠٦ - (ضعيف) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا أَنَّهَا قَالَتْ: وَهِيَ تَذْكُرُ شَأْنَ خَيْبَرَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَبْعَثُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ رَوَاحَةَ إِلَى يَهُودِ خَيْبَرَ، فَيَخْرِصُ النَّخْلَ حِينَ يَطِيبُ قَبْلَ أَنْ يُؤْكَلَ مِنْهُ.

واتە: عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ باسی بەسەرهاتی خەیبەری دەکرد، وتی: ئەو کاتەی کە خورما خۆش دەبوو پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم (عَبدُ اللـه)ی کوڕی ڕەواحەی دەنارد بۆ ناو جولەکەکانی خەیبەر، جا پێش ئەوەی لێی بخۆن خورماکەی دەخەملاند.

## باسی ئەو خورمایەی کە دروست نیە بدرێت لە زەکاتدا.

## ١٦ - باب مَا لاَ يَجُوزُ مِنَ الثَّمَرَةِ فِي الصَّدَقَةِ.

١٦٠٧ - (ضعيف) عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْجُعْرُورِ وَلَوْنِ الْحُبَيْقِ أَنْ يُؤْخَذَا فِي الصَّدَقَةِ. قَالَ الزُّهْرِيُّ: لَوْنَيْنِ مِنْ تَمْرِ الْمَدِينَةِ.

واتە: لە ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەهی کردوە لەوەی خورمای جەعرور و خورمای حوبەیق بدرێن لەزەکاتدا کە دوو جۆر خورمای خراب بوون. پێشەوا زوهری دەڵێ: دوو جۆرن لە خورمای مەدینە.

١٦٠٨ - (حسن) عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَسْجِدَ وَبِيَدِهِ عَصًا، وَقَدْ عَلَّقَ رَجُلٌ مِنَّا قِنًا حَشَفًا فَطَعَنَ بِالْعَصَا فِي ذَلِكَ الْقِنْوِ

وَقَالَ (لَوْ شَاءَ رَبُّ هَذِهِ الصَّدَقَةِ تَصَدَّقَ بِأَطْيَبَ مِنْهَا). وَقَالَ: (إِنَّ رَبَّ هَذِهِ الصَّدَقَةِ يَأْكُلُ الْحَشَفَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)».

واتە: لە عەوفی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هات بۆ لامان لە مزگەوت دارێکی بەدەستەوە بوو، یەکێ لە ئێمە هێشوە خورمای وشك و ڕەقەڵەی خراپی هەڵواسیبوو بۆ ئەوەی هەرکەسێ بیەوێت لێی بخوات، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەدارەکەی کێشای بە هێشوە خورماکەداو فەرمووی: (ئەگەر خاوەنی ئەم زەکاتە بیویستایە خورمای چاکتری دەدا لە زەکاتدا). هەروەها فەرمووی: (بێگومان خاوەنی ئەم زەکاتە خورمای وشك و ڕەقەڵەی خراپ دەخوات لەرۆژی قیامەتدا).

## باسی زەکاتی سەرفترە.

## ١٧ - باب زَكَاةِ الْفِطْرِ.

١٦٠٩ - (حسن) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَكَاةَ الْفِطْرِ طُهْرَةً لِلصَّائِمِ مِنَ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ، وَطُعْمَةً لِلْمَسَاكِينِ، مَنْ أَدَّاهَا قَبْلَ الصَّلاَةِ فَهِيَ زَكَاةٌ مَقْبُولَةٌ، وَمَنْ أَدَّاهَا بَعْدَ الصَّلاَةِ فَهِيَ صَدَقَةٌ مِنَ الصَّدَقَاتِ.

واتە: دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زەکاتی سەرفترەی فەرز کرد لەسەر موسوڵمانان، بۆ ئەوەی پاككەرەوەی رۆژووەوان بێت لە قسەی پڕوپوچ و کرداری ناپەسەند، وە خۆراکیش بێت بۆ هەژاران، جا هەرکەسێ پێش نوێژی جەژن سەرفترەکەی بدات ئەوە زەکاتێکی وەرگیراوە، هەرکەسێکیش لەدوای نوێژی جەژن بیدات ئەوە خێرێکە لە خێرەکان.

## باسی کەی زەکاتی سەرفترە دەدرێت.

## ١٨ - باب مَتَى تُؤَدَّى

١٦١٠ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِزَكَاةِ الْفِطْرِ أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلاَةِ، قَالَ فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُؤَدِّيهَا قَبْلَ ذَلِكَ بِالْيَوْمِ وَالْيَوْمَيْنِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێکردین پێش ئەوەی خەڵك دەربچن بۆ نوێژی جەژن زەکاتی سەرفترەکە بدەین. راوی فەرمودەکە نافع وتی: ئیبنو عومەر خۆی رۆژێ یان دوو رۆژ پێش نوێژی جەژن زەکاتی سەرفترەی دەدا.

## باسی چەند دەدرێت لەزەكاتی سەرفترەدا.

## ١٩ – باب كَمْ يُؤَدَّى فِى صَدَقَةِ الْفِطْرِ.

١٦١١ – (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرَضَ زَكَاةَ الْفِطْرِ، زَكَاةُ الْفِطْرِ مِنْ رَمَضَانَ: صَاعٌ مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعٌ مِنْ شَعِيرٍ، عَلَى كُلِّ حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ، ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى مِنَ الْمُسْلِمِينَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە رەمەزاندا زەكاتی سەرفترەی فەرز كرد لەسەر موسوڵمانان: (صاع)مەنێك لە خورما، یان (صاع)مەنێك لە جۆ، لەسەر هەموو كەسێكی ئازاد یان كۆیلە، ئیتر نێر بێت یان مێ.

١٦١٢ – (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَكَاةَ الْفِطْرِ صَاعًا، فَذَكَرَ بِمَعْنَى مَالِكٍ، زَادَ (وَالصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ)، وَأَمَرَ بِهَا أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلاَةِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ نَافِعٍ، بِإِسْنَادِهِ، قَالَ: عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ. وَرَوَاهُ سَعِيدٌ

الْجُمَحِيُّ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، قَالَ فِيهِ: مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَالْمَشْهُورُ عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ لَيْسَ فِيهِ: مِنَ الْمُسْلِمِينَ.

واتە: لە (عَبدُ الله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زەکاتی سەرفترەی فەرز کرد لەسەر موسوڵمانان: (صاع)مەنێك ... ، ڕاوی فەرمودەکەی پێشوی گێڕایەوە وەك فەرمودەکەی مالیك کە پێشتر باسکرا، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: (لەسەر هەموو کەسێکی بچوك و گەورە). وە فەرمانی دا پێش ئەوەی خەڵك بڕۆن بۆ نوێژی جەژن زەکاتی سەرفترەکەیان بدەن. ئەبو داود دەڵێت: لە نافعەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان سەنەد هاتووە، کە وتویەتی: (لەسەر هەموو موسوڵمانێ). سەعیدی کوڕی جومەحی، لە (عُبَیدِ الله)ەوە، لە نافعەوە گێڕاویەتیەوە، تێدا وتویەتی: (مِنَ المُسلِمین). واتە: لەسەر موسوڵمانان. مەشهور لە (عُبَیدِ الله)ەوە ئەمەیە کە (مِنَ المُسلِمین)ی تێدا نیە.

١٦١٣ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ فَرَضَ صَدَقَةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ تَمْرٍ عَلَى الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ وَالْحُرِّ وَالْمَمْلُوكِ، زَادَ مُوسَى: وَالذَّكَرِ وَالأُنْثَى.

واتە: لە (عَبدُ الله) - ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ - دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم زەکاتی سەرفترەی فەرز

كرد لەسەر موسوڵمانان: (صاع)مەنێك لە جۆ، یان لە خورما، لەسەر هەموو كەسێكی بچوك و گەورە، ئازاد و كۆیلە، راوی فەرمودەكە موسا ئەمەی بۆ زیاد كرد: نێر و مێ.

| |
|---|
| ١٦١٤ - (ضعيف) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ النَّاسُ يُخْرِجُونَ صَدَقَةَ الْفِطْرِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ تَمْرٍ، أَوْ سُلْتٍ، أَوْ زَبِيبٍ. قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: فَلَمَّا كَانَ عُمَرُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ وَكَثُرَتِ الْحِنْطَةُ جَعَلَ عُمَرُ نِصْفَ صَاعِ حِنْطَةٍ مَكَانَ صَاعٍ مِنْ تِلْكَ الأَشْيَاءِ.(ذكر عمر وهم، والصواب أنه معاوية). |

واتە: لە (عَبْدُ الله)ی كوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: خەڵكی لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم زەكاتی سەرفترەیان دەدا كە بریتی بوو لە: (صاع)مەنێك لە جۆ، یان لە خورما، یان (سُلت) كە جۆرێكە لە جۆی سپی وەك گەنم وایە، یان لە مێوژ. راوی فەرمودەكە نافع وتی: (عَبْدُ الله) وتی: كاتێ كە پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ بوو بە خەلیفەو گەنم زۆر بوو كردی بە نیو (صاع) لە گەنم لەجیاتی (صاع)مەنێك لەو شتانەی كە باسكران. (باسی عومەر (وهم)ە، راستیەكەی ئەمەیە كە موعاویە كردی بە نیو (صاع) لە گەنم وەك لە چەند فەرمودەیەكی صەحیح دا هاتووە).

١٦١٥ - (صحيح) عَنْ نَافِعٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: فَعَدَلَ النَّاسُ بَعْدُ نِصْفَ صَاعٍ مِنْ بُرٍّ. قَالَ: وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُعْطِي التَّمْرَ، فَأَعْوَزَ أَهْلَ الْمَدِينَةِ التَّمْرُ عَامًا فَأَعْطَى الشَّعِيرَ.

واته: لە نافعەوە هاتووە، كە وتويەتى: (عَبدُ اللّه) وتى: دواى ئەوە ئيتر خەڵك نيو (صاع) لە گەنميان دەدا لە سەرفترەدا. نافع وتى: (عَبدُ اللّه) خۆى خورماى دەدا لە سەرفترەدا، ساڵێ خورما كەم بوو خەڵكى مەدينە پێويستيان بە خورما بوو، بۆيە ئەو ساڵە جۆيان دا لە سەرفترەدا.

١٦١٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ إِذْ كَانَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَكَاةَ الْفِطْرِ عَنْ كُلِّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ، حُرٍّ أَوْ مَمْلُوكٍ: صَاعًا مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ، فَلَمْ نَزَلْ نُخْرِجُهُ حَتَّى قَدِمَ مُعَاوِيَةُ حَاجًّا، أَوْ مُعْتَمِرًا، فَكَلَّمَ النَّاسَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَكَانَ فِيمَا كَلَّمَ بِهِ النَّاسَ أَنْ قَالَ: إِنِّي أَرَى أَنَّ مُدَّيْنِ مِنْ سَمْرَاءِ الشَّامِ تَعْدِلُ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، فَأَخَذَ النَّاسُ بِذَلِكَ. فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَأَمَّا أَنَا فَلاَ أَزَالُ أُخْرِجُهُ أَبَدًا مَا عِشْتُ.

واتە: ئەبو سەعیدی خودری دەڵێت: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خۆیدا بۆ هەموو کەسێکی بچوك و گەورە، ئازاد یان کۆیلە، (صاع)ێك لە خۆراك، یان (صاع)ێك لە کەشك، یان (صاع)ێك لە جۆ، یان (صاع)ێك لە خورما، یا (صاع)ێك لە مێوژ زەکاتی سەرفترەمان دەدا، بەردەوام ئەم شتانەمان دەدا هەتا موعاویە لە شامەوە هات بۆ حەج یان بۆ عەمرە، لەسەر مینبەر وتاری دا بۆ خەڵك، یەکێ لە وتەکانی ئەمە بوو وتی: وادەزانم کە نیو(صاع) لە گەنمی شام هاوتای (صاع)ێك لە خورمایە، ئیتر خەڵکیش رەفتاریان بەم قسەیەی موعاویە کرد گەنمیان دەدا لە زەکاتی سەرفترەدا. ئەبو سەعید وتی: من هەتا لەژیاندا ماوم بەردەوام (صاع)ێك لەو شتانە دەدەم لە سەرفترەدا واتە لە (صاع)ێك کەمتر نادەم.

١٦١٧ - (ضعيف) عن إِسْمَاعِيل: لَيْسَ فِيهِ ذِكْرُ الْحِنْطَةِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَقَدْ ذَكَرَ مُعَاوِيَةُ بْنُ هِشَامٍ فِي هَذَا الْحَدِيثِ عَنِ الثَّوْرِيِّ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عِيَاضٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ: (نِصْفَ صَاعٍ مِنْ بُرٍّ). وَهُوَ وَهَمٌ مِنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ هِشَامٍ، أَوْ مِمَّنْ رَوَاهُ عَنْهُ.

واتە: لە ئیسماعیلەوە فەرمودەی پێشو هاتووە، بەڵام باسی گەنمی تێدا نیە. ئەبو داود دەڵێت: موعاویەی کوڕی هیشام لەم فەرمودەدا باسی نیو (صاع) گەنمی هێناوە، لە سوفیانی (ثوری)ەوە، لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە، لە (عِیاض)ەوە، لە ئەبو سەعیدەوە. وە ئەمە (وهم)ە لە موعاویەی کوڕی هیشامەوە، یان ئەوانەی کە لە موعاویەوە ریوایەتیان کردوە.

١٦١٨ - (ضعيف) عَن عِيَاضٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ يَقُولُ: لاَ أُخْرِجُ أَبَدًا إِلاَّ صَاعًا، إِنَّا كُنَّا نُخْرِجُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَاعَ تَمْرٍ أَوْ شَعِيرٍ، أَوْ أَقِطٍ أَوْ زَبِيبٍ. هَذَا حَدِيثُ يَحْيَى، زَادَ سُفْيَانُ: أَوْ صَاعًا مِنْ دَقِيقٍ، قَالَ حَامِدٌ: فَأَنْكَرُوا عَلَيْهِ فَتَرَكَهُ سُفْيَانُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: فَهَذِهِ الزِّيَادَةُ وَهَمٌ مِنِ ابْنِ عُيَيْنَةَ.

واتە: لە (عیاض)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: گوێم لێ بوو ئەبو سەعیدی خودری دەیوت: هەتا لەژیاندا ماوم (صاع)ێك لەو شتانە دەدەم لە سەرفترەدا واتە لە (صاع)ێك كەمتر نادەم، چونكە ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم: (صاع)ێك خورما، یان (صاع)ێك جۆ، یان (صاع)ێك كەشك، یا (صاع)ێك مێوژمان دەدا لە زەكاتی سەرفترەدا. ئەمە فەرمودەی یەحیایە، سوفیان لە ریوایەتەكەیدا ئەمەی بۆ زیاد كرد: یان (صاع)ێك لە ئارد. حامد كە شێخی ئەبو داودە وتی: فەرمودەناسان ئینكاریان كرد و رەدیان دایەوە ئیتر سوفیانیش وازی هێنا لە (صاع)ێك لە ئارد. ئەبو داودیش دەڵێت: ئەم زیادەیە (وهم)ە لە ئیبنو عویەینەوە.

# باسی ئەوانەی کە بە نیو(صاع) گەنم گێڕاویانەتەوە.

## ٢٠ - باب مَنْ رَوَى نِصْفَ صَاعٍ مِنْ قَمْحٍ.

١٦١٩ - (ضعيف) عَن عَبْدُ اللَّهِ بْنُ ثَعْلَبَةَ أَوْ ثَعْلَبَةُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِى صُعَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (صَاعٌ مِنْ بُرّ أَوْ قَمْحٍ عَلَى كُلِّ اثْنَيْنِ، صَغِيرٍ أَوْ كَبِيرٍ، حُرّ أَوْ عَبْدٍ، ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى، أَمَّا غَنِيُّكُمْ فَيُزَكِّيهِ اللَّهُ تعالى، وَأَمَّا فَقِيرُكُمْ فَيَرُدُّ اللَّهُ عَلَيْهِ أَكْثَرَ مِمَّا أَعْطَاهُ). زَادَ سُلَيْمَانُ فِى حَدِيثِهِ: غَنِىّ أَوْ فَقِيرٍ.

واتە: لە (عَبدُ الله)ی کوڕی (ثعلَبَة)ەوە یان لە(ثعلَبَة)ی کوڕی (عَبدُ الله)ی کوڕی (أبی صُعَیر)ەوە، لەباوکیەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (صاع)ێك لە گەنم بۆ هەموو دوو کەسێ واتە یەکی نیو (صاع) گەنم بۆ کەسێ، بچوك بێ یان گەورە، ئازاد بێ یان کۆیلە، نێرینە بێ یان مێینە، بە نیسبەت دەوڵەمەندتانەوە خوای گەورە بەو سەرفترە پاکی دەکاتەوە، هەژارەکەشتان خوای گەورە زیاد لەوەی پێ دەبەخشێ کە داویەتی لەسەرفترەدا). سولەیمان لە فەرمودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: دەوڵەمەند بێ یان هەژار.

١٦٢٠ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ ثَعْلَبَةَ بْنِ صُعَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطِيبًا فَأَمَرَ بِصَدَقَةِ الْفِطْرِ: صَاعِ تَمْرٍ، أَوْ صَاعِ شَعِيرٍ، عَنْ كُلِّ رَأْسٍ، زَادَ عَلِيٌّ فِي حَدِيثِهِ: أَوْ صَاعِ بُرٍّ أَوْ قَمْحٍ بَيْنَ اثْنَيْنِ. ثُمَّ اتَّفَقَا: عَنِ الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ، وَالْحُرِّ وَالْعَبْدِ.

واتە: لە (عَبْدُ اللّٰه)ی کوڕی (ثَعْلَبَة)ی کوڕی (أبی صُعَیْر)ەوە، لەباوکیەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا وتاری دا فەرمانی دا بە زەکاتی سەرفترە بۆ هەموو کەسێ: (صاع)ێك لە خورما، یان (صاع)ێك لە جۆ، عەلی کوڕی حەسەن لە فەرموودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: (صاع)ێك لە گەنم بۆ هەموو دوو کەسێ واتە نیو (صاع) لە گەنم بۆ کەسێ، لەپاشدا هەردوو راوی هەماهەنگن لەسەر ئەوەی کە وتی: بچوك و گەورە، ئازادو بەندە.

١٦٢١- (صحيح) عن الْعَدَوِيُّ: وَإِنَّمَا هُوَ الْعُذْرِيُّ: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّاسَ قَبْلَ الْفِطْرِ بِيَوْمَيْنِ، بِمَعْنَى حَدِيثِ الْمُقْرِئِ.

واتە: عەدەوی – واتە: (عَبْدُ الله)ی کوڕی (ثَعْلَبَة) - ، کە لە هۆزی (عُذْرِیّ) بوو دەڵێت: دوو رۆژ پێش جەژن پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەستا وتاری دا بۆ خەڵك،. جا راوی بە هەمان مانا فەرموودەی پێشوی گێڕایەوە وەك (مُقْرِئ)ی - قورئان خوێن – (عَبْدُ اللّٰه)ی کوڕی یەزید شێخی عەلی کوڕی حەسەن - .

١٦٢٢ - (ضعيف) عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: خَطَبَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَحِمَهُ اللَّهُ فِي آخِرِ رَمَضَانَ عَلَى مِنْبَرِ الْبَصْرَةِ، فَقَالَ: أَخْرِجُوا صَدَقَةَ صَوْمِكُمْ، فَكَأَنَّ النَّاسَ لَمْ يَعْلَمُوا. فَقَالَ: مَنْ هَا هُنَا مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ؟ قُومُوا إِلَى إِخْوَانِكُمْ فَعَلِّمُوهُمْ فَإِنَّهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ، فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذِهِ الصَّدَقَةَ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ شَعِيرٍ، أَوْ نِصْفَ صَاعٍ مِنْ قَمْحٍ، عَلَى كُلِّ حُرٍّ أَوْ مَمْلُوكٍ، ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى، صَغِيرٍ أَوْ كَبِيرٍ، فَلَمَّا قَدِمَ عَلِيٌّ رَأَى رُخْصَ السِّعْرِ قَالَ: قَدْ أَوْسَعَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ فَلَوْ جَعَلْتُمُوهُ صَاعًا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ. قَالَ حُمَيْدٌ: وَكَانَ الْحَسَنُ يَرَى صَدَقَةَ رَمَضَانَ عَلَى مَنْ صَامَ.

واتە: لە حەسەن – بەصری- ەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ لە بەسرە لە کۆتایی مانگی رەمەزاندا لەسەر مینبەر وتاری دەدا وتی: سەرفترەی رۆژووەکەتان بدەن، وەك بڵێیت خەڵکەکە لە زەکاتی سەرفترە تێنەگەیشتبن و ئەمە نەزانن، وتی: خەڵکی مەدینە کێ لێرەیە؟ هەستن بچن بەدەم براکانتانەوە فێری ئەحکامەکانی سەرفترەیان بکەن چونکە ئەوان نایزانن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ئەم سەرفترەیەی فەرز کرد لەسەر موسوڵمانان: (صاع)مەنێك لە خورما، یان (صاع)مەنێك لە جۆ، یان نیو (صاع) لە گەنم لەسەر هەموو کەسێکی ئازاد یان کۆیلە، نێرینە بێ یان مێینە، بچوك بێ یان گەورە، کاتێ کە پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ هات بینی

نرخی ئەو شتانە دابەزیوەو هەرزان بوون وتی: خوای گەورە رۆزی بۆ فراوان كردون ئەگەر (صاع)مەنێكتان بدایە چاكتر دەبوو بۆتان. حومەید وتی: حەسەن پێی وابوو زەكاتی سەرفترە لەسەر ئەو كەسەیە كە مانگی رەمەزان بەرۆژوو دەبێت.

## باسی پێشخستنی زەكات.

## ٢١ – باب فِي تَعْجِيلِ الزَّكَاةِ.

١٦٢٣ – (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَمَنَعَ ابْنُ جَمِيلٍ، وَخَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ، وَالْعَبَّاسُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا يَنْقِمُ ابْنُ جَمِيلٍ إِلاَّ أَنْ كَانَ فَقِيرًا فَأَغْنَاهُ اللَّهُ، وَأَمَّا خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ فَإِنَّكُمْ تَظْلِمُونَ خَالِدًا، فَقَدِ احْتَبَسَ أَدْرَاعَهُ وَأَعْتُدَهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عز وجل، وَأَمَّا الْعَبَّاسُ عَمُّ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَهِيَ عَلَيَّ وَمِثْلُهَا). ثُمَّ قَالَ: (أَمَا شَعَرْتَ أَنَّ عَمَّ الرَّجُلِ صِنْوُ الأَبِ). أَوْ (صِنْوُ أَبِيهِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێشەوا عومەری كوڕی (خطاب)ی نارد بەسەركاری زەكات كە كۆی

بکاتەوە، ئیبنو جەمیل و خالیدی کوڕی وەلید و عەباس زەکاتەکەیان نەدا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئیبنو جەمیل تۆڵەی ئەوە دەسێنێ کە هەژار بوو لەسایەی ئیسلامەوە خوای گەورە دەوڵەمەندی کرد، خالیدی کوڕی وەلیدیش ئێوە زوڵم و ستەمی لێ دەکەن زەکاتی لەسەر نیە، چونکە ئەو تەنانەت زریەکەی و چەك و کەرەسەی جەنگی خۆی (وەقف)تەرخان کردوە لەرێگەی خوادا، عەباسیش ئەو زەکاتەی لەسەریەتی دەیدات و دەبێ ئەوەندەی تریشی لەگەڵدا بدات واتە دەبێ دوو قات بیدات، لەپاشدا فەرمووی: ئەی عومەر ئەوە نازانی مامەی پیاو لەجیاتی باوکیەتی).

١٦٢٤ - (حسن) عَنْ عَلِيّ: أَنَّ الْعَبَّاسَ سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي تَعْجِيلِ صَدَقَتِهِ قَبْلَ أَنْ تَحِلَّ، فَرَخَّصَ لَهُ فِي ذَلِكَ. قَالَ مَرَّةً: فَأَذِنَ لَهُ فِي ذَلِكَ.

واتە: عەلی ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: عەباس سەبارەت بە پێشخستنی زەکاتەکەی لە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم پرسی؟ ئەویش مۆڵەتی پێ دا. ڕاوی وتی: مۆڵەتی ئەوەی پێدا کە پێش هاتنی بیدات.

## باسی ئایا زەكات لە شوێنێكەوە دەگوێزرێتەوە بۆ شوێنێكی تر.

## ٢٢ – باب فِي الزَّكَاةِ هَلْ تُحْمَلُ مِنْ بَلَدٍ إِلَى بَلَدٍ.

١٦٢٥ - (صحيح) عن عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ زِيَادًا - أَوْ بَعْضَ الأُمَرَاءِ - بَعَثَ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَلَمَّا رَجَعَ، قَالَ لِعِمْرَانَ: أَيْنَ الْمَالُ؟ قَالَ: وَلِلْمَالِ أَرْسَلْتَنِي أَخَذْنَاهَا مِنْ حَيْثُ كُنَّا نَأْخُذُهَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَوَضَعْنَاهَا حَيْثُ كُنَّا نَضَعُهَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە عمرانی كوڕی حوصەینەوە، لە باوكیەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: زیاد – یان هەندێ لە فەرمانڕەواكان - عمرانی كوڕی حوصەینیان نارد بەسەركاری زەكات كە كۆی بكاتەوە، كاتێ كە گەڕایەوە، وتیان بە عیمران: كوا ماڵ و سامانەكە؟ عیمران وتی: بۆچی تۆ بۆ ماڵ و سامان منت ناردبوو! وەرمانگرت وەك چۆن لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم وەرماندەگرت، دابەشمان كرد بەسەر ئەو كەسانەدا كە شایستەن و زەكاتیان پێ دەشێت وەك چۆن لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دابەشمان دەكرد بەسەریاندا.

# باسی زەکات بە کێ دەدرێت، ئینسان چەندە ماڵ و سامانی هەبێت دەوڵەمەندە.

## ٢٣ – باب مَنْ يُعْطَى مِنَ الصَّدَقَةِ وَحَدِّ الْغِنَى.

١٦٢٦ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ سَأَلَ وَلَهُ مَا يُغْنِيهِ جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ خُمُوشٌ، أَوْ خُدُوشٌ، أَوْ كُدُوحٌ فِي وَجْهِهِ). فَقِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الْغِنَى؟ قَالَ: (خَمْسُونَ دِرْهَمًا، أَوْ قِيمَتُهَا مِنَ الذَّهَبِ).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی – کوڕی مەسعود - ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی بەشی خۆی هەبێ و سوالْ بکات، رۆژی قیامەت کە هات نیشانەی ئەو سواڵە بە روخساریەوە دەبێت وەك پەڵەیەکی روشاوی). وترا: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم! مرۆڤ چەندی هەبێ بەشی دەکات و ئیتر نابێ سوالْ بکات؟ فەرمووی: (پەنجا درهەمی هەبێ، یان بایی ئەوەندە زێڕی هەبێت).

١٦٢٧ - (صحيح) عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي أَسَدٍ أَنَّهُ قَالَ: نَزَلْتُ أَنَا وَأَهْلِي بِبَقِيعِ الْغَرْقَدِ، فَقَالَ لِي أَهْلِي: اذْهَبْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَلْهُ لَنَا

شَيْئًا نَأْكُلُهُ، فَجَعَلُوا يَذْكُرُونَ مِنْ حَاجَتِهِمْ فَذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَجَدْتُ عِنْدَهُ رَجُلاً يَسْأَلُهُ، وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ أَجِدُ مَا أُعْطِيكَ). فَتَوَلَّى الرَّجُلُ عَنْهُ وَهُوَ مُغْضَبٌ، وَهُوَ يَقُولُ: لَعَمْرِي إِنَّكَ لَتُعْطِي مَنْ شِئْتَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَغْضَبُ عَلَيَّ أَنْ لاَ أَجِدَ مَا أُعْطِيهِ، مَنْ سَأَلَ مِنْكُمْ وَلَهُ أُوقِيَّةٌ أَوْ عَدْلُهَا فَقَدْ سَأَلَ إِلْحَافًا). قَالَ الأَسَدِيُّ فَقُلْتُ: لَلَقِحَةٌ لَنَا خَيْرٌ مِنْ أُوقِيَّةٍ - وَالأُوقِيَّةُ أَرْبَعُونَ دِرْهَمًا - . قَالَ فَرَجَعْتُ وَلَمْ أَسْأَلْهُ، فَقَدِمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ ذَلِكَ شَعِيرٌ أَوْ زَبِيبٌ، فَقَسَمَ لَنَا مِنْهُ - أَوْ كَمَا قَالَ - حَتَّى أَغْنَانَا اللَّهُ عز وجل.

واتە: لە (عَطاء)ی کوڕی یەسارەوە، لە پیاوێکی هۆزی ئەسەدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: من و خێزانەکەم هاتین بۆ مەدینە لە دەوروبەری (بَقِيع الْغَرْقَد) دابەزین، - (بَقِيع) گۆڕستانی خەڵکی مەدینەیە، (غَرْقَد)یش ناوی درەختێکە لەو گۆڕستانە هەیە - ، خێزانەکەم پێی وتم: بڕۆ بۆلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوای شتێکی لێ بکە با بیخۆین، منیش چووم بۆلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پیاوێکم بینی داوای لێ دەکرد کە شتێکی بداتێ، فەرمووی: (هیچم نیە هەتا بتدەمێ). پیاوەکە پشتی هەڵکردو توڕەبوو، دەیوت: سوێند بێ ئەوەی بتەوێ پێی دەبەخشی، پێغەمبەری خوا صلی الله

علیه وسلم فەرمووی: (لێم تورەی کە هیچم نیە هەتا بتدەمێ، ئەوەی ئۆقیەیە کە چل درهەمی زیوە یان هێندەی هەبێت و سوالْ بکات ئەوە بەزۆر سوالْ دەسێنێ لەخەلْك و ئیلحاحی کردوە، پیاوە ئەسەدیەکە وتی: وتم: وشترەکەم کە شیر دەدات گەلێ چاکترە لە ئوقیەیە - ئۆقیەیە دەکاتە چل درهەمی زیو - پیاوە ئەسەدیەکە وتی: گەڕامەوە بۆ شوێنەکەی خۆم و داوای هیچ شتێکم لێ نەکرد، پاش ماوەیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم جۆ و مێوژی بۆ هات، لەوە بەشیداین – یان وتی – هەتا خوای گەورە دەوڵەمەندی کردین.

١٦٢٨ - (حسن) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ سَأَلَ وَلَهُ قِيمَةُ أُوقِيَّةٍ فَقَدْ أَلْحَفَ). فَقُلْتُ: نَاقَتِي الْيَاقُوتَةُ هِيَ خَيْرٌ مِنْ أُوقِيَّةٍ. – قَالَ هِشَامٌ: خَيْرٌ مِنْ أَرْبَعِينَ دِرْهَمًا – فَرَجَعْتُ، فَلَمْ أَسْأَلْهُ شَيْئًا. زَادَ هِشَامٌ فِي حَدِيثِهِ: وَكَانَتِ الأُوقِيَّةُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرْبَعِينَ دِرْهَمًا.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی بایی ئۆقیەیە ماڵ و سامانی هەبێت و سوالْ بکات ئەوە بەزۆر سوالْ دەسێنێ لەخەلْك و ئیلحاحی کردوە، وتم: وشترەکەم کە ناوی یاقووتە گەلێ چاکترە لە ئوقیەیەك و لە ئۆقیەیە زیاتر دەکات، راوی فەرمودەکە هیشام وتی: گەلێ چاکترە لە چل درهەم، ئیتر گەڕامەوەو، داوای هیچ شتێکم لێ نەکرد، هیشام لە فەرمودەکەیدا ئەمەی بۆ

زیاد کرد: بێگومان ئوقیەیە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم چل درهەم بووە.

١٦٢٩ - (صحيح) عَنْ سَهْلُ ابْنُ الْحَنْظَلِيَّةِ قَالَ: قَدِمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ عُيَيْنَةُ بْنُ حِصْنٍ وَالأَقْرَعُ بْنُ حَابِسٍ فَسَأَلاَهُ، فَأَمَرَ لَهُمَا بِمَا سَأَلاَ، وَأَمَرَ مُعَاوِيَةَ فَكَتَبَ لَهُمَا بِمَا سَأَلاَ، فَأَمَّا الأَقْرَعُ فَأَخَذَ كِتَابَهُ، فَلَفَّهُ فِي عِمَامَتِهِ وَانْطَلَقَ، وَأَمَّا عُيَيْنَةُ فَأَخَذَ كِتَابَهُ، وَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَكَانَهُ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ أَتَرَانِي حَامِلاً إِلَى قَوْمِي كِتَابًا لاَ أَدْرِي مَا فِيهِ، كَصَحِيفَةِ الْمُتَلَمِّسِ؟!. فَأَخْبَرَ مُعَاوِيَةُ بِقَوْلِهِ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ سَأَلَ وَعِنْدَهُ مَا يُغْنِيهِ، فَإِنَّمَا يَسْتَكْثِرُ مِنَ النَّارِ). وَقَالَ النُّفَيْلِيُّ فِي مَوْضِعٍ آخَرَ: (مِنْ جَمْرِ جَهَنَّمَ). فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا يُغْنِيهِ؟ وَقَالَ النُّفَيْلِيُّ فِي مَوْضِعٍ آخَرَ: وَمَا الْغِنَى الَّذِي لاَ تَنْبَغِي مَعَهُ الْمَسْأَلَةُ؟ قَالَ: (قَدْرُ مَا يُغَدِّيهِ وَيُعَشِّيهِ). وَقَالَ النُّفَيْلِيُّ فِي مَوْضِعٍ آخَرَ: (أَنْ يَكُونَ لَهُ شِبَعُ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ أَوْ لَيْلَةٍ وَيَوْمٍ).

واتە: لە سەهلی کوڕی (حَنظَلِيَّة)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: عویەینەی کوڕی حیصن و ئەقرەعی کوڕی حابیس هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و داوایان لێ کرد کە شتێکیان بداتێ، فەرمانی دا کە بیاندەنێ، موعاویە فەرمانی دا نامەی نوسی بۆیان ئەوەی کە داوایان کردوە بیاندەنێ، ئەقرەع نامەکەی وەرگرت و پێچایەوە بە عەمامەکەیەوەو ڕۆشت، عویەینەش نامەکەی وەرگرت و هات بۆ لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتی: ئەی موحەممەد من نازانم ئەم نامەیە چی تێدایە، وەك نامەکەی (مُتَلَمِّس)ە[١]؟!، موعاویە فەرمودەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (ئەوەی بەشی خۆی هەبێ و سوالْ بکات، ئەوە داوای ئاگری زیاتر دەکات بۆ خۆی). نوفەیلی لە جێگایەکی تردا دەڵێت: فەرمووی: (داوای پشکۆی ئاگری دۆزەخ زیاتر دەکات بۆ خۆی). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم! مرۆڤ چەندی هەبێ بەشی دەکات؟ نوفەیلی لە جێگایەکی تردا دەڵێت: مرۆڤ چەندی هەبێ بەشی دەکات و ئیتر نابێ سوالْ بکات؟ فەرمووی: (ئەوەندە کەبەشی شەو و ڕۆژێکی بکات). نوفەیلی لە جێگایەکی تردا دەڵێت: فەرمووی: (ئەوەندەی هەبێ کە شەو و ڕۆژێ تێری لێ بخوات).

---

[١]- (مُتلمّس)ی شاعیر بەسەرهاتێکی بەناوبانگە لەلای عەرەبەکان چووەتە لای یەکێ لە فەرمانڕەواکان و هەجوی کردوە واتە بە هۆنراوە سەرزەنشتی کردوە، ئەویش نامەیەکی بۆ نوسیوە کە بیبات بۆ لای یەکێ لە سەرکارەکانی، گومانی وابوە کە خەڵات دەکرێ لەڕێگادا نامەکە دەکاتەوە دەبینێ نوسراوە هەرکە گەیشتە لات بیکوژە، ئەویش نامەکە دەدڕێنێ و بۆی دەردەچێت، ئیتر لەو کاتەوە عەرەبەکان ئەو نامەیەیان کردووە بە پەندو دەیڵێنەوە. لە عون المعبود شرح سنن أبي داود لمحمد آبادي ، وەرگیراوە بەدەستکارییەوە).

١٦٣٠ - (ضعيف) عن زِيَادَ بْنَ الْحَارِثِ الصُّدَائِيَّ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبَايَعْتُهُ فَذَكَرَ حَدِيثًا طَوِيلاً قَالَ: فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: أَعْطِنِي مِنَ الصَّدَقَةِ. فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى لَمْ يَرْضَ بِحُكْمِ نَبِيّ وَلاَ غَيْرِهِ فِي الصَّدَقَاتِ حَتَّى حَكَمَ فِيهَا هُوَ، فَجَزَّأَهَا ثَمَانِيَةَ أَجْزَاءٍ، فَإِنْ كُنْتَ مِنْ تِلْكَ الأَجْزَاءِ أَعْطَيْتُكَ حَقَّكَ).

واته: زیادی كوڕی (حارِث الصُدائي)ی دەڵێت: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پەیمانم پێداو موسوڵمان بووم، جا فەرمودەیەكی درێژی گێڕایەوە، وتی: پیاوێ هات بۆلای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتی: زەكاتم پێ بدە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: (سەبارەت بە ماڵی زەكات خوای گەورە نە بەحوكمی پێغەمبەر و نە بەحوكمی كەسی تر رازی نەبووە، بەڵكو بۆ خۆی ئەوەی بڕیارداوەو زەكاتی كردوە بە هەشت بەشەوە — وەك لە ئایەتی: (٦٠)ی سورەتی تەوبەدا هاتووە: (إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ) . - ، جا ئەگەر تۆ یەكێ لەو بەشانەیت حەقی خۆتت دەدەمێ).

١٦٣١ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَيْسَ الْمِسْكِينُ الَّذِى تَرُدُّهُ التَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ، وَالأُكْلَةُ وَالأُكْلَتَانِ، وَلَكِنَّ الْمِسْكِينَ الَّذِى لاَ يَسْأَلُ النَّاسَ شَيْئًا وَلاَ يَفْطِنُونَ بِهِ فَيُعْطُونَهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (هەژار و کەم دەستی بەڕاستی ئەوکەسە نیە کە دەرگا بە دەرگا دەکات و ماڵەو ماڵ لێرەو لەوێ دەسوڕێتەوە خورماو دوو خورمای دەدەنێ، یان پاروو دوو پاروی دەدەنێ، بەڵکو هەژار و کەم دەستی تەواو کە شایستەی زەکاتە ئەو کەسەیە کە داوای هیچ شتێ لەخەڵك ناکات، وە پێشی نازانن هەتا زەکاتی پێ بدەن).

١٦٣٢ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مِثْلَهُ، قَالَ: (وَلَكِنَّ الْمِسْكِينَ الْمُتَعَفِّفُ). زَادَ مُسَدَّدٌ فِى حَدِيثِهِ: (لَيْسَ لَهُ مَا يَسْتَغْنِى بِهِ الَّذِى لاَ يَسْأَلُ، وَلاَ يُعْلَمُ بِحَاجَتِهِ فَيُتَصَدَّقُ عَلَيْهِ، فَذَاكَ الْمَحْرُومُ). وَلَمْ يَذْكُرْ مُسَدَّدٌ: (الْمُتَعَفِّفُ الَّذِى لاَ يَسْأَلُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَى هَذَا مُحَمَّدُ بْنُ ثَوْرٍ وَعَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنْ مَعْمَرٍ جَعَلاَ الْمَحْرُومَ مِنْ كَلاَمِ الزُّهْرِىِّ وَهَذَا أَصَحُّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ڕاوی فەرمودەی پێشوی بە هەمان شێوە گێڕایەوە، وتی: (هەژار و کەم دەستی بەڕاستی ئەو کەسەیە کە خۆی بەدوور دەگرێت لە سواڵکردن). موسەددەد لە فەرمودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: (ئەوەندەی نیە کە بەشی بکات هەتا داوا لەکەس نەکات، پێشی نازانن هەتا زەکاتی پێ بدەن، ئیتر ئەوە داوانەکەرە سواڵنەکەرە). — وەك لە ئایەتی ژمارە: (١٩)ی سورەتی (ذاریات)دا هاتووە: (وَفِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ). واتە: وە لە ماڵ و دارایی یاندا بۆ (هەژاری) داواکەرو داوانەکەر مافی خۆیان هەبوو. - بەڵام موسەددەد باسی: (ئەو کەسەی کە خۆی بەدوور دەگرێت لە سواڵکردن)ی نەکرد. ئەبو داود دەڵێت: موحەممەدی کوڕی (ثور) و (عبد الرزاق) ئەم فەرمودەیان گێڕاوەتەوە، وشەی: (المَحرُوم)یان بە قسەی زوهری داناوە، نەك هی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەمەش ڕاستیەکەیەتی.

١٦٣٣ - (صحيح) عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَدِيِّ بْنِ الْخِيَارِ قَالَ: أَخْبَرَنِي رَجُلَانِ أَنَّهُمَا أَتَيَا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ وَهُوَ يَقْسِمُ الصَّدَقَةَ، فَسَأَلاَهُ مِنْهَا، فَرَفَعَ فِينَا الْبَصَرَ وَخَفَضَهُ، فَرَآنَا جَلْدَيْنِ فَقَالَ: (إِنْ شِئْتُمَا أَعْطَيْتُكُمَا، وَلاَ حَظَّ فِيهَا لِغَنِيٍّ وَلاَ لِقَوِيٍّ مُكْتَسِبٍ).

واتە: (عُبَيد الله)ی کوڕی عەدی کوڕی خیار دەڵێت: دوو پیاو پێیان وتم: کە لەڕۆژی حەجی ماڵاوایی دا ڕۆشتونەتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەوکاتەدا زەکاتی دابەش دەکرد، داوای یارمەتیان لێکردوە، ئەویش

سەرنجیداین بینی دوو پیاوی بەتواناین فەرمووی: (ئەگەر حەز بكەن بەشتان دەدەم، بەلاّم ئەمە بەشی دەوڵەمەند و بەشی ئەو كەسانەی تێدا نیە كە توانای كاركردنیان هەیە).

١٦٣٤ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ وَلاَ لِذِي مِرَّةٍ سَوِيٍّ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ سَعْدٍ قَالَ: (لِذِي مِرَّةٍ قَوِيٍّ). وَالأَحَادِيثُ الأُخَرُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْضُهَا: (لِذِي مِرَّةٍ قَوِيٍّ). وَبَعْضُهَا: (لِذِي مِرَّةٍ سَوِيٍّ). وَقَالَ عَطَاءُ بْنُ زُهَيْرٍ: إِنَّهُ لَقِيَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو فَقَالَ: إِنَّ الصَّدَقَةَ لاَ تَحِلُّ لِقَوِيٍّ، وَلاَ لِذِي مِرَّةٍ سَوِيٍّ.

واتە: لە (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی عەمرەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتی: (زەكات دروست نیە بۆ دەوڵەمەندو، كەسێ كە توانای كاركردنی هەبێت). ئەبو داود دەڵێت: لە سەعدەوە هاتووە، كە وتویەتی: (زەكات دروست نیە بۆ كەسێ كە توانای كاركردنی هەبێت). بەهەرحاڵ بە: (لِذِي مِرَّةٍ قَوِيٍّ). و (لِذِي مِرَّةٍ سَوِيٍّ). لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هاتووە. (عطاء)ی كوڕی زوهەیر گەیشت بە (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی عەمر وتی: زەكات دروست نیە بۆ كەسێ كە توانای كاركردنی هەبێت، وە بۆ كەسێكیش كە جەستەی ساغ و سەلامەت و بەتوانا بێ.

## باسی ئەو كەسەی كە بۆی دروستە زەكات وەربگرێت لەكاتێكدا كە دەوڵەمەندە.

## ٢٤ - باب مَنْ يَجُوزُ لَهُ أَخْذُ الصَّدَقَةِ وَهُوَ غَنِيٌّ.

١٦٣٥ - (صحيح بما بعده) عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ إِلاَّ لِخَمْسَةٍ: لِغَازٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، أَوْ لِعَامِلٍ عَلَيْهَا، أَوْ لِغَارِمٍ، أَوْ لِرَجُلٍ اشْتَرَاهَا بِمَالِهِ، أَوْ لِرَجُلٍ كَانَ لَهُ جَارٌ مِسْكِينٌ فَتُصُدِّقَ عَلَى الْمِسْكِينِ فَأَهْدَاهَا الْمِسْكِينُ لِلْغَنِيِّ).

واتە: لە (عَطاء)ی كوڕی یەسارەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (زەكات دروست نیە بۆ دەوڵەمەند مەگەر یەكێك لەم پێنج كەسە بێت: بۆ غەزاكەرێ لەرێی خوادا بێ، یان ئەوكەسەی كە كاری تێدا دەكات، یان قەرزار بێ، یا بۆ كەسێ دراوسێیەكی هەژاری هەبێ بیداتێ ئەویش بە دیاری بیدات بە دەوڵەمەندێ).

١٦٣٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: بِمَعْنَاهُ.

واتە: ئەبو سەعیدی خودری دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی، راوی بە هەمان مانا فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە.

١٦٣٧ - (ضعيف) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ إِلاَّ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، أَوِ ابْنِ السَّبِيلِ، أَوْ جَارٍ فَقِيرٍ يُتَصَدَّقُ عَلَيْهِ فَيُهْدِي لَكَ أَوْ يَدْعُوكَ).

واتە: ئەبو سەعید - ی خودری - دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (زەکات دروست نیە بۆ دەوڵەمەند مەگەر یەکێ بێت لەم سیانە: بۆ غەزاکەر لەرێی خوادا، یان رێبوار بێ و پارەی لێ ببڕێ ئەوەندە وەربگرێ بیگەیەنەتەوە بە شوێن و ولاتی خۆی، یا بۆ کەسێ دراوسێیەکی هەژاری هەبێ زەکاتیان دابێتێ ئەویش بە دیاری بیبەخشێ پێت، یان سفرەو خوانێ ئامادە بکات پێی و بانگهێشتت بکات بۆ نان خواردن).

# باسی چەندە زەکات دەدرێت بە یەك کەس.

## ٢٥ – باب كَمْ يُعْطَى الرَّجُلُ الْوَاحِدُ مِنَ الزَّكَاةِ

١٦٣٨ - (صحيح) عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ، زَعَمَ أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ: سَهْلُ بْنُ أَبِى حَثْمَةَ أَخْبَرَهُ أَنَّ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَدَاهُ بِمِائَةٍ مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ - يَعْنِى دِيَةَ الأَنْصَارِىِّ الَّذِى قُتِلَ بِخَيْبَرَ - .

واتە: لە بەشیری کوڕی یەسارەوە هاتووە، کە پێی وابوو پیاوێ لە یاریدەدەران کە ناوی سەهلی کوڕی ئەبو (حَثمَة) بوو پێی ڕاگەیاندوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەد وشتری زەکاتی لە خوێندا داوەتێ – واتە خوێنی ئەو یاریدەدەرەی کە لە خەیبەردا کوژرا. - پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەو سەد وشترەی لە بەشی قەرزارەکان داوە بۆ ئاشتەوایی نێوان خەڵکی خەیبەر و هۆزەکەی سەهل، ئەگینا زەکات نادرێت لە خوێندا - [١].

[١] - تفسير سنن أبي داود (معالم السنن) لأبي سليمان الخطابي.

## باسی چ کاتێ داواکردن دروستە.

## ٢٦ – باب مَا تَجُوزُ فِيهِ الْمَسْأَلَةُ.

١٦٣٩ - (صحيح) عَنْ سَمُرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الْمَسَائِلُ كُدُوحٌ يَكْدَحُ بِهَا الرَّجُلُ وَجْهَهُ، فَمَنْ شَاءَ أَبْقَى عَلَى وَجْهِهِ، وَمَنْ شَاءَ تَرَكَ، إِلاَّ أَنْ يَسْأَلَ الرَّجُلُ ذَا سُلْطَانٍ، أَوْ فِي أَمْرٍ لاَ يَجِدُ مِنْهُ بُدًّا).

واتە: لە سەمورەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سوالکردن هەمووی چڕنوکەو پیاو رووی خۆی پێ دەڕنێتەوە، ئەوەی دەیەوێت ئەو روشاویە بە روویەوە بمێنێ ئەوە بەدەستی خۆیەتی، ئەوەشی دەیەوێت بەڕوو سوری بمێنێتەوە با وازی لێ بهێنێت و تەرکی سوالکردن بکات، مەگەر کەسێ کە داوا لە فەرمانڕەوا بکات، یان بۆ کارێ کە ناچار بێ پێی).

١٦٤٠ - (صحيح) عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ مُخَارِقٍ الْهِلاَلِيِّ قَالَ: تَحَمَّلْتُ حَمَالَةً، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: (أَقِمْ يَا قَبِيصَةُ، حَتَّى تَأْتِيَنَا الصَّدَقَةُ فَنَأْمُرَ لَكَ بِهَا). ثُمَّ قَالَ: (يَا قَبِيصَةُ إِنَّ الْمَسْأَلَةَ لاَ تَحِلُّ إِلاَّ لأَحَدِ ثَلاَثَةٍ: رَجُلٌ تَحَمَّلَ حَمَالَةً فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ، فَسَأَلَ

حَتَّى يُصِيبَهَا، ثُمَّ يُمْسِكُ. وَرَجُلٌ أَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ فَاجْتَاحَتْ مَالَهُ، فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ فَسَأَلَ حَتَّى يُصِيبَ قِوَامًا مِنْ عَيْشٍ). أَوْ قَالَ: (سِدَادًا مِنْ عَيْشٍ). (وَرَجُلٌ أَصَابَتْهُ فَاقَةٌ حَتَّى يَقُولَ ثَلاَثَةٌ مِنْ ذَوِى الْحِجَا مِنْ قَوْمِهِ: قَدْ أَصَابَتْ فُلاَنًا الْفَاقَةُ فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ، فَسَأَلَ حَتَّى يُصِيبَ قِوَامًا مِنْ عَيْشٍ -، أَوْ سِدَادًا مِنْ عَيْشٍ - ثُمَّ يُمْسِكُ، وَمَا سِوَاهُنَّ مِنَ الْمَسْأَلَةِ يَا قَبِيصَةُ، سُحْتٌ يَأْكُلُهَا صَاحِبُهَا سُحْتًا).

واتە: لە قەبیصەی كوڕی موخاریقی هیلالیەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: بەشێ لە ماڵی خوێن خۆشكردنم خستبووە ئەستۆی خۆمەوە كە بیدەم لەپێناوی ئاشتەوایی دوو دەستەی ناكۆكدا، بۆ ئەو مەبەستە چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم، فەرمووی: (ئەی قەبیصە بمێنەرەوە هەتا زەكاتمان بۆ دێ جا فەرمان دەدەم بەشت بدەن). لەپاشدا فەرمووی: (ئەی قەبیصە سواڵكردن دروست نیە تەنیا بۆ ئەم سێ كەسە نەبێت: بۆ كەسێ كە چووبێتە ژێر ئەندازەیە لە ماڵ بۆ كوژاندنەوەی ئاژاوەیەك، بۆ ئەمە دروستە كە ئەوەندە كۆبكاتەوە ئیتر دەبێ واز لەوە بهێنێ، بۆ كەسێ كە توشی روداوێ هاتبێ و هەژار كەوتبێ، بۆ ئەمەش ئەوەندە دروستە كە ئەوەندە كۆبكاتەوە كە ژیانی پێ ببات بەڕێوە، یان فەرمووی: (هەتا گوزەرانی پێ دەكات). وە بۆ كەسێ كە سێ پیاوی هۆشیار لە هۆزەكەی بڵێن فلانە كەس هەژار و نەدارە، بۆ ئەمەش دروستە كە ئەوەندە كۆبكاتەوە كە ژیانی پێ ببات بەڕێوە لەپاشدا واز بهێنێت، یان فەرمووی: (هەتا گوزەرانی پێ دەكات). (ئەی قەبیصە ئیتر جگە لەم سێ حاڵەتە سواڵكردنە بە ناڕەوایی و خاوەنەكەی بە ناڕەوایی دەیخوات).

١٦٤١ - (ضعيف) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْأَلُهُ، فَقَالَ: (أَمَا فِي بَيْتِكَ شَيْءٌ). قَالَ بَلَى، حِلْسٌ نَلْبَسُ بَعْضَهُ وَنَبْسُطُ بَعْضَهُ، وَقَعْبٌ نَشْرَبُ فِيهِ مِنَ الْمَاءِ. قَالَ: (ائْتِنِي بِهِمَا). فَأَتَاهُ بِهِمَا، فَأَخَذَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدِهِ وَقَالَ: (مَنْ يَشْتَرِي هَذَيْنِ؟). قَالَ رَجُلٌ: أَنَا آخُذُهُمَا بِدِرْهَمٍ. قَالَ: (مَنْ يَزِيدُ عَلَى دِرْهَمٍ؟). مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، قَالَ رَجُلٌ: أَنَا آخُذُهُمَا بِدِرْهَمَيْنِ. فَأَعْطَاهُمَا إِيَّاهُ وَأَخَذَ الدِّرْهَمَيْنِ وَأَعْطَاهُمَا الأَنْصَارِيَّ، وَقَالَ: (اشْتَرِ بِأَحَدِهِمَا طَعَامًا، فَانْبِذْهُ إِلَى أَهْلِكَ، وَاشْتَرِ بِالآخَرِ قَدُومًا فَأْتِنِي بِهِ). فَأَتَاهُ بِهِ فَشَدَّ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عُودًا بِيَدِهِ، ثُمَّ قَالَ لَهُ: (اذْهَبْ فَاحْتَطِبْ وَبِعْ، وَلاَ أَرَيَنَّكَ خَمْسَةَ عَشَرَ يَوْمًا). فَذَهَبَ الرَّجُلُ يَحْتَطِبُ وَيَبِيعُ، فَجَاءَ وَقَدْ أَصَابَ عَشَرَةَ دَرَاهِمَ فَاشْتَرَى بِبَعْضِهَا ثَوْبًا، وَبِبَعْضِهَا طَعَامًا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:: (هَذَا خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ تَجِيءَ الْمَسْأَلَةُ نُكْتَةً فِي وَجْهِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، إِنَّ الْمَسْأَلَةَ لاَ تَصْلُحُ إِلاَّ لِثَلاَثَةٍ: لِذِي فَقْرٍ مُدْقِعٍ، أَوْ لِذِي غُرْمٍ مُفْظِعٍ، أَوْ لِذِي دَمٍ مُوجِعٍ).

واتـە: لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە دەگێڕنـەوە، کـە وتویـەتی: پیاوێـك لـە یاریدەدەران هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم داوای لـێ کـرد کە شتێکی بداتێ، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لەماڵەوە هیچتان نیـە؟). وتـی: پەڵاسـێك یـان بەرمیـەکمان هەیـە نیـوەی دەخەینـە ژێرمـان و نیوەکـەی تریشـی دەدەیـن بەخۆمانـدا، دەفرێکیشـمان هەیـە ئـاوی تێـدا دەخۆینەوە، فەرمووی: (بـڕۆ بیانهێنـە). چوو لـە ماڵەوە هێنـانی، پێغەمبـەری ئازیزو خۆشەویست صلی الله علیه وسلم بەدەستی موبارەکی خۆی هەڵیگرتن و فـەرمووی: (کـێ ئەمانـەم لـێ دەکڕێـت؟). پیاوێـك وتـی: مـن بـە درهـەمێك دەمەوێت، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (کێ بە زیاتر دەیەوێت؟). پیاوێکی تر گوتی: من بە دوو درهەم دەمەوێت، پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم بـە دوو درهەمەکە فرۆشـتنی بە پیـاوی دووەم، دوو درهەمەکـەی دا بـە پیاوە یاریدەدەرەکەو فەرمووی: (درهەمێکیان بدە بە خواردن بۆ منداڵەکانت و بەوی تـریش تـەورێك بکـڕەو بـۆم بهێنـە). چوو تەورەکـەی هێنـا پێغەمبـەری ئازیز صلی الله علیه وسلم بەدەستی موبارەکی خۆی کلکە تـەورێکی تێخست و فـەرمووی: (بـڕۆ دار بیهێنـەو بیفرۆشـە تـا مـاوەی پـانزە رۆژی تـر نـەتبینم). ئەویش ئاوەهای کردو لە پاش پانزە رۆژەکە هاتـەوە دە درهـەمی پـێ بـوو، بـە هەنـدێکی جـل و بـەرگی کـڕی بـۆ خـاو و خێزانەکـەی و ئـەوی تریشـی دا بـەخواردن بۆیـان، پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم فـەرمووی: (ئائـەوە باشترە بۆت نەك بێی دەست لە خەڵك پان بکەیتەوەو لە رۆژی قیامەتدا ببێتـە پەڵەیەك بە نێوچاوانتەوە، سواڵکردن دروست نیـە بـۆ سـێ کـەس نـەبێت: بـۆ هەژارێکی هیچ نەبوو، یان بۆ قەرزارێك کە قەرزێکی زۆری کەوتبێتـە سـەر، یـا بۆ خوێن خۆشکەرێك کە پارەی خوێنەکەی خستبێتە ئەستۆی خۆیەوە ئەگەر نەیدات بکوژەکە دەکوژنەوەو بۆ ئەو بەئێش و ئازارە).

## باسی خراپی سواڵکردن.

## ٢٧ - باب كَرَاهِيَةِ الْمَسْأَلَةِ.

١٦٤٢ - (صحيح) عَنْ عَوْفُ بْنُ مَالِكٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَبْعَةً، أَوْ ثَمَانِيَةً، أَوْ تِسْعَةً، فَقَالَ: (أَلاَ تُبَايِعُونَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟). - وَكُنَّا حَدِيثَ عَهْدٍ بِبَيْعَةٍ - قُلْنَا: قَدْ بَايَعْنَاكَ حَتَّى قَالَهَا ثَلاَثًا، فَبَسَطْنَا أَيْدِينَا فَبَايَعْنَاهُ، فَقَالَ قَائِلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا قَدْ بَايَعْنَاكَ فَعَلاَمَ نُبَايِعُكَ؟ قَالَ: (أَنْ تَعْبُدُوا اللَّهَ وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَتُصَلُّوا الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ، وَتَسْمَعُوا وَتُطِيعُوا). وَأَسَرَّ كَلِمَةً خُفْيَةً، قَالَ: (وَلاَ تَسْأَلُوا النَّاسَ شَيْئًا). قَالَ: فَلَقَدْ كَانَ بَعْضُ أُولَئِكَ النَّفَرِ يَسْقُطُ سَوْطُهُ، فَمَا يَسْأَلُ أَحَدًا أَنْ يُنَاوِلَهُ إِيَّاهُ.

واتە: لە عەوفی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە حەوت کەس یان هەشت کەس یا نۆ کەس بووین لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (ئایا پەیمان (بەیعەت) نادەن بە پێغەمبەری خوا صلی

الله علیه وسلم؟). - ئێمەش تازە پەیمانمان پێ دابوو - وتمان ئێمە تازە پەیمانمان پێ داوی، هەتا سێ جار فەرموویەوە، ئێمەش دەستمان بۆ درێژکردو پەیمانمان پێ دا، قسەکەرێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! خۆ ئێمە پەیمانمان پێ داوی لەسەر چ شتێ پەیمانت پێ بدەین؟ فەرمووی: (بە تەنیا خوا بپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕیار مەدەن، پێنج فەرزەی نوێژ بە جوانی بکەن، بەگوێی فەرمانڕەوای خۆتان بکەن لە چاکەدا). ئەم وشەیەی بە ئاسپایی چپاند بە گوێماندا فەرمووی: (داوای هیچ شتێ لەکەس مەکەن). راوی وتی: بێگومان لەو کەسانە تێیاندا هەبوو قامچیەکەی لەدەست دەکەوت، داوای لەکەس نەدەکرد بیداتەوە دەستی.

١٦٤٣ - (صحيح) عَنْ ثَوْبَانَ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ تَكَفَّلَ لِي أَنْ لاَ يَسْأَلَ النَّاسَ شَيْئًا وَأَتَكَفَّلَ لَهُ بِالْجَنَّةِ؟). فَقَالَ ثَوْبَانُ: أَنَا. فَكَانَ لاَ يَسْأَلُ أَحَدًا شَيْئًا.

واتە: لە (ثوبان)ی خزمەتکاری پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی بەڵێنم پێ بدات داوای هیچ شتێ لەکەس نەکات، کەفیلی بەهەشتی بۆ دەکەم). (ثوبان) وتی: من. ئیتر(ثوبان) هەتا لە ژیاندا بوو داوای هیچ شتێکی لەکەس نەکرد.

# باسی خۆ بەدورگرتن لە سواڵکردن.

## ٢٨ – باب فِي الاِسْتِعْفَافِ.

١٦٤٤ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، أَنَّ نَاسًا مِنَ الأَنْصَارِ سَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَعْطَاهُمْ، ثُمَّ سَأَلُوهُ فَأَعْطَاهُمْ، حَتَّى إِذَا نَفِدَ مَا عِنْدَهُ، قَالَ: (مَا يَكُونُ عِنْدِي مِنْ خَيْرٍ فَلَنْ أَدَّخِرَهُ عَنْكُمْ، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللَّهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللَّهُ، وَمَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ اللَّهُ، وَمَا أَعْطَى اللَّهُ أَحَدًا مِنْ عَطَاءٍ أَوْسَعَ مِنَ الصَّبْرِ).

واتە: ئەبو سەعیدی خودری دەڵێت: چەند کەسێ لە یاریدەدەران هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و داوایان لێ کرد کە شتێکیان بداتێ، ئەویش پێی دان، لەپاشدا هەم داوایان لێکردەوە ئەویش پێی دان، هەتا ئەو ماڵەی لەلای بوو هەمووی تەواو بوو، فەرمووی: (ئەو خێرو خێراتەی لای من بێت لێتانی ناشارمەوە، هەرکەسێ خۆی بەدوربگرێت لە سواڵکردن و لەوەی خوا حەرامی کردوە خوای گەورە سەربەرزی دەکات و دەیپارێزێ، هەرکەسێکیش چاوی لەدەستی کەس نەبێ و بەرچاو تێربێ خوای گەورە دەوڵەمەندی دەکات، وە هەرکەسێ خۆڕاگربێ خوای گەورە سەبر و ئارامی دەداتێ، گەورەترین بەهرەو خەڵاتێ کە بە کەسێ درابێت بەهرەو خەڵاتی ئارامگرتنە).

١٦٤٥ - (صحيح) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ أَصَابَتْهُ فَاقَةٌ: فَأَنْزَلَهَا بِالنَّاسِ، لَمْ تُسَدَّ فَاقَتُهُ، وَمَنْ أَنْزَلَهَا بِاللَّهِ أَوْشَكَ اللَّهُ لَهُ بِالْغِنَى: إِمَّا بِمَوْتٍ عَاجِلٍ، أَوْ غِنًى عَاجِلٍ).

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ توشی هەژاری و نەداری هات هانا بۆ خەڵك بەرێت و پشتیان پێ ببەستێت ئەوا هەژاری و نەداریەکەی لەکۆڵ نابێتەوەو پێویستیەکانی بۆ دەستەبەر نابێت و بەردەوام هەژار دەبێت، بەڵام ئەو کەسەی هانا بۆ لای خوای گەورە بەرێت و تەنیا پشت بەو ببەستێت ئەوا خوای گەورە دەرووی خێری لێ دەکاتەوە: یان بە مردنی لەناکاو رزگاری دەکات - دەڵێن کەسێ لە نزیکە دەوڵەمەندەکانی دەمرێ و لە میراتەکەی بەر دەکەوێت[١] - ، یا بە زوویی دەوڵەمەندی دەکات).

١٦٤٦ - (ضعيف) عَنِ ابْنِ الْفِرَاسِيِّ، أَنَّ الْفِرَاسِيَّ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَسْأَلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ، وَإِنْ كُنْتَ سَائِلاً لاَ بُدَّ فَاسْأَلِ الصَّالِحِينَ).

واتە: لە ئیبنو فیراسییەوە هاتووە، کە فیراسی وتی بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم! سواڵ بکەم؟

---

[١] - عون المعبود شرح سنن أبي داود لمحمد آبادي.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (نەخێر سوالْ مەكە – داوا لە خەڵك مەكەو پشت بە خوای گەورە ببەستە - ئەگەر هەر چارت نیەو سوالْ دەكەی ئەوا سوالْ لە پیاوچاكان بكە).

**١٦٤٧ - (صحيح) عَنِ ابْنِ السَّاعِدِيِّ قَالَ: اسْتَعْمَلَنِي عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَلَمَّا فَرَغْتُ مِنْهَا وَأَدَّيْتُهَا إِلَيْهِ أَمَرَ لِي بِعُمَالَةٍ، فَقُلْتُ: إِنَّمَا عَمِلْتُ لِلَّهِ وَأَجْرِي عَلَى اللَّهِ. قَالَ: خُذْ مَا أُعْطِيتَ، فَإِنِّي قَدْ عَمِلْتُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَمَّلَنِي، فَقُلْتُ: مِثْلَ قَوْلِكَ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا أُعْطِيتَ شَيْئًا مِنْ غَيْرِ أَنْ تَسْأَلَهُ، فَكُلْ وَتَصَدَّقْ).**

واتە: لە ئیبنو ساعیدییەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێشەوا عومەری كوڕی (خطاب) ڕەزای خوای لێ بێ كردمی بە سەركاری زەكات كۆكردنەوە، كاتێ كە لێبوومەوە زەكاتەكەم بۆ هێنا، وتم: من لەبەر ڕەزامەندی خوا ئەو كارەم كردوە و پاداشتم لەلای خوای گەورەیە، وتی: ئەوەی دەدتدەمێ وەریبگرە، چونكە منیش لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم ئەو كارەم كرد، ئەوەم وت كە تۆ بە منت وت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (ئەگەر شتێكیان دایتێ بە بێ ئەوەی داوای بكەی، بیخۆ و خێریشی لێ بكە).

١٦٤٨ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ وَهُوَ يَذْكُرُ الصَّدَقَةَ، وَالتَّعَفُّفَ مِنْهَا وَالْمَسْأَلَةَ: (الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَالْيَدُ الْعُلْيَا: الْمُنْفِقَةُ، وَالسُّفْلَى: السَّائِلَةُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: اخْتُلِفَ عَلَى أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ فِي هَذَا الْحَدِيثِ قَالَ عَبْدُ الْوَارِثِ: (الْيَدُ الْعُلْيَا: الْمُتَعَفِّفَةُ). وَقَالَ أَكْثَرُهُمْ عَنْ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ: (الْيَدُ الْعُلْيَا: الْمُنْفِقَةُ). وَقَالَ وَاحِدٌ: عَنْ حَمَّادٍ: (الْمُتَعَفِّفَةُ).

واتە: لە (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر مینبەر باسی زەكاتی دەكرد، هەروەها باسی خۆبەدورگرتن لە زەكات وەرگرتن و سوالكردنی دەكرد، فەرمووی: (ئەو دەستەی كاردەكات و دەیبەخشێ چاكترە لەو دەستەی كار ناكات و سوالْ دەكات، (يَدُ الْعُلْيَا) ئەو دەستەیە كە دەیبەخشێ، (يَدُ السُّفْلَى) ئەو دەستەیە كە سوالْ دەكات). ئەبو داود دەڵێت: بە هەرحالْ راویەكان ئەم فەرمودە لە ئەیوبەوە بە دوو شێوە دەگێڕنەوە، لە نافعەوە ئەم فەرمودە هاتووە، كە (عَبْدُ الوَارِث) دەڵێت: (يَدُ الْعُلْيَا). واتە: ئەو دەستەی كە خۆی بەدوردەگرێت لە سوالكردن، زۆربەیان لە حەمادی كوڕی زەیدەوە، لە ئەیوبەوە گێڕاویانەتەوە بە: (يَدُ الْعُلْيَا). واتە: ئەو دەستەی كە دەیبەخشێ، واحید لە حەمادەوە گێڕاویەتیەوە بە: (مُتَعَفِّفَة).

١٦٤٩ - (صحيح) عَنْ مَالِكِ بْنِ نَضْلَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الأَيْدِى ثَلاَثَةٌ: فَيَدُ اللَّهِ الْعُلْيَا، وَيَدُ الْمُعْطِى الَّتِى تَلِيهَا، وَيَدُ السَّائِلِ السُّفْلَى، فَأَعْطِ الْفَضْلَ وَلاَ تَعْجِزْ عَنْ نَفْسِكَ).

واته: لە ماليكی كوڕی (نضلة)ەوە دەگێڕنەوە، كە وتويەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله عليه وسلم فەرموويەتی: (دەست سێ دەستە: دەستی خوای گەورە كە دەستی هەرە بەرز و بالآیە، دەستی بەخشندەو خێركەر كە لەدوای ئەو دێت، وە دەستی داواكەر و سوالكەر كە دەستی ژێرەوەیە، ئەوەی لە خۆت و خانەوادەكەت زيادە لەرێی خوادا ببەخشە بەوانەی كە شايستەن، لە هەژاری مەترسەو بەگوێی نەفس و شەيتان مەكە).

## باسی زەكات دان بە بەنی هاشم

## ٢٩- باب الصَّدَقَةِ عَلَى بَنِى هَاشِمٍ.

١٦٥٠ - (صحيح) عَنْ أَبِى رَافِعٍ، أَنَّ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ رَجُلاً عَلَى الصَّدَقَةِ مِنْ بَنِى مَخْزُومٍ، فَقَالَ لأَبِى رَافِعٍ: اصْحَبْنِى فَإِنَّكَ تُصِيبُ مِنْهَا، قَالَ: حَتَّى آتِىَ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَسْأَلَهُ، فَأَتَاهُ فَسَأَلَهُ؟ فَقَالَ: (مَوْلَى الْقَوْمِ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، وَإِنَّا لاَ تَحِلُّ لَنَا الصَّدَقَةُ).

واتە: لە ئەبو رافیعەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پیاوێکی هۆزی مەخزومی کرد بە سەرکاری زەکات و ناردی، بە ئەبو رافیعی وت: تۆش ببە بە هاوڕێم بەشی تۆشی تێ دەکەوێت، وتی: با بڕۆم لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بپرسم، چوو لێی پرسی؟ فەرمووی: (خزمەتکاری گەل لەخۆیانە، ئێمەش زەکاتمان پێ ناشێت و دروست نیە زەکات وەربگرین).

١٦٥١ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَمُرُّ بِالتَّمْرَةِ الْعَائِرَةِ، فَمَا يَمْنَعُهُ مِنْ أَخْذِهَا إِلاَّ مَخَافَةُ أَنْ تَكُونَ صَدَقَةً.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دای بەلای خورمایەکدا کەوتبو نەدەزانرا خاوەنەکەی کێیە، هیچ شتێ رێگری ئەوەی لێ نەکرد هەڵی بگرێتەوە تەنها ئەوە نەبێت ترسا خورمای زەکات بێت.

١٦٥٢ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَجَدَ تَمْرَةً فَقَالَ: (لَوْلاَ أَنِّي أَخَافُ أَنْ تَكُونَ صَدَقَةً لأَكَلْتُهَا).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خورمایەکی دۆزیەوە لەڕێگادا فەرمووی: (ئەگەر نەترسامایە لەوەی کە ئەو خورمایە هی زەکاتە ئەمخوارد).

١٦٥٣ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: بَعَثَنِى أَبِى إِلَى النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى إِبِلٍ أَعْطَاهَا إِيَّاهُ مِنَ الصَّدَقَةِ.

واتە: لە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: باوکم ناردمی بۆ لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بۆ وشترێ کە لەزەکاتدا پێی دابوو — لەوانەیە ئەم بەسەرهاتە پێش ئەوە بوو بێت کە زەکات لەسەر بەنی هاشم حەرام کرا بێت - .

١٦٥٤ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، نَحْوَهُ، زَادَ: أَبِى يُبْدِلُهَا لَهُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ فەرمودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتووە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: باوکم ناردمی بۆ لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بۆ ئەوەی وشترەکەی بۆ گۆڕێ.

## باسی هەژار زەکاتی خۆی دەکاتە دیاری بۆ دەوڵەمەند.

## ٣٠ – باب الْفَقِيرِ يُهْدِي لِلْغَنِيِّ مِنَ الصَّدَقَةِ.

١٦٥٥ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُتِىَ بِلَحْمٍ، قَالَ: (مَا هَذَا؟) قَالُوا: شَىْءٌ تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ، فَقَالَ: (هُوَ لَهَا صَدَقَةٌ، وَلَنَا هَدِيَّةٌ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گۆشتی بۆ هێنرا، فەرمووی: (ئەمە چی یە؟). وتیان: شتێکە لە زەکاتدا داویانە بە بەریرە - ی خزمەتکاری عائیشە - ، فەرمووی: (ئەمە بۆ ئەو زەکاتە، بۆ ئێمەش دەبێ بە دیاری).

## باسی کەسێ زەکاتێ دەدات لەپاشدا دەبێتەوە بە میراتی.

## ٣٢ – باب مَنْ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ ثُمَّ وَرِثَهَا.

١٦٥٦ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ بُرَيْدَةَ، أَنَّ امْرَأَةً أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ: كُنْتُ تَصَدَّقْتُ عَلَى أُمِّي بِوَلِيدَةٍ، وَإِنَّهَا مَاتَتْ وَتَرَكَتْ تِلْكَ الْوَلِيدَةَ، قَالَ: (قَدْ وَجَبَ أَجْرُكِ، وَرَجَعَتْ إِلَيْكِ فِي الْمِيرَاثِ).

واتە: لە (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی بورەیدەوە، لە باوکیەوە بورەیدە دەگێڕنەوە، کە ئافرەتێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: کارەکەرێکی مندالّم لە زەکاتدا بەخشی بە دایکم، ئێستا دایکم مردووەو کارەکەرەکەی لەپاش بەجێماوە، فەرمووی: (تۆ پاداشتی خۆتت بۆ حەلاڵ بووە، بە میراتیش دەیگێڕینەوە بۆت).

## باسی حەق و مافەكانی ماڵ و سامان.

## ٣٣ - باب فِي حُقُوقِ الْمَالِ.

١٦٥٧ - (حسن) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كُنَّا نَعُدُّ الْمَاعُونَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَارِيَةَ الدَّلْوِ وَالْقِدْرِ.

واتە: لە (عَبدُ اللّه)وە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم ئەو شتانەی كە خەڵك رۆژانە پێویستیان پێی دەبێت وەك خواستنی سەتڵ و مەنجەڵ و قاپ و قاچاغ و پاچ و تەور و ئەو جۆرە شتانەمان بە (مَاعُون) دادەنا، (مَاعُون) واتە ئەو شتانەی كە نابێت رێگریان لێ بكرێت لەوەی كە بدرێن بە خەڵك سودیان لێ ببینن و كارەكانیانی پێ راپەڕێنن.

١٦٥٨ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَا مِنْ صَاحِبِ كَنْزٍ لاَ يُؤَدِّي حَقَّهُ، إِلاَّ جَعَلَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُحْمَى عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَى بِهَا جَبْهَتُهُ وَجَنْبُهُ وَظَهْرُهُ، حَتَّى يَقْضِيَ اللَّهُ تَعَالَى بَيْنَ عِبَادِهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ، ثُمَّ يُرَى سَبِيلُهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِمَّا إِلَى النَّارِ، وَمَا مِنْ صَاحِبِ غَنَمٍ لاَ يُؤَدِّي حَقَّهَا إِلاَّ

جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَوْفَرَ مَا كَانَتْ، فَيُبْطَحُ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ فَتَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا، وَتَطَؤُهُ بِأَظْلاَفِهَا لَيْسَ فِيهَا عَقْصَاءُ وَلاَ جَلْحَاءُ، كُلَّمَا مَضَتْ أُخْرَاهَا رُدَّتْ عَلَيْهِ أُولاَهَا، حَتَّى يَحْكُمَ اللَّهُ بَيْنَ عِبَادِهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ، ثُمَّ يُرَى سَبِيلُهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِمَّا إِلَى النَّارِ، وَمَا مِنْ صَاحِبِ إِبِلٍ لاَ يُؤَدِّي حَقَّهَا إِلاَّ جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَوْفَرَ مَا كَانَتْ، فَيُبْطَحُ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ، فَتَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا، كُلَّمَا مَضَتْ عَلَيْهِ أُخْرَاهَا رُدَّتْ عَلَيْهِ أُولاَهَا، حَتَّى يَحْكُمَ اللَّهُ تَعَالَى بَيْنَ عِبَادِهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ، ثُمَّ يُرَى سَبِيلُهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِمَّا إِلَى النَّارِ).

واته: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: هیچ خاوەن خەزێنەیەك کە زەکاتەکەی نەدات، خوای گەورە لە ئاگری دۆزەخدا بەو سامان و ئاڵتون و زیوە سووروٚ بووە روویان و تەنیشتیان و پشتیان پێ داخ دەکات، هەتا ئەو کاتەی کە خوای گەورە بڕیار دەدات لەنێوان بەندەکانیدا لە ڕۆژێکدا کە ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە لەو ساڵانەی ئێوە دەیژمێرن، لەپاشدا ڕێگەی پێ نیشان دەدرێت بۆ بەهەشت، یان بۆ ئاگری دۆزەخ، وە هیچ خاوەن مەڕێك نیە کە زەکاتی مەڕەکانی نەدابێت ئیللا لەرۆژی قیامەتدا دەهێنرێت لەدەشتێکی تەخت و

ڕێـك و فراوانـدا لەسـەر دەم رادەخـرێ بۆیـان، بـە سمـەکانیان دەیشـێلن و بـە شـاخەکانیان لێـی دەدەن، لـەو کاتـەدا ئـەو مەڕانـە قەڵـەوتر و بـەهێزترن نەیـەکێکیان کەمـە نـە شـاخەکانیان چـەماوەیەو نـە بـێ شاخیشـن واتـە هـەموویان شـاخدارن و شـاخەکانیان راسـتەو کـوڵ نـین، هـەرکاتێ دواینیـان بەسـەریدا تێپـەڕی یەکەمەکـەیان دەگەڕێتـەوە سـەری، هـەتا ئـەو کاتـەی کـە خوای گەورە بڕیـار دەدات لـەنێوان بەندەکانیـدا لـە ڕۆژێکدا کـە ئەندازەکـەی پەنجا هـەزار سـاڵە لـەو سـالآنەی ئێـوە دەیـژمێرن، لەپاشـدا ڕێگـەی پـێ نیشان دەدرێت بۆ بەهەشت، یان بۆ ئاگری دۆزەخ، وە هـیچ خـاوەن وشـترێك نیـە کـە زەکـاتی وشـترەکانی نـەدابێت ئـیللا لـەرۆژی قیامەتـدا دەهێنرێـت لەدەشـتێکی تـەخت و ڕێـك و فراوانـدا لەسـەر دەم رادەخـرێ بۆیـان، هـەتا بڵێیـت ئـەو وشترانە زلن و یەك دانەشیان کەم نیە ئیتر بە سمەکانیان دەیشێلن، هـەرکاتێ دواینیـان بەسـەریدا تێپـەڕی یەکەمەکـەیان دەگەڕێتـەوە سـەری، هـەتا ئـەو کاتـەی کـە خـوای گـەورە بڕیـار دەدات لـەنێوان بەندەکانیـدا لـە ڕۆژێکـدا کـە ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە لەو سالآنەی ئێـوە دەیـژمێرن، لەپاشـدا ڕێگـەی پێ نیشان دەدرێت بۆ بەهەشت، یان بۆ ئاگری دۆزەخ).

**١٦٥٩ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَهُ. قَالَ فِي قِصَّةِ الإِبِلِ بَعْدَ قَوْلِهِ: (لاَ يُؤَدِّي حَقَّهَا). قَالَ: (وَمِنْ حَقِّهَا حَلْبُهَا يَوْمَ وِرْدِهَا).**

واتـە: ئـەبو هـورەیرە بـە هـەمان شـێوە فـەرمودەی پێشـوی گێڕایـەوە،، لـە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم. راوی لە بەسـەرهاتی وشـترەکاندا وتـی: لەدوای وتەی: (ئەگەر حەق و مافی مافدارانی لـێ نـەدابێت) فـەرمووی: (یـەکێ

لەو مافانەی لە وشتردا هەیە ئەوەیە: ئەو رۆژەی كە وشترەكە دەبرێت بۆ سەرئاو و ئاو دەدرێ و دەدۆشرێت – ئەو شیرە مافی هەژارانی پێوەیە - ).

١٦٦٠ - (حسن بما بعده) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَ هَذِهِ الْقِصَّةِ. فَقَالَ لَهُ - يَعْنِى لأَبِى هُرَيْرَةَ -: فَمَا حَقُّ الإِبِلِ؟ قَالَ: تُعْطِى الْكَرِيمَةَ، وَتَمْنَحُ الْغَزِيرَةَ، وَتُفْقِرُ الظَّهْرَ، وَتُطْرِقُ الْفَحْلَ، وَتَسْقِى اللَّبَنَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم. بە هەمان شێوە فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە، بە ئەبو هورەیرەیان وت: حەق و مافی وشتر چییە؟ وتی: لە چاكترینی ببەخشرێت، ئەوەی كە شیری زۆرە بدرێت بە هەژارێ لەشیرەكەی بخوات هەتا شیری نامێنێت، دوای ئەوە بیداتەوە بە خاوەنەكەی، هەروەها ئەوەی بۆ سواری دەست دەدات ئەگەر یەكێ پێویستی پێی هەبوو بیداتێ هەتا پێویستیەكەی دەردەكات، ئەگەر یەكێ داوای كرد تاكو لەگەڵ مێیەكەی كەڵ بگرێت بیداتێ، لەشیرەكەی بەشی هەژار و نەدار بدات.

١٦٦١ - (صحيح) عَنْ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا حَقُّ الإِبِلِ؟ فَذَكَرَ نَحْوَهُ، زَادَ: (وَإِعَارَةُ دَلْوِهَا).

واتە: لە عوبەیدی كوڕی عومەیرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم! حەق و مافی وشتر چییە؟ راوی بە

هەمان شێوە فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: (خواستنی سەتڵەکەی – واتە ئەو سەتڵەی کە وشترەکە ئاوی تێدا دەخواتەوە ئەگەر کەسێ پێویستی پێی هەبوو بیداتێ - ).

١٦٦٢ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَ مِنْ كُلِّ جَادٍّ عَشَرَةِ أَوْسُقٍ مِنَ التَّمْرِ بِقِنْوٍ يُعَلَّقُ فِي الْمَسْجِدِ لِلْمَسَاكِينِ.

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ الله)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی کرد لە هەموو خورمایەکی چنراو لە دە ویسق خورما هێشویەك ببەخشرێت لەمزگەوتدا هەڵبواسرێت بۆ ئەوەی هەژاران لێی بخۆن – ئەمەش بۆ جگە لە زەکاتە - .

١٦٦٣ - (صحيح) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ إِذْ جَاءَ رَجُلٌ عَلَى نَاقَةٍ لَهُ، فَجَعَلَ يَصْرِفُهَا يَمِينًا وَشِمَالاً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ كَانَ عِنْدَهُ فَضْلُ ظَهْرٍ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لاَ ظَهْرَ لَهُ، وَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ فَضْلُ زَادٍ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لاَ زَادَ لَهُ). حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ لاَ حَقَّ لأَحَدٍ مِنَّا فِي الْفَضْلِ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە، کە وتویەتی: لەسەفەرێکدا

لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بووین صلی الله علیه وسلم پیاوێ بەسەر وشترەکەیەوە هات، وشترەکەی نەیدەتوانی رێ بکات بۆیە سەری وشترەکەی بەلای راست و چەپدا وەردەگێڕا بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بیبینێ و وشترێکی تری بداتێ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هەر کەسێ وڵاخی سواری زیاد لە پێویستی خۆی پێیە بابیدات بەو کەسەی وڵاخی سواری نیەو پێویستیەتی، هەر کەسێ خواردنی زیادی پێیە بابیدات بەو کەسەی کە پێی نیە). هەتا وامان دەزانی هیچ کەسێ لە ئێمە ماڤی بەسەر ئەو شتەوە نیە کە لەخۆی زیادە.

١٦٦٤ - (ضعيف) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ ). قَالَ: كَبُرَ ذَلِكَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، فَقَالَ عُمَرُ: أَنَا أُفَرِّجُ عَنْكُمْ. فَانْطَلَقَ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ إِنَّهُ كَبُرَ عَلَى أَصْحَابِكَ هَذِهِ الآيَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:: (إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَفْرِضِ الزَّكَاةَ إِلاَّ لِيُطَيِّبَ مَا بَقِيَ مِنْ أَمْوَالِكُمْ، وَإِنَّمَا فَرَضَ الْمَوَارِيثَ لِتَكُونَ لِمَنْ بَعْدَكُمْ). فَكَبَّرَ عُمَرُ، ثُمَّ قَالَ لَهُ: (أَلاَ أُخْبِرُكَ بِخَيْرِ مَا يَكْنِزُ الْمَرْءُ؟ الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ: إِذَا نَظَرَ إِلَيْهَا سَرَّتْهُ، وَإِذَا أَمَرَهَا أَطَاعَتْهُ، وَإِذَا غَابَ عَنْهَا حَفِظَتْهُ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی:

كاتێ كە ئەم ئایەتە دابەزی: (وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ ). واتە: وە ئەوانەی ئاڵتونو زیوو سەریەك دەنێن و كۆدەكەنەوە. ئەمە لەسەر موسوڵمانان قورس و گران بوو، عومەر وتی: من بە پرسیاركردن لەپێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم ئەم قورسی و گرانیەتان لەسەر لادەبەم، رۆشت بۆ لای پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم! ئەم ئایەتە لەسەر هاوەڵانت قورس و گرانە، پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرمووی: (خوای گەورە بۆیە زەكاتی لەسەر فەرز كردون بۆ ئەوەی ئەو ماڵەی كە ماوتانە پاك بێتەوە، میراتیشی فەرز كردوە بۆ ئەوانەی دوای خۆتان). پێشەوا عومەر (الله أكبر)ی كرد، لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم پێی فەرموو: (رێنمونیتان نەكەم بۆ شتێ كە پیاو پاشەكەوتی بكات؟ هاوسەرێكی چاك و لەخوا ترس: ئەگەر تەماشایكرد دڵخۆشی بكات، ئەگەر فەرمانی بەسەردا دا گوێڕایەڵی بكات، گەر لەماڵ نەبوو یان لێی دووركەوتەوەو چووە سەفەرێك پارێزگاری لە ماڵەكەی و نەفسی بكات).

## باسی حەق و مافی سواڵكەر.

## ٣٤ – باب حَقِّ السَّائِلِ.

١٦٦٥ - (ضعيف) عَنْ حُسَيْنِ بْنِ عَلِيٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:: (لِلسَّائِلِ حَقٌّ وَإِنْ جَاءَ عَلَى فَرَسٍ).

واتە: لە حەسەنی كوڕی عەلیەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: (سواڵكەر حەقی هەیەو دەبێ بەشی بدرێت ئەگەر بەسواری ئەسپیشەوە سواڵ بكات).

١٦٦٦ - (ضعيف) عَنْ عَلِيّ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، مِثْلَهُ.

واتە: پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ فەرمودەی پێشوی بە هەمان شێوە گێڕایەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم.

١٦٦٧ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ بُجَيْدٍ، عَنْ جَدَّتِهِ أُمِّ بُجَيْدٍ - وَكَانَتْ مِمَّنْ بَايَعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - أَنَّهَا قَالَتْ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْكَ)، إِنَّ الْمِسْكِينَ لَيَقُومُ عَلَى بَابِي، فَمَا أَجِدُ لَهُ شَيْئًا أُعْطِيهِ إِيَّاهُ؟! فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنْ لَمْ تَجِدِي لَهُ شَيْئًا تُعْطِينَهُ إِيَّاهُ إِلاَّ ظِلْفًا مُحْرَقًا فَادْفَعِيهِ إِلَيْهِ فِي يَدِهِ).

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی بوجەیدەوە، لە نەنكیەوە دایكی بوجەید هاتووە – كە یەكێ بوو لەو ئافرەتانەی بەیعەتی دا بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم – پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، هەژارێ دێتە بەر دەرگاكەم بۆ سوالكردن، منیش هیچم نیە هەتا بیدەمێ؟! پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەگەر هەر هیچت نەبوو بیدەیتێ تەنها لاسمی مەڕێ نەبێ بیدە دەستی با بڕوات – مەبەستی ئەوەیە با كەمیش بێت - ).

## باسی چاکەکردن لەگەڵ ئەو خاوەن نامانەی کە خاوەنی پەیمانن.

## ٣٥ - باب الصَّدَقَةُ عَلَى أَهْلِ الذِّمَّةِ.

١٦٦٨ - (صحيح) عَنْ أَسْمَاءَ قَالَتْ: قَدِمَتْ عَلَيَّ أُمِّي رَاغِبَةً فِي عَهْدِ قُرَيْشٍ وَهِيَ رَاغِمَةٌ مُشْرِكَةٌ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ: إِنَّ أُمِّي قَدِمَتْ عَلَيَّ وَهِيَ رَاغِمَةٌ مُشْرِكَةٌ أَفَأَصِلُهَا؟ قَالَ: (نَعَمْ فَصِلِي أُمَّكِ).

واتە: لە ئەسمائەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دایکم لەسەردەمی پەیمانی قورەیشدا هاتە لام کە ئەو بت پەرست بوو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دایکم هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەرە هاتووە بۆ لام ئایا پەیوەندی دایکایەتی بەجێبێنم؟ فەرمووی: (بەڵێ با پەیوەندیت لەگەڵی هەبێ).

# باسی ئەو شتەی كە دروست نیە قەدەغەبكرێت لە خەڵك.

## ٣٥ - باب مَا لاَ يَجُوزُ مَنْعُهُ.

١٦٦٩ - (ضعيف) عَنِ امْرَأَةٍ يُقَالُ لَهَا بُهَيْسَةُ، عَنْ أَبِيهَا قَالَتْ: اسْتَأْذَنَ أَبِى النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدَخَلَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ قَمِيصِهِ فَجَعَلَ يُقَبِّلُ وَيَلْتَزِمُ، ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الشَّىْءُ الَّذِى لاَ يَحِلُّ مَنْعُهُ؟ قَالَ: (الْمَاءُ). قَالَ: يَا نَبِىَّ اللَّهِ مَا الشَّىْءُ الَّذِى لاَ يَحِلُّ مَنْعُهُ؟ قَالَ: (الْمِلْحُ). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الشَّىْءُ الَّذِى لاَ يَحِلُّ مَنْعُهُ؟ قَالَ: (أَنْ تَفْعَلَ الْخَيْرَ خَيْرٌ لَكَ).

واتە: لە ئافرەتێكەوە كە ناوی (بُهَیْسَة) بوو، لە باوكیەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: باوكم مۆڵەتی وەرگرت لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم سەری كرد بەژێر كراسەكەیداو جەستەی موبارەكی ماچ كرد و رووی خۆی هەڵسو لە جەستەی، لەپاشدا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم چ شتێك دروست نیە قەدەغەبكرێت؟ فەرمووی: (ئاو). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم چ شتێك دروست نیە قەدەغەبكرێت؟ فەرمووی: (خوێ). هەروەها وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم چ شتێك دروست نیە قەدەغەبكرێت؟ فەرمووی: (هەر چاكەیە بكەیت ئەوە بۆ خۆت چاكترە).

## باسی سواڵكردن لە مزگەوتدا.

## ٣٦ – باب الْمَسْأَلَةِ فِي الْمَسَاجِدِ.

١٦٧٠ - (ضعيف) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هَلْ مِنْكُمْ أَحَدٌ أَطْعَمَ الْيَوْمَ مِسْكِينًا). فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ، فَإِذَا أَنَا بِسَائِلٍ يَسْأَلُ، فَوَجَدْتُ كِسْرَةَ خُبْزٍ فِي يَدِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، فَأَخَذْتُهَا مِنْهُ فَدَفَعْتُهَا إِلَيْهِ.

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی ئەبو بەكرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئایا هیچ كەسێ لە ئێوە ئەمڕۆ خواردنی داوە بە هەژارێ؟). ئەبو بەكر رەزای خوای لێ بێ وتی: كاتێ كە هاتمە ژوورەوە بۆ ناو مزگەوت بینیم سواڵكەرێ سواڵ دەكات، منیش پارچەیە نانم بەدەست (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕمەوە دی لێم وەرگرت و دام بە سواڵكەرەكە.

## باسی کەراهەتی سواڵکردن بە سوێند و بە ناوی خوای گەورەوە.

## ٣٧ – باب كَرَاهِيَةِ الْمَسْأَلَةِ بِوَجْهِ اللَّهِ تَعَالَى.

١٦٧١ - (ضعيف) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ يُسْأَلُ بِوَجْهِ اللَّهِ إِلاَّ الْجَنَّةُ).

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هیچ شتێ لەبەر خاتری خوای گەورەو بە سوێند داوا ناکرێ جگە لە بەهەشت).

## باسی بەخشینی ماڵ بە کەسێ کە بەناوی خواوە داوا دەکات.

## ٣٨ – باب عَطِيَّةِ مَنْ سَأَلَ بِاللَّهِ.

١٦٧٢ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنِ اسْتَعَاذَ بِاللَّهِ فَأَعِيذُوهُ، وَمَنْ سَأَلَ بِاللَّهِ فَأَعْطُوهُ، وَمَنْ دَعَاكُمْ فَأَجِيبُوهُ، وَمَنْ صَنَعَ

إِلَيْكُمْ مَعْرُوفًا فَكَافِئُوهُ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا مَا تُكَافِئُونَهُ فَادْعُوا لَهُ حَتَّى تَرَوْا أَنَّكُمْ قَدْ كَافَأْتُمُوهُ).

واتە: لە (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ پەنای بردە بەر خودا داوای پەنادانی لێکردن،پەنای بدەن، هەرکەسێ بە ناوی خواوە داوای شتێکی رەوای لێ کردن بیدەنێ، هەرکەسێ بانگی لێ کردن وەڵامی بدەنەوەو بچن بە دەم داواکەیەوە، هەرکەسێ چاکەیەکی لەگەڵ کردن پاداشتی بدەنەوە، ئەگەر نەتان بوو پاداشتی بدەنەوە دوعای خێری بۆ بکەن هەتا دڵنیا دەبن کە پاداشتتان داوەتەوە).

## باسی کەسێ هەرچی هەیە بیکات بەخێر.

## ٣٩ – باب الرَّجُلِ يَخْرُجُ مِنْ مَالِهِ.

١٦٧٣ - (ضعيف) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذْ جَاءَ رَجُلٌ بِمِثْلِ بَيْضَةٍ مِنْ ذَهَبٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَصَبْتُ هَذِهِ مِنْ مَعْدِنٍ، فَخُذْهَا فَهِيَ صَدَقَةٌ مَا أَمْلِكُ غَيْرَهَا، فَأَعْرَضَ عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ أَتَاهُ مِنْ قِبَلِ رُكْنِهِ الأَيْمَنِ، فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ

أَتَاهُ مِنْ قِبَلِ رُكْنِهِ الأَيْسَرِ فَأَعْرَضَ عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ أَتَاهُ مِنْ خَلْفِهِ، فَأَخَذَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَحَذَفَهُ بِهَا، فَلَوْ أَصَابَتْهُ لأَوْجَعَتْهُ، أَوْ لَعَقَرَتْهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَأْتِي أَحَدُكُمْ بِمَا يَمْلِكُ فَيَقُولُ: هَذِهِ صَدَقَةٌ، ثُمَّ يَقْعُدُ يَسْتَكِفُّ النَّاسَ! خَيْرُ الصَّدَقَةِ مَا كَانَ عَنْ ظَهْرِ غِنًى).

واتە: لە جابری کوڕی (عبْدُ اللّه)ی (أنصارِیّ)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بووین، لەو کاتەدا پیاوێ هات ئەوەندەی هێلکەیە ئاڵتونی هێنا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەمەم لە کانگایە دەرهێناوە، لێم وەربگرە دەمەوێ بیکەم بە خێر، تەنها هەر ئەوەش ماڵ و سامانم هەیە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رووی لێ وەرگێڕا، لەلای راستیەوە هاتەوە قسەکەی پێشووی دووبارە کردەوە دیسانەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رووی لێ وەرگێڕایەوە، لەلای چەپیەوە هاتەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رووی لێ وەرگێڕایەوە، لەپاشدا لەپشتیەوە هاتەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لێی وەرگرت و تێی گرت ئەگەر بەری بکەوتایە ئازاری پێ دەگەیاند یان برینداری دەکرد، ئینجا فەرمووی: (کەسێ لە ئێوە دێت هەرچی هەیە دەیکات بەخێر، لەپاشدا دادەنیشێ و دەست پان دەکاتەوە لە خەڵك و سواڵ دەکات، چاکترین خێر ئەو خێرەیە کە لەسەر تێری بکرێت).

**١٦٧٤ - (ضعيف) عَنِ ابْنِ إِسْحَاقَ، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ، زَادَ: (خُذْ عَنَّا مَالَكَ لاَ حَاجَةَ لَنَا بِهِ).**

واتە: لە ئیبنو ئیسحاقەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان سەنەد و مانا هاتووە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هانێ ماڵەکەتمان لێ وەربگرە هیچ پێویستیەکمان پێی نیە).

**١٦٧٥ - (حسن) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: دَخَلَ رَجُلٌ الْمَسْجِدَ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّاسَ أَنْ يَطْرَحُوا ثِيَابًا، فَطَرَحُوا، فَأَمَرَ لَهُ مِنْهَا بِثَوْبَيْنِ، ثُمَّ حَثَّ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَجَاءَ فَطَرَحَ أَحَدَ الثَّوْبَيْنِ، فَصَاحَ بِهِ، وَقَالَ: (خُذْ ثَوْبَكَ).**

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێکی رووت و رەجاڵ هاتە مزگەوتەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا پۆشاکێکی بدەنێ هەتا خۆی پێ پۆشتە بکاتەوە، پۆشاکەکەیان دایە، فەرمانی دا بیکەن بە دوو پۆشاك بۆی، لەپاشدا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم خەڵکەکەی هاندا بۆ ئەوەی کە خێر و سەدەقە بکەن، ئەویش هات پۆشاکێکیانی کرد بە خێر، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سەرزەنشتی کرد و لێی تورە بوو ، وە پێشی فەرموو: (پۆشاکەکەت بگرە چونکە تەنها ئەوەت هەیە خۆت پێویستت پێیەتی).

١٦٧٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ خَيْرَ الصَّدَقَةِ مَا تَرَكَ غِنًى، أَوْ تُصُدِّقَ بِهِ عَنْ ظَهْرِ غِنًى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (چاکترین خێر ئەو خێرەیە کە بەشی پێویستی لێ بهێڵرێتەوە، یان لەسەر تێری بکرێت، لە خزم و کەسوکاری خۆشتەوە دەست پێ بکە واتە لەپێشدا خێرو خێرات بدە بە خزم و کەسوکاری خۆت).

## باسی ڕوخسەت لەمەدا واتە لەوەدا کە هەرچی هەیە بیکات بەخێر .

## ٤٠ - باب فِي الرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ.

١٦٧٧ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (جَهْدُ الْمُقِلِّ، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم! کام خێرە چاکترینە؟ فەرمووی: (ئەو خێرەی کە نەدار و کەمدەست دەیکات بە پێی توانای خۆی، لە خزم و کەسوکاری خۆشتەوە دەست پێ بکە واتە لەپێشدا خێر خێرات بدە بە خزم و کەسوکاری خۆت).

١٦٧٨ - (حسن) عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا أَنْ نَتَصَدَّقَ، فَوَافَقَ ذَلِكَ مَالاً عِنْدِي، فَقُلْتُ: الْيَوْمَ أَسْبِقُ أَبَا بَكْرٍ إِنْ سَبَقْتُهُ يَوْمًا، فَجِئْتُ بِنِصْفِ مَالِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا أَبْقَيْتَ لأَهْلِكَ؟). قُلْتُ: مِثْلَهُ. قَالَ: وَأَتَى أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ بِكُلِّ مَا عِنْدَهُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا أَبْقَيْتَ لأَهْلِكَ؟). قَالَ: أَبْقَيْتُ لَهُمُ اللَّهَ وَرَسُولَهُ!. قُلْتُ: لاَ أُسَابِقُكَ إِلَى شَيْءٍ أَبَدًا.

واتە: لە عومەری کوڕی (خطاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ڕۆژێ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ کردین کە خێر و سەدەقە بکەین، وا ڕێکەوت ماڵ و سامانێکم هەبوو، لەدڵی خۆمدا وتم: ئەمڕۆ پێش ئەبو بەکر دەدەمەوە کە هەرگیز پێشی نەکەوتووم، جا نیوەی ماڵ و سامانەکەم هێنا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (چیت بۆ خێزانەکەت هێشتۆتەوە؟). وتم: ئەوەندەی ئەمە، عومەر وتی: جا ئەبو بەکر هات بە خۆی و هەرچیەوە کە هەیبوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (چیت بۆ خێزانەکەت هێشتۆتەوە؟). وتی: خواو پێغەمبەرەکەی، وتم: ناتوانم لە هیچ شتێکدا پێشبڕکێت لەگەڵ بکەم.

# باسی سەبارەت بە فەزڵی ئاودان بە خەڵك.

## ٤١ – باب فِي فَضْلِ سَقْيِ الْمَاءِ.

١٦٧٩ - (حسن) عَنْ سَعِيدٍ، أَنَّ سَعْدًا أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: أَيُّ الصَّدَقَةِ أَعْجَبُ إِلَيْكَ؟ قَالَ: (الْمَاءُ).

واتە: لە سەعیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: سەعد هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: کام خێرە چاکترینە بەلاتەوە ؟ فەرمووی: (ئاو).

١٦٨٠ - (حسن) عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ.

واتە: لە سەعدی کوڕی عوبادە فەرمودەی پێشوی بە هەمان شێوە گێڕاوەتەوە، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم.

١٦٨١ - (حسن) عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أُمَّ سَعْدٍ مَاتَتْ فَأَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (الْمَاءُ). قَالَ: فَحَفَرَ بِئْرًا، وَقَالَ: هَذِهِ لأُمِّ سَعْدٍ.

واتە: لە سەعدی كوڕی عوبادەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دایكی سەعد مردووە چ خێر و سەدەقەیە چاكترینە كە بۆی بكرێت؟ فەرمووی: (ئاو). راوی وتی: سەعد بیرێكی هەڵكەندو وتی: خێر و پاداشتی ئاوی ئەم بیرە بۆ دایكی سەعد.

١٦٨٢ - (ضعيف) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (أَيُّمَا مُسْلِمٍ كَسَا مُسْلِمًا ثَوْبًا عَلَى عُرْيٍ كَسَاهُ اللَّهُ مِنْ خُضْرِ الْجَنَّةِ، وَأَيُّمَا مُسْلِمٍ أَطْعَمَ مُسْلِمًا عَلَى جُوعٍ أَطْعَمَهُ اللَّهُ مِنْ ثِمَارِ الْجَنَّةِ، وَأَيُّمَا مُسْلِمٍ سَقَى مُسْلِمًا عَلَى ظَمَإٍ سَقَاهُ اللَّهُ مِنَ الرَّحِيقِ الْمَخْتُومِ).

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (هەر موسوڵمانێ موسوڵمانێكی رووت پۆشتە بكاتەوە ئەوە خوا لە پۆشاكی سەوزی بەهەشت پۆشتەی دەكاتەوە، وە هەر موسوڵمانێ خۆراك بدات بە موسوڵمانێكی برسی و تێری بكات خوا لە بەروبووم و میوەی بەهەشت تێری دەكات، وە هەر موسوڵمانێ موسوڵمانێكی تینو تێراو بكات خوای گەورە شەرابی پاكی بەهەشتی دەرخوارد دەدا).

## باسی ئەو بزنەیە کە دەدرێت بە هەژارێ لە شیرەکەی بخوات و سودی لێ وەربگرێت لەپاشدا دەیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی.

## ٤٢ - باب فِي الْمَنِيحَةِ.

١٦٨٣ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَرْبَعُونَ خَصْلَةً أَعْلاَهُنَّ مَنِيحَةُ الْعَنْزِ، مَا يَعْمَلُ رَجُلٌ بِخَصْلَةٍ مِنْهَا رَجَاءَ ثَوَابِهَا، وَتَصْدِيقَ مَوْعُودِهَا إِلاَّ أَدْخَلَهُ اللَّهُ بِهَا الْجَنَّةَ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: فِي حَدِيثِ مُسَدَّدٍ، قَالَ حَسَّانُ: فَعَدَدْنَا مَا دُونَ مَنِيحَةِ الْعَنْزِ مِنْ رَدِّ السَّلاَمِ، وَتَشْمِيتِ الْعَاطِسِ، وَإِمَاطَةِ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَنَحْوِهِ، فَمَا اسْتَطَعْنَا أَنْ نَبْلُغَ خَمْسَ عَشْرَةَ خَصْلَةً.

واتە: لە (عَبْدُ الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (چل کاری باش هەیە هەرە گەورەکەیان ئەو بزنە شیردەرەیە کە دەدرێت بە هەژارێ لە شیرەکەی بخوات لەپاشدا بیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی، ئەوەی یەکێ لەم کارە باشانە بکات، بە هیوای پاداشتی باش بێت، باوەڕی بەو بەڵێنە هەبێت، ئەوە خوای گەورە

دەیباتــە بەهەشــتەوە). ئــەبو داود دەڵێــت: لــە فەرمودەکــەی موســەددەددا، حەسسان دەڵێ: جگە لـە (مَنِيحَـةِ الْعَنْـز) ئەمانـەمان لـێ ژمـاردن: وەڵامدانـەوەی سـەلام، ئەگـەر کەسـێ پـژمی وتـی: (الحمـد لله) پێـی بوترێـت: (يرحمـك الله) ، لابردنی ئازارێ لەسەرە رێگادا، هـەروەها هاوشـێوەی ئەمانـە، نـەمانتوانی هـەتا پانزەیان لێ بژمێرین.

## باسی پاداشتی کلیلەوان.

## ٣٤ – باب أَجْرِ الْخَازِنِ.

١٦٨٤ - (صحيح) عَنْ أَبِى مُوسَى قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ الْخَازِنَ الأَمِينَ الَّذِى يُعْطِى مَـا أُمِـرَ بِهِ كَامِلاً مُوَفَّرًا طَيِّبَةً بِهِ نَفْسُهُ، حَتَّى يَدْفَعَهُ إِلَى الَّذِى أُمِرَ لَهُ بِهِ: أَحَدُ الْمُتَصَدِّقَيْنِ).

واتــە: لــە ئــەبو موســا – ی ئەشــعەریەوە - دەگێڕنــەوە، کــە وتویــەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: کلیل بەدەسـتی دەسـت پـاك کاتێ ئەو فەرمانەی کە خاوەن مـاڵ پێـی دەکـات بـە بەخشـینی مـاڵ و سـامانێ، ئەگەر ئەو کارەی کە پێی سپێردراوە بـە تـەواوی و بـە خۆشـحاڵیەوە ئـەنجامی بدات، هەتا دەیدات بەو کەسەی کە پێی وتراوە: دەبێتە یەکێ لـە خێرکـەرەکان - واتە خاوەن ماڵ و سامانەکە خێرکەرێك و ئەویش دەبێتە خێرکەرێك و وەك ئەو پاداشتی بۆ هەیە - .

## باسی بەخشینی ئافرەت لە ماڵی مێردەکەی.

## ٤٤ – باب الْمَرْأَةِ تَتَصَدَّقُ مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا.

١٦٨٥ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا أَنْفَقَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا غَيْرَ مُفْسِدَةٍ، كَانَ لَهَا أَجْرُ مَا أَنْفَقَتْ، وَلِزَوْجِهَا أَجْرُ مَا اكْتَسَبَ، وَلِخَازِنِهِ مِثْلُ ذَلِكَ، لاَ يَنْقُصُ بَعْضُهُمْ أَجْرَ بَعْضٍ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ کە ژنێ لە ماڵی مێردەکەی خۆراکێ دەبەخشێ بە مەرجێ مەبەستی بە فێڕۆدانی نەبێت، ئەوە پاداشتی باشی بۆ هەیە لەسەر ئەو بەخشینە، هەروەها مێردەکەشی پاداشتی باشی بۆ هەیە چونکە ئەو پەیدای کردوە، هەروەها کلیل بەدەستەکەشی بە هەمان شێوە پاداشتی باشی بۆ هەیە، هەندێکیان پاداشتی هەندێکی تریان کەم ناکەنەوە).

١٦٨٦ - (ضعيف) عَنْ سَعْدٍ قَالَ: لَمَّا بَايَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النِّسَاءَ قَامَتِ امْرَأَةٌ جَلِيلَةٌ كَأَنَّهَا مِنْ نِسَاءِ مُضَرَ، فَقَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ إِنَّا كَلٌّ عَلَى آبَائِنَا

وَأَبْنَائِنَا - قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَأُرَى فِيهِ: وَأَزْوَاجِنَا - فَمَا يَحِلُّ لَنَا مِنْ أَمْوَالِهِمْ؟ فَقَالَ: (الرَّطْبُ تَأْكُلْنَهُ وَتُهْدِينَهُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الرَّطْبُ الْخُبْزُ، وَالْبَقْلُ، وَالرُّطَبُ.

واتە: لە سەعدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە ئافرەتان پەیمانیان دا بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئافرەتێکی بە تەمەنی خاوەن پلەو پایە ئەتوت لە ئافرەتانی هۆزی (مُضر)ە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئێمەی ئافرەتان بارین بەسەر باوباپیران و نەوەکانمانەوەو ئەوان بەخێومان دەکەن، ئەبو داود دەڵێت: وا ئەزانم فەرمودەکە ئەمەشی تێدایە: وە بەسەر مێردەکانیشمانەوە — لە ماڵ و سامانەکانیان چی بۆ ئێمە حەلاڵە؟ فەرمووی: (شلەمەنی و خورمای تەڕ بیخۆن و لێشی ببەخشن) ئەبو داود دەڵێت: (رَطب). نان و سەوزەوات و خورمای تەڕ دەگرێتەوە.

١٦٨٧ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا أَنْفَقَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ كَسْبِ زَوْجِهَا مِنْ غَيْرِ أَمْرِهِ فَلَهَا نِصْفُ أَجْرِهِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (کاتێ کە ژنێ لە ماڵ و سامانی مێردەکەی دەبەخشێ بەبێ ئەوەی فەرمانی پێ بدات، نیوەی پاداشتەکەی بۆ دەنوسرێت).

١٦٨٨ - (صحيح موقوف) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ: فِى الْمَرْأَةِ تَصَدَّقُ مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا؟ قَالَ: لاَ، إِلاَّ مِنْ قُوتِهَا وَالأَجْرُ بَيْنَهُمَا، وَلاَ يَحِلُّ لَهَا أَنْ تَصَدَّقَ مِنْ مَالِ زَوْجِهَا إِلاَّ بِإِذْنِهِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، سەبارەت بە ژنێ لە ماڵ و سامانی مێردەکەی دەبەخشێ ئایا دروستە یان نا؟ ئەویش وتویەتی: نەخێر دروست نیە مەگەر لە بەشە رۆزی خۆی پاداشتەکەشی بۆ هەردوکیان دەبێت، وە بە رەزامەندی و مۆڵەتی مێردەکەی نەبێت دروست نیە لە ماڵ و سامانی مێردەکەی ببەخشێ.

## باسی پەیوەندی خزمایەتی.

## ٤٦ - باب فِى صِلَةِ الرَّحِمِ.

١٦٨٩ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ (لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ). قَالَ أَبُو طَلْحَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَى رَبَّنَا يَسْأَلُنَا مِنْ أَمْوَالِنَا، فَإِنِّى أُشْهِدُكَ أَنِّى قَدْ جَعَلْتُ أَرْضِى بِأَرِيحَاءَ لَهُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اجْعَلْهَا فِى قَرَابَتِكَ). فَقَسَمَهَا بَيْنَ حَسَّانَ بْنِ ثَابِتٍ، وَأُبَىِّ بْنِ كَعْبٍ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کاتێ کەی ئەم ئایەتە دابەزی: (لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ). واتە: ئێوە هەرگیز بەخێر و چاکە ناگەن هەتا بەختی نەکەن هەندێ لەو دارایییەی کە خۆشتان دەوێت. (أبُو طلحَة) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم پێم وایە خوای گەورە داوای بەخشینی ماڵ و سامانمان لێ دەکات بیبەخشین بەوانەی کە هەژار و نەدارن، منیش تۆ دەکەم بە شایەت کە خۆشەویسترین ماڵ و سامانێ بەلامەوە باخە خورماکەی (أريحاء)ە دەیبەخشم بە خوای گەورە - تۆش بە کێی دەبەخشی پێی ببەخشە - پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم پێی فەرموو: (بیبەخشە بە خزمە نزیکەکانی خۆت). ئەویش دابەشی کرد بەسەر حەسانی کوڕی (ثابت) و ئوبەی کوڕی کەعب دا.

**١٦٩٠ - (صحيح) عَنْ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ: كَانَتْ لِي جَارِيَةٌ فَأَعْتَقْتُهَا، فَدَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ (آجَرَكِ اللَّهُ أَمَا إِنَّكِ لَوْ كُنْتِ أَعْطَيْتِهَا أَخْوَالَكِ كَانَ أَعْظَمَ لأَجْرِكِ).**

واتە: لە مەیمونەی خێزانی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیە وسلم دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کارەکەرێکم هەبوو ئازادم کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم هات بۆ لام پێم راگەیاند، فەرمووی: (خوای گەورە پاداشتت بداتەوە ئەگەر بت بەخشیایە بە خاڵوانت پاداشتەکەت گەورەتر دەبوو — واتە پاداشتی خێرەکەو پاداشتی پەیوەندی خزمایەتی - ).

١٦٩١ - (حسن) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: أَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالصَّدَقَةِ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ عِنْدِي دِينَارٌ، فَقَالَ: (تَصَدَّقْ بِهِ عَلَى نَفْسِكَ). قَالَ: عِنْدِي آخَرُ، قَالَ: (تَصَدَّقْ بِهِ عَلَى وَلَدِكَ). قَالَ: عِنْدِي آخَرُ، قَالَ: (تَصَدَّقْ بِهِ عَلَى زَوْجَتِكَ). أَوْ قَالَ: (زَوْجِكَ). قَالَ: عِنْدِي آخَرُ، قَالَ: (تَصَدَّقْ بِهِ عَلَى خَادِمِكَ). قَالَ: عِنْدِي آخَرُ، قَالَ (أَنْتَ أَبْصَرُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا بە هاوەڵانی کە خێر و سەدەقە بکەن، پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دینارێکم هەیە، فەرمووی: (بۆ خۆتی سەرف بکە). وتی: دینارێکی ترم هەیە، فەرمووی: (بۆ منداڵەکەتی سەرف بکە). وتی: دینارێکی تریشم هەیە، فەرمووی: (بۆ خێزانەکەتی سەرف بکە). وتی: دینارێکی تریشم هەیە، فەرمووی: (بۆ خزمەتکارەکەتی سەرف بکە). وتی: دینارێکی تریشم هەیە، فەرمووی: (ئیتر خۆت دەزانی بۆ کێی سەرف دەکەی).

١٦٩٢ - (حسن) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُضَيِّعَ مَنْ يَقُوتُ).

واتە: لە (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە

وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەندە بەسە بۆ گوناهباری پیاو کە ئەو کەسانەی بەخێویان دەکات پشتگوێیان بخات و هەوڵ نەدات رۆزیان بۆ دابین بکات).

١٦٩٣ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، وَيُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس دەیەوێت رۆزی فراوان بێت و، تەمەنی درێژ بێت، با پەیوەندی خزمایەتی بەجێبهێنێ).

١٦٩٤ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (قَالَ اللَّهُ: أَنَا الرَّحْمَنُ، وَهِيَ الرَّحِمُ، شَقَقْتُ لَهَا اسْمًا مِنَ اسْمِي، مَنْ وَصَلَهَا وَصَلْتُهُ، وَمَنْ قَطَعَهَا بَتَتُّهُ).

واتە: لە(عَبدُ الرَّحمَن)ی کوڕی عەوفەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرموێت: من (رَحمَن)م - ناوێکە لە ناوەکانی خوای گەورە - خاوەنی بەخشندیی و میهەبانیەکی فراوانم، ناوێکم بۆ (رَحم) دەرهێناوە لە ناوی خۆم، هەرکەس ئەو پەیوەندیەی گەیاند منیش دەیگەیەنم بە سۆزو بەزەیی خۆم، وە هەرکەس ئەو پەیوەندیەی پچڕاند منیش دەیپچڕێنم لە بەزەیی خۆم).

١٦٩٥ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِمَعْنَاهُ.

واتە: لە(عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی عەوفەوە هاتووە، كە بیستویەتی لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، راوی فەرمودەی پێشوی بە هەمان شێوە گێڕایەوە.

١٦٩٦ - (صحيح) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَاطِعُ رَحِمٍ).

واتە: لە موحەممەدی كوڕی جوبەیری كوڕی (مُطْعِم)ەوە، لە باوكیەوە دەگێڕنەوە، راوی فەرمودەكەی بەرزكردەوە هەتا گەیاندیەوە بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم كە فەرموویەتی: (هەركەس پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنێت ناچێتە بەهەشتەوە).

١٦٩٧ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَيْسَ الْوَاصِلُ بِالْمُكَافِئِ، وَلَكِنَّ الْوَاصِلَ هُوَ الَّذِي إِذَا قُطِعَتْ رَحِمُهُ وَصَلَهَا).

واتە: لە (عَبْدُ الله)ی كوڕی عەمرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەو كەسە پەیوەندی خزمایەتی بەجێناهێنێ و خزم دۆست نیە ئەگەر خزمەكەی هات

بۆ لای و سەردانی کرد ئەویش سەردانی بکات، بەڵکو ئەو کەسە پەیوەندی خزمایەتی بەجێ ئەهێنێ و خزم دۆستە کە خزمەکەی پەیوەندی لەگەڵ دەپچڕێت کەچی ئەو بەسەری دەکاتەوە).

## باسی پیسکەیی و چروکی.

## ٤٦ - باب فِي الشُّحِّ.

١٦٩٨ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (إِيَّاكُمْ وَالشُّحَّ، فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِالشُّحِّ، أَمَرَهُمْ بِالْبُخْلِ فَبَخَلُوا، وَأَمَرَهُمْ بِالْقَطِيعَةِ فَقَطَعُوا، وَأَمَرَهُمْ بِالْفُجُورِ فَفَجَرُوا).

واتە: لە (عَبدُ الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتاری بۆ خەڵك دەدا فەرمووی: (دوربن لە پیسکەیی و چروکی، چونکە پیسکەیی و چروکی ئەوانەی پێش ئێوەی لەناوبرد، فەرمانیان پێ دەکرا بە پیسکەیی و چروکی ئەوانیش دەیانکرد، فەرمانیان پێ دەکرا بەپچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی ئەوانیش پەیوەندیان دەپچڕی، فەرمانیان پێ دەکرا بە زیناو خراپەو تاوان ئەوانیش دەیانکرد).

١٦٩٩ - (صحيح) عن أَسْمَاءُ بِنْتُ أَبِي بَكْرٍ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا لِي شَيْءٌ إِلاَّ مَا أَدْخَلَ عَلَيَّ الزُّبَيْرُ بَيْتَهُ،

أَفَـأُعْطِي مِنْـهُ؟ قَـالَ: (أَعْطِـي وَلاَ تُـوكِي فَيُـوكِيَ عَلَيْكِ).

واته: له ئەسمائى كچى ئەبو بەكرەوە رەزاى خوايان لىّ بىّ دەگێڕنـەوە، كـه وتويەتى: وتم: ئەى پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم من هيچ شتێكم نيـه بيبەخشم جگه له ماڵ و سامانى زوبێرى هاوسەرم ئايا ئەتوانم لێـى ببەخشـم؟ فەرمووى: (لێى ببەخشەرەوە خێر بكه مەيكەرە كيسەو تورەكەوەو دەمەكەى تونـد مەبەسـتەو لـه هـەژارانى مـەگرەرەوە، ئـەگينا خـواى گـەورە لەتۆشـى دەگرێتەوە).

١٧٠٠ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا ذَكَرَتْ عِدَّةً مِنْ مَسَاكِينَ - قَـالَ أَبو دَاوُد: وَقَالَ غَيْرُهُ: أَوْ عِدَّةً مِنْ صَدَقَةٍ - فَقَالَ لَهَـا رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَعْطِي وَلَا تُحْصِي فَيُحْصَى عَلَيْكِ).

واتـه: عائيشـه باسـى چـەند هـەژارێكى كـرد بـۆ پێغەمبـەرى خـوا صلى الله عليه وسلم كه هاتونەته بەردەرگاكەى چيان لەگـەڵ بكـات - ئـەبو داود دەڵێـت: جگه لەو راويه راويەكى تر وتى: عائيشه باسى چەند خێرو سەدەقەيەكى كـرد كه چيان لىّ بكات - پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم پێـى فـەرموو: (خێـر بكەو ببەخشەرەوە مەيكەرە كيسەو تورەكەو مـاڵ و سامان كەڵەكـه مەكـەو لـه هـەژارانى مـەگرەرەوە، ئـەگينا خـواى گـەورە لەتۆشـى دەگرێتـەوەو بەرەكـەتى نامێنىّ).

كۆتايى كتێبى زەكات

# كتێبی شتی دۆزراوە.

# ٤ – كتاب اللقطة.

## باسی پێناسەی شتی دۆزراوە.

## ١ – بابُ التَّعْرِيفِ اللُّقَطَةِ.

١٧٠١ - (صحيح) عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ قَالَ: غَزَوْتُ مَعَ زَيْدِ بْنِ صُوحَانَ وَسَلْمَانَ بْنِ رَبِيعَةَ، فَوَجَدْتُ سَوْطًا، فَقَالاَ لِي: اطْرَحْهُ، فَقُلْتُ: لاَ وَلَكِنْ إِنْ وَجَدْتُ صَاحِبَهُ وَإِلاَّ اسْتَمْتَعْتُ بِهِ، فَحَجَجْتُ، فَمَرَرْتُ عَلَى الْمَدِينَةِ، فَسَأَلْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ، فَقَالَ: وَجَدْتُ صُرَّةً فِيهَا مِائَةُ دِينَارٍ فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (عَرِّفْهَا حَوْلاً). فَعَرَّفْتُهَا حَوْلاً، ثُمَّ أَتَيْتُهُ فَقَالَ: (عَرِّفْهَا حَوْلاً). فَعَرَّفْتُهَا حَوْلاً، ثُمَّ أَتَيْتُهُ فَقَالَ: (عَرِّفْهَا حَوْلاً). فَعَرَّفْتُهَا حَوْلاً، ثُمَّ أَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: لَمْ أَجِدْ مَنْ يَعْرِفُهَا، فَقَالَ (احْفَظْ عَدَدَهَا وَوِعَاءَهَا وَوِكَاءَهَا، فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا وَإِلاَّ فَاسْتَمْتِعْ بِهَا). وَقَالَ وَلاَ أَدْرِي أَثَلاَثًا قَالَ: (عَرِّفْهَا). أَوْ مَرَّةً وَاحِدَةً.

واتە: لە سوەیدی كوڕی غەفلەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لەگەڵ زەیدی كوڕی صوحان و سەلمانی كوڕی رەبیعەدا غەزام دەكرد، قامچیەكم دۆزیەوە، پێیان وتم: فڕێی بدە، وتم: نەخێر فڕێی نادەم ئەگەر خاوەنەكەیم دۆزیەوە دەیدەمەوە ئەگینا سودی لێ وەردەگرم، كاتێ كە چووم بۆ حەج، سەبارەت بە قامچیەكە لە ئوبەی كوڕی كەعبم پرسی؟ ئەویش وتی: جارێ تورەكەیەكم دۆزیەوە سەد دیناری تێدا بوو جا چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ساڵێك جاڕی بۆ بدە)، منیش ساڵێ جاڕم بۆ دا كەس خاوەنی نەبوو، لەپاشدا رۆیشتمەوە بۆ خزمەتی فەرمووی: (ساڵێك جاڕی بۆ بدە)، منیش ساڵێ جاڕم بۆ دا كەس خاوەنی نەبوو، لەپاشدا رۆشتمەوە بۆ خزمەتی فەرمووی: (ساڵێك جاڕی بۆ بدە)، منیش ساڵێ جاڕم بۆ دا، لەپاشدا رۆشتمەوە بۆ خزمەتی وتم: كەسم دەست نەكەوت خاوەنی بێت، فەرمووی: (بزانە تورەكەكەو پەتی دەم بەستنەكەی چۆنەو ژمارەی چەندە جا ئەگەر خاوەنەكەی هات بیدەرەوە، ئەگەر خاوەنەكەشی نەهات بۆ خۆت سودی لێ وەربگرە). راوی وتی: ئیتر نازانم سێ جار فەرمووی: (ساڵێك جاڕی بۆ بدە). یان جارێ فەرمووی.

**١٧٠٢ - (صحيح) عَنْ شُعْبَةَ، بِمَعْنَاهُ، قَالَ: (عَرِّفْهَا حَوْلاً). وَقَالَ ثَلاَثَ مِرَارٍ، قَالَ فَلاَ أَدْرِي قَالَ لَهُ ذَلِكَ فِي سَنَةٍ أَوْ فِي ثَلاَثِ سِنِينَ؟.**

واتە: لە شوعبەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان مانا هاتووە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سێ جار بە ئوبەی كوڕی كەعبی فەرموو: (ساڵێك جاڕی بۆ بدە)، راوی وتی: ئیتر نازانم فەرمووی بە ئوبەی لە ساڵێكدا سێ جار جاڕی بۆ بدە یان لە سێ ساڵدا.

١٧٠٣ - (صحيح) عن سَلَمَةُ بْنُ كُهَيْلٍ، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ، قَالَ فِي التَّعْرِيفِ قَالَ: عَامَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةً. وَقَالَ: (اعْرِفْ عَدَدَهَا وَوِعَاءَهَا وَوِكَاءَهَا). زَادَ (فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا فَعَرَفَ عَدَدَهَا وَوِكَاءَهَا فَادْفَعْهَا إِلَيْهِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: لَيْسَ يَقُولُ هَذِهِ الْكَلِمَةَ إِلاَّ حَمَّادٌ فِي هَذَا الْحَدِيثِ، يَعْنِي (فَعَرَفَ عَدَدَهَا). ﴿والمعتمد التعريف سنة واحدة كما في حديث زيد بن خالد الآتي بعده﴾.

واتە: لە سەلەمەی کوڕی کوهەیلەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان سەنەد و مانا هاتووە، لە پێناسەی شتی دۆزراوەدا وتی: دوو ساڵ یان ساڵێك، وە فەرمووی: (بزانە تورەکەکەو پەتی دەم بەستنەکەی چۆنەو ژمارەی چەندە). ئەمەی بۆ زیاد کرد: (جا ئەگەر خاوەنەکەی هات تورەکەکەی ناسیەوەو زانی ژمارەکەی چەندە ئەوا بیدەرەوە). ئەبو داود دەڵێت: وتەی: (ئەگەر زانی ژمارەکەی چەندە) لەم فەرموودەدا تەنها حەماد وتویەتی. ﴿وتەی باوەڕ پێکراو ئەمەیە کە ساڵی جارێك جاڕی بۆ بدرێت وەك لە فەرموودەکەی زەیدی کوڕی خالیددا لەدوای ئەم فەرموودەوە دێت﴾.

١٧٠٤ - (صحيح) عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ اللُّقَطَةِ؟ فَقَالَ: (عَرِّفْهَا سَنَةً، ثُمَّ اعْرِفْ وِكَاءَهَا وَعِفَاصَهَا، ثُمَّ اسْتَنْفِقْ بِهَا،

فَإِنْ جَاءَ رَبُّهَا فَأَدِّهَا إِلَيْهِ). فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَضَالَّةُ الْغَنَمِ؟ فَقَالَ: (خُذْهَا، فَإِنَّمَا هِيَ لَكَ أَوْ لأَخِيكَ أَوْ لِلذِّئْبِ). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَضَالَّةُ الإِبِلِ؟ فَغَضِبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى احْمَرَّتْ وَجْنَتَاهُ، أَوِ احْمَرَّ وَجْهُهُ، وَقَالَ: (مَا لَكَ وَلَهَا؟ مَعَهَا حِذَاؤُهَا وَسِقَاؤُهَا حَتَّى يَأْتِيَهَا رَبُّهَا).

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنییەوە هاتووە، کە پیاوێ سەبارەت بە شتی دۆزراوەوە لە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم پرسی؟ فەرمووی: (ساڵێك جاڕی بۆ بدە، لەپاشدا بزانە پەتی دەم بەستنەکەی و تورەکەکەی چییەو چۆنە، لەپاشدا خەرجی بکە، ئەگەر خاوەنەکەی هات بۆی بیدەرەوە). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەی سەبارە بە مەڕی ونبوو؟ فەرمووی: (بیبە بۆ خۆت، چونکە یان بۆ تۆ دەبێت یان بۆ براکەت یا بۆ گورگ واتە یان گورك دەیخوات). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەی سەبارە بە وشتری ونبوو؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوەندە تووڕە بوو هەتا هەردوو کوڵمی یان روخساری سور هەڵگەڕا، فەرمووی: (چیتە بەسەریەوە ئەتوانێ ڕێ بکات و بەشی خۆشی ئاوی پێیەو ئەتوانێ بۆ خۆی لەو بیابانەدا بژی، هەتا خاوەنەکەی دەیدۆزێتەوە).

١٧٠٥ - (صحيح) عن ابْنُ وَهْبٍ، أَخْبَرَنِي مَالِكٌ، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ، زَادَ: (سِقَاؤُهَا تَرِدُ الْمَاءَ وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ). وَلَمْ يَقُلْ: (خُذْهَا). فِي ضَالَّةِ الشَّاءِ، وَقَالَ فِي اللُّقَطَةِ: (عَرِّفْهَا

سَنَةً، فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا وَإِلاَّ فَشَأْنَكَ بِهَا). وَلَمْ يَذْكُرِ (اسْتَنْفِقْ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ الثَّوْرِيُّ وَسُلَيْمَانُ بْنُ بِلاَلٍ وَحَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ عَنْ رَبِيعَةَ مِثْلَهُ، لَمْ يَقُولُوا: (خُذْهَا).

واتە: ئیبنو وەهەب دەڵێت: مالیك فەرموودەی پێشوی بە هەمان سەنەد و مانا بۆ گێڕامەوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: (بۆ خۆی دەچێت بۆ ئاو خواردنەوە ئاو دەخواتەوەو لە گژ و گیاو گەڵای دار و درەخت دەخوات). سەبارەت بە مەڕی ونبوو نەیفەرموو: (خُذْهَا). واتە: بیبە بۆ خۆت. سەبارەت بە شتی دۆزراوەوەش فەرمووی: (ساڵێك جاڕی بۆ بدە، ئەگەر خاوەنەکەی هات بۆی بیدەرەوە، ئەگەر خاوەنی نەبوو ئیتر ئارەزووی خۆتە چی لێ دەکەیت). مالیك باسی (اسْتَنْفِقْ) ی نەکرد واتە: خەرجی بکە بۆ خۆت، ئەبو داود دەڵێت: (ثَوْرِیَ) و سولەیمانی کوڕی بیلال و حەممادی کوڕی سەلەمە فەرموودەی پێشویان بە هەمان شێوە لە رەبیعەوە گێڕاوەتەوە، بەڵام باسی: (خُذْهَا) یان نەکرد واتە: بیبە بۆ خۆت.

١٧٠٦ - (صحيح) عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُئِلَ عَنِ اللُّقَطَةِ، فَقَالَ: (عَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنْ جَاءَ بَاغِيهَا فَأَدِّهَا إِلَيْهِ وَإِلاَّ فَاعْرِفْ عِفَاصَهَا وَوِكَاءَهَا ثُمَّ كُلْهَا فَإِنْ جَاءَ بَاغِيهَا فَأَدِّهَا إِلَيْهِ).

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنییەوە هاتووە، کە پیاوێ سەبارەت بە

شتی دۆزراوەوە لە پێغەمبەری خوایان صلی الله علیە وسلم پرسی؟ فەرمووی: (ساڵێك جاڕی بۆ بدە، ئەگەر خاوەنەکەی هات بۆی بیدەرەوە، ئەگەر نا بزانە پەتی دەم بەستنەکەی و تورەکەکەی چییەو چۆنە، لەپاشدا خەرجی بکە. ئەگەر خاوەنەکەی هات بۆی بیدەرەوە).

١٧٠٧ - (صحيح) عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ، أَنَّهُ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرَ نَحْوَ حَدِيثِ رَبِيعَةَ، قَالَ: وَسُئِلَ عَنِ اللُّقَطَةِ فَقَالَ: (تُعَرِّفُهَا حَوْلاً، فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا دَفَعْتَهَا إِلَيْهِ، وَإِلاَّ عَرَفْتَ وِكَاءَهَا وَعِفَاصَهَا، ثُمَّ أَفِضْهَا فِي مَالِكَ، فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا فَادْفَعْهَا إِلَيْهِ).

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنییەوە هاتووە، کە وتویەتی: سەبارەت بە شتی دۆزراوەوە پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم، راوی وەك فەرموودەکەی رەبیعەی گێڕایەوە، راوی وتی: سەبارەت بە شتی دۆزراوەوەش لە پێغەمبەری خوایان صلی الله علیە وسلم پرسی؟ فەرمووی: (ساڵێك جاڕی بۆ بدە، ئەگەر خاوەنەکەی هات بۆی بیدەرەوە، ئەگەر نا بزانە پەتی دەم بەستنەکەی و تورەکەکەی چییەو چۆنە، لەپاشدا بیخە سەر ماڵەکەی خۆت، ئەگەر خاوەنەکەی هات بۆی بیدەرەوە).

١٧٠٨ - (صحيح) عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ وَرَبِيعَةَ بِإِسْنَادِ قُتَيْبَةَ وَمَعْنَاهُ، وَزَادَ فِيهِ: (فَإِنْ جَاءَ بَاغِيهَا فَعَرَفَ عِفَاصَهَا وَعَدَدَهَا فَادْفَعْهَا إِلَيْهِ).

واتە: یەحیای کوڕی سەعید و ڕەبیعە بە هەمان سەنەد و مانای فەرمودەکەی قوتەیبە فەرمودەکەیان گێڕایەوە، ئەمەیان بۆ زیاد کرد: (ئەگەر خاوەنەکەی هات پەتی دەم بەستنەکەی ناسیەوە بیدەرەوە).

(حسن) وَقَالَ حَمَّادٌ أَيْضًا، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِثْلَهُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذِهِ الزِّيَادَةُ الَّتِى زَادَ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ فِي حَدِيثِ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ وَيَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ وَعُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ وَرَبِيعَةَ (إِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا فَعَرَفَ عِفَاصَهَا وَوِكَاءَهَا فَادْفَعْهَا إِلَيْهِ).لَيْسَتْ بِمَحْفُوظَةٍ، (فَعَرَفَ عِفَاصَهَا وَوِكَاءَهَا)

واتە: (ئەگەر خاوەنەکەی هات پەتی دەم بەستنەکەی و تورەکەکەی ناسیەوە بیدەرەوە). لەلایەن ڕاویەکانەوە لەبەر نەکراوە،

(صحيح) وَحَدِيثُ عُقْبَةَ بْنِ سُوَيْدٍ عَنْ أَبِيهِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيْضًا قَالَ: (عَرِّفْهَا سَنَةً).

واتە: (ساڵێك جاڕی بۆ بدە) هاتووە.

(صحيح) وَحَدِيثُ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ أَيْضًا، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (عَرِّفْهَا سَنَةً).

واتە: بە (ساڵێك جاڕی بۆ بدە) هاتووە.

١٧٠٩ - (صحيح) عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ وَجَدَ لُقَطَةً فَلْيُشْهِدْ ذَا عَدْلٍ، أَوْ ذَوَيْ عَدْلٍ، وَلاَ يَكْتُمْ، وَلاَ يُغَيِّبْ، فَإِنْ وَجَدَ صَاحِبَهَا فَلْيَرُدَّهَا عَلَيْهِ، وَإِلاَّ فَهُوَ مَالُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ).

واتە: لە (عِیاض)ی کوڕی حیمارەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەس شتێکی دۆزیەوە کەسێ یان دوو کەسی دادپەروەر بکات بە شایەت کە ئەو شتەی دۆزیوەتەوە، نەیشارێتەوە، ونی نەکات و نەیگوێزێتەوە بۆ شوێنێکی تر، ئەگەر خاوەنەکەی دۆزیەوە با بۆی بگێڕێتەوە، ئەگینا ئەوە ماڵ و سامانی خوایە بە کێی دەدات با بیدات).

١٧١٠ - (حسن) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الثَّمَرِ الْمُعَلَّقِ؟

فَقَالَ: (مَنْ أَصَابَ بِفِيهِ مِنْ ذِى حَاجَةٍ غَيْرَ مُتَّخِذٍ خُبْنَةً، فَلاَ شَىْءَ عَلَيْهِ، وَمَنْ خَرَجَ بِشَىْءٍ مِنْهُ: فَعَلَيْهِ غَرَامَةُ مِثْلَيْهِ وَالْعُقُوبَةُ، وَمَنْ سَرَقَ مِنْهُ شَيْئًا بَعْدَ أَنْ يُئْوِيَهُ الْجَرِينُ فَبَلَغَ ثَمَنَ الْمِجَنِّ: فَعَلَيْهِ الْقَطْعُ). وَذَكَرَ فِى ضَالَّةِ الإِبِلِ وَالْغَنَمِ كَمَا ذَكَرَهُ غَيْرُهُ، قَالَ: وَسُئِلَ عَنِ اللُّقَطَةِ؟ فَقَالَ: (مَا كَانَ مِنْهَا فِى طَرِيقِ الْمِيتَاءِ أَوِ الْقَرْيَةِ الْجَامِعَةِ فَعَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنْ جَاءَ طَالِبُهَا فَادْفَعْهَا إِلَيْهِ، وَإِنْ لَمْ يَأْتِ فَهِىَ لَكَ، وَمَا كَانَ فِى الْخَرَابِ - يَعْنِى - فَفِيهَا، وَفِى الرِّكَازِ الْخُمُسُ).

واتە: لە (عَبْدُ الله)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: سەبارەت بەو بەروبومەی کە بەدارەکەوەیە پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم؟ فەرمووی: (هەرکەس بەشی پێویستی خۆی لێ بخوات ئەوە هیچی لەسەر نیە، ئەوەی کۆشی لێ پڕ کرد یان دەفری لێ پڕ کردو بردیەوە ئەوە: دوو ئەوەندەی نرخی ئەوەی لێ ئەسەنرێتەوەو سزاش دەدرێت و تەمێ دەکرێت، ئەوەی لەشوێنی وشك کردنەوەدا دزی لێ بکات ئەگەر نرخەکەی بگاتە نرخی قەڵغانێك: ئەوە دەستی دەبڕرێت لەسەری). هەروەها باسی وشتر و مەڕی ونبوی کرد هەروەك چۆن پێشتر باسکرا – مەڕەکە بۆ خۆت یان بۆ براکەت یان بۆ گورك، وشترەکەش وازی لێ بهێنرێت بۆ خۆی بلەوەڕێت و ئاو بخواتەوە هەتا خاوەنەکەی دەیدۆزێتەوە - ، ڕاوی وتی: سەبارەت بە شتی دۆزراوەش پرسیاری لێ کرا؟ فەرمووی: (ئەگەر لەسەر ڕێگایەکدا بوو خەڵك هاتوچۆیان پێدا دەکرد یان لە شوێنی ئاوەدانیدا

بوو ساڵێك جاڕی بۆ بدە، لەپاشدا ئەگەر خاوەنەكەی هات بیدەرەوە، ئەگەر نەهات ئەوە بۆ خۆت، ئەوەی لەشوێنی وێرانەدا دۆزرایەوە هەروەها گەنجینەی كۆنی دۆزراوە پێنج یەكی هی زەكاتەو ئەوەشی مایەوە بۆ ئەو كەسەیە كە دەیدۆزێتەوە).

١٧١١ - (حسن) عَنِ عَمْرُو بْنُ شُعَيْبٍ، بِإِسْنَادِهِ بِهَذَا، قَالَ فِي ضَالَّةِ الشَّاءِ قَالَ: (فَاجْمَعْهَا).

واتە: لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە فەرموودەی پێشوو بە هەمان سەنەد هاتووە، راوی وتی: سەبارەت بە بزن و مەڕی ونبوو؟ فەرمووی: (بیبە تێكەڵاوی بزن و مەڕەكانی خۆتی بكە – بەڵام ئەگەر خاوەنەكەی هات بیدەرەوە - ).

١٧١٢ - (حسن) عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، بِهَذَا بِإِسْنَادِهِ، قَالَ فِي ضَالَّةِ الْغَنَمِ: (لَكَ أَوْ لأَخِيكَ أَوْ لِلذِّئْبِ خُذْهَا قَطُّ).كَذَا قَالَ فِيهِ أَيُّوبُ وَيَعْقُوبُ بْنُ عَطَاءٍ عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (فَخُذْهَا).

واتە: لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە فەرموودەی پێشوو بە هەمان سەنەد هاتووە، راوی وتی: سەبارە بە مەڕی ونبوو؟ فەرمووی: (بۆ خۆت یان بۆ براكەت یان بۆ گورگ بیبەو بەس). هەروەها ئەیوب و یەعقوب لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە، لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم بە (خذها) گێڕاویانەتەوە بەبێ وشەی (قط).

١٧١٣ - (حسن) عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِهَذَا. قَالَ فِي ضَالَّةِ الشَّاءِ (فَاجْمَعْهَا حَتَّى يَأْتِيَهَا بَاغِيهَا).

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان سەنەد هاتووە، راوی وتی: سەبارەت بە مەڕی ونبوو؟ فەرمووی: (بیبە تێکەڵاوی مەڕەکانی خۆتی بکە هەتا خاوەنەکەی دێت بۆی ئەگەر هات بیدەرەوە).

١٧١٤ - (حسن) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ وَجَدَ دِينَارًا، فَأَتَى بِهِ فَاطِمَةَ فَسَأَلَتْ عَنْهُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (هُوَ رِزْقُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ). فَأَكَلَ مِنْهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَكَلَ عَلِيٌّ وَفَاطِمَةُ، فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ أَتَتْهُ امْرَأَةٌ تَنْشُدُ الدِّينَارَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا عَلِيُّ أَدِّ الدِّينَارَ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە پێشەوا عەلی کوڕی (أبی طالِب)ەوە رەزای خوای لێ بێ دینارێکی دۆزیەوە، بردی بۆ (فاطِمَة)ی خێزانی، ئەویش لەوبارەوە لە باوکی صلی الله علیه وسلم پرسی؟ فەرمووی: (ئەوە رۆزی خوای گەورەیە). پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لێی خوارد، وە پێشەوا عەلی و (فاطِمَة)ش لێیان خوارد، لەپاشدا ئافرەتێك هات بانگەوازی دەکرد بۆ

دیناریّ کە ونی کردبوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی عەلی دینارەکەی بدەرەوە).

١٧١٥ - (صحيح) عَنْ عَلِيّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّهُ الْتَقَطَ دِينَارًا، فَاشْتَرَى بِهِ دَقِيقًا، فَعَرَفَهُ صَاحِبُ الدَّقِيقِ، فَرَدَّ عَلَيْهِ الدِّينَارَ، فَأَخَذَهُ عَلِيٌّ وَقَطَعَ مِنْهُ قِيرَاطَيْنِ، فَاشْتَرَى بِهِ لَحْمًا.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە دیناریّکی دۆزیەوە، بایی دینارەکە ئاردی کڕی، خاوەنی ئاردەکە ناسی دینارەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش بایی دوو (قیراط) گۆشتی پێ کڕی.

١٧١٦ - (حسن) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ دَخَلَ عَلَى فَاطِمَةَ وَحَسَنٌ وَحُسَيْنٌ يَبْكِيَانِ، فَقَالَ مَا يُبْكِيهِمَا؟ قَالَتِ: الْجُوعُ! فَخَرَجَ عَلِيٌّ فَوَجَدَ دِينَارًا بِالسُّوقِ، فَجَاءَ إِلَى فَاطِمَةَ فَأَخْبَرَهَا، فَقَالَتِ اذْهَبْ إِلَى فُلاَنٍ الْيَهُودِيِّ فَخُذْ دَقِيقًا، فَجَاءَ الْيَهُودِيَّ فَاشْتَرَى بِهِ دَقِيقًا، فَقَالَ الْيَهُودِيُّ: أَنْتَ خَتَنُ هَذَا الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَخُذْ دِينَارَكَ وَلَكَ الدَّقِيقُ. فَخَرَجَ عَلِيٌّ حَتَّى جَاءَ فَاطِمَةَ، فَأَخْبَرَهَا،

فَقَالَتِ: اذْهَبْ إِلَى فُلاَنٍ الْجَزَّارِ فَخُذْ لَنَا بِدِرْهَمٍ لَحْمًا، فَذَهَبَ فَرَهَنَ الدِّينَارَ بِدِرْهَمٍ لَحْمٍ، فَجَاءَ بِهِ، فَعَجَنَتْ، وَنَصَبَتْ، وَخَبَزَتْ، وَأَرْسَلَتْ إِلَى أَبِيهَا، فَجَاءَهُمْ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَذْكُرُ لَكَ، فَإِنْ رَأَيْتَهُ لَنَا حَلاَلاً أَكَلْنَاهُ وَأَكَلْتَ مَعَنَا، مِنْ شَأْنِهِ كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ: (كُلُوا بِاسْمِ اللَّهِ). فَأَكَلُوا، فَبَيْنَمَا هُمْ مَكَانَهُمْ إِذَا غُلاَمٌ يَنْشُدُ اللَّهَ وَالإِسْلاَمَ الدِّينَارَ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدُعِيَ لَهُ فَسَأَلَهُ. فَقَالَ سَقَطَ مِنِّي فِي السُّوقِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا عَلِيُّ اذْهَبْ إِلَى الْجَزَّارِ فَقُلْ لَهُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ لَكَ: أَرْسِلْ إِلَيَّ بِالدِّينَارِ، وَدِرْهَمُكَ عَلَيَّ). فَأَرْسَلَ بِهِ، فَدَفَعَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْهِ.

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە دەگێڕنەوە، کە پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ چوو بۆ لای (فاطِمَة)ی خێزانی بینی حەسەن و حوسەین دەگرین، وتی: ئەوە بۆچی دەگرین؟ (فاطِمَة) وتی: لە برسیانا دەگرین، عەلی لەماڵ دەرچوو لە بازاڕ دینارێکی دۆزیەوە، هێنایەوە بۆ (فاطِمَة)ی خێزانی و پێی راگەیاند کە لە بازاڕ دۆزیمەتەوە، وتی: بڕۆ لای فلاّنە جولەکە ئاردمان بۆ بێنە، ئەویش چوو بۆ لای کابرای جولەکەو بایی دینارەکە ئاردی لێ کڕی، جولەکەکە

وتی: تۆ زاوای ئەو کەسەی کە پێی وایە پێغەمبەری خوایە؟ وتی: بەڵێ، وتی: ئەوە دینارەکەت و ئاردەکەش بۆ خۆت، عەلی هاتەوە بۆ لای (فاطِمَة) و هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە، وتی: بڕۆ بۆ لای فلانە قەساب بایی درهەمێ گۆشتمان بۆ بکڕە، چوو بۆ لای قەسابەکەو دینارەکەی بە رەهن دانا لە جیاتی بایی درهەمێك گۆشت، هێنایەوە بۆ (فاطِمَة) و ئەویش شێلای و خستیە سەر ئاگر، ناردی بەدوای باوکیدا، ئەویش هات بۆ لایان، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەسەرهاتەکەت بۆ دەگێڕمەوە، جا ئەگەر پێت وابوو کە حەڵاڵە بۆمان ئەوە لێی دەخۆین و تۆش لەگەڵمان لێی بخۆ، فەرمووی: (بە ناوی خواوە لێی بخۆن). ئەوانیش لێیان خوارد، لە جێگەی خۆیاندا نەجولابوون، غولامێك هات بە ناوی خواو ئیسلامەوە بانگەوازی بۆ دینارە ونبوەکەی دەکرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی کرد کە بۆی بانگ بکەن، لێی پرسی، وتی: لە بازاڕ لێم کەوتووە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی عەلی، بڕۆ بۆ لای قەسابەکەو پێی بڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێت دەفەرموێت: (دینارێکم بۆ بنێرە درهەمەکەت لەسەر من). قەسابەکە دینارەکەی بۆ نارد، ئەویش دینارەکەی دا بە غولامەکە.

**١٧١٧ - (ضعيف) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: رَخَّصَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْعَصَا وَالسَّوْطِ وَالْحَبْلِ وَأَشْبَاهِهِ يَلْتَقِطُهُ الرَّجُلُ يَنْتَفِعُ بِهِ.**

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ الله)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: سەبارەت بە دۆزینەوەی داردەست و گۆچان و قامچی و گوریس و حەبل و وێنەی ئەوانە

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم روخستی پێداین ئەگەر کەسێ لە ئێمە دۆزینیەوە سودی لێ وەربگرێت – چونکە ئەوانە شتی سادەن و پێویست بە بانگەواز ناکات بەڵام ئەگەر خاوەنیان هات دەبێت بیانداتەوە. -

| |
|---|
| ١٧١٨ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (ضَالَّةُ الإِبِلِ الْمَكْتُومَةِ غَرَامَتُهَا وَمِثْلُهَا مَعَهَا). |

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (سەبارەت بە حوکمی وشتری ونبو: ئەگەر کەسێ دۆزیەوەو شاردیەوەو بانگەوازی بۆ نەکرد ئەوە بە ئەندازەی نرخەکەی غەرامە دەکرێت).

| |
|---|
| ١٧١٩ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ التَّيْمِيِّ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ لُقَطَةِ الْحَاجِّ، قَالَ أَحْمَدُ: قَالَ ابْنُ وَهْبٍ: يَعْنِي فِي لُقَطَةِ الْحَاجِّ يَتْرُكُهَا حَتَّى يَجِدَهَا صَاحِبُهَا. |

واتە: لە (عَبدُ الرَّحمَن)ی کوڕی (عُثمَان)ی تەیمییەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەهی کردوە لە هەڵگرتنەوەی شتی ونبوی حاجی. ئەحمەد وتی: راوی ئیبنو وەهەب وتی: واتە شتی ونبوی حاجی وازی لێ دەهێنرێت هەتا خاوەنەکەی دەیدۆزێتەوە.

١٧٢٠ - (صحيح المرفوع منه) عَنِ الْمُنْذِرِ بْنِ جَرِيرٍ قَالَ: كُنْتُ مَعَ جَرِيرٍ بِالْبَوَازِيجِ، فَجَاءَ الرَّاعِى بِالْبَقَرِ، وَفِيهَا بَقَرَةٌ لَيْسَتْ مِنْهَا، فَقَالَ لَهُ جَرِيرٌ: مَا هَذِهِ؟ قَالَ: لَحِقَتْ بِالْبَقَرِ لاَ نَدْرِى لِمَنْ هِىَ، فَقَالَ جَرِيرٌ: أَخْرِجُوهَا، فَقَدْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ يَأْوِى الضَّالَّةَ إِلاَّ ضَالٌّ).

واتە: لە (مُنذِر)ى كوڕى جەریرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لە خزمەت جەریردا بووم لە (بَوَازِیج) — كە شوێنێكە لە نزیك دیجلەوە - ، پیاوێ مانگای دەلەوەڕاند هات، جگە لە مانگاكانی خۆی مانگایەكی تری پێ بوو، جەریر پێی وت: ئەم مانگایە چییە؟ وتی: تێكەڵاوی مانگاكانم كردوە بەڵام نازانم هی كێیە، جەریر وتی: لەناو ئەو مانگانەدا دەری بكە، چونكە لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیستووە ئەیفەرموو: (شتی ونبو تێكەڵاوی ماڵی خۆی ناكات مەگەر كەسێ گومڕا بێ و لەسەر ڕێگەی ڕاست نەبێت).

# سەرەتای پەرتوکی مەناسکی حەج.

## ٥ – أول الكتاب المناسك.

## باسی سەبارەت بە فەریزەی حەج.

## ١ – باب فَرْضِ الْحَجِّ.

**١٧٢١ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ الأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: الْحَجُّ فِي كُلِّ سَنَةٍ أَوْ مَرَّةً وَاحِدَةً؟ قَالَ: (بَلْ مَرَّةٌ وَاحِدَةٌ، فَمَنْ زَادَ فَهُوَ تَطَوُّعٌ).**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ئەقرەعی کوڕی حابیس لە پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم پرسی؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم: ئایا حەج هەموو ساڵێك فەرزە یان لە هەموو تەمەندا یەك جار فەرزە، فەرمووی: (بەڵکو لە هەموو تەمەندا یەك جار فەرزە، هەرکەس زیاتر بکات ئەوە سوننەتەو خێری زیاتری دەست دەکەوێت).

١٧٢٢ - (صحيح) عَنِ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ لأَزْوَاجِهِ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ: (هَذِهِ، ثُمَّ ظُهُورُ الْحُصْرِ).

واتە: لە ئەبو واقیدی (لەیسی)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە حەجی ماڵاوایی دا بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بە خێزانەکانی فەرموو: (ئەمە ئەو حەجەیە کە خوای گەورە فەرزی کردوە لەسەرتان، لەپاشدا ئیتر پابەند بن بە ماڵەکانتانەوە).

## باسی ئافرەتێ حەج بکات بەبێ ئەوەی مەحرەمێکی لەگەڵدا بێت.

## ٢ - باب فِي الْمَرْأَةِ تَحُجُّ بِغَيْرِ مَحْرَمٍ.

١٧٢٣ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ مُسْلِمَةٍ تُسَافِرُ مَسِيرَةَ لَيْلَةٍ إِلاَّ وَمَعَهَا رَجُلٌ ذُو حُرْمَةٍ مِنْهَا).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی: (رەوا نیە بۆ هیچ ئافرەتێکی موسوڵمان ماوەی شەوێ رێ سەفەر بکات مەگەر پیاوێکی مەحرەمی خۆی لەگەڵدا بێت).

١٧٢٤ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُـؤْمِنُ بِاللَّـهِ وَالْيَـوْمِ الآخِـرِ أَنْ تُسَافِرَ يَوْمًا وَلَيْلَةً).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بۆ هیچ ئافرەتێ رەوا نیە کە باوەڕی بە خوا و بە دوارۆژ هەبێت ماوەی شەو و رۆژێ سەفەر بکات مەگەر پیاوێکی مەحرەمی خۆی لەگەڵدا بێت).

١٧٢٥ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: (بَرِيدًا).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی، راوی بە هەمان شێوە فەرموودەی پێشوی گێڕایەوە، تەنها ئەوەندە نەبێت کە وتی: نیوەی رۆژێ — واتە بۆ هیچ ئافرەتێ رەوا نیە کە باوەڕی بە خوا و بە دوارۆژ هەبێت ماوەی نیوەی رۆژێ سەفەر بکات مەگەر پیاوێکی مەحرەمی خۆی لەگەڵدا بێت).

١٧٢٦ - (صحيح) عَنْ أَبِى سَعِيدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ: (لاَ يَحِـلُّ لاِمْـرَأَةٍ تُـؤْمِنُ بِاللَّـهِ وَالْيَـوْمِ الآخِرِ، أَنْ تُسَافِرَ سَفَرًا فَوْقَ ثَلاَثَـةِ أَيَّـامٍ فَصَـاعِدًا إِلاَّ وَمَعَهَا أَبُوهَا، أَوْ أَخُوهَا، أَوْ زَوْجُهَـا، أَوِ ابْنُهَـا، أَوْ ذُو مَحْرَمٍ مِنْهَا).

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بۆ هیچ ئافرەتێ ڕەوا نیە کە باوەڕی بە خوا و بە دوارۆژ هەبێت ماوەی سێ ڕۆژ یان زیاتر بڕوات بۆ سەفەر مەگەر باوکی یان براکەی یان مێردەکەی یان کوڕەکەی یا مەحرەمێکی خۆی لەگەڵدا بێت).

**١٧٢٧ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ تُسَافِرُ الْمَرْأَةُ ثَلاَثًا إِلاَّ وَمَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ).**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (بۆ هیچ ئافرەتێ ڕەوا نیە کە باوەڕی بە خوا و بە دوارۆژ هەبێت ماوەی سێ ڕۆژ سەفەر بکات مەگەر مەحرەمێکی خۆی لەگەڵدا بێت).

**١٧٢٨ - (صحيح) عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ يُرْدِفُ مَوْلاَةً لَهُ، يُقَالُ لَهَا صَفِيَّةُ، تُسَافِرُ مَعَهُ إِلَى مَكَّةَ.**

واتە: نافع دەڵێت: ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ کارەکەرێکی هەبوو پێیان دەوت (صَفِيَّة)، لە پشکۆی خۆیدا سواری دەکرد، لەگەڵی سەفەری دەکرد بۆ مەککە.

# باسی رەبەنگەریی لە ئیسلامدا نیە، یان حەج نەکردن بۆ کەسێ نیە، کە توانای هەبێت.

## ٣ - باب (لاَ صَرُورَةَ) فِی الإِسْلاَمِ.

١٧٢٩- (ضعيف) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ صَرُورَةَ فِی الإِسْلاَمِ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (لاَ صَرُورَةَ فِی الإِسْلاَمِ). زانایان و فەرمودەناسان ئەم فەرموودەیان بە دوو شێوە لێکداوەتەوە: لە ئیسلامدا نیە ئەو کەسەی کە ژیانی رەبەنگەری بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ و واز لە ژیانی هاوسەرگیری دەهێنێت بە مەبەستی پەرستش وەك رەهبانەکانی گاورەکان، یان لە ئیسلامدا حەج نەکردن نیە بۆ کەسێ کە توانای حەجکردنی هەبێت، هەروەها هەتا خۆی حەج نەکات دروست نیە حەج بۆ کەسێکی تر بکات.

# باسی توێشەی ڕێگە لە حەجدا.

## ٤ – باب التَّزَوُّدِ فِى الْحَجِّ.

١٧٣٠ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانُوا يَحُجُّونَ وَلاَ يَتَزَوَّدُونَ - قَالَ أَبُو مَسْعُودٍ: كَانَ أَهْلُ الْيَمَنِ، أَوْ نَاسٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ، يَحُجُّونَ وَلاَ يَتَزَوَّدُونَ – وَيَقُولُونَ: نَحْنُ الْمُتَوَكِّلُونَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ (وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَىٰ ). الآيَةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: خەڵك دەهاتن بۆ حەج توێشەی ڕێگەیان لەگەڵ خۆیان نەدەهێنا وەك خواردن و پێویستی سەفەر - ئەبو مەسعود دەڵێت: خەڵكی یەمەن یان كەسانێك لە خەڵكی یەمەن دەهاتن بۆ حەج توێشەی پێویستیان لەگەڵ خۆیان نەدەهێنا، دەیانوت: ئێمە پشت بە خوای خۆمان دەبەستین و تەوەكولمان لەسەر خوایە، لە ڕێگادا داوای خواردن و پێویستیان لە خەڵك دەكرد پشتیان بە خەڵك دەبەست، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند: (وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَىٰ ). واتە: توێشەی ڕێگە هەڵبگرن بەڕاستی باشترین توێشە تەقوایە.

## باسی بازرگانیکردن لە حەجدا.

## ٥ – باب التِّجَارَةِ فِى الْحَجِّ.

١٧٣١ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُوا فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ﴾. قَالَ: كَانُوا لاَ يَتَّجِرُونَ بِمِنًى، فَأُمِرُوا بِالتِّجَارَةِ إِذَا أَفَاضُوا مِنْ عَرَفَاتٍ.

واتە: لە (عَبْدُ الله)ی کوڕی عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُوا فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ﴾. (البقرە: ١٩٨). واتە: گوناهتان لەسەر نیە کە دوای ڕۆزی پەروەردگارتان بکەون. وتی: موسوڵمانان کاتی حەج لە مینا کڕین و فرۆشتن و کاری بازرگانیان نەدەکرد، جا ڕێگەیان پێدرا کاتێ کە گەڕانەوە لە عەرەفات کڕین و فرۆشتن و کاری بازرگانی بکەن.

## ٦ ـباسی ثةلةكردن لة حةج

١٧٣٢ - (حسن) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ أَرَادَ الْحَجَّ فَلْيَتَعَجَّلْ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی دەیەوێت حەج بكات با پەلە بكات).

## باسی بەكرێدان.

## ٧ - باب الْكَرِيِّ.

١٧٣٣ - (صحيح) عن أَبو أُمَامَةَ التَّيْمِيُّ قَالَ: كُنْتُ رَجُلاً أُكْرِي فِي هَذَا الْوَجْهِ، وَكَانَ نَاسٌ يَقُولُونَ لِي: إِنَّهُ لَيْسَ لَكَ حَجٌّ! فَلَقِيتُ ابْنَ عُمَرَ فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ إِنِّي رَجُلٌ أُكْرِي فِي هَذَا الْوَجْهِ، وَإِنَّ نَاسًا يَقُولُونَ لِي: إِنَّهُ لَيْسَ لَكَ حَجٌّ! فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: أَلَيْسَ تُحْرِمُ وَتُلَبِّي، وَتَطُوفُ بِالْبَيْتِ، وَتُفِيضُ مِنْ عَرَفَاتٍ، وَتَرْمِي الْجِمَارَ، قَالَ: قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: فَإِنَّ لَكَ حَجًّا، جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلَهُ عَنْ مِثْلِ مَا سَأَلْتَنِي عَنْهُ، فَسَكَتَ عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يُجِبْهُ، حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ﴾. فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَقَرَأَ عَلَيْهِ هَذِهِ الآيَةَ، وَقَالَ: (لَكَ حَجٌّ).

واتە: لە ئەبو ئومامەی تەیمییەوە هاتووە، كە وتویەتی: ولاغم بەكرێ ئەدا بە حاجیان و بۆ خۆشم حەجم دەكرد، هەندێ كەس پێیان دەوتم: تۆ حەجت بۆ نیەو حەجەكەت دروست نیە، گەیشتم بە ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ لەوبارەوە لێم پرسی؟ ئەویش وتی: ئایا تۆ ئیحرام نابەستی و تەلبییە(لبيك اللهم لبيك) ناكەیت و بەدەوری كەعبەدا ناسوڕێیتەوە و لە عەرەفاتەوە ناڕۆیت بۆ موزدەلیفەو شەیتان رەجم ناكەیت؟ وتی: وتم: بەڵێ، هەموو ئەوانە دەكەم، وتی: دەی تۆ حەجت بۆ هەیەو حەجەكەت دروستە، پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەو پرسیارەی لێ كرد كە تۆ لەمنت كرد؟ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بێ دەنگ بوو وەلامی نەدایەوە، هەتا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُوا فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ﴾. (البقرە: ١٩٨). واتە: گوناهتان لەسەر نیە كە دوای رۆزی پەروەردگارتان بكەون. جا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ناردی بەدوای پیاوەكەدا، پیاوەكە هات و ئایەتەكەی بەسەردا خوێندەوەو فەرمووی: (بەڵێ حەجت بۆ هەیە).

١٧٣٤ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّاسَ فِى أَوَّلِ الْحَجِّ كَانُوا يَتَبَايَعُونَ بِمِنًى، وَعَرَفَةَ، وَسُوقِ ذِى الْمَجَازِ، وَمَوَاسِمِ الْحَجِّ، فَخَافُوا الْبَيْعَ وَهُمْ حُرُمٌ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُوا فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ﴾. فِى مَوَاسِمِ الْحَجِّ.

واتە: (عَبدُ اللە)ی كوڕی عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: خەڵك لەسەرەتای ئیسلامەوە كە حەجیان دەكرد، لە میناو عەرەفەو بازاڕی (ژی

المَجَاز) و لە شوێنەکانی حەج کردندا کڕین و فرۆشتنیان دەکرد، جا ترسان لەوەی کە بەئیحرامەوە کڕین و فرۆشتن بکەن، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ( لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡۚ ). (البقرە: ١٩٨). واتە: گوناهتان لەسەر نیە کە دوای ڕۆزی پەروەردگارتان بکەون. لە شوێنەکانی حەج کردندا.

**١٧٣٥ - (صحيح بما قبله) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّاسَ فِي أَوَّلِ مَا كَانَ الْحَجُّ كَانُوا يَبِيعُونَ، فَذَكَرَ مَعْنَاهُ، إِلَى قَوْلِهِ: مَوَاسِمِ الْحَجِّ.**

واتە: (عبدُ اللـه)ی کوڕی عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: خەڵك لەسەرەتای ئیسلامەوە کە حەجیان دەکرد، کڕین و فرۆشتنیان دەکرد، ڕاوی بە هەمان مانا فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە، هەتا گەیشتە: (مَوَاسِمِ الْحَجِّ).

## باسی سەبارەت بە حەجی منداڵ.

## ٨ - باب فِي الصَّبِيِّ يَحُجُّ.

١٧٣٦ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالرَّوْحَاءِ فَلَقِيَ رَكْبًا فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ فَقَالَ: (مَنِ الْقَوْمُ). فَقَالُوا: الْمُسْلِمُونَ، فَقَالُوا فَمَنْ أَنْتُمْ، قَالُوا: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَفَزِعَتِ امْرَأَةٌ فَأَخَذَتْ بِعَضُدِ صَبِيٍّ فَأَخْرَجَتْهُ مِنْ مِحَفَّتِهَا فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ لِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: (نَعَمْ، وَلَكِ أَجْرٌ).

واتە: ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ڕەوحا کە شوێنێکە لە نێوان مەککەو مەدینەدا گەیشت بە کۆمەڵە سوارێك سەلامی لێ کردن و فەرمووی: (ئێوە لە کام هۆزن؟)، وتیان: لە هۆزی موسوڵمانانین، وتیان: ئەی ئێوە کێن، ئەوانەی کە لە خزمەتیدا بوون وتیان: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئافرەتێ بەسەر وڵاخێکەوە ڕاچڵەکی لەو شوێنەدا کە وەك کەژاوە وایە بەڵام سەقفی نیە پەلی منداڵێکی گرت و هێنایەدەرەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئایا ئەم منداڵە حەجی بۆ دەبێ؟ فەرمووی: (بەڵێ، بۆ تۆش پاداشتی هەیە).

# باسی دیاریکردنی شوێنی ئیحرام بەستن.

## ٩ – بابٌ فِي الْمَوَاقِيتِ.

١٧٣٧ – (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: وَقَّتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَا الْحُلَيْفَةِ، وَلأَهْلِ الشَّامِ الْجُحْفَةَ، وَلأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنًا، وَبَلَغَنِي أَنَّهُ وَقَّتَ لأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمَ.

واتە: ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم (ذا الحُلَيْفة)ی دیاریکرد بۆ ئیحرام دابەستنی خەڵکی مەدینە، (جُحفة)ی دیاریکرد بۆ ئیحرام دابەستنی خەڵکی شام، (قرن)ی دیاریکرد بۆ ئیحرام دابەستنی خەڵکی نەجد، پێم گەیشتووە کە (يلملم)یشی دیاریکردوە بۆ ئیحرام دابەستنی خەڵکی یەمەن.

١٧٣٨ – (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَنِ ابْنِ طَاوُسٍ عَنْ أَبِيهِ، قَالاَ: وَقَّتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِمَعْنَاهُ، – ﴿وَ﴾قَالَ أَحَدُهُمَا: وَلأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمَ، وَقَالَ أَحَدُهُمَا: أَلَمْلَمَ – قَالَ: (فَهُنَّ لَهُمْ، وَلِمَنْ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِ

أَهْلِهِنَّ مِمَّنْ كَانَ يُرِيدُ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ وَمَنْ كَانَ دُونَ ذَلِكَ). قَالَ ابْنُ طَاوُسٍ: مِنْ حَيْثُ أَنْشَأَ، قَالَ: وَكَذَلِكَ حَتَّى أَهْلُ مَكَّةَ يُهِلُّونَ مِنْهَا).

واتە: ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ، وە لە ئیبنو (طاوُس)ەوە، لەباوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویانە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شوێنی دیاریکرد بۆ ئیحرام دابەستن، ڕاوی فەرمودەی پێشوی بە هەمان مانا گێڕایەوە، یەکێکیان وتی: (یَلَمْلَم)ی دیاریکرد بۆ ئیحرام دابەستنی خەڵکی یەمەن، ئەوی تریشیان وتی: (ألَمْلَم) لە جیاتی (یَلَمْلَم) — فەرمووی: (ئەم شوێنانە جێگەی ئیحرام دابەستنن بۆ ئەوان و خەڵکی ئەم ولاَتانەو، ئەو کەسانەی کە خەڵکی ولاَتانی ترن و بەسەر ئەم شوێنانەدا دێن بۆ حەج و عومرە). ئیبنو (طاوُس) وتی: هەرکەسێکیش لەو شوێنانە نەبو ئەوە لەوشوێنەوە دەست پێ دەکات کە لێی نیشتەجێ یە، هەتا نزیکتر بێ جێگەی ئیحرام دابەستنەکەشی نزیکترە، وتی: تەنانەت خەڵکی مەککە لەناو مەککەدا ئیحرام دادەبەستن.

١٧٣٩ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَّتَ لأَهْلِ الْعِرَاقِ ذَاتَ عِرْقٍ.

واتە: عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (ذات عِرق)ی دیاریکرد بۆ ئیحرام دابەستنی خەڵکی عێراق.

١٧٤٠ - (ضعيف) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: وَقَّتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لأَهْلِ الْمَشْرِقِ الْعَقِيقَ.

واتە: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم (عقيق)ی دیاریكرد بۆ ئیحرام دابەستنی خەڵكی رۆژهەڵات.

١٧٤١ - (ضعيف) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ أَهَلَّ بِحَجَّةٍ أَوْ عُمْرَةٍ مِنَ الْمَسْجِدِ الأَقْصَى إِلَى الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ). أَوْ (وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ).شَكَّ عَبْدُ اللَّهِ أَيَّتَهُمَا قَالَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ:يَرْحَمُ اللَّهُ وَكِيعًا! أَحْرَمَ مِنْ بَيْتِ الْمَقْدِسِ يَعْنِي إِلَى مَكَّةَ.

واتە: لە ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هاتووە، كە بیستویەتی لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (كەسێ لە مزگەوتی ئەقصاوە ئیحرامی حەج یان عومرە دابەستێ خوای گەورە لە گوناهی لەوەو پێشوو لەوەو دواشی خۆش دەبێت). یان (بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت). (عَبدُ اللهِ)ی كوڕی (عَبدُ الرَّحمَن)راوی فەرمودەكە گومانی هەبوو لەوەی كە راوی كامیانی فەرموو. ئەبو داود دەڵێت: رەحمەتی خوا لە وەكیع بێت لە (بَيتِ المَقدِس)ەوە ئیحرامی دادەبەست واتە كاتێ كە دەهات بۆ حەج و عومرە بۆ مەككە.

١٧٤٢ – (حسن) عن زُرَارَةَ بْنُ كُرَيْمٍ، أَنَّ الْحَارِثَ بْنَ عَمْرٍو السَّهْمِيَّ حَدَّثَهُ، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ بِمِنًى أَوْ بِعَرَفَاتٍ، وَقَدْ أَطَافَ بِهِ النَّاسُ، قَالَ: فَتَجِيءُ الأَعْرَابُ فَإِذَا رَأَوْا وَجْهَهُ قَالُوا: هَذَا وَجْهٌ مُبَارَكٌ، قَالَ: وَوَقَّتَ ذَاتَ عِرْقٍ لأَهْلِ الْعِرَاقِ.

واتە: لە زورارەی كوڕی كورەیمەوە دەگێڕنەوە، كە (حارِث)ی كوڕی عەمری سەهمی بۆی گێڕاوتەوە وتویەتی: لە مینا یان لە عەرەفات چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، خەڵك چوار دەوریان دابوو، وتی: عەرەبە دەشتەكیەكان هاتن كاتێ كە روخساریان بینی وتیان: ئەمە روخسارێكی پیرۆز و موبارەكە، (حارِث) وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم (ژاتْ عِرق)ی دیاریكرد بۆ ئیحرام دابەستنی خەڵكی عێراق.

## باسی ئیحرام بەستنی ئافرەتی زەیسان بۆ حەج.

## ١٠ – باب الْحَائِضِ تُهِلُّ بِالْحَجِّ.

١٧٤٣ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: نُفِسَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ بِمُحَمَّدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ بِالشَّجَرَةِ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَبَا بَكْرٍ أَنْ تَغْتَسِلَ فَتُهِلَّ.

واتە: عائیشە رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: ئەسمای كچی عومەیس لە حەجی

مالآوایی دا، لە نزیك درەختەکەی (ذِي الحُلَيْفَة)، موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری بوو، کاتێ کە پێغەمبەریان صلی الله علیه وسلم ئاگادار کردەوە، فەرمانی کرد بە ئەبو بەکر کە پێی بڵێ: خۆی بشوات و ئیحرامی حەج دابەستێ.

١٧٤٤ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الْحَائِضُ وَالنُّفَسَاءُ إِذَا أَتَتَا عَلَى الْوَقْتِ تَغْتَسِلَانِ وَتُحْرِمَانِ وَتَقْضِيَانِ الْمَنَاسِكَ كُلَّهَا غَيْرَ الطَّوَافِ بِالْبَيْتِ). قَالَ أَبُو مَعْمَرٍ فِي حَدِيثِهِ: (حَتَّى تَطْهُرَ)، وَلَمْ يَذْكُرِ ابْنُ عِيسَى: عِكْرِمَةَ وَمُجَاهِدًا، قَالَ: عَنْ عَطَاءٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَلَمْ يَقُلِ ابْنُ عِيسَى: (كُلَّهَا). قَالَ: (الْمَنَاسِكَ إِلاَّ الطَّوَافَ بِالْبَيْتِ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئافرەتی زەیسان و بێ نوێژ کاتێ هاتنە شوێنی دیاریکراوی ئیحرام دابەستن بۆ حەج خۆیان بشۆن و ئیحرام دابەستن و هەموو مەناسك کارو کردەوەکانی حەج ئەنجام بدەن جگە لەسوڕانەوە بەدەوری کەعبەدا). ئەبو مەعمەر لە فەرمودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: (هەتا پاك دەبنەوە)، ئیبنو عیسا نەیوت: لە عیکریمەوە لە موجاهیدەوە، بەڵکو وتی: لە (عَطاء)ەوە، لە ئیبنو عەباسەوە، وە ئیبنو عیسا نەیوت: (کُلها). بەڵکو وتی: (المَناسِكَ إلاَّ الطوافَ بالبَيْتِ).

# باسی بەكارهێنانی بۆنی خۆش پێش ئیحرام بەستن.

## ١١ - باب الطِّيبِ عِنْدَ الإِحْرَامِ.

١٧٤٥ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أُطَيِّبُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لإِحْرَامِهِ قَبْلَ أَنْ يُحْرِمَ، وَلإِحْلاَلِهِ قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ.

واتە: عائیشە رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: من خۆم بۆنی خۆشم دەدا لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێش ئەوەی ئیحرام دابەستێ، وە لەدوای ئیحرام شكاندنیش پێش ئەوەی تەوافیماڵی خوا بكات.

١٧٤٦ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ الْمِسْكِ فِي مَفْرِقِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ.

واتە: عائیشە رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: دەڵێی دەڕوانمە بریقەی ئەو میسكەی شوێنی جیاكردنەوەی مووی سەری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كە لە ناوەڕستدا مووی سەری دەكرد بەدوو بەشەوە، كە لە پێش ئیحرام دابەستندا لێی دابوو.

## باسی (تلْبيد)[١].

## ١٢ - باب التَّلْبِيدِ.

١٧٤٧ - (صحيح) عَنْ سَالِمٍ - يَعْنِي ابْنَ عَبْدِ اللَّهِ - عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُهِلُّ مُلَبِّدًا.

واتە: لە سالم – واتە كوڕی (عَبْدُ الله) – وە، لە باوكیەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بیستووە تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی دەكرد لەكاتێكدا كە كەتیرە یان هەر شتێكی تری لەو شێوەی دابوو لە مووی سەری.

١٧٤٨ - (ضعيف) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَبَّدَ رَأْسَهُ بِالْعَسَلِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەنگوینی دابوو لەسەری بۆ ئەوەی موووەكانی لێك جودا نەبنەوە.

---

[١]- (تلْبيد) واتە: كەتیرە یان هەر شتێكی تری لەو شێوە بدرێت لە مووی سەر لەپێش ئیحرام دابەستندا بۆ ئەوەی موووەكانی سەر بنوسێن بەیەكەوە و لێك جودا نەبنەوە و تەپ و تۆز نەچێتە ناویانەوە و ئەسپێ تێی نەدات.

# باسی هەدی ئاژەڵی دیاریكراو بۆ قوربانی.

## ١٣ - باب فِي الْهَدْيِ.

١٧٤٩ - (حسن بلفظ (فضة) شاذ بلفظ (من ذهب) ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَهْدَى عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ فِي هَدَايَا رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَمَلاً كَانَ لأَبِي جَهْلٍ فِي رَأْسِهِ بُرَةُ فِضَّةٍ. قَالَ ابْنُ مِنْهَالٍ: بُرَةٌ مِنْ ذَهَبٍ، زَادَ النُّفَيْلِيُّ: يَغِيظُ بِذَلِكَ الْمُشْرِكِينَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ساڵی رێكەوتنی حودەیبیەدا وشترێكی كردە سەربڕی، لەو وشترانەی كە دیاریكردبو بۆ قوربانی ئەویش یەكێ بوو لەو وشترانەی كە لە غەنیمەتی جەنگی بەدردا دەستی كەوتبو، هی ئەبو جەهل بوو هەڵقەیەكی زیو كرابووە نەرمایی لوتیەوە. ئیبنو مینهال دەڵێت: هەڵقەیە لە ئاڵتون، نوفەیلی ئەمەی بۆ زیاد كرد: بۆ ئەوەی داخ و خەفەت بخاتە دڵی هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەرانەوە.

## باسی مانگای دیاریکراو بۆ قوربانی.

## ١٤ – باب فِي هَدْيِ الْبَقَرِ.

١٧٥٠ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحَرَ عَنْ آلِ مُحَمَّدٍ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بَقَرَةً وَاحِدَةً.

واتە: لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە حەجی ماڵاوایی دا مانگایەکی کردە قوربانی بۆ ئەو هاوسەرانەی کە لە خزمەتیدا حەجیان کرد.

١٧٥١ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَبَحَ عَمَّنِ اعْتَمَرَ مِنْ نِسَائِهِ بَقَرَةً بَيْنَهُنَّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مانگایەکی کردە قوربانی و سەربڕی بۆ ئەو هاوسەرانەی کە لە خزمەتیدا عومرەیان کرد.

## باسی نیشانەکردنی قوربانی.

## ١٥ - باب فِي الإِشْعَارِ.

١٧٥٢ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى الظُّهْرَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ، ثُمَّ دَعَا بِبَدَنَةٍ فَأَشْعَرَهَا مِنْ صَفْحَةِ سَنَامِهَا الأَيْمَنِ، ثُمَّ سَلَتَ عَنْهَا الدَّمَ وَقَلَّدَهَا بِنَعْلَيْنِ، ثُمَّ أُتِيَ بِرَاحِلَتِهِ، فَلَمَّا قَعَدَ عَلَيْهَا وَاسْتَوَتْ بِهِ عَلَى الْبَيْدَاءِ أَهَلَّ بِالْحَجِّ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە (ذِي الحُلَيْفَة) نوێژی نیوەڕۆی کرد، لەپاشدا داوای کرد وشترێ لە وشترە دیاریەکانی ماڵی خوایان بۆ هێنا، نیشانەی کرد بە شێوەیە تیغی دا لەسەر بەشی لای راستی کۆپارەکەی و لەتی کردو خوێنی پێدا هاتەخوارەوە، دوو نەعلی کردە ملیەوە، ئینجا سواری وشترەکەی بوو کاتێ کە لە (بَيْدَاء) وەستا نیەتی حەجی هێناو فەرمووی: (لَبَّيْكَ حَجاً).

١٧٥٣ - (صحيح) عَنْ شُعْبَةَ بِهَذَا الْحَدِيثِ، بِمَعْنَى أَبِي الْوَلِيدِ، قَالَ: ثُمَّ سَلَتَ الدَّمَ بِيَدِهِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ هَمَّامٌ قَالَ: سَلَتَ الدَّمَ عَنْهَا بِإِصْبَعِهِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا مِنْ سُنَنِ أَهْلِ الْبَصْرَةِ الَّذِي تَفَرَّدُوا بِهِ.

واتە: شوعبە فەرموودەی پێشوی گێڕایەوە، بە هەمان مانای فەرموودەکەی ئەبو وەلید، وتی: لەپاشدا بە دەستی خوێنەکەی هەسوو لە لا کۆپارەکەی. ئەبو داود دەڵێت: هەممام فەرموودەی پێشوی گێڕایەوە، وتی: بە پەنجەی خوێنەکەی هەسوو لە لا کۆپارەکەی. ئەبو داود دەڵێت: ئەمەش لە سوننەت و ڕێبازی خەڵکی بەصرەیە چونکە ئەو پیاوانەی کە ریوایەتیان کردوە هەموویان خەڵکی بەصرەن جگە لە ئیبنو عەباس.

**١٧٥٤ - (صحيح) عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ وَمَرْوَانَ أَنَّهُمَا قَالاَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ، فَلَمَّا كَانَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ قَلَّدَ الْهَدْيَ وَأَشْعَرَهُ وَأَحْرَمَ.**

واتە: لە میسوەری کوڕی مەخرەمەو مەروانەوە دەگێڕنەوە، کە وتویانە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە ساڵی ڕێکەوتنی حودەیبیەدا لە ماڵ دەرچوو، کاتێ کە گەیشتە (ذِي الحُلَيفَة) گەردن بەندی کردە ملی قوربانیەکەی بۆ ئەوەی بزانن کە ئاژەڵی قوربانیە وە نیشانەی کردو ئیحرامی دابەست.

**١٧٥٥ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَهْدَى غَنَمًا مُقَلَّدَةً.**

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم مەڕێکی نیشانەکراوی کردە قوربانی.

# باسی گۆڕینی ئاژەڵی قوربانی.

## ١٦ - باب تَبْدِيلِ الْهَدْيِ.

١٧٥٦ - (ضعيف) عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: أَهْدَى عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ بختيا فَأُعْطِيَ بِهَا ثَلاَثَمِائَةِ دِينَارٍ، فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَهْدَيْتُ بختيا، فَأُعْطِيتُ بِهَا ثَلاَثَمِائَةِ دِينَارٍ، أَفَأَبِيعُهَا وَأَشْتَرِي بِثَمَنِهَا بُدْنًا؟ قَالَ: (لاَ انْحَرْهَا إِيَّاهَا). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا لأَنَّهُ كَانَ أَشْعَرَهَا.

واتە: لە سالمی کوڕی (عَبْدُ اللّه)وە ، لە باوکیەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێشەوا عومەری کوڕی (خطّاب) ڕەزای خوای لێ بێ وشترێکی جوان و چاکی کردە قوربانی سێ سەد دیناریان دایە، چووە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وشترێکی جوان و چاکم کردۆتە قوربانی سێ سەد دیناریان داومەتێ، بیفرۆشم و بە پارەکەی وشترێکی تر بکڕم؟ فەرمووی: (نەخێر مەیفرۆشەو سەری ببڕە واتە مەیگۆڕەو بیکە بە قوربانی). ئەبو داود دەڵێت: ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە نیشانەی کردبوو.

# باسی ئەو كەسەی وشترە قوربانیەكانی دەنێرێ بۆ ماڵی خوا و خۆی ناڕوات.

## ١٧ - باب مَنْ بَعَثَ بِهَدْيِهِ وَأَقَامَ.

١٧٥٧ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: فَتَلْتُ قَلاَئِدَ بُدْنِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدَيَّ، ثُمَّ أَشْعَرَهَا وَقَلَّدَهَا، ثُمَّ بَعَثَ بِهَا إِلَى الْبَيْتِ، وَأَقَامَ بِالْمَدِينَةِ، فَمَا حَرُمَ عَلَيْهِ شَيْءٌ كَانَ لَهُ حِلاًّ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: بەدەستی خۆم ملوانكەی ئاژەڵە دیارییەكانی پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم هۆندۆتەوە، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەو ملوانكانەی دەكردە ملیان و نیشانەی دەكردن، لەپاشدا دەیناردن بۆ ماڵی خوا، خۆشی لە مەدینە دەمایەوە، هیچ شتێكی لێ حەرام نەدەبوو كە پێشتر بۆی حەڵاڵ بوو.

١٧٥٨ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُهْدِي مِنَ الْمَدِينَةِ فَأَفْتِلُ قَلاَئِدَ هَدْيِهِ، ثُمَّ لاَ يَجْتَنِبُ شَيْئًا مِمَّا يَجْتَنِبُ الْمُحْرِمُ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگیّڕنەوە، کە پیّغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاژەڵە دیارییەکانی لە مەدینەوە دەنارد بۆ ماڵی خوا، ئەو ملوانکانەی کە دەیکردە ملیان بەدەستی خۆم دەمهۆنینەوە، لەپاشدا لە هیچ شتیّك لەو شتانە دورنەدەکەوتەوە کە ئەو کەسەی ئیحرام دەبەستیّ لیّیان دوردەکەویّتەوە.

١٧٥٩ - (صحيح) عَنْ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْهَدْيِ، فَأَنَا فَتَلْتُ قَلَائِدَهَا بِيَدِي مِنْ عِهْنٍ كَانَ عِنْدَنَا، ثُمَّ أَصْبَحَ فِينَا حَلَالاً يَأْتِي مَا يَأْتِي الرَّجُلُ مِنْ أَهْلِهِ.

واتە: عائیشەی دایکی باوەڕداران رەزای خوای لیّ بیّ دەڵیّت: پیّغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاژەڵە دیارییەکانی لە مەدینەوە دەنارد بۆ ماڵی خوا، کە بەدەستی خۆم ملوانکەکانیانم دەهۆنیەوە لە خوری رەنگاو رەنگ کە هەمان بوو، لەپاشدا ئیّمەی بۆ حەڵاڵ بوو وەك چۆن پیاویّ هاوسەرەکەی خۆی بۆ حەڵاڵە.

## باسی سواربوونی وشتری دیاریکراو بۆ قوربانی.

## ١٨ - باب فِي رُكُوبِ الْبُدْنِ.

١٧٦٠- (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى رَجُلاً يَسُوقُ بَدَنَةً، فَقَالَ: (ارْكَبْهَا). قَالَ: إِنَّهَا بَدَنَةٌ، فَقَالَ: (ارْكَبْهَا وَيْلَكَ). فِي الثَّانِيَةِ، أَوْ فِي الثَّالِثَةِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پیاوێکی بینی وشترێکی دیاری بۆ قوربانی لێ دەخوڕی، فەرمووی: (سواری ببە). وتی: ئەوە وشتری دیاری یە بۆ قوربانی، فەرمووی: (سواری ببە وەیل بۆ تۆ). لە جاری دووهەمدا یان سێهەمدا.

١٧٦١ - (صحيح) عَن أَبو الزُّبَيْرِ قَالَ: سَأَلْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ رُكُوبِ الْهَدْيِ؟ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (ارْكَبْهَا بِالْمَعْرُوفِ إِذَا أُلْجِئْتَ إِلَيْهَا حَتَّى تَجِدَ ظَهْرًا).

واتە: ئەبو زوبەیر دەڵێت: سەبارەت بە سواربوونی وشتری دیاریکراو بۆ قوربانی لە جابری کوڕی (عبدُ الله)م پرسی؟ وتی: لە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بیستووە دەیفەرموو: (ئەگەر ناچار بووی بە شێوەیەکی چاك کە زیانی پێ نەگات سواری ببە هەتا وڵاغی سواری ترت دەست دەکەوێت).

## باسی پەککەوتنی وشتری دیاری پێش ئەوەی بگاتە ماڵی خوا.

## ١٩ - باب فِي الْهَدْيِ إِذَا عَطِبَ قَبْلَ أَنْ يَبْلُغَ.

١٧٦٢ - (صحيح) عَنْ نَاجِيَةَ الأَسْلَمِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ مَعَهُ بِهَدْيٍ فَقَالَ: (إِنْ عَطِبَ مِنْهَا شَيْءٌ فَانْحَرْهُ، ثُمَّ اصْبَغْ نَعْلَهُ فِي دَمِهِ، ثُمَّ خَلِّ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّاسِ).

واتە: لە ناجییەی ئەسلەمییەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاژەڵە دیارییەکانی لە مەدینەوە پێدا نارد بۆ ماڵی خوا، فەرمووی: (ئەگەر وشترێ یەکی کەوت و نەیتوانی رێ بکات سەری ببڕە، لەپاشدا ئەو نەعلەی کە بۆ نیشانە کراوەتە ملی بیژەنە بە خوێنەکەدا - بۆ ئەوەی خەڵك بزانن قوربانیەو لێی بخۆن - ، ئینجا وازی لێ بێنە بۆ خەڵك با بیخۆن و سودی لێ ببینن).

١٧٦٣ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فُلاَنًا الأَسْلَمِيَّ، وَبَعَثَ مَعَهُ بِثَمَانَ عَشْرَةَ بَدَنَةً، فَقَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ أُزْحِفَ عَلَيَّ مِنْهَا شَيْءٌ؟ قَالَ: (تَنْحَرُهَا، ثُمَّ تَصْبُغُ نَعْلَهَا فِي دَمِهَا، ثُمَّ اضْرِبْهَا عَلَى صَفْحَتِهَا، وَلاَ تَأْكُلْ مِنْهَا أَنْتَ وَلاَ أَحَدٌ مِنْ أَصْحَابِكَ). أَوْ قَالَ: (مِنْ أَهْلِ رُفْقَتِكَ). قَالَ أَبو دَاوُدَ: الَّذِي تَفَرَّدَ بِهِ مِنْ هَذَا الْحَدِيثِ قَوْلُهُ: (وَلاَ تَأْكُلْ مِنْهَا أَنْتَ وَلاَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ رُفْقَتِكَ). وَقَالَ فِي حَدِيثِ عَبْدِ الْوَارِثِ: (ثُمَّ اجْعَلْهُ عَلَى صَفْحَتِهَا). مَكَانَ (اضْرِبْهَا). قَالَ أَبو دَاوُدَ: سَمِعْتُ أَبَا سَلَمَةَ، يَقُولُ: إِذَا أَقَمْتَ الإِسْنَادَ وَالْمَعْنَى كَفَاكَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە فلاَن کەسی ئەسلەمی دا هەژدە وشتری دیاری نارد بۆ ماڵی خوا، پیاوە ئەسلەمیەکە وتی: پێم بڵێ ئەگەر وشترێ نەیتوانی ڕێ بکات چی لێ بکەم؟ فەرمووی: (سەری ببڕە، لەپاشدا ئەو نەعلەی کە بۆ نیشانە کراوەتە ملی بیژەنە بە خوێنەکەداو بیهێنە بە لایەکی کۆپارەکەیدا - بۆ ئەوەی کە خەڵك بینیان بزانن قوربانیەو لێی ببەن و لێی بخۆن - ئینجا نە خۆت و نە هاوڕێکانت لێی مەخۆن). یان فەرمووی: (هیچ کەسێ لە خەڵکانی کاروانەکە لێی نەخوات). ئەبو داود دەڵێت: ئەوەی کە تەنیا یەك کەس ریوایەتی کردوە لەم فەرموودەدا ئەم وتەیە: (ولا تأكل منها أنت ولا

أحَدٌ مِن أهْلِ رُفقَتِكَ). واتە: نە تۆ نـە هـیـچ كـەس لـە خـەڵكانی كاروانەكـە لێـی نەخوات. لە فەرمودەكەی (عَبْد الْوَارِث)دا لـە جیـاتـی (اجرِبهَا) فـەرمووی: (ثـمَّ اجْعَلْهُ عَلَى صَفْحَتِهَا).

١٧٦٤ - (منكر) عَنْ عَلِيّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: لَمَّا نَحَرَ رَسُـولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ بُدْنَـهُ، فَنَحَـرَ ثَلاَثِـينَ بِيَـدِهِ، وَأَمَرَنِي فَنَحَرْتُ سَائِرَهَا.

واتە: پێشەوا عەلی رەزای خـوای لـێ بـێ دەڵێـت: كـاتێ كـە پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليه وسلم وشترە قوربانیەكانی سـەربڕی بەدەسـتی خـۆی سـی سـەری سەربڕی، فەرمانی پێ كردم ئەوانەی كە مابوونەوە من سەرم بڕین.

١٧٦٥ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قُرْطٍ، عَـنِ النَّبِـيِّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (إِنَّ أَعْظَمَ الأَيَّـامِ عِنْـدَ اللَّـهِ تَبَـارَكَ وَتَعَالَى يَوْمُ النَّحْرِ، ثُمَّ يَوْمُ الْقَرِّ). قَـالَ عِيسَـى: قَـالَ ثَوْرٌ: وَهُوَ الْيَوْمُ الثَّانِي. قَالَ وَقُرِّبَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَدَنَاتٌ خَمْسٌ أَوْ سِتٌّ، فَطَفِقْنَ يَـزْدَلِفْنَ إِلَيْه بِأَيَّتِهِنَّ يَبْدَأُ، فَلَمَّا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا - قَـالَ فَـتَكَلَّمَ بِكَلِمَةٍ خَفِيَّةٍ لَمْ أَفْهَمْهَا، فَقُلْتُ: مَا قَالَ؟ - قَالَ: (مَـنْ شَاءَ اقْتَطَعَ).

واتــە: لــە (عَبْـدُ اللّـە)ی کــوڕی (قُــرْط)ەوە دەگێڕنــەوە، کــە وتویــەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویـەتی: (گـەورەترین ڕۆژەکـان لـە لای خـوای گـەورە ڕۆژی دەی مـانگی (ذي الحجة)یـە کـە دەکاتـە یەکـەم ڕۆژی جەژنی قوربـان، لەپاشـدا ڕۆژی دوای ئـەو — لـەو ڕۆژەدا حاجیـەکان لـە مینـادا ئارام دەگرن چونکە زۆربەی هەرە زۆی مەناسیکەکانی حەجیان ئەنجامداوە -). عیسا وتی: (ثۆر) وتی: ڕۆژی دووهەم، ڕاوی وتی: پێنـج یان شـەش وشـتر هێنـرا بـۆ پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم بـۆ ئـەوەی بیانکـات بـە قوربـانی، وشترەکان پێشبڕکێیان دەکرد لـە نزیـك بوونـەوە لـە پێغەمبـەری خـوا صـلى الله عليـە وسـلم بـۆ ئـەوەی ویـستی کامیـان لەپێشـدا سـەربڕێت سـەرییبڕێت، کـاتێ سەرییبڕین و کەوتن، ڕاوی وتی: وشەیەکی بە سوکی فەرموو لێی تێ نەگەیشتم، وتم: چـی فـەرمووی؟ وتیـان: فـەرمووی: (جـا ئـیتر کـێ دەیـەوێت بـا گۆشـت لـێ بکاتەوە بۆ خۆی).

١٧٦٦ - (ضعيف) عَنْ غَرَفَةَ بْـنَ الْحَـارِثِ الْكِنْـدِيَّ، قَـالَ: شَـهِدْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ فِـى حَجَّـةِ الْـوَدَاعِ وَأُتِيَ بِالْبُدْنِ، فَقَالَ: (ادْعُوا لِى أَبَا حَسَنٍ). فَدُعِىَ لَهُ عَلِيٌّ رَضِىَ اللهُ عَنْهُ، فَقَالَ لَهُ: (خُذْ بِأَسْـفَلِ الْحَرْبَـةِ). وَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ بِأَعْلاَهَـا، ثُـمَّ طَعَنَ بِهَا فِى الْبُدْنِ، فَلَمَّا فَـرَغَ رَكِـبَ بَغْلَتَـهُ، وَأَرْدَفَ عَلِيًّا رَضِىَ اللهُ عَنْهُ.

واتە: لە غەرەفەی کوڕی (حارِث)ی کەندییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویـەتی: لـە حەجی ماڵاوایی دا ئامادە بووم لـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوادا صلى الله عليـە

وسلم وشترەكانیان بۆ هێنا، فەرمووی: (باوكی حەسەنم بۆ بانگ بكەن). ئەوانیش پێشەوا عەلییان رەزای خوای لێ بێ بۆ بانگ كرد، پێی فەرموو: (لای خواروی حەربەكە بگرە). خۆشی لای سەروی حەربەكەی گرت و سەریبڕین، لەپاشدا كاتێ كە لێ بویەوە سواری ئێسترەكەی بوو، پێشەوا عەلیشی رەزای خوای لێ بێ خستە پاشكۆی خۆیەوە.

## باسی چۆنیەتی سەربڕینی وشترەكان.

## ٢٠ - باب كَيْفَ تُنْحَرُ الْبُدْنُ

١٧٦٧ - (صحيح) عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَابِطٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابَهُ كَانُوا يَنْحَرُونَ الْبَدَنَةَ مَعْقُولَةَ الْيُسْرَى، قَائِمَةً عَلَى مَا بَقِيَ مِنْ قَوَائِمِهَا.

واتە: (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی (سابط) دەڵێت: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم خۆی و یارانی كاتێ كە وشتری قوربانیان سەردەبڕی دەستی چەپیان دەبەستەوە لەسەر سیانەكەی تری بە پێوە دەمایەوە جا سەریان دەبڕی.

١٧٦٨ - (صحيح) عن زِيَاد بْن جُبَيْرٍ قَالَ: كُنْتُ مَعَ ابْنِ عُمَرَ بِمِنًى فَمَرَّ بِرَجُلٍ وَهُوَ يَنْحَرُ بَدَنَتَهُ وَهِيَ بَارِكَةٌ، فَقَالَ: ابْعَثْهَا قِيَامًا مُقَيَّدَةً، سُنَّةَ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: زیادی كوڕی جوبەیر دەڵێت: لە مینا لەگەڵ ئیبنو عومەردا بووم دای بە لای پیاوێكدا خەریك بوو وشترێكی سەردەبڕی و دەیكرد بە قوربانی بۆ خۆی، وتی: هەڵیسێنە سەر پێ و دەستی چەپی ببەستە جا سەریببڕە، چونكە ئەوە لە رەوشت و سوننەتی موحەممەدە صلی الله علیه وسلم.

**١٧٦٩ - (صحيح) عَنْ عَلِيّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أَقُومَ عَلَى بُدْنِهِ وَأَقْسِمَ جُلُودَهَا وَجِلاَلَهَا، وَأَمَرَنِي أَنْ لاَ أُعْطِيَ الْجَزَّارَ مِنْهَا شَيْئًا، وَقَالَ: (نَحْنُ نُعْطِيهِ مِنْ عِنْدِنَا).**

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێدام سەرپەرشتی وشترە قوربانیەكانی بكەم و گۆشت و پێستەو جل و كۆپانەكانیان بكەم بەخێر و دابەشی بكەم، وە فەرمانی پێدام هیچ نەدەم بە قەسابەكە، وە فەرمووی: (ئێمە لەلایەن خۆمانەوە شتی پێ دەدەین).

## باسی کاتی ئیحرام دابەستن.

## ٢١ - باب فِي وَقْتِ الإِحْرَامِ.

١٧٧٠ - (ضعيف) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ: يَا أَبَا الْعَبَّاسِ عَجِبْتُ لاِخْتِلاَفِ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي إِهْلاَلِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ أَوْجَبَ؟! فَقَالَ: إِنِّي لأَعْلَمُ النَّاسِ بِذَلِكَ، إِنَّهَا إِنَّمَا كَانَتْ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَجَّةٌ وَاحِدَةٌ فَمِنْ هُنَاكَ اخْتَلَفُوا، خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَاجًّا، فَلَمَّا صَلَّى فِي مَسْجِدِهِ بِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْهِ أَوْجَبَ فِي مَجْلِسِهِ، فَأَهَلَّ بِالْحَجِّ حِينَ فَرَغَ مِنْ رَكْعَتَيْهِ، فَسَمِعَ ذَلِكَ مِنْهُ أَقْوَامٌ فَحَفِظْتُهُ عَنْهُ، ثُمَّ رَكِبَ فَلَمَّا اسْتَقَلَّتْ بِهِ نَاقَتُهُ أَهَلَّ، وَأَدْرَكَ ذَلِكَ مِنْهُ أَقْوَامٌ، وَذَلِكَ أَنَّ النَّاسَ إِنَّمَا كَانُوا يَأْتُونَ أَرْسَالاً، فَسَمِعُوهُ حِينَ اسْتَقَلَّتْ بِهِ نَاقَتُهُ يُهِلُّ، فَقَالُوا: إِنَّمَا أَهَلَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ اسْتَقَلَّتْ بِهِ نَاقَتُهُ، ثُمَّ مَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا عَلاَ عَلَى شَرَفِ الْبَيْدَاءِ

أَهَلَّ، وَأَدْرَكَ ذَلِكَ مِنْهُ أَقْوَامٌ فَقَالُوا: إِنَّمَا أَهَلَّ حِينَ عَلاَ عَلَى شَرَفِ الْبَيْدَاءِ، وَايْمُ اللَّهِ لَقَدْ أَوْجَبَ فِي مُصَلاَّهُ، وَأَهَلَّ حِينَ اسْتَقَلَّتْ بِهِ نَاقَتُهُ وَأَهَلَّ، حِينَ عَلاَ عَلَى شَرَفِ الْبَيْدَاءِ. قَالَ سَعِيدٌ: فَمَنْ أَخَذَ بِقَوْلِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ أَهَلَّ فِي مُصَلاَّهُ إِذَا فَرَغَ مِنْ رَكْعَتَيْهِ.

واته: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: به (عَبْدُ الله)ی کوڕی عەباسم رەزای خوایان لێ بێ وت: ئەی باوکی عەباس سەرم سوڕدەمێنێ له یارانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە رایان جیاوازە لەسەر ئیحرام دابەستن و تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ) کردنی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەکاتێکدا کە ئیحرام دابەستن واجب بووِ؟ وتی: من له هەموو کەس زیاتر شارەزاترم بەوە، لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم یەك حەجی کردوە، جیاوازیەکەیان ئا لێرەدایە. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە مەدینە دەرچوو بۆ حەج لە (ذِي الحُلَيفَة) دابەزی کاتێ کە لە مزگەوتەکەیدا دوو رکات نوێژی نیوەڕۆی دەکرد ئیحرام دابەستن واجب بوو، لە دوو رکات نوێژەکەی بویەوە بە نیەتی حەج ئیحرامی دابەست و تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی کرد، کۆمەڵێ ئەوەیان لێ بیست لێیەوە لەبەریان کرد، بۆیە وتیان: لە (ذِي الحُلَيفَة) کاتێ کە لە دوو رکات نوێژەکەی بویەوە ئیحرامی دابەست و تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی کرد، لەپاشدا سواری وشترەکەی بوو کاتێ کە وشترەکەی سەرکەوت بۆ سەر کێوی (بیداء) تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی کرد، کۆمەڵێ خەڵکی تر ئاگاداری ئەوە بوون بۆیە رایان جیاوازە لەسەر کاتی دەست پێ کردنی، لەبەرئەوەی خەڵکەکە دەستە دەستە دەهاتن ئاگایان لێ بوو کاتێ کە وشترەکەی سەرکەوت بۆ سەر کێوی

(بیداء) تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی کرد بۆیە وتیان: کاتێ کە وشترەکەی سەرکەوت بۆ سەر کێوی (بیداء) تەلبییەی کرد، نەیانزانی بوو کە پێشتریش کردویەتی، ئینجا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کەوتە ڕێ کاتێ کە گەیشتە سەر بەرزایی کێوی (بیداء) جارێکی تر بەدەنگی بەرز تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی کرد کۆمەڵێکی تر ئاگایان لێ بوو بۆیە ئەوانیش وتیان: کاتێ کە گەیشتە سەر بەرزایی کێوی (بیداء) تەلبییەی کرد، سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە (ذِي الْحُلَيفَة) لە جێگا نوێژەکەیدا ئیحرامی دابەست و نیەتی هێناو تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی کرد، کاتێ کە وشترەکەی سەرکەوت بۆ سەر کێوی (بیداء) تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی کرد، کە گەیشتە سەر بەرزایی کێوی (بیداء) جارێکی تر بەدەنگی بەرز تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی کرد. سەعید وتی: ئەوەی بە قسەی (عَبْدُ الله)ی کوڕی عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ دەکات با کاتێ کە لە دوو ڕکات نوێژەکەی دەبێتەوە لەجێگا نوێژەکەیدا ئیحرام دابەستێ و نیەت بهێنێ و تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ) بکات.

**١٧٧١ - (صحيح) عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ قَالَ: بَيْدَاؤُكُمْ هَذِهِ الَّتِي تَكْذِبُونَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيهَا، مَا أَهَلَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلاَّ مِنْ عِنْدِ الْمَسْجِدِ، يَعْنِي مَسْجِدَ ذِي الْحُلَيْفَةِ.**

واتە: لە سالمی کوڕی (عَبْدُ الله)وە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەو کێوی (بیداء)ەی کە ئێوە لەخۆتانەوە بەبێ زانیاری باسی دەکەن کە گوایە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەوێ ئیحرامی دابەستووەو تەلبییە(لَبَّيْكَ

اللَّهُـمَّ لَبَّيْـكَ)ی کـردوە وا نیـەو لێتـان تێکچووە، بـەڵکو ئەمـە راسـتیەکەتی کـە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لـە مزگەوتەکەیـدا لـە (ذِي الحُلَيفَـة) دوو رکات نوێژی نیوەڕۆی کرد، کاتێ کە لە دوو رکات نوێژەکـەی بویـەوە ئیحرامـی دابەست و تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی کرد.

١٧٧٢ - (صحيح) عَنْ عُبَيْدِ بْنِ جُرَيْجٍ أَنَّهُ قَالَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، رَأَيْتُكَ تَصْنَعُ أَرْبَعًا لَمْ أَرَ أَحَدًا مِـنْ أَصْحَابِكَ يَصْنَعُهَا، قَالَ: مَا هُنَّ يَا ابْنَ جُـرَيْجٍ؟ قَـالَ: رَأَيْتُكَ لاَ تَمَسُّ مِنَ الأَرْكَـانِ إِلاَّ الْيَمَـانِيَيْنِ، وَرَأَيْتُـكَ تَلْبَسُ النِّعَـالَ السِّـبْتِيَّةَ، وَرَأَيْتُـكَ تَصْبُغُ بِالصُّـفْرَةِ، وَرَأَيْتُكَ إِذَا كُنْتَ بِمَكَّةَ أَهَـلَّ النَّـاسُ إِذَا رَأَوُا الْهِـلاَلَ وَلَمْ تُهِلَّ أَنْتَ حَتَّى كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ!. فَقَالَ عَبْدُ اللَّـهِ بْنُ عُمَرَ: أَمَّا الأَرْكَانُ: فَإِنِّى لَمْ أَرَ رَسُـولَ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمَـسُّ إِلاَّ الْيَمَـانِيَيْنِ، وَأَمَّـا النِّعَـالُ السِّبْتِيَّةُ فَإِنِّى رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ يَلْبَسُ النِّعَالَ الَّتِى لَيْسَ فِيهَا شَـعْرٌ وَيَتَوَضَّـأُ فِيهَـا، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَلْبَسَـهَا، وَأَمَّـا الصُّـفْرَةُ: فَـإِنِّى رَأَيْـتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصْبُغُ بِهَا، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَصْبُغَ بِهَا، وَأَمَّا الإِهْلاَلُ: فَإِنِّى لَمْ أَرَ رَسُـولَ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُهِلُّ حَتَّى تَنْبَعِثَ بِهِ رَاحِلَتُهُ.

واتە: لە عوبەیدی کوڕی جورەیجەوە دەگێڕنەوە، کە بە (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی عومەریان ڕەزای خوایان لێ بێ وت: ئەی باوکی (عَبْدُ الرَّحْمَن)دەتبینم چوار شت دەکەیت هاوڕێکانت لە یارانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەو چوار شتە ناکەن؟ وتی: کامانەن ئەی کوڕی جورەیج؟ وتی: دەتبینم لەکاتی تەوافی کەعبەدا لە چوار گۆشەکەی کەعبە تەنیا دەست بە دوو گۆشە یەمانیەکەدا دەهێنی، دەتبینم نەعلی سیبتی لەپێ دەکەیت - نەعلی سیبتی نەعلێکە خۆشە دەکرێ مووی پێوە نامێنێ - ، دەتبینم مووی خۆت و پۆشاکی خۆت بەڕەنگی زەرد ڕەنگ دەکەیت، دەتبینم کاتێ کە لە مەککەیت خەڵك لەیەکەم ڕۆژی مانگی (ذي الحجة)دا ئیحرام دادەبەستن و تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ) دەکەن، کەچی تۆ لە ڕۆژی هەشتەمی مانگی (ذي الحجة)دا کە ناسراوە بە ڕۆژی (تروية) ئیحرام دادەبەستی و تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ) دەکەیت. (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ وتی: بە نیسبەت دوو گۆشە یەمانیەکەوە: چونکە نەمدیوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەست بهێنێ بە گۆشەکانی تری کەعبەدا جگە لەم دوو گۆشەیە، بۆ نەعلە سیبتیەکانیش پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینیوە نەعلی خۆشەکراوی لەپێ دەکرد کە مووی پێوە نەدەما دەسنوێژیشی پێوە دەگرت، بۆیە منیش حەزدەکەم لەپێی بکەم، بەکارهێنانی ڕەنگی زەردیش لەبەرئەوەیە کە خۆم دیومە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕەنگی زەردی بەکاردەهێنا، بۆیە منیش حەزدەکەم ڕەنگی زەرد بەکاربهێنم، بۆ ئیحرام دابەستنیش: نەمدیوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئیحرام دابەستێ و تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ) بکات هەتاکو وڵاخەکەی لەژێریدا هەڵنەسایەوە و بەرەو مینا دەکەوتە ڕێ واتە لە ڕۆژی هەشتەمی مانگی (ذي الحجة)دا کە ناسراوە بە ڕۆژی (تروية).

١٧٧٣ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الظُّهْرَ بِالْمَدِينَةِ أَرْبَعًا، وَصَلَّى الْعَصْرَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ بَاتَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ حَتَّى أَصْبَحَ، فَلَمَّا رَكِبَ رَاحِلَتَهُ وَاسْتَوَتْ بِهِ أَهَلَّ.

واتە: ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە مەدینە چوار رکات نوێژی نیوەڕۆی کرد، وە لە (ذِي الْحُلَيْفَةِ) نوێژی عەسری کورت کردەوەو دوو رکاتی کرد، لەپاشدا شەو لە (ذِي الْحُلَيْفَةِ) مایەوە هەتا بەیانی، کاتێ کە سواری ولاخەکەی بوو لەسەر کێوی (بیداء) وەستا تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی کرد.

١٧٧٤ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ رَكِبَ رَاحِلَتَهُ فَلَمَّا عَلاَ عَلَى جَبَلِ الْبَيْدَاءِ أَهَلَّ.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە مەدینە نوێژی نیوەڕۆی کرد، لەپاشدا سواری ولاخەکەی بوو کاتێ کە ولاخەکەی گەیشتە سەر بەرزایی کێوی (بیداء) تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی کرد.

١٧٧٥ - (ضعيف) عَنْ سَعْدُ بْنُ أَبِى وَقَّاصٍ قَالَ: كَانَ نَبِىُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَخَذَ طَرِيقَ الْفُرْعِ أَهَلَّ إِذَا اسْتَقَلَّتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ، وَإِذَا أَخَذَ طَرِيقَ أُحُدٍ أَهَلَّ إِذَا أَشْرَفَ عَلَى جَبَلِ الْبَيْدَاءِ.

واتە: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص دەڵێت: ئەگەر پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە (فُرْع)ەوە بکەوتایەتە ڕێ و ڕێگەی (فُرْع)ی هەڵبژاردایە - (فُرْع) شوێنێکە لەنێوان مەکەو مەدینەدا - کاتێ کە وڵاخەکەی سەردەکەوت بۆ (فُرْع) تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی دەکرد، وە ئەگەر لە ئوحودەوە بکەوتایەتە ڕێ و ڕێگەی ئوحودی هەڵبژاردایە کاتێ کە وڵاخەکەی دەگەیشتە سەر بەرزایی کێوی (بیداء) تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی کرد.

## باسی مەرج دانان لە حەجدا واتە حوکمی چییە؟

## ٢٢ - باب الاِشْتِرَاطِ فِى الْحَجِّ.

١٧٧٦ - (حسن صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ ضُبَاعَةَ بِنْتَ الزُّبَيْرِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى أُرِيدُ الْحَجَّ أَأَشْتَرِطُ قَالَ (نَعَمْ). قَالَتْ فَكَيْفَ أَقُولُ؟ قَالَ: (قُولِى: لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ وَمَحِلِّى مِنَ الأَرْضِ حَيْثُ حَبَسْتَنِى).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە (ضُبَاعَة)ی كچی زوبەیری كوڕی (عبد المطلب) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم من دەمەوێت حەج بكەم مەرج دابنێم؟ فەرمووی: (بەڵێ). وتی: بڵێم چی؟ فەرمووی: (بڵێ: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ وَمَحِلِّي مِنَ الأَرْضِ حَيْثُ حَبَسْتَنِي). خودایە لەهەركوێ نەخۆشت خستم لەو شوێنە ئیحرام دەشكێنم.

## باسی ئیحرامی حەج بە جیا دابەستن.

## ٢٣ - باب فِي إِفْرَادِ الْحَجِّ.

١٧٧٧ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَفْرَدَ الْحَجَّ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم ئیحرامی حەجی بە جیا دابەست.

١٧٧٨ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُوَافِينَ هِلاَلَ ذِي الْحِجَّةِ، فَلَمَّا كَانَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ قَالَ: (مَنْ شَاءَ أَنْ يُهِلَّ بِحَجٍّ فَلْيُهِلَّ، وَمَنْ شَاءَ أَنْ يُهِلَّ بِعُمْرَةٍ فَلْيُهِلَّ بِعُمْرَةٍ). قَالَ مُوسَى

فِي حَدِيثِ وُهَيْبٍ: (فَإِنِّي لَوْلاَ أَنِّي أَهْدَيْتُ لأَهْلَلْتُ بِعُمْرَةٍ). وَقَالَ فِي حَدِيثِ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ: (وَأَمَّا أَنَا فَأُهِلُّ بِالْحَجِّ فَإِنَّ مَعِيَ الْهَدْيَ). ثُمَّ اتَّفَقُوا: فَكُنْتُ فِيمَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ. فَلَمَّا كَانَ فِي بَعْضِ الطَّرِيقِ حِضْتُ فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا أَبْكِي. فَقَالَ: (مَا يُبْكِيكِ؟). قُلْتُ: وَدِدْتُ أَنِّي لَمْ أَكُنْ خَرَجْتُ الْعَامَ، قَالَ: (ارْفُضِي عُمْرَتَكِ، وَانْقُضِي رَأْسَكِ، وَامْتَشِطِي).قَالَ مُوسَى: (وَأَهِلِّي بِالْحَجِّ). وَقَالَ سُلَيْمَانُ: (وَاصْنَعِي مَا يَصْنَعُ الْمُسْلِمُونَ فِي حَجِّهِمْ).فَلَمَّا كَانَ لَيْلَةُ الصَّدَرِ أَمَرَ يَعْنِي رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ فَذَهَبَ بِهَا إِلَى التَّنْعِيمِ، زَادَ مُوسَى: فَأَهَلَّتْ بِعُمْرَةٍ مَكَانَ عُمْرَتِهَا، وَطَافَتْ بِالْبَيْتِ، فَقَضَى اللَّهُ عُمْرَتَهَا وَحَجَّهَا. قَالَ هِشَامٌ: وَلَمْ يَكُنْ فِي شَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ هَدْيٌ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: زَادَ مُوسَى فِي حَدِيثِ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ: فَلَمَّا كَانَتْ لَيْلَةُ الْبَطْحَاءِ طَهُرَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا.

واتە: عائیشە رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: لە نزیکی کۆتایی مانگی (ذي لقعدة)دا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیە وسلم لە مەدینەوە ەرچووین بۆ حەج، لە (ذي الحليفة) فەرمووی: (ئەوەی دەیەوێت ئیحرام بە

نیەتی حەج ببەستێت یا بە نیەتی حەج ببیبەستێت، وە ئەوەی دەیەوێت ئیحرام بە نیەتی عومرە ببەستێت با بە نیەتی عومرە ببیبەستێت)، موسا لە فەرموودەکەی وەهەیب دا وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (لەبەرئەوەی ئاژەڵی دیاری ماڵی خوام پێیە ئەگینا بە نیەتی عومرە ئیحرامم دادەبەست). لە فەرموودەکەی حەممادی کوڕی سەلەمەدا وتی: فەرمووی: (من خۆم بە نیەتی حەج ئیحرام دادەبەستم لەبەرئەوەی ئاژەڵی دیاری ماڵی خوام پێیە). لەپاشدا هەردوو راویەکە هەماهەنگن: کە عائیشە وتی: من خۆم یەکێك بووم لەوانەی کە بە نیەتی عومرە ئیحرامیان دابەست، لە رێگادا کەوتمە حاڵەتی بێ نوێژییەوە چوومە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەگریام، فەرمووی: (ئەوە بۆچی دەگریت؟). وتم: خۆزگە ئەم ساڵ دەرنەچوومایە بۆ حەج، فەرمووی: (عومرەکەت واز لێ بهێنە و رەفزی بکە، قژەکەت هەڵوەشێنەوەو، شانەی بکە). موسا وتی: فەرمووی: (ئیحرامی حەج ببەستە). سولەیمان وتی: فەرمووی: (ئەو کارانە بکە کە موسوڵمانان لە حەجەکەیاندا دەیکەن). لەشەوی گەڕانەوەدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی کرد بە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی برام کە بمبات بۆ تەنعیم — کە دەکاتە مزگەوتی عائیشەی ئێستا - لەوێ بە نیەتی عومرە ئیحرام دابەستم منیش لەگەڵی چووم، موسا ئەمەی بۆ زیاد کرد: ئیحرامی عومرەم دابەست لەجیاتی عومرەکەی پێشوو، تەوافی ماڵی خوام کرد، خوای گەورە بە حەج و عومرە بۆی حساب کرد، هیشام وتی: هیچ پێویستی بە سەربڕینی ئاژەڵی دیاریش نەکرد، ئەبو داود دەڵێت: لە فەرموودەکەی حەممادی کوڕی سەلەمەدا موسا ئەمەی بۆ زیاد کرد: ئەو شەوەی کە لە (بَطحَاء) بوون عائیشە رەزای خوای لێ بێ پاك بویەوە.

١٧٧٩ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِالْحَجِّ، وَأَهَلَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْحَجِّ، فَأَمَّا مَنْ أَهَلَّ بِالْحَجِّ أَوْ جَمَعَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ فَلَمْ يَحِلُّوا حَتَّى كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ.

واتە: لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە حەجی ماڵاوایی دا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم لە مەدینەوە دەرچووین، هەمان بوو تەنیا ئیحرامی عومرەی دابەستبوو، هەمان بوو ئیحرامی حەج و عومرەی پێکەوە دابەستبوو، هەشمان بوو ئیحرامی حەجی دابەستبوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئیحرامی حەجی دابەست، جا ئەوەی کە ئیحرامی حەجی دابەستبوو یان ئیحرامی حەج و عومرەی پێکەوە دابەستبوو هەتا ڕۆژی جەژن ئیحرامەکەی نەشکاند.

١٧٨٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ، بِإِسْنَادِهِ مِثْلَهُ، زَادَ: فَأَمَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ فَأَحَلَّ.

واتە: لە ئەبو ئەسوەدەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان سەنەد و بە هەمان شێوە هاتووە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: ئەوەی ئیحرامی عومرەی دابەستبوو ئیحرامەکەی شکاند.

١٧٨١ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ فَأَهْلَلْنَا بِعُمْرَةٍ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ فَلْيُهِلَّ بِالْحَجِّ مَعَ الْعُمْرَةِ، ثُمَّ لاَ يَحِلُّ حَتَّى يَحِلَّ مِنْهُمَا جَمِيعًا). فَقَدِمْتُ مَكَّةَ وَأَنَا حَائِضٌ، وَلَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ، وَلاَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَشَكَوْتُ ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: (انْقُضِي رَأْسَكِ، وَامْتَشِطِي، وَأَهِلِّي بِالْحَجِّ وَدَعِي الْعُمْرَةَ). قَالَتْ: فَفَعَلْتُ: فَلَمَّا قَضَيْنَا الْحَجَّ أَرْسَلَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ إِلَى التَّنْعِيمِ، فَاعْتَمَرْتُ، فَقَالَ: (هَذِهِ مَكَانَ عُمْرَتِكِ). قَالَتْ: فَطَافَ الَّذِينَ أَهَلُّوا بِالْعُمْرَةِ بِالْبَيْتِ، وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ حَلُّوا، ثُمَّ طَافُوا طَوَافًا آخَرَ بَعْدَ أَنْ رَجَعُوا مِنْ مِنًى لِحَجِّهِمْ، وَأَمَّا الَّذِينَ كَانُوا جَمَعُوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ: فَإِنَّمَا طَافُوا طَوَافًا وَاحِدًا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ وَمَعْمَرٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، نَحْوَهُ لَمْ يَذْكُرُوا طَوَافَ الَّذِينَ أَهَلُّوا بِعُمْرَةٍ وَطَوَافَ الَّذِينَ جَمَعُوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ.

واتـە: لـە عائیشـەی خێزانـی پێغەمبـەری خـواوە صـلی الله علیـه وسـلم دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لە حەجی مـاڵاوایی دا لەخزمـەت پێغەمبـەری خـوادا صلی الله علیـه وسـلم لـە مەدینـەوە دەرچووین بـە نیـەتی عـومرە ئیحرامـمان دابەسـت، لەپاشـدا پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم فـەرمووی: (ئـەوەی ئاژەڵی دیاری پێیە با بە نیەتی حەج و عومرە ئیحرام دابەستێت، ئیتر ئیحـرام نەشـكێنێ هـەتا هـەردووكیان تـەواو دەكـات و ئیحرامـی هـەردووكیان پێكـەوە دەشكێنێ). كاتێ كە گەیشتمە مەككە كەوتمـە حاڵـەتی بێ نوێژیـەوە، ئـیتر نـە تەوافی ماڵی خودام كرد، نە هاتوچۆ(سەعی) صەفاو مەروە، لـەلای پێغەمبـەری خوا صلی الله علیه وسلم سكالام خۆم كرد فەرمووی: (قژەكەت هەڵوەشـێنەوەو، شـانەی بكـە، بـە نیـەتی حـەج ئیحـرام دابەسـتە، عومرەكـەت واز لـێ بهێنـە و رەفزی بكە). عائیشە وتی: منـیش وەهـام كـرد، كـاتێ كـە حـەجمان تـەواو كـرد پێغەمبەری خوا صلی الله علیـه وسـلم لەگـەڵ براكـەم (عَبدُ الرَّحمَن)ی كـوڕی ئـەبو بـەكر نـاردمی بـۆ تـەنعیم لـەوێ بـە نیـەتی عـومرە ئیحـرامم دابەسـت، فەرمووی: (ئەمە لە جیاتی ئەو عومرەیـەی كـە وازت لـێ هێنـاو رەفـزت كـرد)، عائیشە وتی: جا ئەوانەی بە نیـەتی عـومرە ئیحرامیـان دابەسـت تـەوافی مـاڵی خوا و هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەیان كـرد، لەپاشـدا ئیحرامـی عومرەكـەیان شـكاند، ئینجـا دوای ئـەوەی لـە مینـا گەڕانـەوە تـەوافێكی تریـان كـرد، بـەڵام ئەوانەی ئیحرامی حەج و عومرەیان بە یەكەوە دابەستبوو یەك تەوافیان كرد، ئەبو داود دەڵێت: ئیبراهیمی كوڕی سـەعد و مەعمـەر، لـە ئیبنـو شـیهابەوە بـە هەمان شێوە گێڕاویانەتەوە، بەڵام باسی ئەوانەیان نەكرد كە بە نیەتی عـومرە ئیحرامیان دابەست یـان ئەوانـەی كـە ئیحرامـی حـەج و عومرەیـان بـە یەكـەوە دابەستبوو.

١٧٨٢ - (صحيح دون قوله (مَنْ شاءَ أن يَجْعَلَهَا عُمْرَةً ....) والصواب: (واجعلوها عُمْرَةً) ) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا أَنَّهَا قَالَتْ: لَبَّيْنَا بِالْحَجِّ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِسَرِفَ حِضْتُ، فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا أَبْكِي فَقَالَ: (مَا يُبْكِيكِ يَا عَائِشَةُ؟). فَقُلْتُ: حِضْتُ، لَيْتَنِي لَمْ أَكُنْ حَجَجْتُ! فَقَالَ: (سُبْحَانَ اللَّهِ! إِنَّمَا ذَلِكَ شَيْءٌ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ). فَقَالَ: (انْسُكِي الْمَنَاسِكَ كُلَّهَا غَيْرَ أَنْ لاَ تَطُوفِي بِالْبَيْتِ). فَلَمَّا دَخَلْنَا مَكَّةَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ شَاءَ أَنْ يَجْعَلَهَا عُمْرَةً فَلْيَجْعَلْهَا عُمْرَةً، إِلاَّ مَنْ كَانَ مَعَهُ الْهَدْيُ). قَالَتْ: وَذَبَحَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ نِسَائِهِ الْبَقَرَ يَوْمَ النَّحْرِ، فَلَمَّا كَانَتْ لَيْلَةُ الْبَطْحَاءِ وَطَهُرَتْ عَائِشَةُ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتَرْجِعُ صَوَاحِبِي بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ وَأَرْجِعُ أَنَا بِالْحَجِّ؟ فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرٍ فَذَهَبَ بِهَا إِلَى التَّنْعِيمِ فَلَبَّتْ بِالْعُمْرَةِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بە نیەتی حەج ئیحراممان دابەست و تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)مان کرد لە سەریف

کەوتمە حاڵەتی بێ نوێژیەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاتەژوورەوە بۆ لام دەگریام، فەرمووی: (ئەوە بۆچی دەگریت؟). وتم: کەوتمە حاڵەتی بێ نوێژیەوە، خۆزگە ئەم ساڵ دەرنەچوومایە بۆ حەج، فەرمووی: (سبحان الله) پاك و بێ عەیبی بۆ خوا ئەمە حاڵەتێکە خوای گەورە نوسیویەتی لەسەر کچانی ئادەم). هەروەها فەرمووی: (هەموو دروشم و مەناسیکەکانی حەج ئەنجام بدە جگە لەتەوافی ماڵی خوا). کاتێ کە چووینە ناو مەککەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوەی دەیەوێت ئیحرام بە نیەتی عومرە دابەستێت با بە نیەتی عومرە دایبەستێت، جگە لەو کەسانەی کە دیاری ماڵی خوایان پێیە). وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رۆژی جەژن بۆ هەموو هاوسەرەکانی مانگایەکی کردە قوربانی و سەریبڕی، ئەو شەوەی کە لە (بَطحَاء) بوون عائیشە پاك بوویەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاوسەرەکانی ترت بە حەج و عەمرەوە گەڕانەوە بەڵام من تەنها بە حەجەوە دەگەڕێمەوە؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی کرد بە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی ئەبو بەکر کە عائیشە ببات بۆ تەنعیم بۆ ئەوەی لەوێ بە نیەتی عومرە ئیحرام دابەستێت.

١٧٨٣ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلاَ نَرَى إِلاَّ أَنَّهُ الْحَجُّ، فَلَمَّا قَدِمْنَا تَطَوَّفْنَا بِالْبَيْتِ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ لَمْ يَكُنْ سَاقَ الْهَدْىَ أَنْ يُحِلَّ، فَأَحَلَّ مَنْ لَمْ يَكُنْ سَاقَ الْهَدْىَ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بە نیەتی حەج لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم لە مەدینەوە دەرچووین، کاتێ کە گەیشتینە مەککە تەواف مالّی خوامان کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی کرد ئەوەی کە دیاری مالّی خوای پێ نیە ئیحرام بشکێنێ، جا ئەوەی کە دیاری مالّی خوای پێ نەبوو ئیحرامەکەی شکاند.

١٧٨٤ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ لَمَا سُقْتُ الْهَدْيَ). قَالَ مُحَمَّدٌ: أَحْسِبُهُ قَالَ: (وَلَحَلَلْتُ مَعَ الَّذِينَ أَحَلُّوا مِنَ الْعُمْرَةِ). قَالَ: أَرَادَ أَنْ يَكُونَ أَمْرُ النَّاسِ وَاحِدًا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەوەی کە ئێستا دەیزانم لەسەرتاوە بمزانیایە دیاری مالّی خوام نەدەهێنا). موحەممەد دەلّێت: وا ئەزانم راوی فەرمودەکە لە فەرمودەکەیدا وتی: فەرمووی: (وە منیش ئیحرامەکەم دەشکاند لەگەلّ ئەوانەی کە ئیحرامیان شکاند). راوی وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەم فەرمودەیەی دەیویست کاروباری خەلّك وەك یەك بێت.

١٧٨٥ - (صحيح) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: أَقْبَلْنَا مُهِلِّينَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْحَجِّ مُفْرَدًا، وَأَقْبَلَتْ عَائِشَةُ مُهِلَّةً بِعُمْرَةٍ، حَتَّى إِذَا كَانَتْ بِسَرِفَ عَرَكَتْ، حَتَّى إِذَا قَدِمْنَا طُفْنَا بِالْكَعْبَةِ، وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَأَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُحِلَّ مِنَّا مَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ، قَالَ: فَقُلْنَا: حِلُّ مَاذَا؟ فَقَالَ: (الْحِلُّ كُلُّهُ). فَوَاقَعْنَا النِّسَاءَ، وَتَطَيَّبْنَا بِالطِّيبِ، وَلَبِسْنَا ثِيَابَنَا، وَلَيْسَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ عَرَفَةَ إِلاَّ أَرْبَعُ لَيَالٍ، ثُمَّ أَهْلَلْنَا يَوْمَ التَّرْوِيَةِ، ثُمَّ دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى عَائِشَةَ فَوَجَدَهَا تَبْكِي، فَقَالَ: (مَا شَأْنُكِ). قَالَتْ: شَأْنِي أَنِّي قَدْ حِضْتُ، وَقَدْ حَلَّ النَّاسُ وَلَمْ أَحْلِلْ، وَلَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ، وَالنَّاسُ يَذْهَبُونَ إِلَى الْحَجِّ الآنَ، قَالَ (إِنَّ هذَا أَمْرٌ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ، فَاغْتَسِلِي، ثُمَّ أَهِلِّي بِالْحَجِّ). فَفَعَلَتْ وَوَقَفَتِ الْمَوَاقِفَ حَتَّى إِذَا طَهُرَتْ طَافَتْ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ قَالَ: (قَدْ حَلَلْتِ مِنْ حَجِّكِ وَعُمْرَتِكِ جَمِيعًا). قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَجِدُ فِي نَفْسِي أَنِّي لَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ حِينَ حَجَجْتُ، قَالَ: (فَاذْهَبْ بِهَا يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ فَأَعْمِرْهَا مِنَ التَّنْعِيمِ). وَذَلِكَ لَيْلَةَ الْحَصْبَةِ.

واتە: جابر دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بە ئیحرامەوە هاتین بۆ حەج بە جیا، بەڵام عائیشە بە نیەتی عومرە هاتبوو، لە سەریف کەوتە حاڵەتی بێ نوێژیەوە، کاتێ کە گەیشتینە مەککە تەوافی ماڵی خوا و هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەمان کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێداین کە هەر کەسێکمان ئاژەڵی دیاری ماڵی خوای پێ نیە با ئیحرام بشکێنێ، راوی وتی: وتمان: ئیحرام شکاندن لەچی و چیمان بۆ حەڵاڵ دەبێ؟ فەرمووی: (هەموو شتێك - لەوانەی کە لێتان قەدەغەکرابوو کاتێ کە ئیحرامتان پۆشیبوو -). لەگەڵ هاوسەرەکانمان جووت بووین، بۆنی خۆشمان دا لە خۆمان، جل و بەرگی ئاسایی خۆمان لەبەر کردەوە، تەنها چوار شەویشمان مابوو بۆ عەرەفە، لەپاشدا هەشتی مانگی (ذی الحجة) کە پێی دەوترێت رۆژی (ترویة) تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی کرد، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چووە ژوورەوە بۆ لای عائیشەی هاوسەری، بینی دەگریا، فەرمووی: (ئەوە چیتە بۆچی دەگریت؟). وتی: کەوتومەتە حاڵەتی بێ نوێژیەوە خەڵك عومرەیان کردو ئیحرامیان شکاند من نەمشکاندوە، تەوافی ماڵی خوام نەکردوە، وا ئێستا خەڵك بۆ حەج دەچن، فەرمووی: (سبحان الله) پاك و بێ عەیبی بۆ خوا ئەمە حاڵەتێکە خوای گەورە نوسیویەتی لەسەر کچانی ئادەم، خۆت بشۆ ئینجا بە نیەتی حەج ئیحرام دابەستە). عائیشەش بە قسەی کردو ئەرکانەکانی بەجێهێنا جگە لە تەوافی ماڵی خوا و هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە، کاتێ کە پاك بویەوە تەوافی ماڵی خوا و هاتوچۆ(سەعی) صەفاو مەروەشی کرد، لەپاشدا پێی فەرموو: (ئیتر تۆ لە حەج و عومرە بویتەوە). عائیشە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شتێك لە دڵما دروست بوو کە بەر لەئەنجامدانی حەج تەوافی ماڵی خوام ئەنجام نەداوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە (عَبْدُ الرَّحْمَنِ)ی فەرموو: (ئەی (عَبْدُ الرَّحْمَنِ) عائیشەی خوشکت ببە لە تەنعیمەوە عومرەیەکی پێ بکە). ئەم بەسەرهاتەش لە شەوی (حَصبَة)دا بوو واتە لە شەوی چواردەی مانگی (ذی الحجة)دا.

١٧٨٦ - (صحيح) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى عَائِشَةَ، بِبَعْضِ هَذِهِ الْقِصَّةِ، قَالَ عِنْدَ قَوْلِهِ: (وَأَهِلِّي بِالْحَجِّ: ثُمَّ حُجِّي وَاصْنَعِي مَا يَصْنَعُ الْحَاجُّ غَيْرَ أَنْ لاَ تَطُوفِي بِالْبَيْتِ، وَلاَ تُصَلِّي).

واتە: جابر دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چووە ژوورەوە بۆ لای عائیشەی هاوسەری، جابر هەندێ لە بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە، وتی: فەرمووی: (بە نیەتی حەج ئیحرام دابەستە: لەپاشدا حەج بکە حاجیەکان چی دەکەن تۆش ئەنجامی بدە جگە لە تەوافی ماڵی خوا، هەروەها نوێژیش مەکە).

١٧٨٧ - (صحيح) عن جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: أَهْلَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْحَجِّ خَالِصًا لاَ يُخَالِطُهُ شَيْءٌ، فَقَدِمْنَا مَكَّةَ لأَرْبَعِ لَيَالٍ خَلَوْنَ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ، فَطُفْنَا وَسَعَيْنَا، ثُمَّ أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نَحِلَّ، وَقَالَ: (لَوْلاَ هَدْيِي لَحَلَلْتُ). ثُمَّ قَامَ سُرَاقَةُ بْنُ مَالِكٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ مُتْعَتَنَا هَذِهِ أَلِعَامِنَا هَذَا أَمْ لِلأَبَدِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (بَلْ هِيَ لِلأَبَدِ).

واتە: جابری کوڕی (عبدُ الله) دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بە نیەتی حەج ئیحرامان دابەست بە بێ عومرە و هیچ شتێکی

تێکەڵ نەکەین، کاتێ کە گەیشتینە مەککە چوار رۆژ لە مانگی (ذی الحجة) تێپەڕی بوو، تەوافی ماڵی خوا و هاتوچۆ(سەعی) نێوان صەفاو مەروەمان کرد، لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێداین کە ئیحرام بشکێنین، وە فەرمووی: (ئەگەر دیاری ماڵی خوام نەهێنایە منیش ئیحرامم دەشکاند). ئینجا سوراقەی کوڕی مالیك هەستا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم ئیحرام شکاندن و سود وەرگرتنەمان لەدوای ئیحرام شکاندن تایبەتە بەم ساڵەوە یان بۆ هەموو ساڵێکە؟ فەرمووی: (بۆ هەموو ساڵێکە).

١٧٨٨ - (صحيح) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابُهُ لأَرْبَعِ لَيَالٍ خَلَوْنَ مِنْ ذِى الْحِجَّةِ، فَلَمَّا طَافُوا بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اجْعَلُوهَا عُمْرَةً إِلاَّ مَنْ كَانَ مَعَهُ الْهَدْيُ). فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ أَهَلُّوا بِالْحَجِّ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ قَدِمُوا فَطَافُوا بِالْبَيْتِ وَلَمْ يَطُوفُوا بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ.

واتە: جابر دەڵێت: چوار رۆژ لە مانگی (ذی الحجة) تێپەڕی بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و یارانی گەیشتینە مەککە، کاتێ کە تەوافی ماڵی خوا و هاتوچۆ(سەعی) صەفاو مەروەیان کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (نیەتی عومرەی لێ بێنن و بیکەن بە عومرە جگە لەو کەسانەی کە دیاری ماڵی خوایان پێیە). لە هەشتی مانگی (ذی

الحجة)دا کە ناسراوە بە رۆژی (ترویة) بە نیەتی حەج ئیحرامیان دابەست، لە دەی مانگی (ذی الحجة)دا کە دەکاتە یەکەم رۆژی جەژنی قوربان گەیشتنە مەککە تەوافی ماڵی خوایان کرد، بەڵام هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەیان نەکرد.

١٧٨٩ - (صحيح) عن جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَهَلَّ هُوَ وَأَصْحَابُهُ بِالْحَجِّ، وَلَيْسَ مَعَ أَحَدٍ مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ هَدْيٌ إِلاَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَطَلْحَةَ، وَكَانَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَدِمَ مِنَ الْيَمَنِ وَمَعَهُ الْهَدْيُ فَقَالَ: أَهْلَلْتُ بِمَا أَهَلَّ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَ أَصْحَابَهُ أَنْ يَجْعَلُوهَا عُمْرَةً: يَطُوفُوا، ثُمَّ يُقَصِّرُوا، وَيَحِلُّوا، إِلاَّ مَنْ كَانَ مَعَهُ الْهَدْيُ، فَقَالُوا: أَنَنْطَلِقُ إِلَى مِنًى وَذُكُورُنَا تَقْطُرُ؟! فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (لَوْ أَنِّي اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا أَهْدَيْتُ، وَلَوْلاَ أَنَّ مَعِيَ الْهَدْيَ لأَحْلَلْتُ).

واتە: جابری کوڕی (عَبْدُ الله) دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆی و یارانی بە نیەتی حەج ئیحرامیان دابەست، لەو کاتەدا جگە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و (طلحة) نەبێ کەس ئاژەڵی دیاری ماڵی

خوای پێ نەبوو، پێشەوا عەلیش رەزای خوای لێ بێ کە لە یەمەنەوە هاتبوو ئەویش دیاری ماڵی خوای پێ بوو وتی: بە نیەتی ئەوە ئیحرام دادەبەستم کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دایبەستوە بۆی، بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا بە یارانی کە بیکەن بە عومرەو، تەواف ماڵی خوا بکەن، لەپاشدا قژیان کورت بکەنەوەو، ئیحرام بشکێنن، جگە لەوانەی کە ئاژەڵی دیاری ماڵی خوایان پێیە، وتیان: ئایا دەرچین بۆ مینا لەکاتێکدا کە تازە لەگەڵ هاوسەرەکانمان جووت بووین؟ هەواڵەکە گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەوەی کە ئێستا دەیزانم لەسەرتاوە بمزانیایە دیاری ماڵی خوام نەدەهێنا، ئەگەر دیاری ماڵی خواشم پێ نەبوایە منیش ئیحرامم دەشکاند).

١٧٩٠ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: (هَذِهِ عُمْرَةٌ اسْتَمْتَعْنَا بِهَا، فَمَنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ هَدْيٌ فَلْيَحِلَّ الْحِلَّ كُلَّهُ، وَقَدْ دَخَلَتِ الْعُمْرَةُ فِي الْحَجِّ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەمە عومرەیە بوو کردمان بۆ خۆمان جا هەرکەسێ دیاری ماڵی خوای پێ نیە با بە یەکجاری ئیحرامەکەی بشکێنێ، ئیتر لەم رۆوە هەتا رۆژی قیامەت لە مانگەکانی حەجدا عومرە دروستە).

١٧٩١ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا أَهَلَّ الرَّجُلُ بِالْحَجِّ، ثُمَّ قَدِمَ مَكَّةَ فَطَافَ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ فَقَدْ حَلَّ، وَهِيَ عُمْرَةٌ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنْ رَجُلٍ عَنْ عَطَاءٍ دَخَلَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُهِلِّينَ بِالْحَجِّ خَالِصًا، فَجَعَلَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عُمْرَةً.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ بە نیەتی حەج ئیحرامی دابەست، لەپاشدا گەیشتە مەککە تەوافی ماڵی خوا و هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەی کرد، ئەوە هەموو شتێکی بۆ حەلاڵ دەبێ، ئەوەش عومرەیە). ئەبو داود دەڵێت: ئەبو جورەیج لە پیاوێکەوە ئەویش لە (عطاء)ەوە گێڕاویەتیەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆی و یارانی بە نیەتی حەج ئیحرامان دابەست بە بێ عومرە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کردی بە عومرە پێیان.

١٧٩٢ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَهَلَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْحَجِّ، فَلَمَّا قَدِمَ طَافَ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ - وَقَالَ ابْنُ شَوْكَرٍ: وَلَمْ يُقَصِّرْ، ثُمَّ اتَّفَقَا - وَلَمْ يَحِلَّ مِنْ أَجْلِ الْهَدْيِ، وَأَمَرَ مَنْ لَمْ يَكُنْ سَاقَ الْهَدْيَ أَنْ يَطُوفَ، وَأَنْ يَسْعَى وَيُقَصِّرَ، ثُمَّ يَحِلَّ. زَادَ ابْنُ مَنِيعٍ فِي حَدِيثِهِ: أَوْ يَحْلِقَ، ثُمَّ يَحِلَّ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە نیەتی حەج لەگەڵ عومرە پێکەوە ئیحرامی دابەست، کاتێ کە گەیشتە مەککە هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەی کرد، راوی فەرمودەکە ئیبنو شەوکەر وتی: قژی کورت نەکردەوە، لەپاشدا هەردوو راوی هەماهەنگن، لەبەر دیاریەکانی ماڵی خوا ئیحرامی نەشکاند، فەرمانی دا بەوانەی کە دیاری ماڵی خوایان رەوانە نەکردوە تەوافی ماڵی خوا بکەن و، هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە بکەن و، قژیان کورت بکەنەوە، ئینجا ئیحرام بشکێنن، راوی فەرمودەکە ئیبنو مونیع لە فەرمودەکەیدا وتی: یان قژیان بتاشن، لەپاشدا ئیحرام بشکێنن.

١٧٩٣ - (ضعيف) عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتَى عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، فَشَهِدَ عِنْدَهُ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مَرَضِهِ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ: يَنْهَى عَنِ الْعُمْرَةِ قَبْلَ الْحَجِّ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە هاتووە، کە پیاوێ لە یارانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاتە خزمەت پێشەوا عومەری کوڕی (خطّاب) رەزای خوای لێ بێ، شایەتی دا: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەخۆش بوو بەو نەخۆشیەش وەفاتی کردو دنیای بەجێهێشت لێی بیستووە نەهی کردوە لە عومرەیە لەپێش حەجدا ئەنجام بدرێت.

١٧٩٤ - (صحيح إلا النهي عن القران فهو شاذ) أَنَّ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِى سُفْيَانَ قَالَ لأَصْحَابِ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ كَذَا وَكَذَا، وَعَنْ رُكُوبِ جُلُودِ النُّمُورِ؟ قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ: فَتَعْلَمُونَ أَنَّهُ نَهَى أَنْ يُقْرَنَ بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ؟ فَقَالُوا: أَمَّا هَذَا فَلاَ. فَقَالَ: أَمَا إِنَّهَا مَعَهُنَّ وَلَكِنَّكُمْ نَسِيتُمْ.

واتە: مەعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بە یارانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وت: ئایا دەزانن پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە ئەوە و ئەوە، لە سواربوونی ولاخێ کورتانەکەی لە پێستی ئاژەڵە دڕندەکان بێت؟ وتیان: بەڵێ، وتی: دەزانن کە نەهی کردوە لە ئەنجامدانی حەج و عومرە پێکەوە. وتیان: بۆ ئەمەیان نەخێر نازانین، وتی: دەی ئەوەش هەر لەگەڵ ئەو نەهیانەی پێشەوەدا بوو بەڵام ئێوە لەیادتان نەماوە.

## باسی ئەنجامدانی حەج و عومرە پێکەوە.

## ٢٤ - باب فِي الإِقْرَانِ.

١٧٩٥ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُلَبِّى بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ جَمِيعًا يَقُولُ: (لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا (معاً)، لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بیستوە تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی حەج و عومرە پێکەوە کردو فەرمووی: (لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا).

١٧٩٦ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَاتَ بِهَا - يَعْنِي بِذِي الْحُلَيْفَةِ - حَتَّى أَصْبَحَ، ثُمَّ رَكِبَ، حَتَّى إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ عَلَى الْبَيْدَاءِ حَمِدَ اللَّهَ وَسَبَّحَ وَكَبَّرَ، ثُمَّ أَهَلَّ بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ، وَأَهَلَّ النَّاسُ بِهِمَا، فَلَمَّا قَدِمْنَا أَمَرَ النَّاسَ فَحَلُّوا، حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ أَهَلُّوا بِالْحَجِّ، وَنَحَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَبْعَ بَدَنَاتٍ بِيَدِهِ قِيَامًا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الَّذِى تَفَرَّدَ بِهِ - يَعْنِي أَنَسًا - مِنْ هَذَا الْحَدِيثِ، أَنَّهُ بَدَأَ بِالْحَمْدِ وَالتَّسْبِيحِ وَالتَّكْبِيرِ، ثُمَّ أَهَلَّ بِالْحَجِّ.

واتە: لە ئەنەسەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە مەدینەوە دەرچوو بۆ حەج شەو لە (ذِي الْحُلَيْفَة) مایەوە هەتا بەیانی، لەپاشدا سواری وڵاخەکەی بوو هەتا سەرکەوت بۆ سەر کێوی (بیداء) سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کردو (الله أکبر)ی کرد، لەپاشدا تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی کرد بۆ حەج و عەمرە پێکەوە، خەڵکەکەش بە هەمان شێوە بە نیەتی حەج و عومرە تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)یان کرد، کاتێ کە گەیشتینە مەککە فەرمانی دا بە کۆمەڵێ لە خەڵکەکە ئیحرام بشکێنن، هەتا رۆژی هەشتەمی مانگی (ذی الحجة) کە ناسراوە بە رۆژی (ترویة) ئەو کاتە بە نیەتی حەج ئیحرام دابەستن، لە دەی مانگی (ذی الحجة)دا کە دەکاتە یەکەم رۆژی جەژنی قوربان دە وشتری بەدەستی خۆی بە پێوە سەربڕی واتە وشترەکان بە پێوە بوون. ئەبو داود دەڵێت: ئەوەی ئەنەس بە جیا لە فەرمودەکەدا گێڕاویەتیەوە ئەمەیە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە سوپاس و ستایشی خوای گەورە و (سبحان الله) و (الله أکبر) دەستی پێ کرد، لەپاشدا تەلبییە(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ)ی کرد بۆ حەج.

١٧٩٧ - (صحيح) عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: كُنْتُ مَعَ عَلِيٍّ حِينَ أَمَّرَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْيَمَنِ، قَالَ: فَأَصَبْتُ مَعَهُ أَوَاقِيَ، قَالَ: فَلَمَّا قَدِمَ عَلِيٌّ مِنَ الْيَمَنِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَجَدَ فَاطِمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَدْ لَبِسَتْ ثِيَابًا صَبِيغًا، وَقَدْ نَضَحَتِ الْبَيْتَ بِنَضُوحٍ، فَقَالَتْ: مَا لَكَ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ أَمَرَ أَصْحَابَهُ فَأَحَلُّوا، قَالَ:

قُلْتُ لَهَا: إِنِّي أَهْلَلْتُ بِإِهْلَالِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ لِي: (كَيْفَ صَنَعْتَ). فَقَالَ: قُلْتُ: أَهْلَلْتُ بِإِهْلَالِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: (فَإِنِّي قَدْ سُقْتُ الْهَدْيَ وَقَرَنْتُ). قَالَ: فَقَالَ لِي: (انْحَرْ مِنَ الْبُدْنِ سَبْعًا وَسِتِّينَ، أَوْ سِتًّا وَسِتِّينَ، وَأَمْسِكْ لِنَفْسِكَ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، أَوْ أَرْبَعًا وَثَلَاثِينَ، وَأَمْسِكْ لِي مِنْ كُلِّ بَدَنَةٍ مِنْهَا بَضْعَةً).

واتە: بەرائی کوڕی عازیب دەڵێت: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی کرد بە پێشەوا عەلی کوڕی بڕوات بۆ یەمەن و ببێتە سەرکار و کاربەدەستیان منیش لە خزمەتیدا بووم، وتی: چەند ئۆقیەیە لە ئاڵتونم دەستکەوت، بەرائی کوڕی عازیب وتی: کاتێ کە پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ لە یەمەنەوە هات بۆ حەج گەیشت بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، بینی (فاطِمَة)ی هاوسەری ڕەزای خوای لێ بێ ئیحرامی شکاندبوو پۆشاکی ڕەنگ کراوی لەبەردا بوو، بۆنی خۆشی دابوو لە ماڵەکەی، (فاطِمَة) وتی: ئەوە بۆچی ئیحرامت نەشکاندوە لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی کردوە بە یارانی ئیحرام بشکێنن ئەوانیش ئیحرامیان شکاندوە، عەلی وتی: پێم وت: من بە نیەتی ئەوە ئیحرامم دابەستووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دایبەستوە، پێشەوا عەلی وتی: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرمووم: (چیت کردوە). وتی: وتم: بە نیەتی ئەوە ئیحرامم دادەبەستووە کە پێغەمبەری خوا صلى الله

علیه وسلم دایبەستوە، فەرمووی: (من ئاژەڵی ماڵی خوام رەوانە کردوە و بە نیەتی حەج و عومرە پێکەوە ئیحرامم دابەستووە). وتی: پێی فەرمووم: (لە جیاتی من شەست و حەوت یان شەست و شەش سەر وشتر سەربڕەو بیکە بە قوربانی بۆم، سی و سێ یان سی و چوار سەر وشتریش سەربڕە بۆ خۆت، لەهەموو سەر وشتێ پارچەیە گۆشتم بۆ دابنێ).

١٧٩٨ - (صحيح) عَنْ أَبِى وَائِلٍ قَالَ: قَالَ الصُّبَىُّ بْنُ مَعْبَدٍ: أَهْلَلْتُ بِهِمَا مَعًا. فَقَالَ عُمَرُ: هُدِيتَ لِسُنَّةِ نَبِيِّكَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: ئەبو وائیل دەڵێت: (صُبَیَ) کوڕی مەعبەد وتی: بە نیەتی حەج و عەمرە پێکەوە ئیحرامم دابەستووە، پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ وتی: تۆ هیدایەت دراوی بۆ سەر سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەرەکەت صلی الله علیه وسلم.

١٧٩٩ - (صحيح) عَنْ أَبِى وَائِلٍ قَالَ: قَالَ الصُّبَىُّ بْنُ مَعْبَدٍ: كُنْتُ رَجُلاً أَعْرَابِيًّا نَصْرَانِيًّا، فَأَسْلَمْتُ، فَأَتَيْتُ رَجُلاً مِنْ عَشِيرَتِى يُقَالُ لَهُ هُذَيْمُ بْنُ ثُرْمُلَةَ، فَقُلْتُ لَهُ: يَا هَنَاهُ إِنِّى حَرِيصٌ عَلَى الْجِهَادِ، وَإِنِّى وَجَدْتُ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ مَكْتُوبَيْنِ عَلَىَّ، فَكَيْفَ لِى بِأَنْ أَجْمَعَهُمَا؟ قَالَ:

اجْمَعْهُمَا وَاذْبَحْ مَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ، فَأَهْلَلْتُ بِهِمَا مَعًا، فَلَمَّا أَتَيْتُ الْعُذَيْبَ لَقِيَنِي سَلْمَانُ بْنُ رَبِيعَةَ وَزَيْدُ بْنُ صُوحَانَ وَأَنَا أُهِلُّ بِهِمَا جَمِيعًا، فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِلآخَرِ: مَا هَذَا بِأَفْقَهَ مِنْ بَعِيرِهِ؟ قَالَ: فَكَأَنَّمَا أُلْقِيَ عَلَيَّ جَبَلٌ، حَتَّى أَتَيْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ إِنِّي كُنْتُ رَجُلاً أَعْرَابِيًّا نَصْرَانِيًّا، وَإِنِّي أَسْلَمْتُ، وَأَنَا حَرِيصٌ عَلَى الْجِهَادِ، وَإِنِّي وَجَدْتُ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ مَكْتُوبَيْنِ عَلَيَّ، فَأَتَيْتُ رَجُلاً مِنْ قَوْمِي فَقَالَ لِي: اجْمَعْهُمَا وَاذْبَحْ مَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ، وَإِنِّي أَهْلَلْتُ بِهِمَا مَعًا، فَقَالَ لِي عُمَرُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: هُدِيتَ لِسُنَّةِ نَبِيِّكَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: ئەبو وائیل دەڵێت: (صُبَيّ) کوڕی مەعبەد وتی: من پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی گاور بووم، موسوڵمان بووم، چووم بۆ لای پیاوێ لە هۆزەکەم ناوی (هُذَيم)ی کوڕی (ثرمُلَة) بوو، پێم وت: ئەی (هَنَاه) من سورم لەسەر ئەوەی کە بڕۆم بۆ جیهاد و تێکۆشان، دەبینم حەج و عومرەشم لەسەر نوسراوە، چۆنە کە بە نیەتی حەج و عەمرە پێکەوە ئیحرام دابەستم؟ وتی: بە نیەتی حەج و عومرە پێکەوە ئیحرام دابەستەو ئەوەندەی کە توانات هەیە قوربانی بکە، کاتێ کە هاتم بۆ (عُذَيب) سولەیمان کوڕی رەبیعە و زەیدی کوڕی صوحانم پێ گەیشت بە نیەتی حەج و عەمرە پێکەوە ئیحرامیان دابەستبوو، یەکێکیان بەوی تریانی وت: ئەمە بە قەد وشترەکەی خۆی تێ نەگەیشتووە لە حەج و

عومرە؟ وتی: وەك ئەوە وابوو کێوێك کەوتبێ بەسەرما، هەتا چوومە خزمەت پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) رەزای خوای لێ بێ، پێم وت: ئەی کاربەدەست و پێشەوای باوەڕداران من پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی گاور بووم، موسوڵمان بووم، سوربووم لەسەر ئەوەی کە بڕۆم بۆ جیهاد و تێکۆشان، بەڵام حەج و عومرەم لەسەر نوسراوە، بۆیە چووم بۆ لای پیاوێ لە هۆزەکەم پێی وتم: بە نیەتی حەج و عومرە پێکەوە ئیحرام دابەستەو ئەوەندەی کە توانات هەیە قوربانی بکە، منیش بە نیەتی حەج و عومرە پێکەوە ئیحرامم دابەست، پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ پێی وتم: تۆ هیدایەت دراوی بۆ سەر سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەرەکەت صلی الله علیه وسلم.

١٨٠٠ - (صحيح) عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ يَقُولُ: حَدَّثَنِى عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ أَنَّهُ رَضِىَ اللهُ عَنْهُ، سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (أَتَانِى اللَّيْلَةَ آتٍ مِنْ عِنْدِ رَبِّى عَزَّ وَجَلَّ). قَالَ: وَهُوَ بِالْعَقِيقِ، وَقَالَ: صَلِّ فِى هَذَا الْوَادِى الْمُبَارَكِ، وَقَالَ: (عُمْرَةٌ فِى حَجَّةٍ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ الْوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ وَعُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْوَاحِدِ فِى هَذَا الْحَدِيثِ عَنِ الأَوْزَاعِىِّ: (وَقُلْ: عُمْرَةٌ فِى حَجَّةٍ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَا رَوَاهُ عَلِىُّ بْنُ الْمُبَارَكِ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِى كَثِيرٍ فِى هَذَا الْحَدِيثِ وَقَالَ: (وَقُلْ: عُمْرَةٌ فِى حَجَّةٍ).

واتە: لە عیکریمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە ئیبنو عەباسم رەزای خوایان لێ بێ بیستووە دەیوت: پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) رەزای خوای لێ بێ بۆی گێڕامەوە کە لە پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم بیستووە دەیفەرموو: (لەلایەن خوای گەورەوە نێردراوێ هاتە لام، وتی: لە عەقیق بوو کە شوێنێکە لە نزیك مەدینەوە، وتی: لەم شیوە پیرۆزەدا نوێژ بکە، وە وتی: بە نیەتی عومرە لەگەڵ حەج پێکەوە ئیحرام دابەستە).

١٨٠١ - (صحيح) عن الرَّبِيعُ بْنُ سَبْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى إِذَا كَانَ بِعُسْفَانَ، قَالَ لَهُ سُرَاقَةُ بْنُ مَالِكٍ الْمُدْلِجِيُّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اقْضِ لَنَا قَضَاءَ قَوْمٍ كَأَنَّمَا وُلِدُوا الْيَوْمَ، فَقَالَ: (إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَدْ أَدْخَلَ عَلَيْكُمْ فِي حَجِّكُمْ هَذَا عُمْرَةً، فَإِذَا قَدِمْتُمْ فَمَنْ تَطَوَّفَ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ فَقَدْ حَلَّ، إِلاَّ مَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْىٌ).

واتە: لە رەبیعی کوڕی سەبرەوە، لە باوکیەوە هاتووە کە وتویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم لە مەدینە دەرچوین هەتا گەیشتینە عوسفان، سوراقەی کوڕی مالیکی مودلیجی پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆمان رون بکەرەوە وەك چۆن رونی دەکەیتەوە بۆ خەڵکانێ کە ئەمڕۆ لەدایك بووبن، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (خوای گەورە دروشم و ئەرکانەکانی عومرەی خستۆتە ناو دروشم و ئەرکانەکانی حەجەوە، ئیتر لە رێگەی نیەت هێنانی حەج و عومرە پێکەوە بێت، یان ئیحرام شکاندن لەدوای عومرەوە، مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە

دروشـم و ئەركانـەكانی حـەج و عـومرە لێـك جوداناكرێنـەوە بـۆ هـەردووكیان ئیحـرام دادەبەسـترێت، تـەوافی مـاڵی خـوا دەكرێـت، هاتوچـۆی نێـوان صـەفاو مەروە دەكرێت، كاتێ كە گەیشتنە مەككە ئەوەی تەوافی ماڵی خوا و هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەی كرد ئـەوە ئـیتر بـۆی هەیـە ئیحـرام بشكێنێ یـان واجبـە لەسەری مەگەر كەسێ كە دیاری ماڵی خوای پێ بێت).

| |
|---|
| ١٨٠٢ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ أَخْبَرَهُ قَالَ: قَصَّرْتُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِشْقَصٍ عَلَى الْمَرْوَةِ، أَوْ: رَأَيْتُهُ يُقَصَّرُ عَنْهُ عَلَى الْمَرْوَةِ بِمِشْقَصٍ. قَالَ ابْنُ خَلَّادٍ: إِنَّ مُعَاوِيَةَ، لَمْ يَذْكُرْ أَخْبَرَهُ. |

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایـان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە مەعاویـەی كوڕی ئەبو سوفیان پێی ڕاگەیاندوە و وتویەتی: لەسەر مەروە قژی پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم كورت كردەوە بە (مِشقَص)سـەری تـیرێ، یـان: بینـیم قژی پێغەمبەری خوایان صلى الله عليه وسلم كورت دەكردەوە بە (مِشقَص)ێك. ئیبنو خەللاد دەڵێت: بێگومان مەعاویە باسی گۆی (أخبَرَهُ)ی نەكرد.

| |
|---|
| ١٨٠٣ - (صحيح دون قوله: (لِحَجَّتِهِ) فإنه شاذ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ مُعَاوِيَةَ قَالَ لَهُ: أَمَا عَلِمْتَ أَنِّي قَصَّرْتُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِشْقَصِ أَعْرَابِيٍّ، عَلَى الْمَرْوَةِ. زَادَ الْحَسَنُ فِي حَدِيثِهِ: لِحَجَّتِهِ. |

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە مەعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان پێی وتوە: ئایا دەزانی کە من لەسەر مەروە بە (مِشْقَص)ی عەرەبێکی دەشتەکی قژی پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم کورت کردەوە، حەسەن لە فەرمودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: بۆ حەجەکەی.

١٨٠٤ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَهَلَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعُمْرَةٍ، وَأَهَلَّ أَصْحَابُهُ بِحَجٍّ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە نیەتی عومرە لەگەڵ حەج پێکەوە ئیحرامی دابەست، بەڵام کۆمەڵێ لە یارانی بە نیەتی حەج ئیحرامیان دابەست.

١٨٠٥ - (صحيح) عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: تَمَتَّعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ، فَأَهْدَى وَسَاقَ مَعَهُ الْهَدْيَ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ، وَبَدَأَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَهَلَّ بِالْعُمْرَةِ، ثُمَّ أَهَلَّ بِالْحَجِّ، وَتَمَتَّعَ النَّاسُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ، فَكَانَ مِنَ النَّاسِ مَنْ أَهْدَى وَسَاقَ الْهَدْيَ، وَمِنْهُمْ مَنْ لَمْ يُهْدِ، فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَكَّةَ قَالَ لِلنَّاسِ: (مَنْ كَانَ مِنْكُمْ أَهْدَى فَإِنَّهُ لاَ يَحِلُّ لَهُ مِنْ

شَىْءٍ حَرُمَ مِنْهُ حَتَّى يَقْضِىَ حَجَّهُ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ مِنْكُمْ أَهْدَى فَلْيَطُفْ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ وَلْيُقَصِّرْ وَلْيَحْلِلْ، ثُمَّ لْيُهِلَّ بِالْحَجِّ، وَلْيُهْدِ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ هَدْيًا فَلْيَصُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ فِى الْحَجِّ وَسَبْعَةً إِذَا رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ). وَطَافَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ قَدِمَ مَكَّةَ فَاسْتَلَمَ الرُّكْنَ أَوَّلَ شَىْءٍ، ثُمَّ خَبَّ ثَلاَثَةَ أَطْوَافٍ مِنَ السَّبْعِ، وَمَشَى أَرْبَعَةَ أَطْوَافٍ، ثُمَّ رَكَعَ حِينَ قَضَى طَوَافَهُ بِالْبَيْتِ عِنْدَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ فَانْصَرَفَ فَأَتَى الصَّفَا فَطَافَ بِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ سَبْعَةَ أَطْوَافٍ، ثُمَّ لَمْ يَحْلِلْ مِنْ شَىْءٍ حَرُمَ مِنْهُ، حَتَّى قَضَى حَجَّهُ وَنَحَرَ هَدْيَهُ يَوْمَ النَّحْرِ، وَأَفَاضَ فَطَافَ بِالْبَيْتِ، ثُمَّ حَلَّ مِنْ كُلِّ شَىْءٍ حَرُمَ مِنْهُ ، وَفَعَلَ النَّاسُ مِثْلَ مَا فَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ أَهْدَى وَسَاقَ الْهَدْىَ مِنَ النَّاسِ.

واتە: لە سالمی کوڕی (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم عومرەو حەجی پێکەوە کرد، ئاژەڵی دیاری ماڵی خوای لە (ذِي الحُلَيْفَة) لەگەڵ خۆی برد، ئیحرامی عومرە و حەجی پێکەوە دابەست، خەڵکەکەش لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم ئیحرامی حەج و عومرەیان دابەست، خەڵکەکە هەیان بوو ئاژەڵی دیاری ماڵی خوای لەگەڵ خۆی هێنا بوو، هەشیان بوو

نەيهێنا بوو، كاتێ كە پێغەمبەرى خوادا صلى الله عليه وسلم گەيشتە مەككە بە خەڵكەكەى فەرموو: (هەركەس لە ئێوە ئاژەڵى ديارى ماڵى خواى هێناوە ئەوە دەبێ بەردەوام بێ لەسەر ئيحرامەكەى و ئيحرام نەشكێنێ هەتا حەجەكەى تەواو دەكات، هيچ شتێ لەوانەى كە بەهۆى ئيحرام بەستنەكەيەوە لێى قەدەغە بووە بۆى ڕەوا نابێتەوە هەتا حەجەكەى تەواو دەكات، ئەو كەسەش كە ئاژەڵى ديارى ماڵى خواى نەهێناوە با تەواف ماڵى خوا بكات، هاتوچۆى نێوان صەفاو مەروە بكات، مووى سەرى كورت بكاتەوەو، ئيحرام بشكێنێ، لەپاشدا لە ڕۆژى هەشتەمى مانگى (ذى الحجة)دا كە ناسراوە بە ڕۆژى (تروية) ئيحرامى حەج دابەستێت، ئەوانەى كە ئيحرام دەشكێنن دەبێ ديارى ماڵ خوا سەربڕن، ئەگەر كەسێ تواناى ماددى نەبوو ديارى بۆ پەيدا نەكرا دەبێ سێ ڕۆژ لەكاتى حەج كردنەكەدا بەرۆژوو بێت، كاتێ كە گەڕايەوە بۆ ناو ماڵ منداڵ و كەسوكارى حەوت ڕۆژى تريش ڕۆژوو بگرێت). پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم كاتێ كە گەيشتە مەككە تەواف (قدوم)گەيشتنە ماڵى خواى ئەنجامدا، يەكەم شتێ كە كردى سڵاوى كرد لە گۆشە(ركن)ى بەردە ڕەشەكە، لەپاشدا سێ جار بە ڕاكردن و چوار جاريش بە ڕۆشتنى ئاسايى سوڕايەوە بەدەورى ماڵى خوادا، كاتێ كە تەوافەكەى تەواو كرد، ڕۆشت بۆ مەقامى ئيبراهيم مەقامى خستە نێوان خۆى و ماڵى خواوە و دوو ركات نوێژى سوننەتى كرد، ئينجا سەلامى دايەوەو چوو بۆ صەفا حەوت جار هاتوچۆى نێوان صەفاو مەروەى ئەنجامدا، لەپاشدا هيچ شتێ لەوانەى كە بەهۆى ئيحرام بەستنەكەيەوە لێى قەدەغە بوو بۆى ڕەوا نەبوو هەتا حەجەكەى تەواو كردو ئاژەڵە ديارييەكانى ماڵى خواى سەربڕى لە ڕۆژى جەژندا، ئينجا ڕۆيشت بۆ ماڵى خواو تەواف (إفاضة)ى ئەنجامدا، لەپاشدا هەموو شتێكى بۆ ڕەوا بوو، لەوانەى كە بەهۆى ئيحرام بەستنەكەيەوە لێى قەدەغە بوو، ئەو خەڵكانەش كە ئاژەڵى ديارى ماڵى خوايان هێنابوو لەگەڵ خۆيان پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم چى كرد ئەوانيش هەمان كاريان كرد.

١٨٠٦ - (صحيح) عَنْ حَفْصَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا شَأْنُ النَّاسِ قَدْ حَلُّوا وَلَمْ تَحْلِلْ أَنْتَ مِنْ عُمْرَتِكَ؟ فَقَالَ (إِنِّي لَبَّدْتُ رَأْسِي، وَقَلَّدْتُ هَدْيِي، فَلاَ أَحِلُّ حَتَّى أَنْحَرَ الْهَدْيَ).

واتە: لە (حَفْصَة)ی خێزانی پێغەمبەرەوە صلی الله علیە وسلم دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ئەوە چییە خەڵك ئیحرامی عومرەیان شكاند بەڵام تۆ ئیحرامی عومرەت نەشكاندوە؟ فەرمووی: (من سەرم بەستوەو، دیاری ماڵی خوام لەگەڵ خۆم هێناوە و ملوانكەم كردوتە ملیان، ئیحرام ناشكێنم هەتا یەكەم ڕۆژی جەژنی قوربان دیاریەكەم سەردەبڕم ئەوكاتە ئیحرام دەشكێنم).

## باسی كەسێ كە ئیحرامی حەج دادەبەستێ، لەپاشدا بیكاتە عومرە.

## ٢٥ - باب الرَّجُلُ يُهِلُّ بِالْحَجِّ ثُمَّ يَجْعَلُهَا عُمْرَةً.

١٨٠٧ - (صحيح، موقوف) عَنْ سَلِيمِ بْنِ الأَسْوَدِ أَنَّ أَبَا ذَرٍّ كَانَ يَقُولُ فِيمَنْ حَجَّ ثُمَّ فَسَخَهَا بِعُمْرَةٍ: لَمْ يَكُنْ ذَلِكَ إِلاَّ لِلرَّكْبِ الَّذِينَ كَانُوا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە سەلیمی کوڕی ئەسوەدەوە، دەگێڕنـەوە، کـە (أبَا ذَرٍ) سـەبارت بـەو کەسانەی کە ئیحرامی حەج دادەبەستن و لەپاشـدا هەڵیەوەشێننەوە و دەیکەن بە عومرە وتویەتی: ئەمە دروست نیە تەنیا بۆ ئەو سوارانە نەبێت کـە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بوون.

**١٨٠٨ - (ضعيف) عَنِ الْحَارِثِ بْنِ بِلاَلِ بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَسْخُ الْحَجِّ لَنَا خَاصَّةً أَوْ لِمَنْ بَعْدَنَا؟ قَالَ: (بَلْ لَكُمْ خَاصَّةً).**

واتە: لە (حارِث)ی کوڕی بیلالی کوڕی (حارِث)ەوە، لە باوکیەوە، دەگێڕنـەوە، کە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم هەڵوەشـانەوەی حەج تایبەتە بە ئێمەوە یان بۆ ئەوانەی دوای ئێمەشە؟ فەرمووی: (تایبەتە بە ئێوەوە).

## باسی کەسێ حەج بکات بۆ کەسێکی تر.

## ٢٦ - باب الرَّجُلِ يَحُجُّ عَنْ غَيْرِهِ.

**١٨٠٩ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ رَدِيفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَجَاءَتْهُ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمَ تَسْتَفْتِيهِ، فَجَعَلَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا وَتَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ**

عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصْرِفُ وَجْهَ الْفَضْلِ إِلَى الشِّقِّ الآخَرِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ فَرِيضَةَ اللَّهِ عَلَى عِبَادِهِ فِي الْحَجِّ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخًا كَبِيرًا لاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَثْبُتَ عَلَى الرَّاحِلَةِ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: (نَعَمْ). وَذَلِكَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ.

واته: له (عَبْدُ اللّه)ى كوڕى عەباسەوە ڕەزاى خوايان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتويەتى: (فضل)ى كوڕى عباس لە پاشكۆى پێغەمبەرى خوادا بوو صلى الله عليه وسلم، ئافرەتێ لە هۆزى (خثعم) هاتە خزمەتى پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم پرسيارى هەبوو، (فضل) سەيرى دەكرد ئەويش سەيرى (فضل)ى دەكرد، پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم بەدەستى خۆى ڕووى (فضل)ى وەرچەرخاند بۆ لايەكى تر بۆ ئەوەى سەيرى نەكات، ئافرەتەكە وتى: ئەى پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم حەج فەرزى خوايە لەسەر بەندەكانى كەوتۆتە سەر باوكم ئەويش پيرێكى بە ساڵاچووەو بەسوارى ولاخەوە خۆى ناگرێت: ئايا دەبێت من حەجى بۆ بكەم؟ فەرمووى: (بەڵێ). ئەمەش لە حەجى ماڵاوايى دا بوو.

١٨١٠ - (صحيح) عَنْ أَبِي رَزِينٍ - قَالَ حَفْصٌ فِي حَدِيثِهِ رَجُلٌ مِنْ بَنِي عَامِرٍ - أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ لاَ يَسْتَطِيعُ الْحَجَّ وَلاَ الْعُمْرَةَ وَلاَ الظَّعْنَ، قَالَ: (احْجُجْ عَنْ أَبِيكَ وَاعْتَمِرْ).

وتى: له ئەبو رەزینەوه هاتووه – (حفص) له فەرمودەكەیدا وتى: كه پیاوێ بوو له بەنى عامر – كه وتویەتى: ئەى پێغەمبەرى خوا صلى الله علیه وسلم باوكم پیرێكى به سالاچووه ناتوانێت حەج و عومره و سەفەر بكات و تواناى نیه رێ بكات، بەسوارى ولاخیشەوه خۆى ناگرێت؟ فەرمووى: (حەج و عومره بكه بۆ باوكت).

١٨١١ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَمِعَ رَجُلاً يَقُولُ: لَبَّيْكَ عَنْ شُبْرُمَةَ، قَالَ: (مَنْ شُبْرُمَةَ؟). قَالَ أَخٌ لِي - أَوْ قَرِيبٌ لِي – قَالَ: (حَجَجْتَ عَنْ نَفْسِكَ؟). قَالَ: لاَ، قَالَ: (حُجَّ عَنْ نَفْسِكَ ثُمَّ حُجَّ عَنْ شُبْرُمَةَ).

واته: له ئیبنو عەباسەوه رەزاى خوایان لێ بێ دەگێڕنەوه، كه پێغەمبەرى خوا صلى الله علیه وسلم گوێى لێ بوو پیاوێ وتى: خودایه ئیحرامى حەج دادەبەستم بۆ تۆ لەجیاتى شوبرومه، پێغەمبەرى خوا صلى الله علیه وسلم فەرمووى: (شوبرومه كێیه؟). وتى: برامه - یان وتى: یەكێكه له خزمه نزیكەكانم - ، فەرمووى: (ئایا خۆت حەجت كردوه؟). وتى: نەخێر، فەرمووى: (دەى حەج بۆ خۆت بكه ئینجا بۆ شوبرومه).

## باسی تەلبییە چۆن دەکرێت.

## ٢٧ - باب كَيْفَ التَّلْبِيَةُ؟

١٨١٢ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ تَلْبِيَةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ). قَالَ: وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ يَزِيدُ فِى تَلْبِيَتِهِ: (لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ بِيَدَيْكَ، وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: تەلبییەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەم شێوەیە بووە: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ). ڕاوی وتی: (عَبْدُاللَّه)ی کوڕی عومەر ئەمەی بۆ تەلبییە زیاد کرد: لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ بِيَدَيْكَ، وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ).

١٨١٣ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: أَهَلَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرَ التَّلْبِيَةَ مِثْلَ حَدِيثِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: وَالنَّاسُ يَزِيدُونَ: (ذَا الْمَعَارِجِ). وَنَحْوَهُ مِنَ

الْكَلاَمِ، وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْمَعُ فَلاَ يَقُولُ لَهُمْ شَيْئًا.

واته: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللّه)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: تەلبییەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئیحرامی دابەست، باسی تەلبییەی پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم کرد وەك چۆن لە فەرمودەی پێشودا هاتووە کە ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ گێراویەتیەوە، وتی: خەڵك ئەمەو: (ذَا الْمَعَارِجِ). وێنەی ئەم وتانەیان بۆ تەلبییە زیاد کرد، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گوێی لێ بوو بەڵام هیچ شتێکی پێ نەوتن و ئینکاری نەکردن.

١٨١٤ - (صحيح) عَنْ خَلاَّدِ بْنِ السَّائِبِ الأَنْصَارِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (أَتَانِي جِبْرِيلُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَنِي أَنْ آمُرَ أَصْحَابِي وَمَنْ مَعِي أَنْ يَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالإِهْلاَلِ) أَوْ قَالَ: (بِالتَّلْبِيَةِ). يُرِيدُ أَحَدَهُمَا.

واته: لە خەللادی کوڕی سائیبی ئەنصاریەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (جیبریل سەلامی خوای لەسەربێت هاتە لام و فەرمانی پێ کردم، کە فەرمان بکەم بە یارانم و ئەوانەی کە لەگەڵمن لەکاتی ئیحرام دابەستنی حەج و عومرەدا بە دەنگی بەرز تەلبییە بکەن: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ). مەبەستی لە یەکێکیان بوو.

## باسی تەلبییەکردن کەی دەبڕێت و ناوترێت.

## ٢٨ – باب مَتَى يَقْطَعُ التَّلْبِيَةَ.

١٨١٥ - (صحيح) عَنِ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَبَّى حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ.

واتە: لە (فضل)ی کوڕی عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەلبییەی کرد هەتا ڕەمی (جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ)ی کرد.

١٨١٦ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: غَدَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَاتٍ مِنَّا الْمُلَبِّي وَمِنَّا الْمُكَبِّرُ.

واتە: لە (عَبدُ اللە)ی کوڕی (عَبدُ اللە)ی کوڕی عومەرەوە، لە باوکیەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم سەرلەبەیانی لەمیناوە دەرچووین بۆ عەرەفات هەمان بوو تەلبییەی دەکرد هەشمان بوو (الله أکبر)ی دەکرد.

## باسی ئەو کەسەی کە عومرە دەکات هەتا کەی تەلبییە دەکات.

## ٢٩ – باب مَتَى يَقْطَعُ الْمُعْتَمِرُ التَّلْبِيَةَ.

١٨١٧ - (ضعيف) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (يُلَبِّى الْمُعْتَمِرُ حَتَّى يَسْتَلِمَ الْحَجَرَ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ئەو کەسەی کە عومرە دەکات تەلبییە دەکات هەتا دەست دەدات لە بەردە ڕەشەکەو ماچی دەکات).

## باسی ئەو کەسەی کە لە ئیحرامدایە ئەدەبی غولامەکەی دادات.

## ٣٠ – باب الْمُحْرِمِ يُؤَدِّبُ غُلاَمَهُ.

١٨١٨ - (حسن) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِى بَكْرٍ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حُجَّاجًا، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْعَرْجِ نَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَزَلْنَا، فَجَلَسَتْ عَائِشَةُ رَضِىَ اللهُ عَنْهَا إِلَى جَنْبِ رَسُولِ اللَّهِ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَجَلَسْتُ إِلَى جَنْبِ أَبِي، وَكَانَتْ زِمَالَةُ أَبِي بَكْرٍ وَزِمَالَةُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاحِدَةً مَعَ غُلَامٍ لِأَبِي بَكْرٍ، فَجَلَسَ أَبُو بَكْرٍ يَنْتَظِرُ أَنْ يَطْلُعَ عَلَيْهِ، فَطَلَعَ وَلَيْسَ مَعَهُ بَعِيرُهُ، قَالَ: أَيْنَ بَعِيرُكَ؟ قَالَ: أَضْلَلْتُهُ الْبَارِحَةَ، قَالَ: فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: بَعِيرٌ وَاحِدٌ تُضِلُّهُ، قَالَ: فَطَفِقَ يَضْرِبُهُ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَبَسَّمُ، وَيَقُولُ: (انْظُرُوا إِلَى هَذَا الْمُحْرِمِ مَا يَصْنَعُ). قَالَ ابْنُ أَبِي رِزْمَةَ: فَمَا يَزِيدُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى أَنْ يَقُولَ: (انْظُرُوا إِلَى هَذَا الْمُحْرِمِ مَا يَصْنَعُ). وَيَتَبَسَّمُ.

واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر دەڵێت: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیە وسلم لە مەدینەوە دەرچووین بۆ حەج، لەشوێنێ کە پێی دەوترا عەرج پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دابەزی و ئێمەش دابەزین عائیشە رەزای خوای لێ بێ لە تەنیشت پێغەمبەری خواوە صلی الله علیە وسلم دانیشت منیش لە تەنیشت باوکمەوە دانیشتم، باوکم و پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم یەك وڵاخی سواریان پێ بوو لەگەڵ غوڵامێ کە هی ئەبو بەکر بوو رەزای خوای لێ بێ، ئەبو بەکر دانیشت چاوەڕێی غوڵامەکەی بوو هەتا وشترەکە بێنێ کاتێ کە هات وشترەکەی پێ نەبوو، وتی: کوانێ وشترەکەت،؟ وتی: دوێنێ ونم کردوە، راوی وتی:ئەبوبەکر وتی: تەنیا یەك وشترت پێ بوو ئەویشت ونکردوە، وتی: ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ دەستی کرد بە لێدانی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم سەیری دەکردو پێدەکەنی فەرمووی:

(سەیری ئەمە بکەن لە ئیحرامدایە چی دەکات). ئیبنو ئەبی رەزمە وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەنیا ئەوەندەی فەموو: (سەیری ئەمە بکەن لە ئیحرامدایە چی دەکات). زیاتری نەفەمووو، وە پێدەکەنی.

## باسی ئیحرام دابەستنی کەسێ بە جل و بەرگی خۆیەوە.

## ٣١ - باب الرَّجُلِ يُحْرِمُ فِى ثِيَابِهِ.

١٨١٩ - (صحيح) عن صَفْوَانُ بْنُ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ بِالْجِعْرَانَةِ وَعَلَيْهِ أَثَرُ خَلُوقٍ، أَوْ قَالَ صُفْرَةٍ، وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: كَيْفَ تَأْمُرُنِى أَنْ أَصْنَعَ فِى عُمْرَتِى؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى عَلَى النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْوَحْىَ، فَلَمَّا سُرِّىَ عَنْهُ قَالَ: (أَيْنَ السَّائِلُ عَنِ الْعُمْرَةِ). قَالَ: (اغْسِلْ عَنْكَ أَثَرَ الْخَلُوقِ - أَوْ قَالَ أَثَرَ الصُّفْرَةِ - وَاخْلَعِ الْجُبَّةَ عَنْكَ، وَاصْنَعْ فِى عُمْرَتِكَ مَا صَنَعْتَ فِى حَجَّتِكَ).

واتە: لە (صَفوَان)ی کوڕی یەعلای کوڕی ئومەییەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە پیاوێ ئاسەواری بۆنی خۆش و زەردکردنی ریش و قژی خۆی پێوە دیار بوو، وە جبەیەکی لەبەردا بوو، لە جەعرانە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا

صلى الله عليه وسلم، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە عومرەکەمدا فەرمانم بە چی پێ دەکەیت هەتا ئەنجامی بدەم، خوای گەورە وەحی نارده خوارەوە بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، کاتێ کە وەحی تەواو بوو هاتەوە سەر باری ئاسایی خۆی فەرمووی: (ئاسەواری بۆنی خۆش و زەردکردنی ریش و قژەکەت بشۆ و جبەکەت داکەنەو، هەرچی لە حەجەکەتدا دەیکەیت لە عومرەکەتدا بیکە).

**١٨٢٢ - (صحيح دون قوله: (فخلعها مِن رأسِهِ)، فإنه منكر) عَنْ صَفْوَانَ بْنِ يَعْلَى، عَنْ أَبِيهِ، بِهَذِهِ الْقِصَّةِ، قَالَ فِيهِ: فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اخْلَعْ جُبَّتَكَ). فَخَلَعَهَا مِنْ رَأْسِهِ.**

واتە: لە (صەفوان)ی کوڕی یەعلاوە، لەباوکیەوە، ئەم بەسەرهاتە هاتووە، راوی لە فەرمودەکەیدا وتی: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: (جبەکەت داکەنە). ئەویش جبەکەی داکەند.

**١٨٢١ - (صحيح) عَنِ ابْنِ يَعْلَى ابْنِ مُنْيَةَ، عَنْ أَبِيهِ، بِهَذَا الْخَبَرِ، قَالَ فِيهِ: فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَنْزِعَهَا نَزْعًا، وَيَغْتَسِلَ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا.**

واتە: لە ئیبنو یەعلای کوڕی مونیەوە، لە باوکیەوە، ئەم هەواڵە هاتووە، راوی لە فەرمودەکەیدا وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ کرد جبەکەی بەتەواوی لەبەر داکەنێ و ئاسەواری بۆنی خۆش و زەردکردنی ریش و قژەکەی دوو جار یان سێ جار بشوات.

١٨٢٢ - (صحيح) عَنْ صَفْوَانَ بْنِ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْجِعْرَانَةِ وَقَدْ أَحْرَمَ بِعُمْرَةٍ وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ، وَهُوَ مُصَفِّرٌ لِحْيَتَهُ وَرَأْسَهُ.

واته: لە (صفوان)ی کوڕی یەعلای کوڕی ئومەییەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە پیاوێ ئیحرامی عومرەی دابەستبوو جبەیەکی لەبەردا بوو، ریش و سەری خۆی زەرد کرد بوو.

## باسی ئەو کەسەی کە دەیەوێت ئیحرام دابەستێ چ پۆشاکێ دروستە لەبەری بکات.

## ٣٢ - باب مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ.

١٨٢٥ - عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا يَتْرُكُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ؟ فَقَالَ: (لاَ يَلْبَسُ الْقَمِيصَ، وَلاَ الْبُرْنُسَ، وَلاَ السَّرَاوِيلَ، وَلاَ الْعِمَامَةَ، وَلاَ ثَوْبًا مَسَّهُ وَرْسٌ وَلاَ زَعْفَرَانٌ، وَلاَ الْخُفَّيْنِ، إِلاَّ لِمَنْ لَمْ يَجِدِ النَّعْلَيْنِ، فَمَنْ لَمْ يَجِدِ النَّعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسِ الْخُفَّيْنِ وَلْيَقْطَعْهُمَا حَتَّى يَكُونَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ).

واتــە: لــە ســالمەوە، لــە باوکیــەوە، ڕەزای خوایــان لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، کــە وتویەتی: پیاوێ سەبارەت بەو کەسەی کە دەیەوێت ئیحـرام دابەسـتێ بـۆ حـەج یان بۆ عـومرە چ پۆشـاکێ لەبـەر نـەکات لـە پێغەمبـەری خـوای صـلى الله علیـه وسلم پرسی؟ ئـەویش فـەرمووی: (کـراس و شـەرواڵ و بـورنس ئـەو پۆشـاکەیە کڵاوەکەی لە خۆیەتی لەبەر نەکات، کڵاو و مێزەر لەسەر نەکات، هـەر پۆشـاکێ کە ڕەنگ کرابێ بەشتێك بۆنی خۆشی لێ بێـت یان زەعفـەران و وەرسـی پێـوە بێت لەبەری نەکات، نابێت (خوف)کاڵە لەپێ بکات، مەگەر جوتێ نەعلی دەست نەکەوێت، ئەو کەسەی کە جوتێ نەعلی دەست نەکەوت، با جـوتێ خـوف لـەپێ بکات بەڵام بەشێوەیە بیانبڕێتەوە لەژێر قولەپێکانیەوە بێت.

١٨٢٤ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ، بِمَعْنَاهُ.

واتە: ئیبنو عومەر ڕەزای خوایـان لـێ بـێ، لـە پێغەمبـەری خـواوە صـلى الله علیه وسلم، بە هەمان مانا فەرمودەی پێشوی گێڕاوەتەوە.

١٨٢٥ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ بِمَعْنَاهُ. زَادَ: (وَلاَ تَنْتَقِـبُ الْمَـرْأَةُ الْحَـرَامُ وَلاَ تَلْـبَسُ الْقُفَّازَيْنِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنِ ابْنِ عُمَـرَ، عَـنِ النَّبِـيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (الْمُحْرِمَةُ لاَ تَنْتَقِبُ وَلاَ تَلْـبَسُ الْقُفَّازَيْنِ).

واتە: ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم، بە هەمان مانا فەرموودەی پێشووی گێرایەوە. بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: (ئافرەتی خاوەن ئیحرام پەچە دانەداتەوەو دەستکێش لەدەست نەکات).

ئەبو داود دەڵێت: لەریوایەتێکی تردا ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم هاتووە: (ئافرەتی خاوەن ئیحرام پەچە دانەداتەوەو دەستکێش لەدەست نەکات).

**١٨٢٦ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الْمُحْرِمَةُ لاَ تَنْتَقِبُ وَلاَ تَلْبَسُ الْقُفَّازَيْنِ).**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئافرەتی خاوەن ئیحرام پەچە دانەداتەوەو دەستکێش لەدەست نەکات).

**١٨٢٧ - (حسن صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نَهَى النِّسَاءَ فِي إِحْرَامِهِنَّ عَنِ الْقُفَّازَيْنِ وَالنِّقَابِ وَمَا مَسَّ الْوَرْسُ وَالزَّعْفَرَانُ مِنَ الثِّيَابِ، وَلْتَلْبَسْ بَعْدَ ذَلِكَ مَا أَحَبَّتْ مِنْ أَلْوَانِ الثِّيَابِ، مُعَصْفَرًا أَوْ خَزًّا أَوْ حُلِيًّا أَوْ سَرَاوِيلَ أَوْ قَمِيصًا، أَوْ خُفًّا.**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە بیستویەتی لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: (نەهی دەکرد لەوە کە ئافرەتان لە

ئیحرامـدا پەچـە دادەنــەوەو دەســتکێش لەدەســت بکــەن و هــەروەها ئــەو پۆشاکانەی کە وەرس یان زەعفەرانی لێ درابێت، لەوانە بەدواوە ئیتر حەزی لە چ جـۆرە پۆشـاکێکی رەنگـاو رەنگــە بـا لەبــەری بکـات، وەك عەصـفەراوی و ئاوریشم و خشڵ و دەرپێ و کراس، خوفیش لەپێ بکات.

(حسن) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَى هَذَا الْحَدِيثَ عَنِ ابْنِ إِسْحَاقَ، عَـنْ نَـافِعٍ عَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ، وَمُحَمَّدُ بْنُ سَلَمَةَ إِلَـى قَوْلِـهِ: وَمَـا مَسَّ الْوَرْسُ وَالزَّعْفَرَانُ مِنَ الثِّيَابِ. وَلَـمْ يَـذْكُرَا مَـا بَعْدَهُ.

ئەبو داود دەڵێـت: ئـەم فـەرمودە لـە ئیبنـو ئیسحاقەوە ریوایـەت کـراوە، لـە نافعی عەبدەی کوڕی سولەیمان و موحەممـەدی کوڕی سـەلەمەوە هـەتا: (ئـەو پۆشاکانەی کە وەرس یان زەعفەرانی لێ درابێت). لەوە بەدواوە باس نەکراوە.

١٨٢٨ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّهُ وَجَدَ الْقُرَّ فَقَالَ: أَلْقِ عَلَـيَّ ثَوْبًـا يَا نَافِعُ. فَأَلْقَيْتُ عَلَيْهِ بُرْنُسًا، فَقَالَ: تُلْقِي عَلَـيَّ هَـذَا وَقَدْ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ أَنْ يَلْبَسَـهُ الْمُحْرِمُ؟!.

واتە: ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ لە رۆژێکی سارددا وتـی: ئـەی نـافع کراسێکم پێدا بدە، نافع وتی: بورنسێکم پێدا واتە ئەو پۆشاکەی کە کلاوەکەی لە خۆیەتی، ئیبنو عومەر وتی: ئەمـەم پێـدا دەدەی لەکاتێکـدا کـە پێغەمبـەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردوە لە ئیحرامدا بپۆشرێت.

١٨٢٩ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُـولُ: (السَّـرَاوِيلُ لِمَـنْ لاَ يَجِـدُ الإِزَارَ، وَالْخُفُّ لِمَنْ لاَ يَجِدُ النَّعْلَيْنِ).

واتە: لە ئیبنو عومـەرەوە رەزای خوایـان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە وتویـەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (شەروالْ بۆ كەسـێ كە بەركۆشی دەست نەكەوێت بیپۆشێ لەئیحرامـدا، وە خـوفیش بـۆ كەسـێ كـە نەعلی دەست نەكەوێت لەپێی بكات).

١٨٣٠ - (صحيح) عن عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِىَ اللهُ عَنْهَـا قَالَـتْ: كُنَّا نَخْرُجُ مَعَ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى مَكَّـةَ فَنُضَمِّدُ جِبَاهَنَا بِالسُّكِّ الْمُطَيَّبِ عِنْـدَ الإِحْـرَامِ، فَـإِذَا عَرِقَتْ إِحْدَانَا سَالَ عَلَى وَجْهِهَا فَيَرَاهُ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلاَ يَنْهَاهَا.

واتـە: عائیشـەی دایكـی بـاوەڕداران رەزای خـوای لـێ بـێ دەڵێـت: ئێمـە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم دەرچووین بـۆ مەككە جۆرە بۆنێكی خۆشمان دەدا لە روخساری خۆمان لە ئیحرامدا كە پێی دەوتـرا (سُك)، ئەگەر یەكێكمان عەرەقی بكردایە بە روخساریدا دەهاتە خـوارەوە و پێغەمبـەر صلی الله علیه وسلم دەیبینی نەهی لێ نەدەكردین.

١٨٣١ – (حسن) عَنْ سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ - يَعْنِى ابْنَ عُمَرَ - كَانَ يَصْنَعُ ذَلِكَ - يَعْنِى يَقْطَعُ الْخُفَّيْنِ لِلْمَرْأَةِ الْمُحْرِمَةِ - ثُمَّ حَدَّثَتْهُ صَفِيَّةُ بِنْتُ أَبِى عُبَيْدٍ أَنَّ عَائِشَةَ رَضِىَ اللهُ عَنْهَا حَدَّثَتْهَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ كَانَ رَخَّصَ لِلنِّسَاءِ فِى الْخُفَّيْنِ، فَتَرَكَ ذَلِكَ.

واتە: لە سالمی کوڕی (عبدُ الله)وە دەگێڕنەوە، کە (عبدُ الله) – واتە ئیبنو عومەر - حوکمی دەکرد بە ئافرەتان لە ئیحرامدا خوفەکانیان ببڕنەوە، لەپاشدا (صفِيَّة)ی کچی عوبەید کە هاوسەری بوو بۆی گێڕایەوە، عائیشە رەزای خوای لێ بێ بۆی گێراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم مۆڵەتی داوە بە ئافرەتان خوف لەپێ بکەن، ئیتر ئیبنو عومەر وازی لەو کارە هێنا.

## باسی هەڵگرتنی چەك لە ئیحرامدا.

## ٣٣ – باب الْمُحْرِمِ يَحْمِلُ السِّلاَحَ.

١٨٣٢ - (صحيح) عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ: لَمَّا صَالَحَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَهْلَ الْحُدَيْبِيَةِ صَالَحَهُمْ عَلَى أَنْ لاَ يَدْخُلُوهَا إِلاَّ بِجُلْبَانِ السِّلاَحِ، فَسَأَلْتُهُ مَا جُلْبَانُ السِّلاَحِ؟ قَالَ: الْقِرَابُ بِمَا فِيهِ.

واتــه: لــه بــەرائى كـورِى عازيبــەوه دەگێڕنــەوه، كــه وتويــەتى: كــاتێ كــه پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم رێكەوتنى حودەيبيەى كرد لەگەڵ هاوەڵ بۆ خـوا برِياردەرانـدا، رێكـەوتن لەسـەر ئـەوەى بچـنه نـاو مەككەوه بەمـەرجێ چەكەكانيان بە كێلانەوه لەناو هەگبەدا بێـت، راوى وتـى سـەبارەت بـه (جُلُبَـانِ السِّلاَحِ) لـێم پرسـى؟ وتـى: شـتێكە كـه شمشـێر و كەرەسـەى جـەنگى تێـدا هەڵدەگیرێت بۆ ئەوەى بەدەرەوه نەبێت.

## باسى ئافرەت لە ئیحرامدا روخسارى دادەپۆشێت.

## ٣٢ - باب فِي الْمُحْرِمَةِ تُغَطِّي وَجْهَهَا.

١٨٣٣ - (ضعيف) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ الرُّكْبَانُ يَمُرُّونَ بِنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُحْرِمَاتٌ، فَإِذَا حَاذَوْا بِنَا سَدَلَتْ إِحْدَانَا جِلْبَابَهَا مِنْ رَأْسِهَا إِلَى وَجْهِهَا، فَإِذَا جَاوَزُونَا كَشَفْنَاهُ.

واته: له عائيشەوه رەزاى خواى لێ بێ دەگێڕنـەوه، كـه وتويـەتى: ئێمـه لـه خزمەت پێغەمبەرى خوادا صلى الله عليه وسلم لـه ئیحرامـدا بـووين كـاتێ كـه سـوارەكان بەلامانـدا تێدەپـەڕين چارشـێوەكەى سـەرمانمان دادەدايـەوه بەسـەر روخسارماندا كاتێ كە لێمان دوردەكەوتنەوه لامان دەدايەوه.

# باسی ئەو کەسەی کە لە ئیحرامدایە سێبەری بۆ بکرێت.

# ٣٥ - باب فِي الْمُحْرِمِ يُظَلَّلُ.

١٨٣٤ - (صحيح) عَنْ أُمِّ الْحُصَيْنِ قَالَتْ: حَجَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَجَّةَ الْوَدَاعِ، فَرَأَيْتُ أُسَامَةَ وَبِلَالاً، وَأَحَدُهُمَا آخِذٌ بِخِطَامِ نَاقَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالآخَرُ رَافِعٌ ثَوْبَهُ لِيَسْتُرَهُ مِنَ الْحَرِّ، حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ.

واتە: لە دایکی حوصەینەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە حەجی ماڵاوایی دا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم حەجمان کرد، ئوسامەو بیلالم بینی، یەکێکیان رەشمەی وشترەکەی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم گرتبوو، ئەوی تریشیان کراسەکەی بەرزکردبووەوەو بۆی کردبوی بە سێبەر لەبەر گەرما، هەتا رەمی (جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ)ی کرد.

## باسی کەسیٚ لە ئیحرامدا کەڵەشاخ بکات.

## ٣٦ - باب الْمُحْرِمِ يَحْتَجِمُ.

١٨٣٥ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ احْتَجَمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لیٚ بیٚ دەگیٚڕنەوە، کە پیٚغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە ئیحرامدا بووەو کەڵەشاخی کردوە.

١٨٣٦ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ احْتَجَمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ، فِي رَأْسِهِ مِنْ دَاءٍ كَانَ بِهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لیٚ بیٚ دەگیٚڕنەوە، کە پیٚغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە ئیحرامدا بووەو کەڵەشاخی کردوە، لەبەر نەخۆشیە کە هەیبوو.

١٨٣٧ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ احْتَجَمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ، عَلَى ظَهْرِ الْقَدَمِ مِنْ وَجَعٍ كَانَ بِهِ.

واتە: لە ئەنەسەوە هاتووە، کە پیٚغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە ئیحرامدا بووەو کەڵەشاخی کردوە، لەبەر ئازاریٚ کە لەپشتی پیٚیدا هەیبوو.

## باسی چاو رشتنی كەسیٚ كە لە ئیحرامدا بیٚت.

## ٣٧ - باب يَكْتَحِلُ الْمُحْرِمُ.

١٨٣٨ - (صحيح) عَنْ نُبَيْهِ بْنِ وَهْبٍ، قَالَ: اشْتَكَى عُمَرُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ مَعْمَرٍ عَيْنَيْهِ، فَأَرْسَلَ إِلَى أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ - قَالَ سُفْيَانُ وَهُوَ أَمِيرُ الْمَوْسِمِ - مَا يَصْنَعُ بِهِمَا؟ قَالَ: اضْمِدْهُمَا بِالصَّبِرِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ عُثْمَانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ يُحَدِّثُ ذَلِكَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە نوبەیهی كوڕی وەهەبەوە دەگیٚڕنەوە، كە وتویەتی: عومەری كوڕی (عُبَيْدِ اللّهِ)ی كوڕی مەعمەر چاوەكانی ژانیان دەكرد، ناردی بۆ لای ئەبانی كوڕی (عثمان) — سوفیان وتی: ئەو ساڵە ئەو ئەمیر و كاربەدەستی حەج بوو - هەتا لیٚی بپرسیٚ لەوبارەوە كە چی بكات؟ ئەبان وتی: بە گوشراوی درەختی (صَبر) كە تاڵە تیماری بكەو بیپیٚچە، چونكە من بیستومە لە (عثمان) رەزای خوای لیٚ بیٚ ئەمەی لە پیٚغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم گیٚڕاوەتەوە.

١٨٣٩ - (صحيح) عَنْ نُبَيْهِ بْنِ وَهْبٍ، بِهَذَا الْحَدِيثِ.

واتە: لە نوبەیهی كوڕی وەهەبەوە، فەرمودەی پیٚشو هاتووە.

## باسى خۆشوشتنى كەسىٚ كە لە ئيحرامدا بيٚت.

## ٣٨ - باب الْمُحْرِمِ يَغْتَسِلُ.

١٨٤٠ - (صحيح) عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُنَيْنٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ وَالْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ اخْتَلَفَا بِالأَبْوَاءِ: فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ، وَقَالَ الْمِسْوَرُ: لاَ يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ، فَأَرْسَلَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ إِلَى أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ، فَوَجَدَهُ يَغْتَسِلُ بَيْنَ الْقَرْنَيْنِ وَهُوَ يُسْتَرُ بِثَوْبٍ، قَالَ: فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ قُلْتُ: أَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حُنَيْنٍ، أَرْسَلَنِي إِلَيْكَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ أَسْأَلُكَ كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَغْسِلُ رَأْسَهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ؟ قَالَ: فَوَضَعَ أَبُو أَيُّوبَ يَدَهُ عَلَى الثَّوْبِ فَطَأْطَأَهُ حَتَّى بَدَا لِي رَأْسُهُ، ثُمَّ قَالَ لإِنْسَانٍ يَصُبُّ عَلَيْهِ اصْبُبْ، قَالَ فَصَبَّ عَلَى رَأْسِهِ، ثُمَّ حَرَّكَ أَبُو أَيُّوبَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ، فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُهُ يَفْعَلُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتـە: لـە ئیبراهیمـی کـوڕی (عَبْـدُ اللّـه)ی کـوڕی حونەینـەوە، لـە باوکیـەوە دەگێڕنەوە، کە (عَبْدُ اللّه)ی کـوڕی عـەباس ڕەزای خوایـان لـێ بـێ و میسوەری کوڕی مەخرەمە لە (أبوّاو) کە شوێنێکە لـە نزیـك مەککە سـەبارەت بـە سـەر شتنی کەسێ کە لە ئیحرامدایە جیاوازی کەوتە نێوانیـان: ئیبنـو عـەباس وتـی: ئەو کەسەی کە لـە ئیحرامدایـە بـۆی هەیـە سـەری بشوات، میسوەر وتـی: ئـەو کەسەی کە لە ئیحرامدایە بۆی نیە سەری بشوات، (عَبْدُ اللّه)ی کـوڕی عـەباس ئیبراهیمی کوڕی (عَبْدُ اللّه)ی نارد بۆ لای ئـەبو ئـەیوبی ئەنصاری، وتـی: کـاتێ کە گەیشتمە لای بینیم لەنێوان دوو شاخەی چەرخی بیرەکەدا خۆی دەشـۆرێت کە بە کراسێ پەردەی بۆ کرابوو، وتی: سڵاوم لێ کرد، وتی: ئەمە کێ یـە؟ وتم: (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی حونەینم، (عَبْدُ اللّه)ی کـوڕی عـەباس نـاردومی بـۆ لات کـە لێت بپرسم: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لـە ئیحرامـدا بوایـە چۆن سەری خۆی دەشت؟ وتی: ئەبو ئەیوب دەستی خۆی لەسەر پەردەکە دانـا، پەردەکەی کەمێ دانەواند هەتا سەری لە منەوە دەرکەوت، لەپاشدا بە یـەکێکی وت کە ئاوی دەکرد بە سەریا ئادەی ئاو بکە بەسەرما، ئەویش ئاوەکەی کرد بـە سەریا، ئینجا ئەبو ئەیوب دەستی خستە نێو مووەکانی سەری و دەستی لەپێش سەریەوە دەبـرد بـۆ بەشـی دواوەی سـەری و دەیهێنایـەوە بـۆ پێشـەوە، لەپاشـدا وتی: پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم بینی بەم شێوەیە سەری خۆی دەشت.

## باسی ژنهێنانی كەسیٚ كە لە ئیحرامدا بێت.

## ٣٩ – باب الْمُحْرِمِ يَتَزَوَّجُ.

١٨٤٠ - (صحيح) عَنْ نُبَيْهِ بْنِ وَهْبٍ أَخِي بَنِي عَبْدِ الدَّارِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ عُبَيْدِ اللَّهِ أَرْسَلَ إِلَى أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ يَسْأَلُهُ - وَأَبَانُ يَوْمَئِذٍ أَمِيرُ الْحَاجِّ - وَهُمَا مُحْرِمَانِ: إِنِّي أَرَدْتُ أَنْ أُنْكِحَ طَلْحَةَ بْنَ عُمَرَ ابْنَةَ شَيْبَةَ بْنِ جُبَيْرٍ، فَأَرَدْتُ أَنْ تَحْضُرَ ذَلِكَ، فَأَنْكَرَ ذَلِكَ عَلَيْهِ أَبَانُ، وَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ أَبِي عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ وَلاَ يُنْكَحُ).

واتە: لە نوبەیهی كوڕی وەهبەوە بـرای (بَنِی عَبْدِ الدَّار) دەگێڕنـەوە، كـە عومـەری كـوڕی (عُبَیْدِ اللّـهِ) نـاردی بـۆ لای ئـەبانی كـوڕی (عُثمَـان)ی كـوڕی عەففان ڕەزای خوایان لێ بێ - كـە ئـەو ساڵە ئـەو ئـەمیر و كاربەدەسـتی حـەج بـوو - هـەردووكیان واتـە عومـەری كـوڕی (عُبَیْدِ اللّـهِ) و ئـەبان لـە ئیحرامـدا بوون، هەتا لێی بپرسێ: مـن دەمـەوێت كچێكی شـەیبەی كـوڕی جوبـەیر مـارە بكەم بۆ (طَلحَة)ی كوڕی عومـەر، بۆیـە دەمـەوێت تـۆش ئامـادەبی، ئـەبان ڕازی نەبوو بەكارەكەی و ئینكاری كردو وتی: گوێم لێ بـوو بـاوكم (عُثمَـان)ی كـوڕی عـەففان ڕەزای خوایـان لـێ بـێ وتـی: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم

فەرموویەتی: (ئەو کەسەی کە لە ئیحرامدایە نە ژن بهێنێ بۆ خۆی و نە ژن بەشو بدات وە نە خوازبێنیش بکات).

**١٨٤٢ - (صحيح) عَنْ عُثْمَانَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ذَكَرَ مِثْلَهُ، زَادَ: (وَلاَ يَخْطُبُ).**

واتە: لە (عثمان)ی کوڕی عەففانەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کەپێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ڕاوی بە هەمان شێوە فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: (وە خوازبێنی نەکات).

**١٨٤٣ - (صحيح) عَنْ مَيْمُونَةَ قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ حَلاَلاَنِ بِسَرِفَ.**

واتە: مەیمونە دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە سەریف منی مارە کرد لەکاتێکدا کە هەردوکمان لە ئیحرامدا نەبوین.

**١٨٤٤ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَزَوَّجَ مَيْمُونَةَ وَهُوَ مُحْرِمٌ.**

واتە: ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم مەیمونەی مارە کرد لەکاتێکدا کە لە ئیحرامدا بوو.

١٨٤٥ - (صحيح مقطوع) عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ قَالَ: وَهِمَ ابْنُ عَبَّاسٍ فِي تَزْوِيجِ مَيْمُونَةَ وَهُوَ مُحْرِمٌ.

واتە: سەعیدی کوڕی موسەییەب دەڵێت: ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ بە هەڵەدا چووە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم مەیمونەی مارە کرد لەکاتێکدا کە لە ئیحرامدا بوو.

## باسی ئەو کەسەی لە ئیحرامدایە بۆی هەیە چ جۆرە جانەوەرێ بکوژێت؟

## ٤٠ – باب مَا يَقْتُلُ الْمُحْرِمُ مِنَ الدَّوَابِّ.

١٨٤٦ - (صحيح) عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، سُئِلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَمَّا يَقْتُلُ الْمُحْرِمُ مِنَ الدَّوَابِّ؟ فَقَالَ: (خَمْسٌ لاَ جُنَاحَ فِي قَتْلِهِنَّ عَلَى مَنْ قَتَلَهُنَّ فِي الْحِلِّ وَالْحَرَمِ: الْعَقْرَبُ، وَالْفَأْرَةُ، وَالْحِدَأَةُ، وَالْغُرَابُ، وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ).

واتە: لە سالمەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم: ئەو کەسەی کە لە ئیحرامدایە چ جۆرە جانەوەرێ بکوژێت گوناهی ناگات؟ فەرمووی: (پێنج جانەوەر هەن هەرکەسێ بیانکوژێت

گوناهی ناگات جا لە ئیحرامدا بێت یان نا: دوپشك و مشك و كۆلارە و قەلەڕەش و سەگی هار كە بگەزێت).

١٨٤٧ - (حسن صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (خَمْسٌ قَتْلُهُنَّ حَلاَلٌ فِى الْحَرَمِ: الْحَيَّةُ، وَالْعَقْرَبُ، وَالْحِدَأَةُ، وَالْفَأْرَةُ، وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (پێنج جانەوەر هەن حەڵاڵە كوشتنیان لە خاكی حەرەمدا: مار و دوپشك و كۆلارە و مشك و سەگی هار كە بگەزێت).

١٨٤٨ - (ضعيف) عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ، أَنَّ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُئِلَ عَمَّا يَقْتُلُ الْمُحْرِمُ؟ قَالَ: (الْحَيَّةُ، وَالْعَقْرَبُ، وَالْفُوَيْسِقَةُ، وَيَرْمِى الْغُرَابَ وَلاَ يَقْتُلُهُ، وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ، وَالْحِدَأَةُ، وَالسَّبُعُ الْعَادِى). (وقوله: (وَيَرْمِى الْغُرَابَ وَلاَ يَقْتُلُهُ) منكر).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، كە پرسیار كرا لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم: ئەو كەسەی كە لە ئیحرامدایە چ جانەوەرێ بكوژێت گوناهی ناگات؟ فەرمووی: (مار و دوپشك و، ئەوەی لە كون دێتەدەرەوە - لێرەدا مەبەست لە مشكە - ، قەلەڕەشە هەڵی دەفڕێنێت بەڵام نابێ بیكوژێت، سەگی هار كە بگەزێت، كۆلارە و ئەو دڕندەیەی كە پەلاماری خەڵك دەدات و دەیگەزێت و بریندار دەكات).

# باسی خواردنی گۆشتی نێچیری راوکراو بۆ ئەو کەسەی کە لە ئیحرامدایە دروستە یان نا؟

## ٤١ - باب لَحْمِ الصَّيْدِ لِلْمُحْرِمِ.

١٨٤٩ - (صحيح) عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ أَبِيهِ، وَكَانَ الْحَارِثُ خَلِيفَةَ عُثْمَانَ عَلَى الطَّائِفِ، فَصَنَعَ لِعُثْمَانَ طَعَامًا فِيهِ مِنَ الْحَجَلِ وَالْيَعَاقِيبِ وَلَحْمِ الْوَحْشِ، قَالَ: فَبَعَثَ إِلَى عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ فَجَاءَهُ الرَّسُولُ وَهُوَ يَخْبِطُ لأَبَاعِرَ لَهُ، فَجَاءَهُ وَهُوَ يَنْفُضُ الْخَبَطَ عَنْ يَدِهِ فَقَالُوا لَهُ: كُلْ، فَقَالَ: أَطْعِمُوهُ قَوْمًا حَلاَلاً فَإِنَّا حُرُمٌ، فَقَالَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنْشُدُ اللَّهَ مَنْ كَانَ هَا هُنَا مِنْ أَشْجَعَ، أَتَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَهْدَى إِلَيْهِ رَجُلٌ حِمَارَ وَحْشٍ وَهُوَ مُحْرِمٌ فَأَبَى أَنْ يَأْكُلَهُ؟ قَالُوا: نَعَمْ.

واتە: لە ئیسحاقی کوڕی (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی (حارث)ەوە، لە باوکیەوە هاتووە، بێگومان پێشەوا (عُثمان) رەزای خوای لێ بێ (حارث) کردبووە ئەمیر و کاربەدەستی (طائِف)، (حارِث) خواردنێکی دروستکرد بۆ پێشەوا (عُثمان) رەزای خوای لێ بێ لە گۆشتی (حَجَل) کە باڵندەیەکی ناسراوە گۆشتی (یَعاقِیب) کۆی (یعقوب)ە لەگەڵ گۆشتی ئاژەڵی کێوی، راوی وتی: پێشەوا

(عُثمَان) ناردی بەدوای پێشەوا عەلی کوڕی (أبی طالِب)دا ڕەزای خوای لێ بێ بۆ ئەوەی بێت بۆ ئەو دەعوەتە، کە نێردراوەکە چوو بۆ لای گەڵای دەوەراند بۆ وشترەکانی پێشەوا عەلی هێنا، کە هات تەپ و تۆزی درەختەکانی لە خۆی دەتەکاند، پێیان وت: بخۆ، وتی: ئەم خواردنە بدەن بە کەسانێ بیخۆن لە ئیحرامدا نەبن چونکە ئێمە لە ئیحرامداین، پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ وتی: سوێندتان دەدەم بە خوا ئەوانەی کە لێرەدا ئامادەن لە هۆزی ئەشجەع، ئایا دەزانن کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ئیحرامدا بوو پیاوێ گۆشتی کەرە کێوی بەدیاری بۆ هێنا نەیخوارد؟ وتیان: بەڵێ.

١٨٥٠ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَالَ: يَا زَيْدُ بْنَ أَرْقَمَ هَلْ عَلِمْتَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُهْدِيَ إِلَيْهِ عُضْوُ صَيْدٍ فَلَمْ يَقْبَلْهُ، وَقَالَ: (إِنَّا حُرُمٌ)؟ قَالَ: نَعَمْ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەی زەیدی کوڕی ئەرقەم ئایا دەزانیت کە پارچەیە گۆشتی نێچیری ڕاوکراویان بەدیاری هێنا بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وەری نەگرت، فەرمووی: (ئێمە لە ئیحرامداین)؟ وتی: بەڵێ.

١٨٥١ - (ضعيف) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (صَيْدُ الْبَرِّ لَكُمْ حَلاَلٌ مَا لَمْ تَصِيدُوهُ أَوْ يُصَدْ لَكُمْ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: إِذَا تَنَازَعَ الْخَبَرَانِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُنْظَرُ بِمَا أَخَذَ بِهِ أَصْحَابُهُ.

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللّه)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (گۆشتی نێچیری کێوی و وشکانی حەڵاڵە بۆتان لە کاتێکدا کە لە ئیحرامدا بن بە مەرجێ خۆتان راوی نەکەن و بۆتان راو نەکەن). ئەبو داود دەڵێت: ئەگەر دوو فەرمودەی دژ بەیەك لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم ریوایەت کرا سەیر دەکرێت یارانی دەستیان گرتووە بە کامەیانەوە ئیش بەوەیان دەکرێت.

١٨٥٢ - (صحيح) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ، أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى إِذَا كَانَ بِبَعْضِ طَرِيقِ مَكَّةَ تَخَلَّفَ مَعَ أَصْحَابٍ لَهُ مُحْرِمِينَ، وَهُوَ غَيْرُ مُحْرِمٍ، فَرَأَى حِمَارًا وَحْشِيًّا، فَاسْتَوَى عَلَى فَرَسِهِ، قَالَ: فَسَأَلَ أَصْحَابَهُ أَنْ يُنَاوِلُوهُ سَوْطَهُ، فَأَبَوْا، فَسَأَلَهُمْ رُمْحَهُ، فَأَبَوْا، فَأَخَذَهُ ثُمَّ شَدَّ عَلَى الْحِمَارِ فَقَتَلَهُ، فَأَكَلَ مِنْهُ بَعْضُ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَبَى بَعْضُهُمْ، فَلَمَّا أَدْرَكُوا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَأَلُوهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: (إِنَّمَا هِيَ طُعْمَةٌ أَطْعَمَكُمُوهَا اللَّهُ تَعَالَى).

واتە: لە ئەبو قەتادەوە دەگێڕنەوە، کە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم لەسەفەرێکدا دەچوون بەرەو مەککە هەتا لەگەڵ چەند هاورێیەکی لە رێگادا دواکەوتن لە کاروانەکە کە لە ئیحرامدا بوون، بەڵام ئەبو قەتادە لە ئیحرامدا نەبوو، کەرە کێوییەکی دی، لەسەر ئەسپەکەی وەستا، راوی

وتى: داواى كرد لە هاوڕێكانى قەمچيەكەى كە كەوتبوە خوارەوە لەدەستى بيدەنەوە دەستى، نەياندايە دەستى چونكە لە ئيحرامدا بوون، داواى رمەكەى كرد، ئەويشيان نەدايە، لەپاشدا ئەبو قەتادە خۆى كەرە كێويەكەى كوشت، هەندێ لە يارانى پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم لە گۆشتى كەرە كێويەكەيان خوارد چونكە نە خۆيان راويان كردبو نە يارمەتيشيان دا بۆ ئەوەى راوى بكات، بەڵام هەندێكيان نەيانخوارد، كاتێ كە گەيشتنەوە بە خزمەت پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم لەوبارەوە لێيان پرسى، فەرمووى: (بێگومان ئەوە خواردنێكە كە خواى گەورە دەرخواردى داون).

## باسى ئەو كەسەى كە لە ئيحرامدايە دروستە راوى كوللە بكات يان نا؟

## ٤٢ – باب فِي الْجَرَادِ لِلْمُحْرِمِ.

**١٨٥٣ - (ضعيف) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «الْجَرَادُ مِنْ صَيْدِ الْبَحْرِ».**

واتە: لە ئەبو هورەيرە دەگێڕنەوە، كە وتويەتى: پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم فەرموويەتى: (كوللە حوكمى نێچيرى دەرياى هەيە كەواتە خواردنى دروستە بۆ ئەو كەسەى كە لە ئيحرامدايە).

١٨٥٤ - (ضعيف جدا) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: أَصَبْنَا صِرْمًا مِنْ جَـرَادٍ فَكَانَ رَجُلٌ مِنَّا يَضْرِبُهُ بِسَوْطِهِ وَهُوَ مُحْرِمٌ، فَقِيلَ لَـهُ: إِنَّ هَذَا لاَ يَصْلُحُ! فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: (إِنَّمَا هُوَ مِنْ صَيْدِ الْبَحْرِ).

واتـە: ئـەبو هـورەیرە دەڵێـت: توشـی کۆمـەڵێ کوللـەی زۆر بـووین یـەکێ لـە ئێمە لە ئیحرامدا بوو بە قەمچیەکەی لێـی دەدان و راوی دەکـردن، پێـی وتـرا: ئەو کارە دروست نیە بۆ کەسێ کـە لـە ئیحرامـدا بێـت، ئەمـەیان گێرایـەوە بـۆ پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم فـەرمووی: (بێگومـان کوللـە حـوکمی نێچـیری دەریـای هەیـە کەواتـە خـواردنی دروسـتە بـۆ ئـەو کەسـەی کـە لـە ئیحرامدایە).

١٨٥٥ - (ضعيف) عَنْ كَعْبٍ قَالَ: الْجَرَادُ مِنْ صَيْدِ الْبَحْرِ.

واتە: لە کەعبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کوللە حوکمی نێچیری دەریـای هەیە.

## باسی فدیە دان.

## ٤٣ – باب فِي الْفِدْيَةِ.

١٨٥٦ - (صحيح) عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ بِهِ زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ فَقَالَ: (قَدْ آذَاكَ هَوَامُّ رَأْسِكَ؟). قَالَ: نَعَمْ. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (احْلِقْ، ثُمَّ اذْبَحْ شَاةً نُسُكًا، أَوْ صُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، أَوْ أَطْعِمْ ثَلاَثَةَ آصُعٍ مِنْ تَمْرٍ عَلَى سِتَّةِ مَسَاكِينَ).

واتە: لە کەعبی کوڕی عوجرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە سەردەمی ڕێککەوتنی حودەیبیەدا بەلایدا تێپەڕی – بینی جانەوەرەکانی سەری هەڵئەوەراند - فەرمووی: (جانەوەرەکانی سەرت ئازارت دەدەن؟). وتی: بەڵێ، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (دەی سەرت بتاشە، لەپاشدا مەڕێ سەربڕە بۆ خوا، یان سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بە، یا سێ صاع خورما بدە بە شەش هەژار).

١٨٥٧ - (صحيح) عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُ: (إِنْ شِئْتَ فَانْسُكْ نَسِيكَةً، وَإِنْ شِئْتَ فَصُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَطْعِمْ ثَلاَثَةَ آصُعٍ مِنْ تَمْرٍ لِسِتَّةِ مَسَاكِينَ).

واتە: لە كەعبی كوڕی عوجرەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووە: (ئەگەر دەتەوێ ئاژەڵێ سەربڕە بۆ خوا، وە ئەگەر حەز دەكەی سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بە، وە ئەگەر دەتەوێ سێ صاع خورما بدە بە شەش هەژار، ئیتر ئارەزووی خۆتە لەم سیانە كامیان هەڵدەبژێری).

١٨٥٨ - (صحيح) عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ بِهِ زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ، فَذَكَرَ الْقِصَّةَ، فَقَالَ: (أَمَعَكَ دَمٌ؟). قَالَ: لاَ، قَالَ: (فَصُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، أَوْ تَصَدَّقْ بِثَلاَثَةِ آصُعٍ مِنْ تَمْرٍ عَلَى سِتَّةِ مَسَاكِينَ: بَيْنَ كُلِّ مِسْكِينَيْنِ صَاعٌ).

واتە: لە كەعبی كوڕی عوجرەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە سەردەمی ڕێككەوتنی حودەیبیەدا بەلایدا تێپەڕی، ڕاوی بەسەرهاتەكەی گێڕایەوە، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئاژەڵت پێیە سەری ببڕی؟). وتی: نەخێر، فەرمووی: (دەی سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بە، یان سێ صاع خورما بدە بە شەش هەژار: هەر صاعێك دابەش بكە بەسەر دوو هەژاردا).

١٨٥٩ - (ضعيف وقوله: (بَقَرَةً) منكر، والمحفوظ أنه أمر بشاة) عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ - وَكَانَ قَدْ أَصَابَهُ فِي رَأْسِهِ أَذًى فَحَلَقَ - فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُهْدِيَ هَدْيًا بَقَرَةً.

واتە: لە کەعبی کوڕی عوجرەوە دەگێڕنەوە - کە ئازارێ لەسەری پەیدا بوو سەری تاشی - پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێ کرد مانگایە سەربڕێت.

**١٨٦٠ - (حسن لكن قوله: (فرقًا من زبيب) شاذ، والمحفوظ بلفظ: (ثلاث آصُع من تمر) كما في الأحاديث الباب) عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ قَالَ: أَصَابَنِي هَوَامٌّ فِي رَأْسِي، وَأَنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ، حَتَّى تَخَوَّفْتُ عَلَى بَصَرِي، فَأَنْزَلَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى: (فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ). الآيَةَ، فَدَعَانِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ لِي: (احْلِقْ رَأْسَكَ، وَصُمْ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ، أَوْ أَطْعِمْ سِتَّةَ مَسَاكِينَ فَرَقًا مِنْ زَبِيبٍ، أَوِ انْسُكْ شَاةً). فَحَلَقْتُ رَأْسِي ثُمَّ نَسَكْتُ.**

واتە: لە کەعبی کوڕی عوجرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە سەردەمی رێککەوتنی حودەیبیەدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بووم، رشك و ئەسپێ دابویە سەرم، هەتا ترسام لە چاوم کە کوێر بێت، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ). واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە نەخۆش بوو یان ئازارێك لە سەریدا بوو فدیە بدات. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بانگی کردم پێی فەرمووم: (سەرت بتاشە، سێ رۆژ بە رۆژوو بە، یان (فرق)ێك مێوژ کە دەکاتە سێ صاع بدە بە

شەش هەژار، یا مەڕێ بکە بە قوربانی). منیش سەرم تاشی، لەپاشدا قوربانیەکەم کرد.

١٨٦١ - (صحيح) عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، فِي هَذِهِ الْقِصَّةِ زَادَ: (أَيَّ ذَلِكَ فَعَلْتَ أَجْزَأَ عَنْكَ).

واتە: لە کەعبی کوڕی عوجرەوە هەمان بەسەرهات دەگێڕنەوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: (ئیتر لەم سیانەی کە باسکران کامەیان هەڵدەبژێری لەلایەن خواوە پاداشت دەدرێیتەوە).

## باسی رێ لێ گیران لە حەجدا.

## ٤٤ - باب الإِحْصَارِ.

١٨٦٢ - (صحيح) عَنِ الْحَجَّاجِ بن عَمْرو الأَنْصَارِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ كُسِرَ أَوْ عَرِجَ فَقَدْ حَلَّ وَعَلَيْهِ الْحَجُّ مِنْ قَابِلٍ). قَالَ عِكْرِمَةُ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ وَأَبَا هُرَيْرَةَ عَنْ ذَلِكَ فَقَالاَ: صَدَقَ.

واتە: لە حەجاجی کوڕی عەمری ئەنصاریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ قاچی شکا یان توشی شەلی بوو بە جۆرێ کە بوونە رێگر لەبەردەم ئەنجامدانی دروشم و

ئەرکانەکانی حەج ئەوە دروستە ئیحرامەکەی بشکێنێ بەڵام لەسەریەتی ساڵی داهاتوو حەجەکەی بکاتەوە)، عیکریمە دەڵێت: لەوبارەوە لە ئیبنو عەباس و ئەبو هورەیرەم پرسی؟ وتیان: راست دەکات.

١٨٦٣ - (صحيح) عَنِ الْحَجَّاجِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنْ كُسِرَ أَوْ عَرِجَ أَوْ مَرِضَ). فَذَكَرَ مَعْنَاهُ.

واتە: لە حەجاجی کوڕی عەمرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەرکەسێ قاچی شکا یان توشی شەلی بوو یا نەخۆش کەوت). راوی بە هەمان مانا فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە.

١٨٦٤ - (ضعيف) عَنْ مَيْمُونِ بْنِ مِهْرَانَ قَالَ: خَرَجْتُ مُعْتَمِرًا عَامَ حَاصَرَ أَهْلُ الشَّأْمِ ابْنَ الزُّبَيْرِ بِمَكَّةَ، وَبَعَثَ مَعِي رِجَالٌ مِنْ قَوْمِي بِهَدْيٍ، فَلَمَّا انْتَهَيْنَا إِلَى أَهْلِ الشَّأْمِ مَنَعُونَا أَنْ نَدْخُلَ الْحَرَمَ، فَنَحَرْتُ الْهَدْيَ مَكَانِي، ثُمَّ أَحْلَلْتُ، ثُمَّ رَجَعْتُ، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْعَامِ الْمُقْبِلِ خَرَجْتُ لأَقْضِيَ عُمْرَتِي، فَأَتَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: أَبْدِلِ الْهَدْيَ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَ أَصْحَابَهُ أَنْ يُبْدِلُوا الْهَدْيَ الَّذِي نَحَرُوا عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ فِي عُمْرَةِ الْقَضَاءِ.

واتە: لە مەیمونی کوڕی میهرانەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەو ساڵەی کە خەڵکی شام ئابلۆقەی ئیبنو زوبەیریان دا لە مەککە - واتە حەجاج و لەشکرەکەی – دەرچووم بۆ عومرە، کەسانێ لە هۆزەکەم ئاژەڵی دیاری ماڵی خوایان پێدا ناردم بۆ ئەوەی لەوێ بۆیان بکەم بە قوربانی، کاتێ کە گەیشتین خەڵکی شام ڕێیان نەداین بچینە ناو حەرەمەوە، بۆیە لە جێگای خۆمدا دیاریەکانم سەربڕین، لەپاشدا ئیحرامەکەم شکاند، ئینجا گەڕامەوە، ساڵی داهاتوو دەرچووم بۆ ئەوەی عومرەکەم بکەمەوە، گەیشتم بە ئیبنو عەباس لەوبارەوە لێم پرسی؟ وتی: لە جیاتی دیاریەکەی ساڵی پار دیاریەکی تر سەربڕە، چونکە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی کرد بە یارانی کە لە جیاتی دیاریەکانی ساڵی حودەیبیە دیاری تر سەربڕن.

## باسی ئادابەکانی چونە ناو مەککەوە.

## ٤٥ – باب دُخُولِ مَكَّةَ.

١٨٦٥ - (صحيح) عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ إِذَا قَدِمَ مَكَّةَ بَاتَ بِذِي طُوًى حَتَّى يُصْبِحَ وَيَغْتَسِلَ، ثُمَّ يَدْخُلُ مَكَّةَ نَهَارًا، وَيَذْكُرُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ فَعَلَهُ.

واتە: نافع دەڵێت: ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ کاتێ کە دەیویست بچێتە ناو شاری مەککەوە شەو لە (ذِی طوًى) کە شوێنێکە لە نزیك مەککە دەمایەوە هەتا بەیانی لەوێ خۆی دەشت، لەپاشدا بەڕۆژ دەچووە ناو شاری مەککەوە، وە ئیبنو عومەر لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم گێڕایەوە، کە ئەو کارەی کردوە.

١٨٦٦ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَدْخُلُ مَكَّةَ مِنَ الثَّنِيَّةِ الْعُلْيَا - قَالاَ عَنْ يَحْيَى إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَدْخُلُ مَكَّةَ مِنْ كَدَاءَ مِنْ ثَنِيَّةِ الْبَطْحَاءِ - وَيَخْرُجُ مِنَ الثَّنِيَّةِ السُّفْلَى.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە (ثَنِيَةِ العُلْيا)وە کە ڕێگەیەکە لەسەرووی مەککەوە دەچوە ناو مەککەوە - لە یەحیاوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە کەدائەوە لە (ثَنِيَةِ البَطحاء)وە دەچوە ناو مەککەوە — وە لە (ثَنِيَةِ السُفلى)وە کە ڕێگەیەکە لەخوارووی مەککەوە لە مەککە دەردەچو.

١٨٦٧ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَخْرُجُ مِنْ طَرِيقِ الشَّجَرَةِ، وَيَدْخُلُ مِنْ طَرِيقِ الْمُعَرَّسِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ڕێگەی (شَجَرَة)وە لە مەدینەوە دەردەچو، وە لە ڕێگەی (مُعَرَّس)وە دەچوە ناو مەککەوە.

١٨٦٨ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَ الْفَتْحِ مِنْ كَدَاءَ مِنْ أَعْلَى مَكَّةَ، وَدَخَلَ فِي الْعُمْرَةِ مِنْ كُدًى، قَالَ: وَكَانَ عُرْوَةُ يَدْخُلُ مِنْهُمَا جَمِيعًا، وَكَانَ أَكْثَرُ مَا كَانَ يَدْخُلُ مِنْ كُدًى، وَكَانَ أَقْرَبَهُمَا إِلَى مَنْزِلِهِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ساڵی ڕزگارکردنی شاری مەککەدا لە ڕێگەی (كداء)ەوە لە سەروی مەککەوە چوە ناو شارەوە، - وە لە ڕێگەی (كدى)ەوە چوە ناو شاری مەککەوە بۆ عومرە، دەڵێن: عوروە لەهەردوو ڕێگەکەوە دەچوە ناو شاری مەککەوە، بێگومان زۆر تر لە ڕێگەی (كدى)ەوە دەچوە ناو شاری مەککەوە، چونکە لە مەنزڵگاکەیەوە نزیکتر بوو.

١٨٦٩ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا دَخَلَ مَكَّةَ دَخَلَ مِنْ أَعْلاَهَا وَخَرَجَ مِنْ أَسْفَلِهَا.

واتە: عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم دەیویست بچێتە ناو شاری مەککەوە لە سەروی مەککەوە دەچوە ناویەوە، وە لە لای خوارویەوە دەردەچو.

# باسی کەسێ لەکاتی بینینی ماڵی خوادا دەستەکانی بەرزکاتەوە.

## ٤٦ – باب فِي رَفْعِ الْيَدَيْنِ إِذَا رَأَى الْبَيْتَ.

١٨٧٠ - (ضعيف) عَنِ الْمُهَاجِرِ الْمَكِّيِّ، قَالَ: سُئِلَ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ عَنِ الرَّجُلِ يَرَى الْبَيْتَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ؟ فَقَالَ: مَا كُنْتُ أَرَى أَحَدًا يَفْعَلُ هَذَا إِلاَّ الْيَهُودَ، وَقَدْ حَجَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ يَكُنْ يَفْعَلُهُ.

واتە: موهاجیری مەککی دەڵێت: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللّه)یان پرسی: ئایا کەسێ کە ماڵی خوای بینی دروستە دەستەکانی بەرزکاتەوە لە پاڕانەوەدا یان نا؟ جابر وتی: جگە لە جولەکە کەسم نەدیوە ئەو کارە بکات، بێگومان لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم حەجمان کردوە ئەو کارەی نەکردوە. واتە لەکاتی بینینی ماڵی خوادا دەستەکانی بەرزنەدەکردەوە.

١٨٧١ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا دَخَلَ مَكَّةَ طَافَ بِالْبَيْتِ وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَلْفَ الْمَقَامِ. يَعْنِي يَوْمَ الْفَتْحِ.

واته: ئەبو هورەیره دەڵێت: كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چوە ناو شاری مەككەوە تەوافی ماڵی خوای كرد، لەدوای مەقامی ئیبراهیمەوە دوو ركات نوێژی كرد. واته: لەرۆژی رزگاركردنی مەككەدا.

| |
|---|
| ١٨٧٢ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: أَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدَخَلَ مَكَّةَ، فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْحَجَرِ فَاسْتَلَمَهُ، ثُمَّ طَافَ بِالْبَيْتِ، ثُمَّ أَتَى الصَّفَا فَعَلاَهُ حَيْثُ يَنْظُرُ إِلَى الْبَيْتِ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ، فَجَعَلَ يَذْكُرُ اللَّهَ مَا شَاءَ أَنْ يَذْكُرَهُ وَيَدْعُوهُ، قَالَ: وَالأَنْصَارُ تَحْتَهُ، قَالَ هَاشِمٌ: فَدَعَا وَحَمِدَ اللَّهَ وَدَعَا بِمَا شَاءَ أَنْ يَدْعُوَ. |

واته: ئەبو هورەیره دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە مەدینەوە چو بۆ مەككە كاتێ كە چوە ناو شاری مەككەوە سەرەتا دەستی دا لەبەردە رەشەكەو ماچی كرد، لەپاشدا تەوافی ماڵی خوای كرد، ئینجا چوە سەر بەرزایی كێوی صەفاو سەیری ماڵی خوای دەكردو دەستەكانی بەرزكردبونەوە، ئەوەندەی كە خوا بیەوێ زیكر و یادی خوای كردو لێی پاڕایەوە، راوی وتی: ئەنصار لەبەردەمیدا بوون، هاشم راوی فەرمودەكە وتی: ئەوەندەی كە خوا بیەوێ پاڕایەوە.

## باسی ماچ كردنی بەردە رەشەكە.

## ٤٧ – باب فِی تَقْبِیلِ الْحَجَرِ.

١٨٧٣ - (صحيح) عَنْ عُمَرَ، أَنَّهُ جَاءَ إِلَى الْحَجَرِ فَقَبَّلَهُ فَقَالَ: إِنِّی أَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ لاَ تَنْفَعُ وَلاَ تَضُرُّ، وَلَوْلاَ أَنِّی رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُقَبِّلُكَ مَا قَبَّلْتُكَ.

واتە: پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە چوە بۆ لای بەردە رەشەكەو ماچی كردووەو، وتویەتی: من دەزانم كە تۆ بەردێكیت نە سودت هەیەو نە زیان دەگەیەنیت، ئەگەر بە چاوی خۆم پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم نەدیایە ماچی دەكردی هەرگیز ماچم نەدەكردی.

## باسی دەستدان لە گۆشەكان.

## ٤٨ – باب اسْتِلاَمِ الأَرْكَانِ.

١٨٧٤ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْسَحُ مِنَ الْبَيْتِ إِلاَّ الرُّكْنَيْنِ الْيَمَانِيَيْنِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: نەمدیوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەست بهێنێ بە هیچ شوێنێكی ماڵی خوادا جگە لە دوو گۆشە یەمانیەكان.

١٨٧٥ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّهُ أُخْبِرَ بِقَوْلِ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: إِنَّ الْحَجَرَ بَعْضُهُ مِنَ الْبَيْتِ. فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: وَاللَّهِ - إِنِّي لأَظُنُّ عَائِشَةَ إِنْ كَانَتْ سَمِعَتْ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - إِنِّي لأَظُنُّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَتْرُكِ اسْتِلاَمَهُمَا إِلاَّ أَنَّهُمَا لَيْسَا عَلَى قَوَاعِدِ الْبَيْتِ، وَلاَ طَافَ النَّاسُ وَرَاءَ الْحِجْرِ إِلاَّ لِذَلِكَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێی راگەیەنراوە، كە عائیشە رەزای خوای لێ بێ وتویەتی: بەردە رەشەكە هەندێكی لە ماڵی خوایە. ئیبنو عومەر وتی: سوێند بە خوا - من وا ئەزانم عائیشە ئەمەی بیستوە لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم - وا ئەزانم كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وازی لەدەست پێداهێنان و ماچكردنی نەدەهێنا، تەنها لەبەر ئەوەی ئەو دوو گۆشەیە لەسەر بناغەی ماڵی خوا نین، وە هەر لەبەر ئەوەشە خەڵك لەدوای بەردەكەوە تەواف دەكەن.

١٨٧٦ - (حسن) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يَدَعُ أَنْ يَسْتَلِمَ الرُّكْنَ الْيَمَانِيَ وَالْحَجَرَ فِي كُلِّ طَوْفَةٍ، قَالَ: وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ يَفْعَلُهُ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەهەموو سوڕانەوەیەكدا بەدەوری ماڵی

خوادا دەستی دەهێنا بە گۆشە یەمانیەکەو بەردە رەشەکەداو ماچی دەکرد. راوی وتی: (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەریش رەزای خوایان لێ بێ خۆشی ئەو کارەی دەکرد.

## باسی تەوافی واجب.

## ٤٩ - باب الطَّوَافِ الْوَاجِبِ.

١٨٧٧ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَافَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ عَلَى بَعِيرٍ يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ بِمِحْجَنٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە حەجی ماڵاوایی دا بە سواری وشترێ تەوافی ماڵی خوای دەکرد گۆچانێکی هێنا بە بەردە رەشەکەدا ئەو شوێنەی گۆچانەکەی ماچ دەکرد کە بەر بەردەکە کەوتبوو.

١٨٧٨ - (صحيح) عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةَ قَالَتْ: لَمَّا اطْمَأَنَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ طَافَ عَلَى بَعِيرٍ يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ بِمِحْجَنٍ فِي يَدِهِ. قَالَتْ: وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَيْهِ.

واتــە: لــە صــەفیەی كچــی شــەیبەوە دەگێڕنــەوە، كــە وتویــەتی: لــە ســاڵی ڕزگاركردنی شاری مەككەدا كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دڵنیابوو بە سواری وشترێكەوە تەوافی ماڵی خوای كرد گۆچانێكی بە دەستەوە بوو هێنای بە بەردە ڕەشەكەداو ماچی كرد. صەفیە وتی: منیش سەیرم دەكرد.

١٨٧٩ - (صحيح) عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عَلَى رَاحِلَتِهِ يَسْتَلِمُ الرُّكْنَ بِمِحْجَنِهِ، ثُمَّ يُقَبِّلُهُ. زَادَ مُحَمَّدُ بْنُ رَافِعٍ: ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ فَطَافَ سَبْعًا عَلَى رَاحِلَتِهِ.

واتــە: ئــەبو (طفَیل) دەڵێت: پێغەمبەرم صلی الله علیە وسلم بینیوە بە سواری وڵاخەكەیەوە تەوافی ماڵی خوای كردوە گۆچانەكەی داوە لە بەردە ڕەشەكە، لەپاشدا ماچی كرد. موحەممەدی كوڕی ڕافع ئەمەی بۆ زیاد كرد: ئینجا دەرچو بۆ صەفا و مەروە و بە سواری وڵاخەكەیەوە حەوت جار هاتوچۆی كرد لە نێوانیاندا.

١٨٨٠ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: طَافَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ عَلَى رَاحِلَتِهِ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ لِيَرَاهُ النَّاسُ، وَلِيُشْرِفَ، وَلِيَسْأَلُوهُ، فَإِنَّ النَّاسَ غَشُوهُ.

واتە: جابری کوڕی (عَبْد الله) دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە حەجی ماڵاوایی دا بە سواری وڵاخەکەیەوە تەوافی ماڵی خواو هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەی کرد، بۆ ئەوەی خەڵك بیبینن و، خۆی سەرپەرشتیان بکات و، پرسیاری لێ بکەن، چونکە قەرەباڵغ بوو خەڵك دەوریان دابوو.

١٨٨١ - (ضعيف) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدِمَ مَكَّةَ وَهُوَ يَشْتَكِي، فَطَافَ عَلَى رَاحِلَتِهِ، كُلَّمَا أَتَى عَلَى الرُّكْنِ اسْتَلَمَ الرُّكْنَ بِمِحْجَنٍ، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ طَوَافِهِ أَنَاخَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ.

واتە: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گەیشتە شاری مەککە نەخۆش بوو، بۆیە بە سواری وڵاخەکەیەوە تەوافی ماڵی خوای کرد، هەرکاتێ کە دەگەیشتە ئاستی گۆشەکە گۆچانەکەی دەهێنا پێیدا و ماچی دەکرد، کاتێ کە لە تەواف بویەوە وڵاغەکەی یخ داو دوو رکات نوێژی تەوافی کرد.

١٨٨٢ - (صحيح) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهَا قَالَتْ: شَكَوْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنِّي أَشْتَكِي، فَقَالَ: (طُوفِي مِنْ وَرَاءِ النَّاسِ وَأَنْتِ رَاكِبَةٌ). قَالَتْ: فَطُفْتُ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَئِذٍ يُصَلِّي إِلَى جَنْبِ الْبَيْتِ، وَهُوَ يَقْرَأُ بِ (وَٱلطُّورِ وَكِتَٰبٍ مَّسۡطُورٍ).

واتە: ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەڵێت: سکاڵام نەخۆشی خۆم کرد لەلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (لەدوای خەڵکەوە بەسواری تەواف بکە). وتی: لەوکاتەدا کە تەوافم دەکرد پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە تەنیشت ماڵی خواوە نوێژی دەکرد، ئەم سورەتەی دەخوێند: (وَٱلطُّورِ وَكِتَٰبٍ مَّسۡطُورٍ).

## باسی دەرخستنی شانی راست لەکاتی تەوافی ماڵی خوادا.

## ٥٠ - باب الاِضْطِبَاعِ فِي الطَّوَافِ.

١٨٨٣ - (حسن) عَنْ يَعْلَى قَالَ: طَافَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُضْطَبِعًا بِبُرْدٍ أَخْضَرَ.

واتە: یەعلا دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەوافی دەکرد ناوەڕاستی بوردەیەکی سەوزی کردبو بە ژێر باڵی راستیداو لاکانی دابوو بەسەر لای چەپیدا واتە شانی راستی دەرخستبوو.

١٨٨٤ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابَهُ اعْتَمَرُوا مِنَ الْجِعْرَانَةِ فَرَمَلُوا بِالْبَيْتِ، وَجَعَلُوا أَرْدِيَتَهُمْ تَحْتَ آبَاطِهِمْ، قَدْ قَذَفُوهَا عَلَى عَوَاتِقِهِمُ الْيُسْرَى.

واتە: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و یارانی لە جیعرانەوە عومرەیان کرد بە لۆقە تەوافی ماڵی خوایان کرد، ئیحرامەکەیان خستە ژێر باڵیان و لاکانیان دایەوە بەسەر شانی چەپیاندا.

## باسی تەوافی ماڵی خوا بە لۆقە.

## ٥١ – باب فِي الرَّمَلِ.

١٨٨٥ - (صحيح) عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ قَالَ: قُلْتُ لابْنِ عَبَّاسٍ: يَزْعُمُ قَوْمُكَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ رَمَلَ بِالْبَيْتِ، وَأَنَّ ذَلِكَ سُنَّةٌ، قَالَ: صَدَقُوا وَكَذَبُوا، قُلْتُ: وَمَا صَدَقُوا وَمَا كَذَبُوا؟ قَالَ: صَدَقُوا، قَدْ رَمَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَكَذَبُوا، لَيْسَ بِسُنَّةٍ، إِنَّ قُرَيْشًا قَالَتْ زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ: دَعُوا مُحَمَّدًا وَأَصْحَابَهُ حَتَّى يَمُوتُوا مَوْتَ النَّغَفِ، فَلَمَّا صَالَحُوهُ عَلَى أَنْ يَجِيئُوا مِنَ الْعَامِ الْمُقْبِلِ، فَيُقِيمُوا بِمَكَّةَ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ، فَقَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالْمُشْرِكُونَ مِنْ قِبَلِ قُعَيْقِعَانَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لأَصْحَابِهِ: (ارْمُلُوا بِالْبَيْتِ ثَلاثًا). وَلَيْسَ بِسُنَّةٍ. قُلْتُ: يَزْعُمُ قَوْمُكَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

طَافَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ عَلَى بَعِيرِهِ، وَأَنَّ ذَلِكَ سُنَّةٌ، فَقَالَ: صَدَقُوا وَكَذَبُوا. قُلْتُ مَا صَدَقُوا، وَمَا كَذَبُوا؟ قَالَ: صَدَقُوا، قَدْ طَافَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ عَلَى بَعِيرِهِ، وَكَذَبُوا: لَيْسَ بِسُنَّةٍ، كَانَ النَّاسُ لاَ يُدْفَعُونَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلاَ يُصْرَفُونَ عَنْهُ، فَطَافَ عَلَى بَعِيرٍ، لِيَسْمَعُوا كَلاَمَهُ، وَلِيَرَوْا مَكَانَهُ، وَلاَ تَنَالَهُ أَيْدِيهِمْ.

واته: ئەبو (طُفَيل) دەڵێت: بە ئیبنو عەباسم وت: هۆزەكەت پێیان وایە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە لۆقە تەوافی ماڵی خوای كردوە، ئەو كارەش سوننەتە، ئیبنو عەباس وتی: راستیان كردو، درۆیان كرد، وتم: چیان راست كرد، چیان درۆ كرد؟ وتی: راستیان كرد، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە لۆقە تەوافی ماڵی خوای كردوە، بەڵام درۆیان كرد ئەو كارە سوننەت نیە، لەسەردەمی رێكەوتنی حودەیبیەدا هۆزی قورەیش وتیان: لێیان گەڕێن با موحەممەدو یارانی بمرن وەك چۆن وشتر و مەڕ بە زوترین كات دەمرن بە هۆی كرمێكەوە كە دەداتە لوتیان، كاتێ كە رێكەوتنیان لەگەڵ كرد ساڵی داهاتوو بێتەوە، سێ رۆژ بمێنێتەوە لە مەككە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و هاوەڵ بۆ خوا برپاردەران لە كێوی (قُعَيقِعَان) گەیشتن بەیەك، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە یارانی فەرموو: (لە سێ سوڕانەوەی تەوافی ماڵی خوادا بە لۆقە بڕۆن - چوارەكەی تر بە رۆشتنی ئاسایی - ) ، ئەمەش سوننەت نیە، وتم: هۆزەكەت پێیان وایە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە سواری وشترەكەیەوە هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەی كردوە، ئەو كارەش سوننەتە، ئیبنو عەباس وتی: راستیان كردو، درۆیان كرد، وتم:

چیان راست کرد، چیان درۆ کرد؟ وتی: راستیان کرد، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە سواری وشترەکەیەوە هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەی کردوە، بەڵام درۆیان کرد ئەو کارە سوننەت نیە، خەڵك دەوریان دابوو لێی دوورنەدەکەوتنەوەو لایان چۆڵ نەدەکرد بۆیە ئەویش بە سواری وشترەکەیەوە تەواڤ کرد، بۆ ئەوەی وتەکانی ببیستن و جێگاکەی ببینن و، دەستیان نەیگاتێ.

١٨٨٦ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَكَّةَ وَقَدْ وَهَنَتْهُمْ حُمَّى يَثْرِبَ، فَقَالَ الْمُشْرِكُونَ: إِنَّهُ يَقْدَمُ عَلَيْكُمْ قَوْمٌ قَدْ وَهَنَتْهُمُ الْحُمَّى وَلَقُوا مِنْهَا شَرًّا، فَأَطْلَعَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ نَبِيَّهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى مَا قَالُوهَا، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَرْمُلُوا الأَشْوَاطَ الثَّلاَثَةَ، وَأَنْ يَمْشُوا بَيْنَ الرُّكْنَيْنِ، فَلَمَّا رَأَوْهُمْ رَمَلُوا قَالُوا: هَؤُلاَءِ الَّذِينَ ذَكَرْتُمْ أَنَّ الْحُمَّى قَدْ وَهَنَتْهُمْ!! هَؤُلاَءِ أَجْلَدُ مِنَّا! قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَلَمْ يَأْمُرْهُمْ أَنْ يَرْمُلُوا الأَشْوَاطَ إِلاَّ إِبْقَاءً عَلَيْهِمْ.

واتە: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گەیشتە گەیشتە شاری مەکە لەگەڵ یارانی تای (یَثرِب) ماندو لاوازی کردبون، هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەران وتیان: قەومێ هاتوون بۆ مەککە بۆ ناومان توشی تای مەدینە(یَثرِب)بوون و ماندو لاوازی کردون لە مەدینە توشی خراپترین شت بوون، خوای گەورە ئاگاداری کردەوە لەوەی کە

وتیان، بۆیە فەرمانی پێ كردن لە سێ سوڕانەوەی تەوافیماڵی خوادا بە لۆقە بڕۆن بۆ ئەوەی پێیان بسەلمێنێ كە درۆدەكەن، وە هاتوچۆی نێوان گۆشەی یەمانی بەردە رەشەكە بكەن، كاتێ كە هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەران بینینیان بە لۆقە دەڕۆن بۆیان دەركەوت كە درۆدەكەن وتیان: ئەوانەی كە ئێوە باستان كرد كە تای مەدینە(یَثرِب) ماندو لاوازی كردون لە مەدینە توشی خراپترین شت بوون!! ئەوانە زۆر لە ئێمە بە هێز تر و چالاك ترن! ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ وتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ نەكردن لە هەموو سوڕانەوەكاندا بە لۆقە بڕۆن چونكە بەزەیی پێیاندا هاتەوەو نەیویست لەوە زیاتر ماندو بن.

١٨٨٧ - (حسن صحيح) عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ يَقُولُ: فِيمَ الرَّمَلاَنُ الْيَوْمَ، وَالْكَشْفُ عَنِ الْمَنَاكِبِ؟ وَقَدْ أَطَّأَ اللَّهُ الإِسْلاَمَ وَنَفَى الْكُفْرَ وَأَهْلَهُ، مَعَ ذَلِكَ لاَ نَدَعُ شَيْئًا كُنَّا نَفْعَلُهُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

واتە: لە زەیدی كوڕی ئەسلەمەوە، لە باوكیەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لە پێشەوا عومەری كوڕی (خَطاب)م رەزای خوای لێ بێ بیستوە دەیوت: ئیتر ئەمڕۆ ئەم لۆقە كردنە بۆچی لەگەڵ ئەم شان دەرخستنەدا، لەكاتێكدا كە خوای گەورە حوكمی ئیسلامی چەسپاندووەو موسوڵمانانی سەربەرز كردوە و كوفر و بێ باوەڕی و خاوەنەكانیانی دەرپەڕاند، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە واز لە شتێ ناهێنین كە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بەجێمان هێناوە.

١٨٨٨ - (ضعيف) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّمَا جُعِلَ الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَرَمْيُ الْجِمَارِ: لإِقَامَةِ ذِكْرِ اللَّهِ).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بێگومان تەوافی ماڵی خواو هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە و رەجمی شەیتان و هەموو ئەركان و دروەشمەكانی حەج بۆیە دانراون كە یادی خوای گەورەیان تێدا بكرێت).

١٨٨٩ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اضْطَبَعَ فَاسْتَلَمَ وَكَبَّرَ، ثُمَّ رَمَلَ ثَلاَثَةَ أَطْوَافٍ، وَكَانُوا إِذَا بَلَغُوا الرُّكْنَ الْيَمَانِيَ وَتَغَيَّبُوا مِنْ قُرَيْشٍ مَشَوْا، ثُمَّ يَطْلُعُونَ عَلَيْهِمْ يَرْمُلُونَ، تَقُولُ قُرَيْشٌ: كَأَنَّهُمُ الْغِزْلاَنُ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَكَانَتْ سُنَّةً.

واتە: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم شانی راستی دەرخستو دەستی هێنا بە بەردەكەداو (الله أكبر)ی كرد، لەپاشدا سێ جار بە لۆقە سوڕایەوە، یاران كاتێ كە دەگەیشتنە گۆشەی یەمانی و قورەیشیان لێوە دیار نەدەما بە رۆشتنی ئاسایی دەڕۆشتن، ئینجا كاتێ كە لێیانەوە دەردەكەوتن بە لۆقە دەسوڕانەوە، قورەیش وتیان: دەڵێی ئاسكن، ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: كەواتە ئەمەش سوننەتە.

١٨٩٠ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابَهُ اعْتَمَرُوا مِنَ الْجِعْرَانَةِ، فَرَمَلُوا بِالْبَيْتِ ثَلاَثًا، وَمَشَوْا أَرْبَعًا.

واتە: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و یارانی لە جیعرانەوە عومرەیان کرد سێ جار بە لۆقە تەوافی ماڵی خوایان کرد، چوار جاریش بە رۆشتنی ئاسایی.

١٨٩١ - (صحيح) عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رَمَلَ مِنَ الْحَجَرِ إِلَى الْحَجَرِ، وَذَكَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَلَ ذَلِكَ.

واتە: لە نافعەوە هاتووە، کە ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ لەبەردەکەوە بۆ بەردەکە بە لۆقە دەسوڕایەوە، باسی ئەوەشی کرد کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم کارەی کردوە.

## باسی پاڕانەوە لەکاتی تەوافدا.

## ٥٢ - باب الدُّعَاءِ فِي الطَّوَافِ.

١٨٩٢ - (حسن) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ مَا بَيْنَ الرُّكْنَيْنِ: (رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْأَخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ).

واتە: لە (عَبْد اللَّه)ی کوڕی سائیبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بیستوە لە نێوان دوو گۆشەکەدا دەیفەرموو: (رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْأَخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ). واتە: (خودایە! ئەی پەروەردگاری ئێمە لەدنیاو دوارۆژدا چاکەمان پێ ببەخشەو لەسزای دۆزەخ بمانپارێزە).

١٨٩٣ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا طَافَ فِي الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ أَوَّلَ مَا يَقْدَمُ، فَإِنَّهُ يَسْعَى ثَلاَثَةَ أَطْوَافٍ، وَيَمْشِي أَرْبَعًا، ثُمَّ يُصَلِّي سَجْدَتَيْنِ.

واتە: ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە دەگەیشتە مەککە یەکەم شت کە دەیکرد سێ جار بە لۆقە تەوافی ماڵی خوای دەکرد، چوار جاریش بە ڕۆیشتنی ئاسایی، لەپاشدا دوو ڕکات نوێژی تەوافی دەکرد).

## باسی تەوافی ماڵی خوا لەدوای عەسر.

## ٥٣ – باب الطَّوَافِ بَعْدَ الْعَصْرِ.

١٨٩٤ - (صحيح) عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ تَمْنَعُوا أَحَدًا يَطُوفُ بِهَذَا الْبَيْتِ وَيُصَلِّي أَيَّ سَاعَةٍ شَاءَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ). قَالَ الْفَضْلُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، لاَ تَمْنَعُوا أَحَدًا).

واتە: لە جوبەیری کوڕی (مُطعِم)ەوە هاتووە، فەرمودەکەی بەرزکردەوە هەتا گەیاندیەوە سەر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە فەرمویەتی: (ڕێگری لە هیچ کەسێك نەکەن، کە بەدەوری ئەم ماڵەدا بسوڕێتەوەو نوێژ بکات، هەرکاتێ کە ئارەزووی لێی بێ لە شەودا بێت یان لە ڕۆژدا). (فضل) وتی: ئەی کوڕانی عەبدومەناف ڕێگری لە هیچ کەسێك نەکەن، کە بەدەوری ئەم ماڵەدا بسوڕێتەوە.

# باسی تەوافی ئەو کەسەی کە حەج و عومرە پێکەوە دەکات.

## ٥٤ – باب طَوَافِ الْقَارِنِ.

١٨٩٥ - (صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: لَمْ يَطُفِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلاَ أَصْحَابُهُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ إِلاَّ طَوَافًا وَاحِدًا، طَوَافَهُ الأَوَّلَ.

واتە: جابری کوڕی (عبد الله) دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەخۆی و نە یارانی ئەوانەی کە ئیحرامی حەج و عومرەیان پێکەوە دابەستبو لە نێوان صەفاو مەروەدا یەك تەواف زیاتریان ئەنجام نەدا، واتە بۆ حەج و بۆ عومرەکەیان حەوت جار سوڕانەوە بەدەوری ماڵ خوادا و حەوت جاریش هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەیان ئەنجامدا. تەوافی یەکەمی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم.

١٨٩٦ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الَّذِينَ كَانُوا مَعَهُ لَمْ يَطُوفُوا حَتَّى رَمَوُا الْجَمْرَةَ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە یارانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوانەی لە حەجی ماڵاوایی دا لە خزمەتیدا بوون

تەوافی ماڵی خوایان نەکرد واتە: تەوافی (الإفاضة) هەتا شەیتانیان رەجم کـرد، بێگومان تەوافی (الإفاضة)ش لەسەر هەموو حاجیەکانە.

١٨٩٧ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَـالَ لَهَا: (طَوَافُكِ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَـرْوَةِ: يَكْفِيـكِ لِحَجَّتِكِ وَعُمْرَتِكِ).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليـه وسـلم پێـی فـەرمووە: (ئـەو حـەوت جـار سـوڕانەوەت بـەدەوری مـاڵی خوادا وە ئەو حەوت جار هاتوچۆیەی کە لە نێوان صـەفاو مـەروەدا ئەنجامتـدا بەستە بۆ حەج و بۆ عومرەکەت واتە: تەوافی (الإفاضة).

## باسی ئەو دیوارەی کە دەکەوێتە نێوان دەرگای کەعبەو بەردە رەشەکەوە.

## ٥٥ – باب الْمُلْتَزَمِ.

١٨٩٨ - (ضعيف) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ صَفْوَانَ قَالَ: لَمَّا فَتَحَ رَسُـولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَكَّةَ، قُلْتُ: لأَلْبَسَنَّ ثِيَـابِي - وَكَانَتْ دَارِي عَلَى الطَّرِيقِ - فَلأَنْظُرَنَّ كَيْفَ يَصْـنَعُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ، فَانْطَلَقْـتُ، فَرَأَيْـتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ خَرَجَ مِنَ الْكَعْبَةِ هُـوَ

وَأَصْحَابُهُ، وَقَدِ اسْتَلَمُوا الْبَيْتَ مِنَ الْبَابِ إِلَى الْحَطِيمِ، وَقَدْ وَضَعُوا خُدُودَهُمْ عَلَى الْبَيْتِ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَسْطَهُمْ.

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی صەفوانەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم شاری مەككەی رزگار كرد، لە دڵی خۆمدا وتم: پۆشاكەكەم لەبەردەكەم -ماڵەكەم لەسەر رێگەكەدا بوو - سەرنج دەدەم و سەیر دەكەم بزانم پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چ كارێ دەكات، دەرچووم، پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم بینی لە كەعبە دەرچوو لەگەڵ یارانی دەستیان هێنا بە دیواری ماڵی خوادا لە لەدەرگاكەیەوە هەتا بەردە رەشەكە(حَطِیم)، كوڵمیان دانابوو لەسەر دیواری ماڵی خوا لەكاتێكدا كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ناوەڕاستیاندا بوو.

١٨٩٩ - (ضعيف) عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: طُفْتُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ فَلَمَّا جِئْنَا دُبُرَ الْكَعْبَةِ، قُلْتُ: أَلاَ تَتَعَوَّذُ؟ قَالَ: نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ، ثُمَّ مَضَى حَتَّى اسْتَلَمَ الْحَجَرَ، وَأَقَامَ بَيْنَ الرُّكْنِ وَالْبَابِ، فَوَضَعَ صَدْرَهُ، وَوَجْهَهُ، وَذِرَاعَيْهِ، وَكَفَّيْهِ، هَكَذَا وَبَسَطَهُمَا بَسْطًا، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَفْعَلُهُ.

واتە: لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە، لە باوكیەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی:

لەگەڵ (عَبْدُ الله)ی كوڕی عەمردا تەواف ماڵی خوامان كرد، كاتێ كە هاتینە پشتی كەعبەوە ئەو رووەی كە لە دوای دەرگاكەوەیە وتم: ئایا پەنا نەگرین بە خوا؟ وتی: پەنا ئەگرین بە خوا لە ئاگری دۆزەخ، لەپاشدا رۆشت هەتا دەستی هێنا بە بەدە رەشەكەداو ماچی كرد، لە نێوان گۆشەی بەردەكەو دەرگاكەی ماڵی خوادا راوەستا، سنگ و دەم و چاو و هەردوو قۆڵی و هەردوو ناو لەپی دەستی نا بەدیوارەكەوە و بڵاوی كردنەوەو خۆی نوساند بە دیوارەكەوە، ئینجا وتی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم دی بەم شێوەیەی كرد.

١٩٠٠ - (ضعيف) عن مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ كَانَ يَقُودُ ابْنَ عَبَّاسٍ فَيُقِيمُهُ عِنْدَ الشُّقَّةِ الثَّالِثَةِ مِمَّا يَلِي الرُّكْنَ الَّذِي يَلِي الْحَجَرَ مِمَّا يَلِي الْبَابَ، فَيَقُولُ لَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ: أُنْبِئْتَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي هَا هُنَا؟ فَيَقُولُ: (نَعَمْ). فَيَقُومُ فَيُصَلِّي.

واتە: لە موحەممەدی كوڕی (عَبْدُ اللە)ی كوڕی سائیبەوە، لە باوكیەوە هاتووە، كاتێ كە ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ كوێر بوو بوو (عَبْدُ الله)ی كوڕی سائیب دەستی گرتوە و لەلای بەشی سێیەم رایگرتوە واتە لەلای ئەو دیوارەی كە دەكەوێتە نێوان دەرگای كەعبەو بەردە رەشەكەوە كە پێی دەوترێت (ملتزم)، ئیبنو عەباس بە (عَبْدُ اللە)ی كوڕی سائیبی وت: پێت راگەیەنراوە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئالێرەدا نوێژی كرد، وتی: بەڵێ، جا ئیبنو عەباس هەستا نوێژی كرد.

## باسی سەبارەت بە پلەو پایەی صەفاو مەروە.

## ٥٦ - باب أَمْرِ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ.

١٩٠١ - (صحيح) عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا يَوْمَئِذٍ حَدِيثُ السِّنِّ: أَرَأَيْتِ قَوْلَ اللَّهِ تَعَالَى: (إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ). فَمَا أَرَى عَلَى أَحَدٍ شَيْئًا أَنْ لاَ يَطَّوَّفَ بِهِمَا؟! قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: كَلاَّ لَوْ كَانَ كَمَا تَقُولُ كَانَتْ: فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ لاَ يَطَّوَّفَ بِهِمَا، إِنَّمَا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِي الأَنْصَارِ، كَانُوا يُهِلُّونَ لِمَنَاةَ، وَكَانَتْ مَنَاةُ حَذْوَ قُدَيْدٍ، وَكَانُوا يَتَحَرَّجُونَ أَنْ يَطُوفُوا بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَلَمَّا جَاءَ الإِسْلاَمُ سَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ).

واتە: لە هیشامی کوڕی عورووەوە، لە باوکیەوە، هاتووە کە وتویەتی: سەرەتای تەمەنم بوو بە عائیشەی خێزانی پێغەمبەرم صلی الله علیە وسلم وت: سەبارەت بەم ئایەتەی خوای گەورە هەواڵم بدەرێ: (إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن

شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا). (البقره:١٥٨) . واته: بەڕاستی صەفاو مەروە له دروشمەكانی (دینی) خوان، جا هەركەسێ حەجی ماڵی خوای كرد یان عومرەی كرد هیچ تاوانی ناگات تەوافی ئەو دوانەش بكات. وا ئەزانم هەركەسێ لەكاتی حەج و عومرەدا هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە ئەنجام نەدات گوناهی ناگات و حەج و عومرەكەشی تەواوە، عائیشه رەزای خوای لێ بێ وتی: نەخێر ئەگەر وەك ئەوە بوایه كه تۆ لێی تێگەیشتویت و دەیڵێی ئەوە بەم شێوەیه دەبوو: هەركەسێ لەكاتی حەج و عومرەدا هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە ئەنجام نەدات ئەوە گوناهی ناگات، بێگومان ئەم ئایەتە لەسەر ئەنصار هاتەخوارەوە، لەسەردەمی نەفامی دا ئەنصارەكان ئیحرامیان بۆ بتێ دادەبەست كه ناوی مەنات بوو بەرامبەر به قەدید، ئەنصارەكان لەسەردەمی نەفامی دا هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەیان به تاوان دەزانی، كاتێ كه ئیسلام هات لەوبارەوە له پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم پرسی، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ). واته: بەڕاستی صەفاو مەروە له دروشمەكانی (دینی) خوان.

١٩٠٢ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اعْتَمَرَ فَطَافَ بِالْبَيْتِ، وَصَلَّى خَلْفَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، وَمَعَهُ مَنْ يَسْتُرُهُ مِنَ النَّاسِ، فَقِيلَ لِعَبْدِ اللَّهِ: أَدَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْكَعْبَةَ؟ قَالَ: لاَ.

واته: له (عَبْدُ الله)ی كوڕی ئەبی ئەوفاوه هاتووه، كه پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئیحرامی دابەست بۆ عومره تەوافی ماڵی خوای كرد، له پشت

مەقامــەوە دوو رکـات نویـژی کـرد، کۆمــەڵێکی زۆر لـە یـارانی لەگـەڵ بـوو دەیانپاراست لە فەرەبالّغی خەڵکەکەو لـەبێ بـاوەڕانی قـورەیش، بـە(عَبْدُ اللّه) وترا: ئایا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رۆشـتـە ژورەوە بـۆ نـاو کەعبـە، وتی: نەخێر – چونکە لەو کاتەدا بتی تێدا بوو - .

١٩٠٣ - (صحيح دون: (حلَقَ)) عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْـنِ أَبِـى خَالِـدٍ قَـالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِى أَوْفَى بِهَذَا الْحَـدِيثِ زَادَ ثُـمَّ أَتَى الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ فَسَعَى بَيْنَهُمَـا سَـبْعًا، ثُـمَّ حَلَـقَ رَأْسَهُ.

واتە: ئیسماعیلی کوڕی ئـەبی خالیـد دەڵێـت: لـە (عَبْدُ اللّه)ی کـوڕی ئـەبی ئەوفاوە ئەم فەرمودەم بیستووە، بەلاّم ئەمەی بـۆ زیـاد کـرد: لەپاشـدا هـات بـۆ صەفاو مەروە حەوت جار لە نێوانیاندا هاتوچۆی کرد. ئینجا سەری تاشی.

١٩٠٤ - (صحيح) عَنْ كَثِيرِ بْنِ جُمْهَانَ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِعَبْدِ اللَّـهِ بْـنِ عُمَرَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ: يَا أَبَـا عَبْـدِ الـرَّحْمَنِ إِنِّـى أَرَاكَ تَمْشِي وَالنَّاسُ يَسْعَوْنَ، قَالَ: إِنْ أَمْشِ فَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْشِي، وَإِنْ أَسْعَ فَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ يَسْـعَى، وَأَنَـا شَيْخٌ كَبِيرٌ.

واتـە: لـە (كَـثِیر)ی كوڕی جوهمانـەوە هـاتووە، كـە پیـاوێ لـە نێـوان صـەفاو مەروەدا لە (عَبْدُ الله)ی كوڕی عومەری پرسی: ئەی بـاوكی (عَبْـدُ الـرَّحْمَن)مـن دەبینم تۆ لە هەندێ شوێندا بە رۆشتنی ئاسایی دەڕۆی لەكاتێكدا كە خەڵك بە پەلە دەڕۆن، وتـی: ئەگـەر لـە هەنـدێ شـوێندا بـە رۆشـتنی ئاسـایی بـڕۆم ئـەوە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم دیـوە بـە رۆشـتنی ئاسـایی رۆشـتوە، خـۆ ئەگەر لە هەنـدێ شوێنیشـدا بـە پەلـە بـڕۆم ئـەوە بێگومـان پێغەمبـەری خـوام صلی الله علیه وسلم دیوە بەو شێوەیە رۆشتوە، ئەوكاتە من شێخێكی بە تەمەن بووم.

## باسی چۆنیەتی حەجەكەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

## ٥٧ - باب صِفَةِ حَجَّةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

١٩٠٥ - (صحيح) عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، فَلَمَّا انْتَهَيْنَا إِلَيْهِ سَأَلَ عَنِ الْقَوْمِ، حَتَّى انْتَهَى إِلَيَّ، فَقُلْتُ: أَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، فَأَهْوَى بِيَدِهِ إِلَى رَأْسِي فَنَزَعَ زِرِّي الأَعْلَى، ثُمَّ نَزَعَ زِرِّي الأَسْفَلَ، ثُمَّ وَضَعَ كَفَّهُ بَيْنَ ثَدْيَيَّ وَأَنَا يَوْمَئِذٍ غُلاَمٌ شَابٌّ، فَقَالَ: مَرْحَبًا بِكَ وَأَهْلاً يَا ابْنَ أَخِي، سَلْ

عَمَّا شِئْتَ، فَسَأَلْتُهُ وَهُوَ أَعْمَى، وَجَاءَ وَقْتُ الصَّلاَةِ فَقَامَ فِي نِسَاجَةٍ مُلْتَحِفًا بِهَا - يَعْنِي ثَوْبًا مُلَفَّقًا - كُلَّمَا وَضَعَهَا عَلَى مَنْكِبِهِ رَجَعَ طَرَفَاهَا إِلَيْهِ مِنْ صِغَرِهَا، فَصَلَّى بِنَا وَرِدَاؤُهُ إِلَى جَنْبِهِ عَلَى الْمِشْجَبِ، فَقُلْتُ: أَخْبِرْنِي عَنْ حَجَّةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ بِيَدِهِ فَعَقَدَ تِسْعًا، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَكَثَ تِسْعَ سِنِينَ لَمْ يَحُجَّ، ثُمَّ أُذِّنَ فِي النَّاسِ فِي الْعَاشِرَةِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَاجٌّ، فَقَدِمَ الْمَدِينَةَ بَشَرٌ كَثِيرٌ كُلُّهُمْ يَلْتَمِسُ أَنْ يَأْتَمَّ بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَيَعْمَلَ بِمِثْلِ عَمَلِهِ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَخَرَجْنَا مَعَهُ، حَتَّى أَتَيْنَا ذَا الْحُلَيْفَةِ، فَوَلَدَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ مُحَمَّدَ بْنَ أَبِي بَكْرٍ، فَأَرْسَلَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَيْفَ أَصْنَعُ؟ قَالَ: (اغْتَسِلِي وَاسْتَذْفِرِي بِثَوْبٍ وَأَحْرِمِي). فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَسْجِدِ، ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ حَتَّى إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ نَاقَتُهُ عَلَى الْبَيْدَاءِ، قَالَ جَابِرٌ: نَظَرْتُ إِلَى مَدِّ بَصَرِي: مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ مِنْ رَاكِبٍ

وَمَاشٍ، وَعَنْ يَمِينِهِ مِثْلَ ذَلِكَ، وَعَنْ يَسَارِهِ مِثْلَ ذَلِكَ، وَمِنْ خَلْفِهِ مِثْلَ ذَلِكَ، وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ أَظْهُرِنَا، وَعَلَيْهِ يَنْزِلُ الْقُرآنُ، وَهُوَ يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ، فَمَا عَمِلَ بِهِ مِنْ شَيْءٍ عَمِلْنَا بِهِ، فَأَهَلَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالتَّوْحِيدِ: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ). وَأَهَلَّ النَّاسُ بِهَذَا الَّذِى يُهِلُّونَ بِهِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْئًا مِنْهُ، وَلَزِمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَلْبِيَتَهُ. قَالَ جَابِرٌ لَسْنَا نَنْوِى إِلاَّ الْحَجَّ، لَسْنَا نَعْرِفُ الْعُمْرَةَ حَتَّى إِذَا أَتَيْنَا الْبَيْتَ مَعَهُ اسْتَلَمَ الرُّكْنَ فَرَمَلَ ثَلاَثًا وَمَشَى أَرْبَعًا، ثُمَّ تَقَدَّمَ إِلَى مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ فَقَرَأَ: (وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى). فَجَعَلَ الْمَقَامَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ، قَالَ: فَكَانَ أَبِى يَقُولُ: - قَالَ ابْنُ نُفَيْلٍ وَعُثْمَانُ، وَلاَ أَعْلَمُهُ ذَكَرَهُ إِلاَّ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ سُلَيْمَانُ: وَلاَ أَعْلَمُهُ إِلاَّ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - يَقْرَأُ فِى الرَّكْعَتَيْنِ بِ (قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ). وَبِ (قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ). ثُمَّ

رَجَعَ إِلَى الْبَيْتِ فَاسْتَلَمَ الرُّكْنَ، ثُمَّ خَرَجَ مِنَ الْبَابِ إِلَى الصَّفَا، فَلَمَّا دَنَا مِنَ الصَّفَا قَرَأَ: (إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ). (نَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللَّهُ بِهِ). فَبَدَأَ بِالصَّفَا فَرَقِيَ عَلَيْهِ حَتَّى رَأَى الْبَيْتَ فَكَبَّرَ اللَّهَ وَوَحَّدَهُ وَقَالَ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ). ثُمَّ دَعَا بَيْنَ ذَلِكَ، وَقَالَ: مِثْلَ هَذَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ نَزَلَ إِلَى الْمَرْوَةِ، حَتَّى إِذَا انْصَبَّتْ قَدَمَاهُ رَمَلَ فِي بَطْنِ الْوَادِي، حَتَّى إِذَا صَعِدَ مَشَى حَتَّى أَتَى الْمَرْوَةَ، فَصَنَعَ عَلَى الْمَرْوَةِ مِثْلَ مَا صَنَعَ عَلَى الصَّفَا، حَتَّى إِذَا كَانَ آخِرُ الطَّوَافِ عَلَى الْمَرْوَةِ قَالَ: (إِنِّي لَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ لَمْ أَسُقِ الْهَدْيَ، وَلَجَعَلْتُهَا عُمْرَةً، فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ لَيْسَ مَعَهُ هَدْيٌ فَلْيَحْلِلْ وَلْيَجْعَلْهَا عُمْرَةً). فَحَلَّ النَّاسُ كُلُّهُمْ وَقَصَّرُوا، إِلاَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْيٌ، فَقَامَ سُرَاقَةُ بْنُ جُعْشُمٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلِعَامِنَا هَذَا أَمْ لِلأَبَدِ؟ فَشَبَّكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَصَابِعَهُ فِى الأُخْرَى، ثُمَّ قَالَ: (دَخَلَتِ الْعُمْرَةُ فِى الْحَجِّ). هَكَذَا مَرَّتَيْنِ: (لاَ بَلْ لأَبَدِ أَبَدٍ لاَ بَلْ لأَبَدِ أَبَدٍ). قَالَ: وَقَدِمَ عَلِىٌّ رَضِىَ اللهُ عَنْهُ مِنَ الْيَمَنِ بِبُدْنِ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَوَجَدَ فَاطِمَةَ رَضِىَ اللهُ عَنْها مِمَّنْ حَلَّ وَلَبِسَتْ ثِيَابًا صَبِيغًا وَاكْتَحَلَتْ، فَأَنْكَرَ عَلِىٌّ ذَلِكَ عَلَيْهَا، وَقَالَ: مَنْ أَمَرَكِ بِهَذَا؟ فَقَالَتْ: أَبِى، قَالَ: وَكَانَ عَلِىٌّ يَقُولُ بِالْعِرَاقِ: ذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُحَرِّشًا عَلَى فَاطِمَةَ فِى الأَمْرِ الَّذِى صَنَعَتْهُ، مُسْتَفْتِيًا لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى الَّذِى ذَكَرَتْ عَنْهُ، فَأَخْبَرْتُهُ أَنِّى أَنْكَرْتُ ذَلِكَ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: إِنَّ أَبِى أَمَرَنِى بِهَذَا، فَقَالَ: (صَدَقَتْ صَدَقَتْ، مَاذَا قُلْتَ حِينَ فَرَضْتَ الْحَجَّ؟). قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُمَّ إِنِّى أُهِلُّ بِمَا أَهَلَّ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: (فَإِنَّ مَعِىَ الْهَدْىَ فَلاَ تَحْلِلْ). قَالَ: وَكَانَ جَمَاعَةُ الْهَدْىِ الَّذِى قَدِمَ بِهِ عَلِىٌّ مِنَ الْيَمَنِ وَالَّذِى أَتَى بِهِ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الْمَدِينَةِ مِائَةً. فَحَلَّ النَّاسُ كُلُّهُمْ وَقَصَّرُوا، إِلاَّ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَنْ كَانَ

مَعَهُ هَدْيٌ. قَالَ: فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ وَوَجَّهُوا إِلَى مِنًى أَهَلُّوا بِالْحَجِّ، فَرَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَلَّى بِمِنًى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ وَالصُّبْحَ، ثُمَّ مَكَثَ قَلِيلاً حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ، وَأَمَرَ بِقُبَّةٍ لَهُ مِنْ شَعَرٍ فَضُرِبَتْ بِنَمِرَةَ، فَسَارَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلاَ تَشُكُّ قُرَيْشٌ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاقِفٌ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ بِالْمُزْدَلِفَةِ كَمَا كَانَتْ قُرَيْشٌ تَصْنَعُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَأَجَازَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى أَتَى عَرَفَةَ فَوَجَدَ الْقُبَّةَ قَدْ ضُرِبَتْ لَهُ بِنَمِرَةَ فَنَزَلَ بِهَا، حَتَّى إِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ أَمَرَ بِالْقَصْوَاءِ فَرُحِلَتْ لَهُ، فَرَكِبَ حَتَّى أَتَى بَطْنَ الْوَادِي فَخَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: (إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، أَلاَ إِنَّ كُلَّ شَيْءٍ مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ تَحْتَ قَدَمَيَّ مَوْضُوعٌ، وَدِمَاءُ الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعَةٌ، وَأَوَّلُ دَمٍ أَضَعُهُ دِمَاؤُنَا: دَمُ - قَالَ عُثْمَانُ: دَمُ ابْنِ رَبِيعَةَ. وَقَالَ سُلَيْمَانُ: دَمُ رَبِيعَةَ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ. ﴿وَقَالَ بَعْضُ هَؤُلاَءِ﴾: كَانَ مُسْتَرْضَعًا

فِي بَنِي سَعْدٍ، فَقَتَلَتْهُ هُذَيْلٌ - ، وَرِبَا الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ، وَأَوَّلُ رِبًا أَضَعُهُ رِبَانَا: رِبَا عَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَإِنَّهُ مَوْضُوعٌ كُلُّهُ، اتَّقُوا اللَّهَ فِي النِّسَاءِ، فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانَةِ اللَّهِ وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللَّهِ، وَإِنَّ لَكُمْ عَلَيْهِنَّ أَنْ لاَ يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ أَحَدًا تَكْرَهُونَهُ، فَإِنْ فَعَلْنَ فَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ، وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ، وَإِنِّي قَدْ تَرَكْتُ فِيكُمْ مَا لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ إِنِ اعْتَصَمْتُمْ بِهِ: كِتَابَ اللَّهِ، وَأَنْتُمْ مَسْئُولُونَ عَنِّي، فَمَا أَنْتُمْ قَائِلُونَ). قَالُوا: نَشْهَدُ أَنَّكَ قَدْ بَلَّغْتَ وَأَدَّيْتَ وَنَصَحْتَ، ثُمَّ قَالَ: بِأُصْبُعِهِ السَّبَّابَةِ يَرْفَعُهَا إِلَى السَّمَاءِ وَيَنْكُبُهَا إِلَى النَّاسِ: (اللَّهُمَّ اشْهَدِ، اللَّهُمَّ اشْهَدِ، اللَّهُمَّ اشْهَدْ). ثُمَّ أَذَّنَ بِلاَلٌ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الْعَصْرَ وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَيْئًا، ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ حَتَّى أَتَى الْمَوْقِفَ فَجَعَلَ بَطْنَ نَاقَتِهِ الْقَصْوَاءَ إِلَى الصَّخَرَاتِ، وَجَعَلَ حَبْلَ الْمُشَاةِ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفًا حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ وَذَهَبَتِ الصُّفْرَةُ قَلِيلاً حِينَ غَابَ الْقُرْصُ، وَأَرْدَفَ أُسَامَةَ خَلْفَهُ،

فَدَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَدْ شَنَقَ لِلْقَصْوَاءِ الزِّمَامَ حَتَّى إِنَّ رَأْسَهَا لَيُصِيبُ مَوْرِكَ رَحْلِهِ، وَهُوَ يَقُولُ بِيَدِهِ الْيُمْنَى: (السَّكِينَةَ أَيُّهَا النَّاسُ، السَّكِينَةَ أَيُّهَا النَّاسُ). كُلَّمَا أَتَى حَبْلاً مِنَ الْحِبَالِ أَرْخَى لَهَا قَلِيلاً حَتَّى تَصْعَدَ، حَتَّى أَتَى الْمُزْدَلِفَةَ فَجَمَعَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِأَذَانٍ وَاحِدٍ وَإِقَامَتَيْنِ.

- قَالَ عُثْمَانُ: وَلَمْ يُسَبِّحْ بَيْنَهُمَا شَيْئًا، ثُمَّ اتَّفَقُوا - ثُمَّ اضْطَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ، فَصَلَّى الْفَجْرَ حِينَ تَبَيَّنَ لَهُ الصُّبْحُ. - قَالَ سُلَيْمَانُ: بِنِدَاءٍ وَإِقَامَةٍ، ثُمَّ اتَّفَقُوا - ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ حَتَّى أَتَى الْمَشْعَرَ الْحَرَامَ فَرَقِيَ عَلَيْهِ، قَالَ عُثْمَانُ وَسُلَيْمَانُ: فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَكَبَّرَهُ وَهَلَّلَهُ، - زَادَ عُثْمَانُ: وَوَحَّدَهُ - فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفًا حَتَّى أَسْفَرَ جِدًّا، ثُمَّ دَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَأَرْدَفَ الْفَضْلَ بْنَ عَبَّاسٍ، وَكَانَ رَجُلاً حَسَنَ الشَّعْرِ أَبْيَضَ وَسِيمًا، فَلَمَّا دَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ الظُّعُنُ يَجْرِينَ، فَطَفِقَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهِنَّ، فَوَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَهُ

عَلَى وَجْهِ الْفَضْلِ وَصَرَفَ الْفَضْلُ وَجْهَهُ إِلَى الشِّقِّ الآخَرِ، وَحَوَّلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَهُ إِلَى الشِّقِّ الآخَرِ، وَصَرَفَ الْفَضْلُ وَجْهَهُ إِلَى الشِّقِّ الآخَرِ، يَنْظُرُ حَتَّى أَتَى مُحَسِّرًا فَحَرَّكَ قَلِيلاً، ثُمَّ سَلَكَ الطَّرِيقَ الْوُسْطَى الَّذِي يُخْرِجُكَ إِلَى الْجَمْرَةِ الْكُبْرَى، حَتَّى أَتَى الْجَمْرَةَ الَّتِي عِنْدَ الشَّجَرَةِ، فَرَمَاهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ مِنْهَا بِمِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ، فَرَمَى مِنْ بَطْنِ الْوَادِي، ثُمَّ انْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْمَنْحَرِ، فَنَحَرَ بِيَدِهِ ثَلاَثًا وَسِتِّينَ وَأَمَرَ عَلِيًّا فَنَحَرَ مَا غَبَرَ - يَقُولُ مَا بَقِيَ - وَأَشْرَكَهُ فِي هَدْيِهِ، ثُمَّ أَمَرَ مِنْ كُلِّ بَدَنَةٍ بِبَضْعَةٍ، فَجُعِلَتْ فِي قِدْرٍ فَطُبِخَتْ فَأَكَلاَ مِنْ لَحْمِهَا وَشَرِبَا مِنْ مَرَقِهَا. قَالَ سُلَيْمَانُ: ثُمَّ رَكِبَ ثُمَّ أَفَاضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْبَيْتِ فَصَلَّى بِمَكَّةَ الظُّهْرَ، ثُمَّ أَتَى بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ وَهُمْ يَسْقُونَ عَلَى زَمْزَمَ فَقَالَ: (انْزِعُوا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَلَوْلاَ أَنْ يَغْلِبَكُمُ النَّاسُ عَلَى سِقَايَتِكُمْ لَنَزَعْتُ مَعَكُمْ). فَنَاوَلُوهُ دَلْوًا فَشَرِبَ مِنْهُ.

واتە: لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: چوین بۆلای جابری کوڕی (عَبْدُ اللّه) کوێر بوو بوو یەکە یەکە دەیپرسی ئەمە کێیەو ئەوە کێیە هەتا هاتە سەر من، وتم: من موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینم دەستی هێنا بەسەرما دەستی هێنایە خوارەوە بۆ سنگ و بەرۆکم و دوگمەی سەرەوەی ترازاند، لەپاشدا دوگمەی خوارەوەشی ترازاند، ئینجا لەپی هێنا بە سنگمدا من لەو کاتەدا کوڕێکی لاو بووم وتی: مەرحەبات لێ بێ و بەخێر هاتی ئەی برازای خۆشەویستم، چ پرسیارێکت هەیە بیکە، لەو کاتەدا کە پرسیارم لێ کرد ئەو کوێر بوو، کاتی نوێژ هات هەستا بەرنوێژی بۆ کردین پۆشاکێکی ڕێستراوی پێچا بوو بە خۆیەوە کە دەیدا بەسەر شانیا چمکەکانی دەگەڕایەوە بۆلای خۆی لەبەر بچوکی، (ریداء)ەکەشی لەتەنیشتیەوە بەسەر سێ پایەکەوە بوو، وتم: باسی چۆنیەتی حەجەکەی پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بۆ بکە، نۆ پەنجەی خۆی ژمارد، لەپاشدا وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نۆ ساڵ لە مەدینە مایەوە بەبێ ئەوەی حەج بکات، لە ساڵی دەیەمدا جاڕی دا بەناو خەڵکا: کە ئەم ساڵ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نیازی حەجکردنی هەیەو دەچێ بۆ حەج، دوا بەدوای بانگەوازەکە خەڵکێکی زۆر گەیشتنە شاری مەدینە خەڵکەکە بەدوای یەکدا دەهاتن بۆ ئەوەی لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بڕۆن بۆ حەج و هەموویان چاو لەو بکەن و ئەو کاروکردەوانە ئەنجام بدەن کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەنجامی دەدات، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە مەدینە دەرچوو بەرەو شاری مەککە، ئێمەش لە خزمەتیدا دەرچووین لە شار، هەتا گەیشتینە(ذي الحُلَيفَة)، لەو شوێنەدا ئەسمائی کچی عومەیس موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری بوو، جا کچی عومەیس هەواڵی نارد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: کە ئەوە حاڵەکەمە چی بکەم بۆ ئەنجامدانی حەجەکەم؟ فەرمووی: (خۆت بشۆ و خۆت توند بە پارچەیە ببەستەو ئیحرامەکە دابەستە). پێغەمبەری خوا صلی الله

عليه وسلم لە مزگەوت نوێژی كرد، لەپاشدا هەستا سواری وشترەكەی بوو كە ناوی (قصواء) بوو، رۆیشت هەتا سەركەوتە سەر كێوی (بیداء)، جابر وتی: تاكو چاوەكانم بڕیان دەكرد بە هەر چوار لادا تەماشام كرد هەر سوارە بوو هەر پیادە بوو بەدەوری پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەناوماندا بوو قورئانی بۆ دەهاتەخوارەوە، تەفسیرەكەشی دەزانی، هیچ كارێكی ئەنجام نەدەدا ئیللا ئێمەش بەدوایدا ئەنجاممان دەدا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەلبیەی كرد بە یەكتاپەرستی: (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ). خەڵكەكەش بە دەنگی بەرز هەمان تەلبیەیان دووبارە دەكردەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هیچ رەدی نەدانەوە، بەڵام خۆی هەر لەسەر تەلبیە كردنەكەی بەردەوام بوو. جابر وتی: تەلبیەمان بە هیچ نەدەكرد جگە بە حەج نەبێ، تاكو ئەو كاتە عومرە كردنمان نەدەزانی، هەتا لە خزمەتیدا گەیشتینە ماڵی خوا دەستی هێنا بە گۆشەی بەردە رەشەكەدا دەستی كرد بە تەواف كردن سێ جار بە پەلە سوڕایەوە بەدەوری ماڵی خوادا چوار جارەكەی تریش بە رۆشتنی ئاسایی و لەسەرخۆ، لەپاشدا رۆشت بۆلای مەقامی ئیبراهیم ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى). مەقامی خستە نێوان خۆی و ماڵی خواوە، دوو ركات سونەتی تەواف كرد، لەدوای خوێندنی سورەتی فاتیحە لە ركاتی یەكەمدا سورەتی: (قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ)ی خوێند، وە لە ركاتی دووەمدا سورەتی: (قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ)ی خوێند، لەپاشدا گەڕایەوە بۆ ماڵی خوا دەستی هێنا بە گۆشەی بەردە رەشەكەدا، ئینجا لەدەرگاكەوە دەرچوو رۆشت بۆ كێوی صەفا، كاتێ كە لە صەفا نزیك بویەوە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ). فەرمووی: (دەست پێ دەكەم بەوەی كە خوای گەورە دەستی پێ

کردوە). بەو شێوەیە لە صەفاوە دەستی پێ کرد و رۆشتە سەر کێوی صەفا هەتا ماڵی خوای لێوە دەرکەوت رووی کردە ماڵی خواو سێ جار (الله أكبر)ی کردو یەکتاپەرستی راگەیاندو فەرمووی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ). لەپاشدا لە نێوان ئەو زیکرانەدا دەپاڕایەوەو نزای دەکرد، لەپاشدا بەڕێ کردن دابەزی بەرەو کێوی مەروە، کە پێی نایە ناو شیوەکەوە خێرا رۆیی تاکو گەیشتە هەورازەکە ئینجا بە ئاسایی رۆیشت هەتا گەیشتە سەر کێوی مەروە، چووە سەر کێوی مەروە هەتا ماڵی خوای لێوە دەرکەوت رووی کردە ماڵی خوا هەمان کاری ئەنجامدا کە پێشتر لەسەر کێوی صەفا ئەنجامی دابوو، هەتا گەیشتە دوایین هاتوچۆ لەسەر مەروە فەرمووی: (ئەوەی ئێستا دەیزانم ئەگەر پێشتر بمزانیایە ئاژەڵی دیاری ماڵی خوام نەدەهێناو حەجەکەم دەکرد بە عومرە، ئەوەتان کە ئاژەڵی دیاری لەگەڵ خۆی نەهێناوە با ئیحرام بشکێنێ و بیکات بە عومرە). جا هەموو خەڵکەکە ئیحرامیان شکاند و پرچیان کورت کردەوە جگە لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و ئەوانەی کە ئاژەڵی دیاری ماڵی خوایان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشوم هەستا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەم ئیحرام شکاندنە بۆ ئەم ساڵە یان بۆ هەتا هەتایە؟ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پەنجەکانی دەستی یەك بە یەك کرد بەناو یەکداو دوو جار فەرمووی: (عومرە لەگەڵ حەجدا تێکەڵ بوو هەتا رۆژی دوایی، نەخێر بۆ هەتا هەتایە، نەخێر بۆ هەتا هەتایە). جابر وتی: پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ کە کاری کۆکردنەوەی زەکاتی پێ سپێردرابو لە یەمەنەوە هات، وشترە قوربانیەکانی پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم لەگەڵ خۆی هێنابوو، بینی (فاطمة) رەزای خوای لێ بێ یەکێکە لەوانەی کە ئیحرامی شکاندوە، پۆشاکێکی رەنگ کراوی لەبەر کردوە، چاوەکانی رەشت بوو، پێشەوا

عەلی رەزای خوای لێ بێ ئینكاری ئەو كارەی كردو وتی: ئەوە كێ فەرمانی پێ كردوی بەوە، وتی: باوكم فەرمانی پێ كردوم بەوە. پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ كاتێ كە لە عێراق بوو ئەو باسەی گێڕایەوە وتی: كە ئەوەم بینی رۆشتمە لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆ ئەوەی هانی بدەم لە (فاطمة) لەبەرئەوەی كە كردبوی، لەگەڵ پرسیاركردن لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەبارەت بەو قسەیەش كە لێیەوە دەیگێڕایەوە دەیوت باوكم فەرمانی پێ كردوم بەوە، ئەوەشم پێ راگەیاند كە ئینكاری ئەو شتەم كردوە لەسەری، ئەویش وتی: بێگومان باوكم فەرمانی پێ كردوم بەوە. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (راست دەكات، راست دەكات، ئەی تۆ چیت وت كە ئیحرامی حەجت دابەست؟). پێشەوا عەلی وتی: وتم: من ئیحرامی حەج دادەبەستم، وەك چۆن پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئیحرامی حەجی دادەبەستوە، فەرمووی: (من ئاژەڵی دیاری ماڵی خوام پێیە تۆش ئیحرام مەشكێنە وەك خۆت بمێنەوە). كۆی هەموو ئاژەڵە دیاریەكانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كە پێشەوا عەلی لە یەمەنەوە هێنابووی، لەگەڵ ئەوانەی كە خۆی لە مەدینەوە هێنابوونی سەد وشتر دەبوون، خەڵكەكە هەموو ئیحرامیان شكاندو پرچیان كورت كردەوە، جگە لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و ئەوانەی كە ئاژەڵی دیاری ماڵی خوایان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو. وتی: لە رۆژی (تروية)دا كە دەكاتە رۆژی هەشتەمی مانگی (ذي الحجة) رۆشتن بەرەو مینا لەوێدا تەلبیەی حەجیان كردو ئەوانەی كە حەجەكەیان كردبو بە عومرە ئیحرامی حەجیان دابەست، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سواری وشترەكەی بوو لە مینا نوێژی نیوەڕۆ و عەسرو شێوان و خەوتنان و بەیانی كرد، لەپاشدا كەمێك مایەوە هەتا خۆر هەڵهات، فەرمانی كرد كە چادرێكی بۆ هەڵبدرێت كە لە تووك دروستكرابو، ئەوانیش لە نەمیرە بۆیان هەڵدا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كەوتە رێ

قورەیشیەکانیش گومانیان لەوە نەبوو کە لە جێگاو مەنزلگەی (مَشعَر الحَرَام) دەبێت، هەروەك چۆن قورەیش لەسەردەمی نەفامی دا لەوێ دەوەستان، کەچی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەو شوێنەی بەجێهێشت هەتا گەیشتە عەرەفە بینی چادرەکەی لە نەمیرە هەڵدراوە ئەویش رۆشتە ناوی، هەتا خۆر ئاوا بوو فەرمانی کرد وشترەکەی کە ناوی (قصواء) بوو بۆی ئامادە بکرێت، بۆی ئامادەکراو سواری بوو هەتا گەیشتە ناوەڕاستی شیوی (عُرنة) لەوێ وتاری بۆ خەڵکەکە خوێندەوە، فەرمووی: (خوێن و سەرو ماڵ و ناموستان لەیەکتری حەرام و قەدەغەیە، وەك حەرامێتی ئەم رۆژەتان، لەم مەنگەتان، لەم وڵاتەتاندا، ئاگاداربن کە هەموو کاروباری سەردەمی نەفامی لەژێر ئەم دوو پێیەمدان و بێ بایەخ و بەتاڵن، وە ئەو خوێنانەش کە رژاون بێ بایەخ و بەتاڵن و نابێت تۆڵەیان بکرێتەوە، وە یەکەم خوێنی کەسوکاری خۆم کە بە بێ بایەخ و بەتاڵی دادەنێم، کوڕەکەی رەبیعەیەی کوڕی (حَارِث)ی کوڕی (عَبْد المُطّلِب)ە — هەندێ لە راویەکان دەڵێن: کوڕەکەی رەبیعە شیرەخۆر بوو درابوو بە دایەن بە هۆزی بنی سەعد، هۆزی (هذیل) کوشتیان - ، وە یەکەم سوود(ربا)یش لە سوودی کەسوکاری خۆم کە بێ بایەخە و بەتاڵی دەکەمەوە، سوودەکەی عەباسی کوڕی (عَبْد المُطّلِب)ە، ئەو سوودە هەمووی بێ بایەخ و بەتاڵە، سەبارەت بە ئافرەتانیش لە خوا بترسن و ستەمیان لێ مەکەن و رەفتارتان جوان بێ لەگەڵیان چونکە ئەمانەت و سپاردەی خوای گەورەن لەلای ئێوەی پیاوان، لەسەر فەرمودەی خوای گەورە سەرجێی ئەوانتان بۆ حەڵاڵ کراوە، مافی ئەوەتان لەسەریانە کە رێ نەدەن بە هیچ کەسێ کە ئێوە رقتان لێیانە بێنە ماڵەکانتان، ئەگەر ئەو کارەیان کرد ئەوە لێیان بدەن بە لێدانێکی سوك لێیان بدەن و برینداریان مەکەن، مافی ئەوانیش لەسەر ئێوە ئەوەیە کە بژێوی رۆژانەیان بۆ دابین بکەن و پۆشاکیان بۆ بکەن بە پێی عورف و عادەت، منیش یاساو رێسایەکی وەهام لەپاش خۆم بۆ بەجێهێشتون ئەگەر پەیڕەوی

بکەن و دەستی پێوە بگرن هەرگیز گومڕاو سەرگەردان نابن ئەویش قورئانەکەی خوای گەورەیە، ئێوە لە دوارۆژدا سەبارەت بە من پرسیارتان لێ دەکرێت، ئێوە چی دەڵێن؟). وتیان: گەواهی ئەوە دەدەین کە تۆ پەیامەکەی پەروەردگاری خۆتت گەیاندوە، ئەرکی سەرشانی خۆتت بەجێ هێناوەو ئامۆژگاری خێری خۆتت بە ئومەتەکەت راگەیاندوە، ئەویش پەنجەی شایەتومانی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و دایگرت بەرەو خەڵکەکە و دەیفەرموو: (خودایە تۆ شاهید بە لەسەر ئەو وتەیەمان، خودایە تۆ شاهید بە لەسەر ئەو وتەیەمان، خودایە تۆ شاهید بە لەسەر ئەو وتەیەمان). لەپاشدا بیلال بانگی دا، ئینجا قامەتی کردو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی نیوەڕۆی پێ کردن، لەپاشدا بیلال قامەتی کردەوەو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی عەسری پێ کردین وە هیچ نوێژێکی لەنێوانیاندا ئەنجام نەدا، لەپاشدا سواری وشترەکەی بوو کە ناوی (قصواء) بوو هەتا گەشتە عەرەفە جا رووی وشترەکەی کردە تاوێرە بەردەکانی کێوی رەحمە کە لەناوەڕاستی خاکی عەرەفاتدایە، کۆمەڵێ حاجیە پیادەکانیش لە بەردەستیدا بوون، جا رووشی کردبوە قیبلە، ئیتر لەوێدا بە پێوە راوەستا هەتا خۆر ئاوا بوو، زەردە پەڕی و بازنەی خۆر دیار نەما، ئینجا ئوسامەی خستە پشکۆی خۆیەوە، لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە ئارامی و لەسەرخۆ لە کێوی رەحمە دابەزی رەشمەی وشترەکەی ئەوەندە توند کردبوو سەری دەیدا لە شوێنی جێگە پێکانی ئەو شوێنەی کە سوار قاچی دەخاتە سەر لەسەر پشتی وڵاخ بۆ حەوانەوە لەبەرئەوەی لەو قەڵەباڵغیەدا سەری وشترەکە بەر خەڵك نەکەوێ و ئازاریان بدات، بە دەستی راستی ئاماژەی بۆ خەڵکەکە دەکرد و دەیفەرموو: (خەڵکینە هێواش و لەسەرخۆ بن، خەڵکینە هێواش و لەسەرخۆ بن ئارامی بپارێزن). بەڵام کە دەگەشتە کۆمایە لەو کۆما لە گەورانە کەمێ رەشمەی بۆ وشترەکەی شل دەکرد، تا سەردەکەوتە سەری، جا رۆیشت هەتا گەیشتە موزدەلیفە، نوێژی شێوان و خەوتنانی تێدا کۆکردنەوە بە یەك بانگ و دوو

قامەت، (عثمان) راوی فەرمودەکە وتی: هیچ نوێژێکی سوننەتی لەنێوانیاندا ئەنجام نەدا، - لەپاشدا (عثمان) و سولەیمان هەردوو راوی هەماهەنگن – ئینجا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خەوت هەتا شەبەقی دا، جا کە بەیانی تەوی دا نوێژی بەیانی بۆ کردین، سولەیمان وتی: بە بانگ و قامەتێ، لەپاشدا سواری وشترەکەی بوو کە ناوی (قصواء) بوو هەتا گەشتە (مَشعَر الحَرَام) کە کێوی (قُـزَح) دەگرێتەوە لە موزدەلیفە بە سەریا سەرکەوت، - (عثمان) و سولەیمان وتیان: رووی کردە قیبلەو پاڕایەوە و سوپاس و ستایشی خوای کرد و (الله أكبر) و (لا إله إلا الله)ی کرد - بەڵام (عثمان) ئەمەی بۆ زیاد کرد: یەکتاپەرستی خوای گەورەی راگەیاند - . بەردەوام بوو لەسەر راوەستان هەتا خۆر زۆر زەرد بوویەوە، لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەپێش خۆر کەوتندا کەوتەڕێ بۆ مینا، (فضل)ی کوڕی عەباسی خستە پاشکۆی خۆی کە پیاوێکی پرچ جوانی سپیکەلانەی رووگەش بوو، لەوکاتەدا کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کەوتەڕێ چەند ئافرەتێ بەلایدا تێپەڕبوون (فضل) سەیری دەکردن، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستی نا بە رووی (فضل)ەوە و رووی وەرگێڕا بۆ ئەوەی تەماشایان نەکات، (فضل)یش رووی وەرگێڕا بۆ لاکەی تر و سەیری دەکردن، جارێکی تر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستی نا بە رووی (فضل)ەوە و رووی وەرگێڕا بۆ ئەوەی تەماشایان نەکات، (فضل)یش رووی وەرگێڕا بۆ لاکەی تر و سەیری دەکردن، هەتا گەیشتە شیوی موحەسسەر کە شیوێکە لەنێوان مینا و موزدەلیفە لەوێ تۆزێ خێرا لێی خوڕی، رێگەی ناوەڕاستی گرتەبەر کە لە (جمرة الكبرى)وە سەردەردەکات، هەتا گەیشتە لای کۆگا بەردەکە کە وا لەلای درەختەکەدا، حەوت بەردی بۆ فڕێ دا، لەگەڵ هەموو بەردێکدا کە فڕێی دەدا (الله أكبر)ی دەکرد، بەردەکانیش ئەوەندەی ناوکە پاقلەیە دەبوون، لەناو شیوەکەوە بەردەکانی تێ دەگرت، لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رۆیشت بۆ

شوێنی سەربڕینی قوربانیەکان، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە سەد وشترەکە شەست و سێ وشتری بەدەستی خۆی سەربڕی، ئینجا فەرمانی کرد بە پێشەوا عەلی باقیەکەیان سەربڕێ و کردی بە شەریکی خۆی لە ئاژەڵە دیاریەکەیدا، لەپاشدا فەرمانی دا لە گۆشتی هەر وشترێ پارچەیەکیان هێناو خستیانە ناو مەنجەڵێکەوەو کوڵاندیان خۆی و پێشەوا عەلی لە گۆشتەکەیان خواردو لە شلەکەشیان (شۆرباکەشیان) خواردەوە، سولەیمان وتی: لەپاشدا سواری وشترەکەی بوو، ڕۆیشت بۆ ماڵی خواو تەواف (الإفاضة)ی کرد، نوێژی نیوەڕۆی لە مەککە کرد، ئینجا چوو بۆلای نەوەی (عَبْد المُطلِب) کە لەسەر ئاوی زەمزەم ئاویان دەدا بە حاجیان، فەرمووی: (ئەی نەوەی (عَبْد المُطلِب) ئاو هەڵگۆزن و بیدەن بە حاجیان، لەبەر ئەوە نەبوایە کە خەڵکتان لەسەر کۆببێتەوەو قەڵەباڵغ بێت منیش لەگەڵتانا ئاوم دەدا بە خەڵك). جا ئەوانیش دۆلکەیە ئاوی زەمزەمیان پێدا ئەویش لێی خواردەوە.

١٩٠٦ - (صحيح) عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ بِأَذَانٍ وَاحِدٍ بِعَرَفَةَ، وَلَمْ يُسَبِّحْ بَيْنَهُمَا، وَإِقَامَتَيْنِ، وَصَلَّى الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِجَمْعٍ بِأَذَانٍ وَاحِدٍ وَإِقَامَتَيْنِ، وَلَمْ يُسَبِّحْ بَيْنَهُمَا.

واتە: لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە عەرەفە نوێژی نیوەڕۆ و عەسری کرد بە یەك بانگ و دوو قامەت، هیچ نوێژێکی سوننەتی لەنێوانیاندا ئەنجام نەدا، وە

نوێژی شێوان و خەوتنانی تێدا کۆکردنەوە بە یەك بانگ و دوو قامەت، هیچ نوێژێکی سوننەتی لەنێوانیاندا ئەنجام نەدا.

(ضعيف) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ جَابِرٍ، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: فَصَلَّى الْمَغْرِبَ وَالْعَتَمَةَ بِأَذَانٍ وَإِقَامَةٍ.

ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرمودە بە سەنەدێکی تر لە جابرەوە هاتووە، تەنها ئەوەندە نەبێت کە وتی: نوێژی شێوان و خەوتنانی کرد بە یەك بانگ و یەك قامەت.

١٩٠٧ - (صحيح) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (قَدْ نَحَرْتُ هَا هُنَا، وَمِنًى كُلُّهَا مَنْحَرٌ). وَوَقَفَ بِعَرَفَةَ فَقَالَ: (قَدْ وَقَفْتُ هَا هُنَا، وَعَرَفَةُ كُلُّهَا مَوْقِفٌ). وَوَقَفَ فِي الْمُزْدَلِفَةِ فَقَالَ: (قَدْ وَقَفْتُ هَا هُنَا، وَمُزْدَلِفَةُ كُلُّهَا مَوْقِفٌ).

واتە: جابر دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (من ئا لێرەدا ئاژەڵە دیاریەکانم سەربڕیوە، ئەوە بزانن کە خاکی مینا هەمووی جێگەیە بۆ سەربڕینی قوربانی. لە عەرەفە راوەستاو فەرمووی: (بێگومان ئالێرەدا وەستاوم، هەموو عەرەفەش شوێنی وەستانە). لە موزدەلیفە راوەستاو فەرمووی: (بێگومان ئالێرەدا وەستاوم، هەموو خاکی موزدەلیفەش شوێنی وەستانە).

١٩٠٨ - (صحيح) عَنْ جَعْفَرٍ، بِإِسْنَادِهِ زَادَ: (فَانْحَرُوا فِي رِحَالِكُمْ).

واتە: لە جەعفەرەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان سەنەد هاتووە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد كرد: (لە مەنزلگای خۆتان و شوێنی مانەوەتان قوربانیەكانتان سەربڕن).

١٩٠٩ - (صحيح) عَنْ جَابِرٍ، فَذَكَرَ هَذَا الْحَدِيثَ وَأَدْرَجَ فِي الْحَدِيثِ عِنْدَ قَوْلِهِ: (وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى). قَالَ فَقَرَأَ فِيهَا بِالتَّوْحِيدِ وَ (قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ). وَقَالَ فِيهِ: قَالَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ بِالْكُوفَةِ - قَالَ أَبِي: هَذَا الْحَرْفُ لَمْ يَذْكُرْهُ جَابِرٌ - فَذَهَبْتُ مُحَرِّشًا، وَذَكَرَ قِصَّةَ فَاطِمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا.

واتە: ئەبو داود لە ڕێگەیەكی ترەوە لە جابرەوە ئەم فەرمودەی ریوایەت كردوە بە هەندێ زیادەوە، لەدوای خوێندنی ئایەتی: (وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى). راوی وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوو ركات سوننەتی تەواف كرد لەدوای خوێندنی سورەتی فاتیحەوە لە ركاتی یەكەمدا سورەتی: (قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ )ی خوێند، وە لە ركاتی دوەمدا سورەتی: (قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ) ی خوێند. راوی فەرمودەكە جەعفەری كوڕی موحەممەد لە فەرمودەكەیدا وتی: لە پێشەوا عەلی كوڕی (أبی گالب)ەوە رەزای خوای لێ بێ لە كوفە وتی – باوكم واتە موحەممەدی كوڕی عەلی وتی: جابر باسی ئەم

وشەیەی نەکرد: ڕۆشتم بۆلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بۆ ئەوەی هانی دەم لە (فاگمە). بەڵکو بەسەرهاتەکەی (فاگمە)ی ڕەزای خوای لێ بێ گێڕایەوە.

## باسی وەستان لە عەرەفات.

## ٥٨ - باب الْوُقُوفِ بِعَرَفَةَ.

١٩١٠ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: كَانَتْ قُرَيْشٌ وَمَنْ دَانَ دِينَهَا يَقِفُونَ بِالْمُزْدَلِفَةِ، وَكَانُوا يُسَمَّوْنَ الْحُمْسَ، وَكَانَ سَائِرُ الْعَرَبِ يَقِفُونَ بِعَرَفَةَ، قَالَتْ: فَلَمَّا جَاءَ الإِسْلاَمُ أَمَرَ اللَّهُ تَعَالَى نَبِيَّهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَأْتِيَ عَرَفَاتٍ فَيَقِفَ بِهَا، ثُمَّ يُفِيضَ مِنْهَا، فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ( ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: قورەیش و ئەوانەی کە لەسەر دینی قورەیش بوون لە موزدەلیفە رادەوەستان، کە پێیان دەوتن (حمس) کۆی (أحمس)ە کە مانای ئازایەتی و دلێری دەگەیەنێت، عەرەبەکانی تریش لە عەرەفە رادەوەستان، کاتێ کە دینی ئیسلام هات خوای گەورە فەرمانی کرد بە پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم لە موزدەلیفە نەوەستێ و بڕوات بۆ عەرەفات و لەوێ راوەستێ، لەپاشدا دابەزێ بۆ موزدەلیفەو (مشعر الحرام) و مینا، وەك خوای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ( ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ).

## باسی دەرچوون لە مەککەوە بۆ مینا.

## ٥٩ - باب الْخُرُوجِ إِلَى مِنًى.

١٩١١ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الظُّهْرَ يَوْمَ التَّرْوِيَةِ، وَالْفَجْرَ يَوْمَ عَرَفَةَ بِمِنًى.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: نوێژی نیوەڕۆی رۆژی هەشتەمی مانگی (ذی الحجة) کە لە مینا دەکرێت رۆژی (تروية)یە، لە رۆژی نۆیەمی مانگی (ذی الحجة)دا دوای ئەوەی کە نوێژی بەیانی کراو خۆر دەرکەوت حاجیان لە میناوە کەوتنە رێ بۆ عەرەفات ئەو رۆژەش رۆژی عەرەفەیە.

١٩١٢ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ قُلْتُ: أَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ عَقَلْتَهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَيْنَ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الظُّهْرَ يَوْمَ التَّرْوِيَةِ؟ فَقَالَ: بِمِنًى. قُلْتُ: فَأَيْنَ صَلَّى الْعَصْرَ يَوْمَ النَّفْرِ؟ قَالَ: بِالأَبْطَحِ، ثُمَّ قَالَ: افْعَلْ كَمَا يَفْعَلُ أُمَرَاؤُكَ.

واتە: (عَبْد العَزِيز)ی کوڕی روفەیع دەڵێت: لە ئەنەسی کوڕی مالیکم پرسی وتم: شتێکم بۆ باس بکە کە لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم فێربوبی و لەبەرت کردبێت، پێغەمبەری خوا لە رۆژی هەشتەمی مانگی (ذی الحجة)دا کە ناسراوە بە رۆژی (ترویة)ە لە کوێ نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، وتی: لە مینا، وتم: ئەی لە رۆژی سیانزەهەمی مانگی (ذی الحجة)دا کاتێ کە لە مینا دەگەڕایەوە لە کوێ نوێژی عەسری دەکرد؟ وتی: لە (أبطح)، لەپاشدا وتی: ئەوە بکە کە ئەمیر و کاربەدەستەکانت دەیکەن پێچەوانەی ئەوان مەجوڵێرەوە.

## باسی دەرچوون لە میناوە بۆ عەرەفات.

## ٦٠ - باب الْخُرُوجِ إِلَى عَرَفَةَ.

١٩١٣ - (حسن) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: غَدَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ مِنًى حِينَ صَلَّى الصُّبْحَ صَبِيحَةَ يَوْمِ عَرَفَةَ، حَتَّى أَتَى عَرَفَةَ فَنَزَلَ بِنَمِرَةَ، وَهِيَ مَنْزِلُ الإِمَامِ الَّذِي يَنْزِلُ بِهِ بِعَرَفَةَ، حَتَّى إِذَا كَانَ عِنْدَ صَلاَةِ الظُّهْرِ رَاحَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُهَجِّرًا فَجَمَعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، ثُمَّ خَطَبَ النَّاسَ، ثُمَّ رَاحَ فَوَقَفَ عَلَى الْمَوْقِفِ مِنْ عَرَفَةَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لە رۆژی نۆیەمی مانگی (ذی الحجة)دا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە مینا نوێژی بەیانی كرد كاتێ كە خۆر دەركەوت بەرەو عەرەفە كەوتەرێ هەتا گەشتە نزیك عەرەفە لە نەمیرە دابەزی، كە مەنزلگای پێشەوایە كاتێ كە دەچێ بۆ عەرەفە لەوێ دادەبەزێت، هەتا كاتی نوێژی نیوەڕۆ كاتێ كە خۆر لایدا لەناوەڕاستی ئاسمان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رۆشت بۆ عەرەفە لەوێ نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی عەسری كۆكردەوە، لەپاشدا وتاری خوێندەوە بۆ خەڵكەكە، ئینجا رۆیشت بۆ شوێنی راوەستان لە عەرەفەو لەوێ راوەستا.

## باسی رۆشتن لە نەمیرەوە بۆ عەرەفات.

## ٦١ – باب الرَّوَاحِ إِلَى عَرَفَةَ.

١٩١٤ - (حسن) عَنْ سَعِيدِ بْنِ حَسَّانَ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: لَمَّا أَنْ قَتَلَ الْحَجَّاجُ ابْنَ الزُّبَيْرِ أَرْسَلَ إِلَى ابْنِ عُمَرَ: أَيَّةُ سَاعَةٍ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرُوحُ فِي هَذَا الْيَوْمِ؟ قَالَ: إِذَا كَانَ ذَلِكَ رُحْنَا، فَلَمَّا أَرَادَ ابْنُ عُمَرَ أَنْ يَرُوحَ، قَالُوا: لَمْ تَزِغِ الشَّمْسُ، قَالَ: أَزَاغَتْ؟ قَالُوا: لَمْ تَزِغْ - أَوْ زَاغَتْ – قَالَ: فَلَمَّا قَالُوا: قَدْ زَاغَتِ: ارْتَحَلَ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی حەسانەوە، لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە حەجاج ئیبنو زوبێری کوشت ناردی بۆلای ئیبنو عومەر کە پرسیاری لێ بکەن: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەم ڕۆژەدا کە ڕۆژی عەرەفەیە لە چ کاتێکدا لە مزگەوتی نەمیرەوە دەڕۆشت بۆ وتار خوێندن و ئەنجامدانی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر پێکەوەو ڕاوەستان لە عەرەفات؟ وتی: ئەگەر کاتی شەرعی ڕۆشتن بهاتایە دەڕۆشتین، کاتێ کە ئیبنو عومەر ویستی بڕوات، وتیان: خۆر لای نەداوە، وتی: خۆر لای نەداوە؟ وتیان: خۆر لای نەداوە — یان وتیان لایداوە ڕاوی فەرمودەکە سەعیدی کوڕی حەسان وتی: کاتێ کە ئەوانەی لە خزمەتیا بوون وتیان: خۆر لایداوە: ئەو کاتە بەرەو عەرەفە کەوتەڕێ.

## باسی وتار خوێندنەوە لە عەرەفە.

## ٦٢ – باب الْخُطْبَةِ بِعَرَفَةَ.

١٩١٥ - (ضعيف) عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِى ضَمْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ - أَوْ عَمِّهِ - قَالَ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ بِعَرَفَةَ.

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە، لە پیاوێکی هۆزی (ضَمرَة)وە، لە باوکیەوە - یان لە مامیەوە - دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە عەرەفە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی لەسەر مینبەر وتاری دەخوێندەوە بۆ خەڵك.

١٩١٦ - (صحيح) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ نُبَيْطٍ، عَنْ رَجُلٍ مِنَ الْحَيِّ، عَنْ أَبِيهِ نُبَيْطٍ، أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاقِفًا بِعَرَفَةَ عَلَى بَعِيرٍ أَحْمَرَ يَخْطُبُ.

واتە: لە سەلەمەی کوڕی (نُبَيط)ەوە، لە پیاوێکی هۆزی (حَیّ)ەوە، لە باوکیەوە (نُبَيط) دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم دیوە لە ڕۆژی وەستان لە عەرەفە بەسەر پشتی وشترێکی سورەوە وتاری خوێندۆتەوە بۆ خەڵك.

١٩١٧ - (صحيح) عن خَالِدُ بْنُ الْعَدَّاءِ بْنِ هَوْذَةَ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ النَّاسَ يَوْمَ عَرَفَةَ عَلَى بَعِيرٍ قَائِمٌ فِي الرِّكَابَيْنِ.

واتە: خالیدی کوڕی عەددائی کوڕی (هَوْذَة) دەڵێت: لە ڕۆژی وەستان لە عەرەفە پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی بەسەر وشترێکەوە وتاری دەخوێندەوە.

١٩١٨ - (صحيح) عَنِ الْعَدَّاءِ بِمَعْنَاهُ.

واتە: لە عەددائەوە لەرێگەیەکی ترەوە بە هەمان مانا هاتووە.

# باسی شوێنی وەستان لە عەرەفە.

# ٦٣ - باب مَوْضِعِ الْوُقُوفِ بِعَرَفَةَ.

١٩١٩ - (صحيح) عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ صَفْوَانَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ شَيْبَانَ قَالَ: أَتَانَا ابْنُ مِرْبَعٍ الأَنْصَارِيُّ وَنَحْنُ بِعَرَفَةَ فِي مَكَانٍ يُبَاعِدُهُ عَمْرٌو عَنِ الإِمَامِ - ، فَقَالَ: أَمَا إِنِّي رَسُولُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْكُمْ، يَقُولُ لَكُمْ: (قِفُوا عَلَى مَشَاعِرِكُمْ فَإِنَّكُمْ عَلَى إِرْثٍ مِنْ إِرْثِ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ).

واتە: لە عەمری كوڕی (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی صەفوانەوە، لە یەزیدی كوڕی شەیبانەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لە عەرەفە بووین لە شوێنێكدا كە عەمر دوور بوو لەو شوێنەوە كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لێی وەستا بوو، میربەعی ئەنصاری هات بۆ لامان وتی: من نێردراوی پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم منی ناردوە بۆلای ئێوە: پێتان دەفەرموێت: (لە شوێنی پەرستشەكانی حەجتان بن - لەشوێنی خۆتان راوەستن و بمێننەوە چونكە هەموو شوێنێكی خاكی عەرەفات شوێنی وەستانە - ، بێگومان ئێوە لەسەر میراتێكن لە میراتەكانی ئیبراهیم پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێت).

## باسی هاتنەخوارەوەی حاجیان لە عەرەفەوە بۆ موزدەلیفە بە لێشاو.

## ٦٤ - باب الدَّفْعَةِ مِنْ عَرَفَةَ.

١٩٢٠ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: أَفَاضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ عَرَفَةَ وَعَلَيْهِ السَّكِينَةُ وَرَدِيفُهُ أُسَامَةُ، وَقَالَ: (أَيُّهَا النَّاسُ عَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ، فَإِنَّ الْبِرَّ لَيْسَ بِإِيجَافِ الْخَيْلِ وَالإِبِلِ). قَالَ: فَمَا رَأَيْتُهَا رَافِعَةً يَدَيْهَا عَادِيَةً حَتَّى أَتَى جَمْعًا. زَادَ وَهْبٌ: ثُمَّ أَرْدَفَ الْفَضْلَ بْنَ الْعَبَّاسِ، وَقَالَ: (أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ الْبِرَّ لَيْسَ بِإِيجَافِ الْخَيْلِ وَالإِبِلِ، فَعَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ). قَالَ: فَمَا رَأَيْتُهَا رَافِعَةً يَدَيْهَا حَتَّى أَتَى مِنًى.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەرخۆ و بەویقارەوە لە عەرەفەوە هاتەخوارەوە بەرەو موزدەلیفە ئوسامەی لە پاشکۆدا بوو، فەرمووی: (ئەی خەڵکینە هێواش و لەسەرخۆ بن، چونکە خێر لە خێرا ڕۆشتنی ئەسپ و وشتردا نیە). ڕاوی وتی: نەم دی هیچ ئەسپ و وشترێ بە خێرایی بڕوات هەتا گەیشتە موزدەلیفە - پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ لە عەرەفە هاتەخوارەوە بەرەو موزدەلیفە ڕەشمەی وشترەکەی ئەوەندە توند کردبوو

سەری دەیدا لە شوێنی جێگە پێکانی لەبەرئەوەی لەو قەڵەباڵغیەدا سەری وشترەکەی بەر خەڵك نەکەوێ و ئازاریان بدات، بەڵام کاتێ کە دەگەیشتە گردۆڵکەیە یان بەرزاییە رەشمەکەی بۆ شل دەکرد بۆ ئەوەی سەرکەوێت - .
راوی فەرموودەکە وەهەب ئەمەی بۆ زیاد کرد: لەپاشدا (فضل)ی کوڕی عەباسی خستە پاشکۆی خۆیەوە بەرەو مینا، فەرمووی: (ئەی خەڵکینە، خێر و چاکە لە خێرا رۆشتنی ئەسپ و وشتردا نیە، بۆیە بە هێواش و لەسەرخۆ بن). ئەم دی هیچ ئەسپ و وشترێ بە خێرایی بڕوات هەتا گەیشتە مینا.

١٩٢١ - (صحيح) عَن كُرَيْب، أَنَّهُ سَأَلَ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ، قُلْتُ: أَخْبِرْنِي كَيْفَ فَعَلْتُمْ، أَوْ صَنَعْتُمْ، عَشِيَّةَ رَدِفْتَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: جِئْنَا الشِّعْبَ الَّذِي يُنِيخُ النَّاسُ فِيهِ لِلْمُعَرَّسِ، فَأَنَاخَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَاقَتَهُ، ثُمَّ بَالَ - وَمَا قَالَ: أَهْرَاقَ الْمَاءَ - ثُمَّ دَعَا بِالْوَضُوءِ فَتَوَضَّأَ وُضُوءًا لَيْسَ بِالْبَالِغِ جِدًّا، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ الصَّلاَةَ، قَالَ: (الصَّلاَةُ أَمَامَكَ). قَالَ: فَرَكِبَ حَتَّى قَدِمْنَا الْمُزْدَلِفَةَ، فَأَقَامَ الْمَغْرِبَ، ثُمَّ أَنَاخَ النَّاسُ فِي مَنَازِلِهِمْ، وَلَمْ يَحِلُّوا حَتَّى أَقَامَ الْعِشَاءَ وَصَلَّى، ثُمَّ حَلَّ النَّاسُ. زَادَ مُحَمَّدٌ فِي حَدِيثِهِ: قَالَ: قُلْتُ: كَيْفَ فَعَلْتُمْ حِينَ أَصْبَحْتُمْ؟ قَالَ: رَدِفَهُ الْفَضْلُ وَانْطَلَقْتُ أَنَا فِي سُبَّاقِ قُرَيْشٍ عَلَى رِجْلَيَّ.

واتە: لە کورەیبەوە هاتووە، کە لە ئوسامەی کوڕی زیدی پرسیوە، کورەیب دەڵێت: وتم: پێم بڵێ ئەو ئێوارەیەی کە لە عەرەفەوە هاتنەخوارەوە بەرەو موزدەلیفە تۆ لە پاشکۆی پێغەمبەری خوادا بویت صلی الله علیه وسلم چیتان کرد؟ وتی: ڕۆشتین هەتا گەیشتینە ئەو ڕێگەیەی کە لە نێوان دوو کێودایە جا لەوێ خەڵکەکە وشترەکانیان یخ دا بۆ حەوانەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دابەزی و وشترەکەی یخ دا، لەپاشدا میزی کرد – نەیوت: دەستی بە ئاو گەیاند بەڵکو وتی: میزی کرد - ئینجا داوای ئاوی دەستنوێژی کرد دەستنوێژێکی سوکی گرت واتە ئاوی کەمی بەکارهێنا ئەندامەکانی دەستنوێژی یەکجار یەکجار شت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لێرە نوێژی شێوان دەکەیت؟ فەرمووی: (نا نوێژ لە پێشتەوەیە لێرە نوێژ ناکەین). وتی: جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سوار بوو ڕۆیشت هەتا گەیشتینە موزدەلیفە، لەوێ قامەت کراو نوێژی شێوانی بە کۆمەڵ بۆ کردین، لەپاشدا هەرکەس لەشوێنی خۆی وشترەکەی خۆی یخ دا بەڵام بارەکانیان نەخست هەتا قامەت کرا بۆ نوێژی خەوتنان نوێژی خەوتنانی بە کۆمەڵ بۆ کردین، ئینجا بارەکانیان خست. موحەممەد لە فەرمودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: وتی: وتم: ئەو بەیانیەی کە چون بۆ مینا چیتان کرد؟ ئوسامە وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سوار بوو (فضل)ی خستە پاشکۆی خۆی، منیش لەگەڵ ئەوانەی کە زوو ڕۆیشتن بەپێ ڕۆیشتم بۆ مینا.

١٩٢٢ - (حسن دون قوله: (لاَ يَلْتَفِتْ) شاذ، والمحفوظ: (يَلْتَفِتْ) وصححه الترمذي) عَنْ عَلِيّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: ثُمَّ أَرْدَفَ أُسَامَةَ، فَجَعَلَ يُعْنِقُ عَلَى نَاقَتِهِ، وَالنَّاسُ يَضْرِبُونَ

الإِبِـلَ يَمِينًـا وَشِـمَالاً، لاَ يَلْتَفِـتُ إِلَـيْهِمْ، وَيَقُـولُ: (السَّكِينَةَ أَيُّهَا النَّاسُ). وَدَفَعَ حِينَ غَابَتِ الشَّمْسُ.

واتە: پێشەوا عەلی کوڕی (أبی طالِب) رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: لەپاشدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سواری وڵاخەکەی بوو ئوسامەی خستە پاشکۆی خۆیەوە و بە رۆشتنێکی مام ناوەندی رێی دەکرد، خەڵکەکە وشترەکانیان بە خێرایی لێ دەخوڕی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاوڕی نەئەدایەوە بە لایاندا - راستیەکەی ئەوەیە ئاوڕی ئەدایەوە بە لایانداو ئاماژەی بۆ دەکردن کە لەسەرخۆ بڕۆن - ، وە دەیفەرموو: (ئەی خەڵکینە هێواش و لەسەرخۆ بن لە وشترەکانتان مەدەن بۆ ئەوەی بە خێرایی بڕۆن). کاتێ کە خۆر ئاوا بوو لە عەرەفە گەڕایەوە.

١٩٢٣ - (صحيح) عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ قَالَ: سُئِلَ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ وَأَنَا جَالِسٌ: كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسِيرُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ حِينَ دَفَعَ؟ قَالَ: كَانَ يَسِيرُ الْعَنَقَ، فَإِذَا وَجَدَ فَجْوَةً نَصَّ.

واتە: لە هیشامی کوڕی عوروەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە وتویەتی: خۆم لە خزمەت ئوسامەی کوڕی زیددا دانیشتبوم کە لێیان پرسی: لە حەجی ماڵاوایی دا ئەوکاتەی کە خەڵك لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم لە عەرەفەوە بەرەو موزدەلیفە بە لێشاو هاتنەخوارە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چۆن رێی دەکرد؟ وتی: بە رۆشتنێکی مام ناوەندی رێی دەکرد، ئەگەر بواری دەستکەوتایە بە خێرایی لێ دەخوڕی.

١٩٢٤ - (حسن صحيح) عَنْ أُسَامَةَ قَالَ: كُنْتُ رِدْفَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا وَقَعَتِ الشَّمْسُ دَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: ئوسامەی کوڕی زید دەڵێت: لە پاشکۆی پێغەمبەردا بووم صلی الله علیه وسلم، کاتێ کە خۆر ئاوا بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە عەرەفەوە بەرەو موزدەلیفە کەوتەڕێ.

١٩٢٥ - (صحيح) عَنْ أُسَامَةَ بْنُ زَيْدٍ قَالَ: دَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ عَرَفَةَ، حَتَّى إِذَا كَانَ بِالشِّعْبِ نَزَلَ فَبَالَ فَتَوَضَّأَ وَلَمْ يُسْبِغِ الْوُضُوءَ، قُلْتُ لَهُ: الصَّلاَةَ. فَقَالَ (الصَّلاَةُ أَمَامَكَ). فَرَكِبَ فَلَمَّا جَاءَ الْمُزْدَلِفَةَ نَزَلَ فَتَوَضَّأَ فَأَسْبَغَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَصَلَّى الْمَغْرِبَ، ثُمَّ أَنَاخَ كُلُّ إِنْسَانٍ بَعِيرَهُ فِي مَنْزِلِهِ، ثُمَّ أُقِيمَتِ الْعِشَاءُ فَصَلاَّهَا، وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَيْئًا.

واتە: ئوسامەی کوڕی زید دەڵێت: لە پاشکۆی پێغەمبەردا بووم صلی الله علیه وسلم، کاتێ کە خۆر ئاوا بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە عەرەفەوە بەرەو موزدەلیفە کەوتەڕێ، هەتا گەیشتە ئەو ڕێگەیەی کە لە نێوان دوو کێودایە ئەوکاتە دابەزی و میزی کرد دەستنوێژی گرت بەڵام وەك عادەتی خۆی بە تەواوی دەستنوێژی نەگرت واتە سێ جار سێ جار ئەندامەکانی جەستەی نەشت، پێم وت: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لێرە

نوێژی شێوان دەكەیت؟ فەرموی: (نا نوێژ لە پێشتەوەیە لێرە نوێژ ناكەین). وتی: جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سوار بوو رۆیشت هەتا گەیشتینە موزدەلیفە، لەوێ دابەزی دەستنوێژێكی بە تەواوی گرت، لەپاشدا قامەت كراو نوێژی شێوانی بە كۆمەڵ بۆ كردین، ئینجا هەموو كەسێ لەشوێنی خۆی وشترەكەی یخ دا، لەپاشدا قامەت كرا بۆ نوێژی خەوتنان نوێژی خەوتنانی بە كۆمەڵ بۆ كردین، هیچ نوێژێكی سوننەتی لەنێوانیاندا ئەنجام نەدا.

## باسی كۆكردنەوەی نوێژی شێوان و خەوتنان لە موزدەلیفە.

## ٦٥ - باب الصَّلاَةِ بِجَمْعٍ.

١٩٢٦ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِالْمُزْدَلِفَةِ جَمِيعًا.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی شێوان و خەوتنانی كۆكردەوە و بەیەكەوە كردنی لە موزدەلیفە.

١٩٢٧ - (صحيح) عَنِ الزُّهْرِيِّ، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ، وَقَالَ: بِإِقَامَةٍ إِقَامَةٍ جَمَعَ بَيْنَهُمَا. قَالَ أَحْمَدُ: قَالَ وَكِيعٌ: صَلَّى كُلَّ صَلاَةٍ بِإِقَامَةٍ.

واتە: لە زوهریەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان سەنەد و مانا هاتووە، وتی: بۆ هەر نوێژێکیان قامەت کرا واتە بۆ نوێژی شێوان و نوێژی خەوتنان، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وتی: وەکیع وتی: بۆ هەموو نوێژێ قامەت کرا.

١٩٢٨ - (صحيح) عَنِ الزُّهْرِيِّ - بِإِسْنَادِ ابْنِ حَنْبَلٍ عَنْ حَمَّادٍ وَمَعْنَاهُ — قَالَ: بِإِقَامَةٍ وَاحِدَةٍ لِكُلِّ صَلاَةٍ، وَلَمْ يُنَادِ فِي الأُولَى، وَلَمْ يُسَبِّحْ عَلَى أَثَرِ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا، قَالَ مَخْلَدٌ: لَمْ يُنَادِ فِي وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا.

واتە: لە زوهریەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان سەنەد و مانا هاتووە، وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی شێوان و خەوتنانی کۆکردەوە و بەیەکەوە کردنی لە موزدەلیفە بە یەك بانگ و دوو قامەت، لەدوای هیچ نوێژێکیانەوە نوێژی سوننەتی نەکرد، موخەلەد وتی: بۆ نوێژێکیان بانگ نەدرا.

١٩٢٩ - (صحيح بزيادة: (لكل الصلاة) كما في الذي قبله) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ ابْنِ عُمَرَ الْمَغْرِبَ ثَلاَثًا وَالْعِشَاءَ رَكْعَتَيْنِ، فَقَالَ لَهُ مَالِكُ بْنُ الْحَارِثِ: مَا هَذِهِ الصَّلاَةُ؟ قَالَ: صَلَّيْتُهُمَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذَا الْمَكَانِ بِإِقَامَةٍ وَاحِدَةٍ.

واتە: لە (عبدُ الله)ی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە وتویەتی: لەگەڵ ئیبنو عومەردا ڕەزای خوایان لێ بێ سێ ڕکات نوێژی شێوان و دوو ڕکات نوێژی

خەوتنانمان كرد بەیەكەوە، مالیكی كوڕی (حَارِث) پێی وت: ئەم نوێژە چی بوو؟ وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم لەم شوێنەدا ئەم دوو نوێژەم بەم شێوەیە كردوە بە یەك قامەت.

١٩٣٠ - (صحيح بزيادة المذكورة آنفا) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَالِكٍ قَالاَ: صَلَّيْنَا مَعَ ابْنِ عُمَرَ بِالْمُزْدَلِفَةِ الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِإِقَامَةٍ وَاحِدَةٍ.

واتە: لە سەعیدی كوڕی جوبەیر و (عَبْدُ الله)ی كوڕی مالیكەوە هاتووە، كە وتویانە: لە موزدەلیفە لەگەڵ ئیبنو عومەردا ڕەزای خوایان لێ بێ بە یەك قامەت نوێژی شێوان و خەوتنانمان كۆكردەوە و بەیەكەوە كردنمان.

١٩٣١ - (صحيح) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: أَفَضْنَا مَعَ ابْنِ عُمَرَ، فَلَمَّا بَلَغْنَا جَمْعًا صَلَّى بِنَا الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِإِقَامَةٍ وَاحِدَةٍ ثَلاَثًا وَاثْنَتَيْنِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ، قَالَ لَنَا ابْنُ عُمَرَ: هَكَذَا صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذَا الْمَكَانِ.

واتە: لە سەعیدی كوڕی جوبەیرەوە هاتووە، كە وتویەتی: لەگەڵ ئیبنو عومەردا ڕەزای خوایان لێ بێ لە عەرەفاتەوە كەوتینەڕێ بەرەو موزدەلیفە كاتێ كە گەیشتینە موزدەلیفە بە یەك قامەت سێ ركات نوێژی شێوان و دوو ركات نوێژی خەوتنانی پێ كردین، كاتێ كە لەنوێژ بویەوە، ئیبنو عومەر پێی

وتین: لەم شوێنەدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم دوو نوێژەی بەم شێوەیە پێ کردین بە یەك قامەت.

١٩٣٢ - (صحيح) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ قَالَ: رَأَيْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ أَقَامَ بِجَمْعٍ فَصَلَّى الْمَغْرِبَ ثَلَاثًا، ثُمَّ صَلَّى الْعِشَاءَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: شَهِدْتُ ابْنَ عُمَرَ صَنَعَ فِي هَذَا الْمَكَانِ مِثْلَ هَذَا، وَقَالَ: شَهِدْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَنَعَ مِثْلَ هَذَا فِي هَذَا الْمَكَانِ.

واتە: لە سەلەمەی کوڕی کوهەیلەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: سەعیدی کوڕی جوبەیرم بینی نوێژی شێوان و نوێژی خەوتنانی کۆکردەوە بەم شێوەیە: قامەتی بۆ کرا سێ رکات نوێژی شێوانی کرد، لەپاشدا هەستا دوو رکات نوێژی خەوتنانیشی کرد، ئینجا وتی: لە خزمەت ئیبنو عومەردا رەزای خوایان لێ بێ ئامادەبووم لەم شوێنەدا بەم شێوەیە نوێژی شێوان و نوێژی خەوتنانی کۆکردەوە بە یەك قامەت، هەروەها وتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم ئامادەبووم بەم شێوەیە نوێژی شێوان و نوێژی خەوتنانی کۆکردەوە لەم شوێنەدا.

١٩٣٣ - (صحيح لكن قوله: (فقَالَ: (الصَّلَاةُ) شاذ، والمحفوظ: (فأقام) كما في الحديثين: (١٩٢٧)، (١٩٢٨)). عَنْ أَشْعَثَ بْنِ سُلَيْمٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: أَقْبَلْتُ مَعَ ابْنِ عُمَرَ مِنْ عَرَفَاتٍ إِلَى

الْمُزْدَلِفَةِ، فَلَمْ يَكُنْ يَفْتُرُ مِنَ التَّكْبِيرِ وَالتَّهْلِيلِ حَتَّى أَتَيْنَا الْمُزْدَلِفَةَ، فَأَذَّنَ وَأَقَامَ، أَوْ أَمَرَ إِنْسَانًا فَأَذَّنَ وَأَقَامَ، فَصَلَّى بِنَا الْمَغْرِبَ ثَلاَثَ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَيْنَا فَقَالَ: الصَّلاَةُ فَصَلَّى بِنَا الْعِشَاءَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ دَعَا بِعَشَائِهِ. قَالَ: وَأَخْبَرَنِي عِلاَجُ بْنُ عَمْرٍو بِمِثْلِ حَدِيثِ أَبِي، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: فَقِيلَ لاِبْنِ عُمَرَ فِي ذَلِكَ، فَقَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَكَذَا.

واتە: لە (أشعث)ی کوڕی سولەیمەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە وتویەتی: لەگەڵ ئیبنو عومەردا ڕەزای خوایان لێ بێ ئەهاتمەوە لە عەرەفاتەوە بۆ موزدەلیفە، بەردەوام (الله أكبر) و (لا اله الا الله)ی دەکردو بێ تاقەت نەدەبوو لە وتنیان هەتا گەیشتینە موزدەلیفە، لەوێ بانگ دراو قامەت کرا، یان فەرمانی دا بە کەسێ بانگ بدات و قامەت بکات، سێ ڕکات نوێژی شێوانی پێ کردین، ئینجا لایکردەوە بەلاماندا وتی: نوێژەکانتان بکەن، جا دوو ڕکات نوێژی خەوتنانی پێ کردین، لەپاشدا داوای خواردنی کرد. (أشعث) وتی: عیلاجی کوڕی عەمر وەك فەرمودەکەی باوکم سولەیمی بۆ گێڕامەوە، لەوبارەوە لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیە وسلم بەم شێوەیە نوێژی شێوان و نوێژی خەوتنانم کردوە.

١٩٣٤ - (صحيح) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى صَلاَةً إِلاَّ لِوَقْتِهَا، إِلاَّ بِجَمْعٍ، فَإِنَّهُ جَمَعَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِجَمْعٍ، وَصَلَّى صَلاَةَ الصُّبْحِ مِنَ الْغَدِ قَبْلَ وَقْتِهَا.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم هەرگیز نەدیوە نوێژێ بكات لەكاتی خۆیدا نەبێت، ئیللا لە موزدەلیفە نەبێ، بێگومان پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نوێژی شێوان و خەوتنانی كۆكردەوە لە موزدەلیفە، زوو نوێژی بەیانی ڕۆژی جەژنی كرد - وەك عادەتی خۆی لەدوای دوو ركات سوننەتەكە ماوەیە چاوەڕێی خەڵكی نەكرد چونكە خەڵكەكە هەموو لە خزمەتیدا ئامادەبوون - .

١٩٣٥ - (حسن صحيح) عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: فَلَمَّا أَصْبَحَ - يَعْنِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - وَوَقَفَ عَلَى قُزَحَ، فَقَالَ: (هَذَا قُزَحُ وَهُوَ الْمَوْقِفُ وَجَمْعٌ كُلُّهَا مَوْقِفٌ، وَنَحَرْتُ هَا هُنَا وَمِنًى كُلُّهَا مَنْحَرٌ فَانْحَرُوا فِي رِحَالِكُمْ).

واتە: پێشەوا عەلی كوڕی (أبی طالب) ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: كاتێ كە ڕۆژ بویەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەر قوزەح ڕاوەستا كە كێوێكە لە موزدەلیفە فەرمووی: (ئەوە بزانن ئەمە كێوی قوزەحە شوێنی وەستانە هەموو خاكی موزدەلیفە شوێنی وەستانە)، لە میناش ڕاوەستا فەرمووی: (من ئا لێرەدا ئاژەڵە دیاریەكانم سەربڕیوە، ئەوە بزانن كە خاكی

مینا هەمووی جێگەیە بۆ سەربڕینی قوربانی، لە مەنزڵگای خۆتان و شوێنی مانەوەتان قوربانیەکانتان سەربڕن).

١٩٣٦ - (صحيح) عَنْ جَابِرٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (وَقَفْتُ هَا هُنَا بِعَرَفَةَ وَعَرَفَةُ كُلُّهَا مَوْقِفٌ، وَوَقَفْتُ هَا هُنَا بِجَمْعٍ، وَجَمْعٌ كُلُّهَا مَوْقِفٌ، وَنَحَرْتُ هَا هُنَا وَمِنًى كُلُّهَا مَنْحَرٌ، فَانْحَرُوا فِي رِحَالِكُمْ).

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (من ئا لێرەدا لە عەرەفە راوەستاوم ئەوە بزانن کە هەموو خاکی عەرەفە شوێنی وەستانە، من ئا لێرەدا لە موزدەلیفە وەستاوم ئەوە بزانن کە هەموو خاکی موزدەلیفە شوێنی وەستانە، ئا لێرەدا ئاژەڵە دیاریەکانم سەربڕیوە، ئەوە بزانن لە خاکی مینا هەمووی جێگەیە بۆ سەربڕینی قوربانی، لە مەنزڵگای خۆتان و شوێنی مانەوەتان قوربانیەکانتان سەربڕن).

١٩٣٧ - (حسن صحيح) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (كُلُّ عَرَفَةَ مَوْقِفٌ، وَكُلُّ مِنًى مَنْحَرٌ، وَكُلُّ الْمُزْدَلِفَةِ مَوْقِفٌ، وَكُلُّ فِجَاجِ مَكَّةَ طَرِيقٌ وَمَنْحَرٌ).

واتە: لە جابری کوڕی (عبدُ الله)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (هەموو خاکی عەرەفە شوێنی راوەستانە، خاکی مینا هەمووی جێگەیە بۆ سەربڕینی قوربانی، هەموو خاکی موزدەلیفە شوێنی

وەستانە، هەموو ڕێگایەکی فراوان کە لێیەوە خەڵك بڕواتە ناو شاری مەککەوە جێگەیە بۆ سەربڕینی قوربانی).

١٩٣٨ - (صحيح) عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: كَانَ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ لاَ يُفِيضُونَ حَتَّى يَرَوُا الشَّمْسَ عَلَى ثَبِيرٍ، فَخَالَفَهُمُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدَفَعَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ.

واتە: لە عەمری کوڕی مەیمونەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) ڕەزای خوای لێ بێ وتی: خەڵکانی سەردەمی نەفامی لە عەرەفەوە نەدەکەوتنەڕێ بەرەو موزدەلیفە هەتا خۆریان لە کێوی (ثبیر) دەبینی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە پێچەوانەی ئەوانەوە لە پێش خۆر ئاوا بوونەوە لە عەرەفەوە دەکەوتەڕێ بەرەو موزدەلیفە.

## باسی پەلەکردن لە موزدەلیفەوە بۆ مینا.

## ٦٦ - باب التَّعْجِيلِ مِنْ جَمْعٍ.

١٩٣٩ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَنَا مِمَّنْ قَدَّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةَ الْمُزْدَلِفَةِ فِي ضَعَفَةِ أَهْلِهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: خۆم یەکێ بووم لە کەسوکارە لاوازەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە شەوی موزدەلیفە ناردنی بۆ مینا.

١٩٤٠ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَدَّمَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةَ الْمُزْدَلِفَةِ أُغَيْلِمَةَ بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ عَلَى حُمُرَاتٍ، فَجَعَلَ يَلْطَحُ أَفْخَاذَنَا وَيَقُولُ: (أُبَيْنِيَّ لاَ تَرْمُوا الْجَمْرَةَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: خۆم یەکێ بووم لەو غوڵامە بچوکانەی نەوەی (عَبْد المطلب) کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم شەوی موزدەلیفە بەسواری گوێدرێژەکان ناردینی بۆ مینا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە سوکی دەیکێشا بە ڕانماندا دەیفەرموو: (ڕۆڵەکانم شەیتان ڕەجم نەکەن هەتا خۆر هەڵدێ).

١٩٤١ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُقَدِّمُ ضُعَفَاءَ أَهْلِهِ بِغَلَسٍ، وَيَأْمُرُهُمْ - يَعْنِي - لاَ يَرْمُونَ الْجَمْرَةَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کەسوکارە لاوازەکانی بە تاریکی شەوا لە موزدەلیفەوە دەنارد بۆ مینا، فەرمانی پێ دەدان کە شەیتان ڕەجم نەکەن هەتا خۆر هەڵدێ.

١٩٤٢ - (ضعيف) عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: أَرْسَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِأُمِّ سَلَمَةَ لَيْلَةَ النَّحْرِ فَرَمَتِ الْجَمْرَةَ قَبْلَ الْفَجْرِ، ثُمَّ مَضَتْ فَأَفَاضَتْ، وَكَانَ ذَلِكَ الْيَوْمُ الْيَوْمَ الَّذِي يَكُونُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - تَعْنِي - عِنْدَهَا.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: شەوی جەژنی قوربان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئوم سەلەمەی نارد لە پێش بەرە بەیاندا شەیتانی ڕەجم کرد، لەپاشدا لەوێوە ڕۆشت بۆ تەواف (الإفاضة) واتە تەوافی ماڵی خوا، ئینجا گەڕایەوە بۆ مینا، بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەسەرە دەچوو بۆ ماڵی هاوسەرەکانی ئەو ڕۆژەش سەرەی ئوم سەلەمە بوو.

١٩٤٣ - (صحيح) عَنْ أَسْمَاءَ أَنَّهَا رَمَتِ الْجَمْرَةَ، قُلْتُ: إِنَّا رَمَيْنَا الْجَمْرَةَ بِلَيْلٍ، قَالَتْ: إِنَّا كُنَّا نَصْنَعُ هَذَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەسمائەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە شەیتانی ڕەجم کرد، ڕاوی وتی: وتم: ئێمە لەشەودا شەیتانمان ڕەجم دەکرد، ئەسما وتی: ئێمەش لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم وامان دەکرد.

١٩٤٤ - (صحيح) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: أَفَاضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَيْهِ السَّكِينَةُ، وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَرْمُوا بِمِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ وَأَوْضَعَ فِي وَادِي مُحَسِّرٍ.

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لەسەرخۆ و بەویقارەوە لە موزدەلیفەوە گەڕایەوە، فەرمانی پێدان کە ئەو بەردانەی رەجمی شەیتانی پێدەکەن بە ئەندازەی دەنکە پاقلەیە بن، لە شیوی (مُحَسِّر) کە شیوێکە لە نێوان موزدەلیفە و مینادا بە سواری وشترەکەیەوە بەپەلە رێی دەکرد.

## باسی رۆژی حەجی گەورە.

## ٦٧ – باب يَوْمِ الْحَجِّ الأَكْبَرِ.

١٩٤٥ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَفَ يَوْمَ النَّحْرِ بَيْنَ الْجَمَرَاتِ فِي الْحَجَّةِ الَّتِي حَجَّ فَقَالَ: (أَيُّ يَوْمٍ هَذَا؟). قَالُوا: يَوْمُ النَّحْرِ، قَالَ: (هَذَا يَوْمُ الْحَجِّ الأَكْبَرِ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لە رۆژی جەژنی قوربانی حەجی ماڵئاواییدا لەنێوان بەردەکاندا راوەستا ئەو بەردانەی کە حاجیەکان وردە

بەردیان تێ دەگرن فەرمووی: (ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟). وتیان: ڕۆژی جەژنی قوربانە، فەرمووی: (ئەمڕۆ ڕۆژی حەجی گەورەیە).

١٩٤٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: بَعَثَنِي أَبُو بَكْرٍ فِيمَنْ يُؤَذِّنُ يَوْمَ النَّحْرِ بِمِنًى: أَنْ لاَ يَحُجَّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ، وَلاَ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ، وَيَوْمُ الْحَجِّ الأَكْبَرِ: يَوْمُ النَّحْرِ، وَالْحَجُّ الأَكْبَرُ: الْحَجُّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەبو بەکر منی لەناو ئەو جاڕچیانەدا نارد کە لە ڕۆژی جەژنی قورباندا لە مینا بڵێین: لەدوای ئەمساڵ ئیتر نابێ هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەر حەج بکات، نابێ کەس بەڕوتی تەواف ماڵی خوا بکات، ڕۆژی حەجی گەورە: ڕۆژی جەژنە کە یەکەم ڕۆژی قوربانی کردنە، (الْحَجّ الأكْبَر): حەجی تەواوە – (حج الأصغر)حەجی بچوك: عومرەیە - ).

## باسی مانگە حەڕامەکان: (ذُو الْقَعْدَةِ، ذُو الْحِجَّةِ، الْمُحَرَّمُ، رَجَب).

## ٦٨ - باب الأَشْهُرِ الْحُرُمِ.

١٩٤٧ - (صحيح) عَنْ أَبِى بَكْرَةَ، أَنَّ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطَبَ فِى حَجَّتِهِ، فَقَالَ: (إِنَّ الزَّمَانَ قَدِ اسْتَدَارَ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ خَلَقَ اللَّهُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ، السَّنَةُ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا، مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ، ثَلاَثٌ مُتَوَالِيَاتٌ: ذُو الْقَعْدَةِ وَ ذُو الْحِجَّةِ وَالْمُحَرَّمُ، وَرَجَبُ مُضَرَ الَّذِى بَيْنَ جُمَادَى وَشَعْبَانَ».

واتە: لە (أبی بَكْرَة)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەو حەجەدا کردی کە بەناوبانگە بە حەجی ماڵاوایی وتاری دەدا، فەرمووی: (زەمان سوڕاوەتەوە سەر ئەو شێوەیەی خۆی کە خوای گەورە ئاسمانەکان و زەوی دروستکرد، ساڵ دوانزە مانگە، چواریان حەرامن و خاوەن قەدر و رێزن جەنگ تیایاندا حەرامە، سیانیان بەدوای یەکدا دێن کە بریتین لە: (ذُو القَعدَة، ذُو الحِجَّة، مُحَرَم)، ئەوی تریشیان تەنیایە کە پێی دەوترێت: (رَجَب)ی هۆزی (مُضَر) چونکە کە هۆزی (مُضَر) زۆر قەدری ئەم مانگە دەگرن کە دەکەوێتە نێوان مانگی(جُمَادَى الثاني) و مانگی (شَعبَان)ەوە.

١٩٤٨ - (صحيح) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَعْنَاهُ.

واتە: لە (أبی بکرة)وە، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم فەرمودەی پێشو بە هەمان مانا هاتووە.

## باسی کەسێ فریای راوەستانی عەرەفە نەکەوێت حەجەکەی دروست نیە.

## ٦٩ - باب مَنْ لَمْ يُدْرِكْ عَرَفَةَ.

١٩٤٩ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي يَعْمَرَ الدِّيلِيِّ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ بِعَرَفَةَ فَجَاءَ نَاسٌ - أَوْ نَفَرٌ - مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ، فَأَمَرُوا رَجُلاً فَنَادَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَيْفَ الْحَجُّ؟ فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلاً فَنَادَى: الْحَجُّ: الْحَجُّ يَوْمُ عَرَفَةَ، مَنْ جَاءَ قَبْلَ صَلاَةِ الصُّبْحِ مِنْ لَيْلَةِ جَمْعٍ فَتَمَّ حَجُّهُ، أَيَّامُ مِنًى ثَلاَثَةٌ، فَمَنْ تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ، وَمَنْ تَأَخَّرَ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ، قَالَ: ثُمَّ أَرْدَفَ رَجُلاً خَلْفَهُ، فَجَعَلَ يُنَادِي بِذَلِكَ. قَالَ أَبُو

دَاوُدَ: وَكَذَلِكَ رَوَاهُ مِهْرَانُ، عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: (الْحَجُّ الْحَجُّ). مَرَّتَيْنِ، وَرَوَاهُ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الْقَطَّانُ، عَنْ سُفْيَانَ قَالَ: (الْحَجُّ). مَرَّةً.

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحمن)ی کوڕی ئەبو یەعمەری دیلییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە عەرەفە بوو چوومە خزمەتی هەندێ لە خەڵکی نەجد هاتن پیاوێکیان کردە دەمڕاستی خۆیان هەر ئەو پیاوە بانگی لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کرد وتی: حەج کەیە؟ ئەویش فەرمانی دا بە پیاوێ کە جاڕبدات و بەدەنگی بەرز بڵێ: حەجی ڕاست و دروست حەجی ڕۆژی عەرەفەیە، هەرکەس شەوی موزدەلیفە بەر لە نوێژی بەیانی هاتبێ بۆ عەرەفە ئەوە حەجەکەی تەواوە، ڕۆژەکانی مینا سێ ڕۆژن، هەرکەسێ پەلە بکات و لە دوو ڕۆژدا ئەنجامیان بدات هیچ تاوانێکی ناگات، ئەوەشی دوای بخات و سێ ڕۆژ لە مینا بمێنێتەوە هیچ تاوانێکی ناگات، ڕاوی وتی: لەپاشدا پیاوێکی خستە پاشکۆی خۆیەوە کە ئەو جاڕبدات ئەوە بڵێت هەتا خەڵکی بیبیستن. ئەبو داود دەڵێت: هەروەها میهران لە سوفیانەوە گێڕاویەتیەوە، کە دووجار وتی: (الْحَجُّ الْحَجُّ). یەحیای کوڕی سەعیدی (قطان) لە سوفیانەوە گێڕاویەتیەوە، کە یەکجار وتی: (الْحَجُّ).

١٩٥٠ - (صحيح) عن عُرْوَةَ بْنُ مُضَرِّسٍ الطَّائِيُّ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْمَوْقِفِ - يَعْنِي بِجَمْعٍ - قُلْتُ: جِئْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مِنْ جَبَلِ طَيِّئٍ، أَكْلَلْتُ مَطِيَّتِي، وَأَتْعَبْتُ نَفْسِي، وَاللَّهِ مَا تَرَكْتُ مِنْ جَبَلٍ إِلاَّ

وَقَفْتُ عَلَيْهِ، فَهَلْ لِي مِنْ حَجٍ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ أَدْرَكَ مَعَنَا هَذِهِ الصَّلاَةَ وَأَتَى عَرَفَاتٍ قَبْلَ ذَلِكَ لَيْلاً أَوْ نَهَارًا فَقَدْ تَمَّ حَجُّهُ وَقَضَى تَفَثَهُ).

واتە: لە عوروەی کوڕی (مُضَرِّس الطائِيَ)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە موزدەلیفە چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە کێوی (طيئ)ەوە هاتووم، ولاخەکەم هیلاك و ماندو کردوە، نەفسی خۆشم هیلاك و ماندو کردوە، سوێند بە خوا هیچ کێوێکم تەرك نەکردوە ئیللا لەسەری راوەستاوم، ئایا حەجم بۆ هەیە واتە ئایا حەجەکەم راست و دروستە؟ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەوەی گەیشتبێ بەم نوێژەماندا واتە نوێژی بەیانی رۆژی جەژنی قوربان لەپێشدا هاتبێ بۆ عەرەفات لە شەودا بێ یان لە رۆژدا ئەوە حەجەکەی حەجی راست و دروستە، ئەو شتانە بکات کە لەسەریەتی لە دوای ئیحرام شکاندن وەك: سەرتاشین یان کورتکردنەوەی و خۆشتن و نینۆك کردن و هەڵکێشانی مووەکانی بن باڵ و لابردنی مووەکانی شەرمگای.

## باسی دابەزین لە مینا دوای ئەوەی کە حاجیەکان لە عەرەفەو لە موزدەلیفەوە هاتنەوە.

## ٧٠ - باب النُّزُولِ بِمِنًى.

١٩٥١ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مُعَاذٍ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: خَطَبَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّاسَ بِمِنًى، وَنَزَّلَهُمْ مَنَازِلَهُمْ، فَقَالَ: (لِيَنْزِلِ الْمُهَاجِرُونَ هَا هُنَا). وَأَشَارَ إِلَى مَيْمَنَةِ الْقِبْلَةِ: (وَالأَنْصَارُ هَا هُنَا). وَأَشَارَ إِلَى مَيْسَرَةِ الْقِبْلَةِ، (ثُمَّ لِيَنْزِلِ النَّاسُ حَوْلَهُمْ).

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی (مُعاذ)ەوە، لە یەکێ لە یارانی پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە مینا وتاری دەخوێندەوە شوێنی دابەزینی بۆ خەڵکەکە دیاریکرد، رووی لە قیبلە بوو فەرمووی: (با (مهاجرین) ئەو یارانەی کە لە مەککەوە کۆچیان کردوە بۆ مەدینە لێرەدا دابەزن) ئاماژەی کرد بۆ لای راستی قیبلە، (با (ئەنصار)یاریدەدەران لێرەدا دابەزن)، ئاماژەی کرد بۆ لای چەپی قیبلە، (لەپاشدا خەڵکەکەی تر با لە دەوری ئەوان دابەزن).

## باسی چ رۆژێ لە مینا وتار دەخوێندرێتەوە؟

## ٧١ - باب أَيِّ يَوْمٍ يَخْطُبُ بِمِنًى؟

١٩٥٢ - (صحيح) عَنْ رَجُلَيْنِ مِنْ بَنِي بَكْرٍ، قَالاَ: رَأَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ بَيْنَ أَوْسَطِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ، وَنَحْنُ عِنْدَ رَاحِلَتِهِ، وَهِيَ خُطْبَةُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الَّتِي خَطَبَ بِمِنًى.

واتە: لە دوو پیاوی هۆزی بەكرەوە هەتووە، كە وتویانە: پێغەمبەری خوامان دی صلی الله علیه وسلم لە رۆژی دوانزەی مانگی (ذی الحجة)دا كە دەكاتە سێیەم رۆژی جەژنی قوربان وتاری خوێندەوە، ئێمەش لە نزیك وڵاخەكەیەوە بووین، ئەم وتارەی كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە مینا خوێندیەوە لە رۆژی دوانزەی مانگی (ذی الحجة)دا لەگەڵ ئەو وتارەی كە رۆژی جەژنی قوربان كە دەكاتە دەی مانگی (ذی الحجة) لە مانادا یەك بوون.

١٩٥٣ - (ضعيف) عَنْ سَرَّاءَ بِنْتِ نَبْهَانَ، وَكَانَتْ رَبَّةَ بَيْتٍ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، قَالَتْ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الرُّءُوسِ، فَقَالَ: (أَيُّ يَوْمٍ هَذَا؟). قُلْنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: (أَلَيْسَ أَوْسَطَ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ؟).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَلِكَ قَالَ عَمُّ أَبِي حُرَّةَ الرَّقَاشِيِّ: إِنَّهُ خَطَبَ أَوْسَطَ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ.

واته: سەرڕائی کچی نەبهان، کە لەسەردەمی نەفامی دا خاوەنی ماڵێ بوو بتی تێدا بوو، دەڵێت: لە سێیەم ڕۆژی جەژنی قوربان کە دەکاتە ڕۆژی دوانزەی مانگی (ذی الحجة) پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتاری بۆ دەخوێندینەوە، فەرمووی: (ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟)، وتمان: خواو پێغەمبەرەکەی دەیزانن، فەرمووی: (ئایا ئەمڕۆ سێیەم ڕۆژی جەژنی قوربان نیە؟). ئەبو داود دەڵێت: هەروەها مامی ئەبو حوڕڕەی ڕەقاشی دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە سێیەم ڕۆژی جەژنی قورباندا کە دەکاتە ڕۆژی دوانزەی مانگی (ذی الحجة) وتاری خوێندەوە.

## باسی ئەوانەی کە دەڵێن: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە ڕۆژی جەژنی قورباندا وتاری خوێندەوە.

## ٧٢ – باب مَنْ قَالَ: خَطَبَ يَوْمَ النَّحْرِ.

١٩٥٤ - (حسن) عن الْهِرْمَاس بْنُ زِيَاد الْبَاهِلِيّ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ النَّاسَ عَلَى نَاقَتِهِ الْعَضْبَاءِ يَوْمَ الأَضْحَى بِمِنًى.

واتە: هیرماسی كوڕی زیادی باهیلی دەڵێت: پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم دی لە رۆژی جەژنی قورباندا لە مینا بەسواری وشترەكەیەوە كە ناوی (عَضبَاء) بوو وتاری دەخوێندەوە بۆ خەڵك.

١٩٥٥ - (صحيح) عن أَبَا أُمَامَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ خُطْبَةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِنًى يَوْمَ النَّحْرِ.

واتە: ئەبو ئومامە دەڵێت: گوێم لە وتارەكەی پێغەمبەری خوا بوو صلی الله علیه وسلم كە لە رۆژی جەژنی قورباندا لە مینا خوێندیەوە بۆ خەڵك.

## باسی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە چ كاتێكدا وتاری رۆژی جەژنی قوربانی خوێندەوە؟

## ٧٣ - باب أَيِّ وَقْتٍ يَخْطُبُ يَوْمَ النَّحْرِ؟

١٩٥٦ - (صحيح) عَنْ رَافِعِ بن عَمْرٍو الْمُزَنِيِّ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ النَّاسَ بِمِنًى حِينَ ارْتَفَعَ الضُّحَى عَلَى بَغْلَةٍ شَهْبَاءَ، وَعَلِيٌّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ يُعَبِّرُ عَنْهُ، وَالنَّاسُ بَيْنَ قَاعِدٍ وَقَائِمٍ.

واتە: رافعی كوڕی عەمری موزەننی دەڵێت: لە مینا پێغەمبەری خوام صلی الله علیە وسلم دی لەو كاتەدا كە نوێژی چێشتەنگاو(ضُحَى)ی تێدا ئەنجام دەدرێت بەسواری ئێسترێكی سپیەوە كە كەمێ مووی رەشی تێكەڵاو بوو وتاری دەخوێندەوە بۆ خەڵك، پێشەوا عەلیش رەزای خوای لێ بێ وتەكانی رادەگەیاند بەوانەی كە دووربون لێیەوەو دەنگیان نەدەبیست، خەڵكەكەش هەندێكیان بە پێوە بون، هەندێكیشیان دانیشتبون.

## باسی ئەوەی پێشنوێژ لەوتارەكەیدا باسی دەكات لە مینا.

## ٧٤ – باب مَا يَذْكُرُ الإِمَامُ فِي خُطْبَتِهِ بِمِنًى.

١٩٥٧ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مُعَاذٍ التَّيْمِيِّ، قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ بِمِنًى، فَفُتِحَتْ أَسْمَاعُنَا، حَتَّى كُنَّا نَسْمَعُ مَا يَقُولُ، وَنَحْنُ فِي مَنَازِلِنَا! فَطَفِقَ يُعَلِّمُهُمْ مَنَاسِكَهُمْ حَتَّى بَلَغَ الْجِمَارَ، فَوَضَعَ أُصْبُعَيْهِ السَّبَّابَتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: (بِحَصَى الْخَذْفِ). ثُمَّ أَمَرَ الْمُهَاجِرِينَ فَنَزَلُوا فِي مُقَدَّمِ الْمَسْجِدِ، وَأَمَرَ الأَنْصَارَ فَنَزَلُوا مِنْ وَرَاءِ الْمَسْجِدِ، ثُمَّ نَزَلَ النَّاسُ بَعْدَ ذَلِكَ.

واتە: (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی (مُعَاذ)ی تـەیمی دەڵێـت: لـە مینـا پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم وتـاری بـۆ دەدایـن، ئێمـە لـە مـەنزلگاكانی خۆمانـدا گوێمان كرایـەوە بیسـتنمان فـراوان و بـەهێز بـوو هـەتا وتـەكانیمان دەبیسـت و دەمـانزانی چـی دەفـەرموێت ئەمـەش لـە بەرەكـەتی دەنگیـەوە بـوو، جـا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەحكام و دروشمەكانی حـەجی فێركـردن و بـۆی رونكردنـەوە هـەتا لـە وتارەكەیـدا گەیشـتە باسـی ئـەو شـتانەی كـە پەیوەندیان هەیە بە شەیتان رەجمەوە، ئاماژەی بە چۆنیەتی بەردەكە كرد كـە بەئەنـدازەی دەنكـە پاقلەیەكـە - لـە ریوایەتێكـدا هـاتووە كـە سـەری هـەردوو پەنجەی شایەتومانی كرد بەناو كونی گوێكانیدا بۆ ئەوەی زیاتر دەنگی بـڕوات و لەدورەوە دەنگی ببیستن - لەپاشـدا فـەرمانی دا بـە كۆچـكەران لـە پێشـەوەی مزگەوت دابەزن، وە فەرمانی دا بە یاریدەدەران لە پشتەوەی مزگەوت دابـەزن، لەپاشدا خەڵكەكەی تر با لە دەوری ئەوان دابەزن.

## باسی حوكمی مانەوە لە مەككە لەشەوەكانی مینادا.

## ٧٥ - باب يَبِيتُ بِمَكَّةَ لَيَالِيَ مِنًى.

١٩٥٨ - (ضعيف) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ فَرُّوخٍ يَسْأَلُ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: إِنَّا نَتَبَايَعُ بِأَمْوَالِ النَّاسِ، فَيَأْتِي أَحَدُنَا مَكَّةَ فَيَبِيتُ عَلَى الْمَالِ؟ فَقَالَ: أَمَّا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبَاتَ بِمِنًى وَظَلَّ.

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی فەڕوخەوە هاتووە، کە پرسیاری کرد لە ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ، وتی: ئێمە لە مەککە ماڵ و سامانمان دەکڕی بە گۆڕینەوەی ماڵ بە ماڵ بۆیە یەکێ لە ئێمە بۆ پاراستنی ئەو ماڵ و سامانە لە شەوەکانی مینادا لە مەککە دەمایەوە؟ ئیبنو عومەر وتی: بەڵام پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم شەو و ڕۆژ لە مینا دەمایەوە.

١٩٥٩ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: اسْتَأْذَنَ الْعَبَّاسُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَبِيتَ بِمَكَّةَ لَيَالِيَ مِنًى مِنْ أَجْلِ سِقَايَتِهِ فَأَذِنَ لَهُ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: عەباس ڕوخسەتی خواست لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە ڕێی بدات شەوەکانی مینا لە مەککە بمێنێتەوە، لەبەر ئاودان بە حاجیان، ئەویش ڕێگەی دا.

## باسی نوێژکردن لە مینا واتە: ئایا نوێژە چوار رکاتیەکان تێیدا کورت دەکرێنەوە یان نا؟

## ٧٦ - باب الصَّلاَةِ بِمِنًى.

١٩٦٠ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، قَالَ: صَلَّى عُثْمَانُ بِمِنًى أَرْبَعًا، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَكْعَتَيْنِ، وَمَعَ أَبِي بَكْرٍ رَكْعَتَيْنِ، وَمَعَ عُمَرَ رَكْعَتَيْنِ - زَادَ عَنْ حَفْصٍ وَمَعَ عُثْمَانَ صَدْرًا مِنْ إِمَارَتِهِ ثُمَّ أَتَمَّهَا - زَادَ مِنْ هَا هُنَا عَنْ أَبِي مُعَاوِيَةَ: ثُمَّ تَفَرَّقَتْ بِكُمُ الطُّرُقُ، فَلَوَدِدْتُ أَنَّ لِي مِنْ أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ رَكْعَتَيْنِ مُتَقَبَّلَتَيْنِ. قَالَ الأَعْمَشُ: فَحَدَّثَنِي مُعَاوِيَةُ بْنُ قُرَّةَ عَنْ أَشْيَاخِهِ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ صَلَّى أَرْبَعًا، قَالَ: فَقِيلَ لَهُ: عِبْتَ عَلَى عُثْمَانَ ثُمَّ صَلَّيْتَ أَرْبَعًا؟! قَالَ: الْخِلاَفُ شَرٌّ.

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی یەزیدەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێشەوا (عثمان) رەزای خوای لێ بێ لە مینا چوار رکات نوێژی کرد، (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی مەسعود وتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم لە مینا

دوو رکات نوێـژم کـردوە، هـەروەها لەگـەڵ ئـەبو بـەکر و عومەریشـدا رەزای خوایان لێ بێ بە هەمان شێوە، - راوی لە حیفصـەوە ئەمـەی بـۆ زیـاد کـرد: وە لەگـەڵ پێشـەوا (عثمَـان)یشـدا رەزای خـوای لـێ بـێ لەسـەرەتای دەسـەڵاتیەوە، لەپاشدا لە کۆتایی دەسەڵاتیەوە چوار رکاتی دەکـرد – راوی ئـا لێـرەدا لـە ئـەبو موعاویەوە ئەمەی بۆ زیاد کرد: ئینجا رێگەکانی ئەنجامـدانی نوێـژ جیاوازیـان تێکەوت هەنـدێکیان دوو رکاتیـان دەکـرد، هەندێکیشـیان چـوار رکاتیـان دەکـرد، خۆزگە پێشەوا (عثمَان) دوو رکاتی بکردایە وەك چۆن پێغەمبـەری خـوا صلی الله علیـه وسـلم و ئـەبو بـەکر و عومـەر دوو رکاتیـان دەکـرد، ئەعمـەش وتـی: موعاویەی کوڕی قوررە لە شێخەکانیەوە گێڕاویەتیەوە، کە (عَبْدُ الله) لـە مینـا چـوار رکـات نوێـژی کـرد، وتـی: پێـی وتـرا: تـۆ رەخنـەت لـە پێشـەوا (عثمَـان) دەگـرت کەچـی خـۆت چـوار رکـات نوێـژت کـرد؟ (عَبْـدُ اللـه) وتـی: جوڵانـەوە پێچەوانەی پێشەواو کاربەدەستان خراپەو بەڵایە.

١٩٦١ - (ضعيف) عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَنَّ عُثْمَانَ إِنَّمَا صَـلَّى بِمِنًـى أَرْبَعًـا لأَنَّهُ أَجْمَعَ عَلَى الإِقَامَةِ بَعْدَ الْحَجِّ.

واتە: لە زوهریەوە هاتووە، کە پێشەوا (عثمَان) رەزای خوای لێ بێ لـە مینـا چـوار رکـات نوێـژی کـرد چـونکە سـوربوو لەسـەرئەوەی کـە لـەدوای حـەج لـە مەککە چەند رۆژێ بمێنێتەوە.

١٩٦٢ - (ضعيف) عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَـالَ: إِنَّ عُثْمَـانَ صَـلَّى أَرْبَعًـا لأَنَّـهُ اتَّخَذَهَا وَطَنًا.

واتە: لە ئیبراهیمەوە هاتووە، کە وتویەتی: بێگومان پێشەوا (عُثمَان) ڕەزای خوای لێ بێ لە مینا چوار ڕکات نوێژی کرد چونکە خۆی لەسەفەری ڕزگار کردو نیەتی مانەوەی هێنا.

١٩٦٣ - (ضعيف) عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: لَمَّا اتَّخَذَ عُثْمَانُ الأَمْوَالَ بِالطَّائِفِ وَأَرَادَ أَنْ يُقِيمَ بِهَا صَلَّى أَرْبَعًا، قَالَ: ثُمَّ أَخَذَ بِهِ الأَئِمَّةُ بَعْدَهُ.

واتە: لە زوهریەوە هاتووە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێشەوا (عُثمَان) ڕەزای خوای لێ بێ لە (طائِف) ماڵ و شمەکی کڕی ویستی لەوێ بمێنێتەوە چوار ڕکات نوێژی کرد، زوهری وتی: لەپاشدا کاربەدەستان و پێشەوایانی دوای خۆی بە تەواوی نوێژیان دەکردو کورتیان نەدەکردەوە.

١٩٦٤ - (حسن) عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ أَتَمَّ الصَّلاَةَ بِمِنًى مِنْ أَجْلِ الأَعْرَابِ، لأَنَّهُمْ كَثُرُوا عَامَئِذٍ، فَصَلَّى بِالنَّاسِ أَرْبَعًا لِيُعْلِمَهُمْ أَنَّ الصَّلاَةَ أَرْبَعٌ.

واتە: لە زوهریەوە هاتووە، کە پێشەوا (عُثمَان)ی کوڕی عەففان ڕەزای خوای لێ بێ لە مینا نوێژی بە تەواوی دەکرد لە پێناوی دەشتەکیەکاندا، چونکە لەو ساڵەدا زۆر زۆر بوون، چوار ڕکات نوێژی کرد بۆ ئەوەی فێریان بکات کە نوێژ چوار ڕکاتە.

# باسی خەڵکی مەککە لە حەجدا نوێژ کورت دەکەنەوە یان نا؟

## ٧٧ - باب الْقَصْرِ لأَهْلِ مَكَّةَ.

١٩٦٥ - (صحيح) عَنْ حَارِثَةَ بْنِ وَهْبٍ الْخُزَاعِيِّ - وَكَانَتْ أُمُّهُ تَحْتَ عُمَرَ فَوَلَدَتْ لَهُ عُبَيْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ - قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِنًى وَالنَّاسُ أَكْثَرُ مَا كَانُوا، فَصَلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ فِى حَجَّةِ الْوَدَاعِ.
قَالَ أَبو دَاوُدَ: حَارِثَةُ مِنْ خُزَاعَةَ وَدَارُهُمْ بِمَكَّةَ.

واتە: (حارِثة)ی کوڕی وەهەبی خوزاعی – کە دایکی شوی کردبوو بە پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) ڕەزای خوای لێ بێ، (عُبَيْد الله) لەو ژنەی بوو - دەڵێت: لەدوای پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم لە مینا نوێژم کردوە لەوکاتەدا ژمارەی خەڵکەکە زۆر زۆر بوو، دوو ركات نوێژی بۆ کردین لە حەجی ماڵاوایی دا. ئەبو داود دەڵێت: (حارِثة) لە هۆزی خوزاعە بوو ماڵەکانیان لە مەککە بوو واتە خەڵکی مەککە بوون.

# باسی سەبارەت بە رەجمی شەیتان.

## ٧٨ – باب فِي رَمْيِ الْجِمَارِ.

بێگومان لە یەکەم رۆژی جەژندا حاجیەکان تەنیا رەمی (جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ) دەکەن، کاتەکەی لەدوای خۆر هەڵاتنەوە دەست پێ دەکات هەتا خۆر ئاوا بوون، سێ رۆژەکەی تر هەرسێکیان رەجم دەکرێن و کاتەکەشی لەدوای خۆر لادان لەناوەڕاستی ئاسمانەوە دەست پێ دەکات واتە لەدوای نوێژی نیوەڕۆوە.

١٩٦٦ - (حسن) عَنْ عَمْرِو بْنِ الأَحْوَصِ، عَنْ أُمِّهِ، قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرْمِي الْجَمْرَةَ مِنْ بَطْنِ الْوَادِي، وَهُوَ رَاكِبٌ يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ، وَرَجُلٌ مِنْ خَلْفِهِ يَسْتُرُهُ، فَسَأَلْتُ عَنِ الرَّجُلِ؟ فَقَالُوا: الْفَضْلُ بْنُ الْعَبَّاسِ، وَازْدَحَمَ النَّاسُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ لاَ يَقْتُلْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا، وَإِذَا رَمَيْتُمُ الْجَمْرَةَ فَارْمُوا بِمِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ).

واتە: لە عەمری کوڕی ئەحوەصەوە، لە دایکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوام صلى الله عليه وسلم بینی لەناو شیوەکەوە بە سواری وشترەکەیەوە رەمی (جَمْرَةَ العَقَبَةِ)ی دەکرد واتە: رەجمی شەیتانی دەکرد، لەگەڵ هەر بەردێکدا کە دەیهاویشت (الله أكبر)ی دەکرد، پیاوێ لەدوایەوە سێبەری بۆ کردبوو یان دەیپاراست بۆ ئەوەی بەردی بەر نەکەوێت، دەربارەی

ئەو پیاوە پرسیارم کرد؟ وتیان: ئەوە (فضل)ی کوڕی عەباسە رەزای خوایان لێ بێ، خەڵکەکە هێرشیان برد بۆ رەجمی شەیتان و کردیانە قەرەباڵغی، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (ئەی خەڵکینە یەکتری مەکوژن بەو هێرش بردن و قەرەباڵغیە بیانکەن بە ژێرەوە یان بە بەردەکان بە تایبەتی ئەگەر گەورە بوون، ئەگەر شەیتانتان رەجم کرد بە بەدردێ رەجمی بکەن بە ئەندازەی دەنکە پاقلەیە بێت).

**١٩٦٧ - (صحيح) عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ عَمْرِو بْنِ الأَحْوَصِ، عَنْ أُمِّهِ، قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَ جَمْرَةِ الْعَقَبَةِ رَاكِبًا، وَرَأَيْتُ بَيْنَ أَصَابِعِهِ حَجَرًا فَرَمَى وَرَمَى النَّاسُ.**

واتە: لە سولەیمانی کوڕی عەمری کوڕی ئەحوەصەوە، لە دایکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەلای (جَمْرَةَ الْعَقَبَة) پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم بینی بە سواری وشترەکەیەوە، وە لەنێوان پەنجەکانیدا وردە بەردی رەمی (جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ)ی کرد، خەڵەکەکەش لەگەڵیا رەمیان کرد، واتە شەیتانیان رەجم کرد.

**١٩٦٨ - (صحيح) عن يَزِيد بْنُ أَبِي زِيَادٍ، بِإِسْنَادِهِ فِي مِثْلِ هَذَا الْحَدِيثِ، زَادَ: وَلَمْ يَقُمْ عِنْدَهَا.**

واتە: یەزیدی کوڕی ئەبو زیاد وەك فەرمودەی پێشوی گێڕاوەتەوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە یەکەم رۆژی جەژندا لەلای (جَمْرَةَ الْعَقَبَة)دا رانەوەستا.

١٩٦٩ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّهُ كَانَ يَأْتِي الْجِمَارَ فِي الأَيَّامِ الثَّلاَثَةِ بَعْدَ يَوْمِ النَّحْرِ، مَاشِيًا: ذَاهِبًا وَرَاجِعًا، وَيُخْبِرُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە لە سێ رۆژی دوای یەكەم رۆژی جەژنی قورباندا بەپێ دەهات بۆ شەیتان رەجم و بە پێش دەگەڕایەوە، هەواڵی دەداو رایدەگەیاند كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وەهای دەكرد.

١٩٧٠ – (صحيح) عن جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرْمِي عَلَى رَاحِلَتِهِ يَوْمَ النَّحْرِ، يَقُولُ: (لِتَأْخُذُوا مَنَاسِكَكُمْ، فَإِنِّي لاَ أَدْرِي لَعَلِّي لاَ أَحُجُّ بَعْدَ حَجَّتِي هَذِهِ).

واتە: جابری كوڕی (عَبْدُ اللَّه) دەڵێت: پێغەمبەری خوام دی صلى الله عليه وسلم لە رۆژی جەژنی قورباندا بە سواری وڵاخەكەیەوە رەجمی شەیتانی دەكرد، دەیفەرموو: (ئەركان و دروشمەكانی حەج لە خۆمەوە فێربن و وەری بگرن، چەنكە نازانم لەوانەیە لەدوای ئەم حەجەوە ئیتر حەجی تر نەكەم).

١٩٧١ - (صحيح) عن جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَرْمِي عَلَى رَاحِلَتِهِ يَوْمَ النَّحْرِ ضُحًى، فَأَمَّا بَعْدَ ذَلِكَ فَبَعْدَ زَوَالِ الشَّمْسِ.

واتـە: جـابری کـوڕی (عَبـدُ اللّـه) دەڵێـت: پێغەمبـەری خـوام صـلی الله علیـه وسـلم دی لـە یەکـەم ڕۆژی جـەژنی قوربانـدا لـەکاتی چێشـتەنگاودا ڕەجمـی شەیتانی دەکرد، بەڵام ڕۆژەکانی تر لەدوای نیوەڕۆوە ڕەجمی شەیتانی دەکرد.

١٩٧٢ - (صحيح) عَنْ وَبَرَةَ، قَـالَ: سَـأَلْتُ ابْـنَ عُمَـرَ مَتَـى أَرْمِـي الْجِمَارَ؟ قَالَ: إِذَا رَمَى إِمَامُكَ فَـارْمِ، فَأَعَـدْتُ عَلَيْـهِ الْمَسْأَلَةَ، فَقَالَ: كُنَّا نَتَحَيَّنُ زَوَالَ الشَّمْسِ فَـإِذَا زَالَـتِ الشَّمْسُ رَمَيْنَا.

واتە: وەبەرە دەڵێـت: سـەبارەت بـەکاتی شـەیتان ڕەجمـی دوای یەکـەم ڕۆژی جەژن لە ئیبنو عومەرم ڕەزای خوایان لێ بێ پرسـی؟ وتـی: کـاتێ کـە ڕابـەر و پێشـەواکەت ڕەجمـی شـەیتانی کـرد تـۆش ڕەجمـی بکـە واتـە شـوێن ڕابـەر و پێشەواکەت بکەوە، پرسیارەکەم لێ دووپات کردەوە، وتـی: ئێمـە چاوەڕێی کـاتی خۆر لادانمان دەکرد لە ناوەڕاستی ئاسمان کـاتێ کـە لایدایـە واتـە دوای نیـوەڕۆ، ئەو کاتە ڕەجمی شەیتانمان دەکرد.

١٩٧٣ - (صحيح إلا قول: (حِينَ صَلَّى الظُّهْرَ) فهو منكر) عَـنْ عَائِشَـةَ قَالَتْ: أَفَاضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ مِـنْ آخِرِ يَوْمِهِ حِينَ صَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى مِنًى، فَمَكَثَ بِهَا لَيَالِيَ أَيَّـامِ التَّشْـرِيقِ يَرْمِـي الْجَمْـرَةَ إِذَا زَالَـتِ الشَّمْسُ، كُلَّ جَمْرَةٍ بِسَـبْعِ حَصَـيَاتٍ يُكَبِّـرُ مَـعَ كُـلِّ

حَصَاةٍ، وَيَقِفُ عِنْدَ الأُولَى وَالثَّانِيَةِ فَيُطِيلُ الْقِيَامَ وَيَتَضَرَّعُ، وَيَرْمِي الثَّالِثَةَ وَلاَ يَقِفُ عِنْدَهَا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە دەوری کەعبەدا سوڕایەوە واتە تەواف(الإفاضة)ی کرد لە کۆتا رۆژی جەژنی قوربانـدا ئەوکاتەی کە نوێـژی نیـوەڕۆی کـرد - ئەوکاتەی کە نوێژی نیوەڕۆی کرد جێگیر و لەبەرکراو نیە - ، ئینجا گەڕایەوە بۆ مینا، شەوەکانی سێ رۆژەی دوای یەکەم رۆژی جەژن لە مینا مایەوە، کاتێ کە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدەدا واتە دوای نیوەڕۆان رەجمی شەیتانی دەکرد، هەر یەکەی بە حەوت بەرد رەجمی دەکردن، لەگەڵ هەر بەردێکدا کە دەیهاویشت (الله أكبر)ی دەکرد، لەلای یەکەم و دووەمدا ئەوەستا درێژەی بە وەستانەکانی دەداو بەگەردنکەچیەوە لە خوا دەپاڕایەوە، لەپاشدا سێیەمی رەجم دەکردو لەلایدا نەدەوەستا.

١٩٧٤ - (صحيح) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، قَالَ: لَمَّا انْتَهَى إِلَى الْجَمْرَةِ الْكُبْرَى جَعَلَ الْبَيْتَ عَنْ يَسَارِهِ وَمِنًى عَنْ يَمِينِهِ، وَرَمَى الْجَمْرَةَ بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، وَقَالَ: هَكَذَا رَمَى الَّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە گەیشتە (جَمْرَةِ الْكُبْرَى) کەعبەی خستە لای چەپی خۆیەوەو مینای خستە لای راستی خۆیەوە، حەوت بەردی گرتە (جَمْرَةِ الْكُبْرَى)، وتی: ئا بەم شێوەیە حەوت بەردی گرتە (جَمْرَةِ الْكُبْرَى) ئەو کەسەی کە سورەتی (البقرة)ی بۆ دابەزی —

بۆیە سورەتی (البقرة)ی تایبەت کرد چونکە باسی زۆربەی ئەحکامەکانی حەجی تێدایە - .

١٩٧٥ - (صحيح) عَنْ أَبِي الْبَدَّاحِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَخَّصَ لِرِعَاءِ الإِبِلِ فِي الْبَيْتُوتَةِ يَرْمُونَ يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ يَرْمُونَ الْغَدَ، وَمِنْ بَعْدِ الْغَدِ بِيَوْمَيْنِ، وَيَرْمُونَ يَوْمَ النَّفْرِ.

واتە: لە ئەبو بەدداحی کوڕی عاصیمەوە، لە باوکیەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم روخسەتی دا بە وشترەوانەکان لە مینا نەمێننەوە لەگەڵ وشترەکانیاندا بڕۆن یەکەم رۆژی جەژنی قوربانـدا رەمی (جَمْرَةَ الْعَقَبَة) بکەن واتە شەیتان رەجم بکەن، لەپاشدا رۆژی دوای یەکەم رۆژی جەژن شەیتان رەجم بکەن کە دەکاتە رۆژی یانزەهەمی مانگی (ذی الحجة)، وە دووەم رۆژی دوای یەکەم رۆژی جەژن شەیتان رەجم بکەن کە دەکاتە رۆژی دوانزەهەمی مانگی (ذی الحجة)، هەروەها ئەو رۆژەش کە لە مینا بە یەکجاری دەگەڕێنەوە شەیتان رەجم بکەن کە دەکاتە رۆژی سیانزەهەمی مانگی (ذی الحجة).

١٩٧٦ - (صحيح) عَنْ أَبِي الْبَدَّاحِ بْنِ عَدِيّ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَخَّصَ لِلرِّعَاءِ أَنْ يَرْمُوا يَوْمًا وَيَدَعُوا يَوْمًا.

واتە: لە ئەبو بەدداحی كوڕی عەدییەوە، لە باوكیەوە هاتووە، كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم روخسەتی دا بە وشترەوانەكان كە رۆژێ شەیتان رەجم بكەن و رۆژێ نەیكەن.

**١٩٧٧ - (صحيح) عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا مِجْلَزٍ يَقُولُ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ شَىْءٍ مِنْ أَمْرِ الْجِمَارِ، فَقَالَ: مَا أَدْرِى أَرَمَاهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِسِتٍّ أَوْ بِسَبْعٍ.**

واتە: قەتادە دەڵێت: لە میجلەزم بیست دەیوت: سەبارەت بە ژمارەی بەردەكان كە شەیتان رەجمی پێ دەكرێت لە ئیبنو عەباسم رەزای خوایان لێ بێ پرسی؟ ئیبنو عەباس وتی: نازانم كە ئایا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە حەوت بەرد یان بە شەش بەرد رەجمی شەیتانی دەكرد – بێگومان چەسپاوە كە بە حەوت بەرد رەجمی شەیتانی كردوە - .

**١٩٧٨ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِذَا رَمَى أَحَدُكُمْ جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ فَقَدْ حَلَّ لَهُ كُلُّ شَىْءٍ إِلاَّ النِّسَاءَ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا حَدِيثٌ ضَعِيفٌ، الْحَجَّاجُ لَمْ يَرَ الزُّهْرِيَّ وَلَمْ يَسْمَعْ مِنْهُ.**

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەركەس لە ئێوە یەكەم رۆژی جەژن

رەمی (جَمْرَةَ العَقَبَةَ)ی کرد هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵ دەبێ جگە لە ئافرەت واتە جگە لە هاوسەرەکەی). ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرمودە لاوازە، حەجاج زوهری نەبینیوە و هیچی لێ نەبیستوە.

## باسی سەرتاشین و کورتکردنەوەی.

## ٧٩ - باب الْحَلْقِ وَالتَّقْصِيرِ.

**١٩٧٩ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (اللَّهُمَّ ارْحَمِ الْمُحَلِّقِينَ). قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَالْمُقَصِّرِينَ، قَالَ: (اللَّهُمَّ ارْحَمِ الْمُحَلِّقِينَ). قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَالْمُقَصِّرِينَ، قَالَ: (وَالْمُقَصِّرِينَ).**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خودایە رەحم بکە بەوانەی لەپاش حەج و عومرە سەریان دەتاشن)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەوانەش کە مووی سەریان کورت دەکەنەوە، فەرمووی: (خودایە رەحم بکە بەوانەی لەپاش حەج و عومرە سەریان دەتاشن)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەوانەش کە مووی سەریان کورت دەکەنەوە، فەرمووی: (بەوانەش کە مووی سەریان کورت دەکەنەوە).

١٩٨٠ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَر، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَلَقَ رَأْسَهُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبـەری خوا صلى الله عليه وسلم لە حەجی مالآوایی فەرمانی دا کە سەری بتاشن.

١٩٨١ - (صحيح) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى مَنْزِلِهِ بِمِنًى فَدَعَا بِذِبْحٍ فَذُبِحَ، ثُمَّ دَعَا بِالْحَلَّاقِ فَأَخَذَ بِشِقِّ رَأْسِهِ الأَيْمَنِ فَحَلَقَهُ، فَجَعَلَ يَقْسِمُ بَيْنَ مَنْ يَلِيهِ الشَّعْرَةَ وَالشَّعْرَتَيْنِ، ثُمَّ أَخَذَ بِشِقِّ رَأْسِهِ الأَيْسَرِ فَحَلَقَهُ، ثُمَّ قَالَ: (هَا هُنَا أَبُو طَلْحَةَ). فَدَفَعَهُ إِلَى أَبِي طَلْحَةَ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبـەری خـوا صلى الله عليه وسلم یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان ڕەمی (جَمْرَةَ الْعَقَبَة)ی کـرد، لەپاشـدا گەڕایـەوە بـۆ مەنزڵگاکـەی لـە مینـا داوای ئـاژەڵی قوربـانی کـرد بۆیـان هێنـا قوربانی کرد، ئینجا سەرتاشی بانگ کرد سەرتاشەکە لای ڕاستی سـەری گـرت و تاشی، مووەکانی بەشکرد هی وا هەبوو یەك تەڵ مووی دەدایـە هـی واش هـەبوو دوو تەڵی دەدایە، لەپاشدا لای چەپی سـەری گـرت و تاشـی، ئینجا مووەکـانی دا بە ئەبو (طلحَة) بۆ ئەوەی دابەشی بکات بەسەریاندا.

**١٩٨٢ - (صحيح) عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّان، بِإِسْنَادِهِ بِهَذَا قَالَ فِيهِ: قَالَ لِلْحَالِقِ: (ابْدَأْ بِشِقِّي الأَيْمَنِ فَاحْلِقْهُ).**

واتە: لە هیشامی کوڕی حەسسانەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان هاتووە تێیدا وتی: بە سەرتاشەکەی فەرموو: (لەلای راستەوە دەست پێ بکە ئەویش سەری تاشی).

**١٩٨٣ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُسْأَلُ يَوْمَ مِنًى فَيَقُولُ: (لاَ حَرَجَ). فَسَأَلَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنِّي حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ، قَالَ: (اذْبَحْ وَلاَ حَرَجَ). قَالَ: إِنِّي أَمْسَيْتُ وَلَمْ أَرْمِ، قَالَ: (ارْمِ وَلاَ حَرَجَ).**

واتە: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: خەڵکەکە لە مینا سەبارەت بە پاش و پێشی کارەکانی رۆژی جەژن پرسیاریان کرد لە پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم ئەویش دەیفەرموو: (هیچی تێدا نیە قەیناکات)، پیاوێ لێی پرسی وتی: من نەمزانی سەرم تاشی پێش ئەوەی قوربانی بکەم، فەرمووی: (سەری ببڕە هیچی تێدا نیەو قەیناکات)، یەکێکی تر وتی: ئەوا من ئێوارەم لێ هاتووە ڕەجمی شەیتانم نەکردوە، فەرمووی: (بڕۆ ڕەجمی بکە هیچی تێدا نیەو قەیناکات).

١٩٨٤ - (صحيح بما بعده) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَيْسَ عَلَى النِّسَاءِ حَلْقٌ، إِنَّمَا عَلَى النِّسَاءِ التَّقْصِيرُ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئافرەتان سەرتاشینیان لەسەر نیە، بەڵام کورتکردنەوەی قژیان لەسەرە).

١٩٨٥ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَيْسَ عَلَى النِّسَاءِ حَلْقٌ، إِنَّمَا عَلَى النِّسَاءِ التَّقْصِيرُ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئافرەتان سەرتاشینیان لەسەر نیە، بەڵام کورتکردنەوەی قژیان لەسەرە).

# باسی عومره.

## ٨٠ - باب الْعُمْرَةِ.

١٩٨٦ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَر، قَالَ: اعْتَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَبْلَ أَنْ يَحُجَّ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم عومرەی كرد پێش ئەوەی حەج بكات.

١٩٨٧ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: وَاللَّهِ مَا أَعْمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَائِشَةَ فِي ذِي الْحِجَّةِ إِلاَّ لِيَقْطَعَ بِذَلِكَ أَمْرَ أَهْلِ الشِّرْكِ، فَإِنَّ هَذَا الْحَيَّ مِنْ قُرَيْشٍ وَمَنْ دَانَ دِينَهُمْ كَانُوا يَقُولُونَ: إِذَا عَفَا الْوَبَرْ، وَبَرَأَ الدَّبَرْ، وَدَخَلَ صَفَرْ، فَقَدْ حَلَّتِ الْعُمْرَةُ لِمَنِ اعْتَمَرْ، فَكَانُوا يُحَرِّمُونَ الْعُمْرَةَ حَتَّى يَنْسَلِخَ ذُو الْحِجَّةِ وَالْمُحَرَّمُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: سوێند بە خوا عومرە پێ كردنی عائیشە لە مانگی (ذی الحجة)دا لەلایەن پێغەمبەری خواوە صلی الله علیە وسلم بۆ ئەوە بوو كە فەرمانی خەڵكانی

هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەر بەدرۆبخاتەوەو پشتیان بشکێنێ — کە پێیان وابوو عومرە لە مانگەکانی (رَجب، ذو القعدة، ذو الحجة، مُحرَّمْ)دا لە تاوانە هەرەگەورەکانە لەسەر رووی زەویدا - ، چونکە بێگومان خەڵکی قورەیش و ئەوانەی کە لەسەر دینی قورەیش بوون دەیانوت: کاتێ کە مووی پشتی وشتر زۆر بوو، برینی پشتی وڵاخی حاجیان ساڕێژ بوو، مانگی صەفەر هات، ئەوکاتە عومرە دروستە، قورەیش و ئەوانەی کە لەسەر دینی قورەیش بوون عومرەیان لەلا حەرام بوو هەتا مانگی (ذو الحِجَّة) و (مُحَرَّم) تەواو دەبوون.

١٩٨٨ - (صحيح دون قوله:المرأة (إِنّي امرَأةٌ .... حَجَّتِي)) عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَخْبَرَنِي رَسُولُ مَرْوَانَ الَّذِي أَرْسَلَ إِلَى أُمِّ مَعْقِلٍ قَالَتْ: كَانَ أَبُو مَعْقِلٍ حَاجًّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا قَدِمَ، قَالَتْ أُمُّ مَعْقِلٍ: قَدْ عَلِمْتَ أَنَّ عَلَيَّ حَجَّةً فَانْطَلَقَا يَمْشِيَانِ حَتَّى دَخَلَا عَلَيْهِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ عَلَيَّ حَجَّةً، وَإِنَّ لأَبِي مَعْقِلٍ بَكْرًا، قَالَ أَبُو مَعْقِلٍ: صَدَقَتْ جَعَلْتُهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَعْطِهَا فَلْتَحُجَّ عَلَيْهِ، فَإِنَّهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ). فَأَعْطَاهَا الْبَكْرَ، فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ: إِنِّي امْرَأَةٌ قَدْ كَبِرْتُ وَسَقِمْتُ فَهَلْ مِنْ عَمَلٍ يُجْزِئُ عَنِّي مِنْ حَجَّتِي؟ قَالَ: (عُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ تُجْزِئُ حَجَّةً).

واتە: ئەبو بەکری کوڕی (عَبْدُ الرَّحْمَن)دەڵێت: نێردراوەکەی مەروان کە ناردبووی بۆلای ئوممو مەعقیل پێی راگەیاندم کە ئوممو مەعقیل وتویەتی: ئەبو مەعقیل لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم چوو بۆ حەج کاتێ کە لەحەج گەڕایەوە، پێم وت: بێگومان دەتزانی کە من حەجم لەسەرەو نیەتی حەجم هەبوو لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم بەلام نەمتوانی حەجی لەگەڵ بکەم ئەو هەموو پاداشتەم لەدەست چوو،،جا ئوممو مەعقیل و ئەبو مەعقیل هەردووکیان پێکەوە لەماڵ دەرچوون و رۆشتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ کە چوونە خزمەتی، ئوممو مەعقیل وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من حەجم لەسەرە، ئەبو مەعقیلیش وشترێکی تازە پێگەیشتوی هەیە، ئەبو مەعقیل وتی: راست دەکات، بەلام من تەرخانم کردوە بۆ جیهاد لەرێی خوادا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بیدەرێ با بە سواری ئەو وشترە حەج بکات، چونکە بەڕاستی حەج لەرێی خوادایە)، ئەبو مەعقیلیش وشترە تازە پێگەیشتوەکەی دایە، ئوممو مەعقیل وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من پیر بووم و بێ هێز بووم کردەوەیە هەیە بیکەم بەسم بێت و پاداشتەکەی بە ئەندازەی پاداشتی ئەو حەجە بێت؟ فەرمووی: (عومرەیە لە مانگی رەمەزاندا پاداشتەکەی بە ئەندازەی پاداشتی حەجێکە).

١٩٨٩ - (صحيح دون قوله: (فكانت تقول.... إلخ)) عَنْ أُمِّ مَعْقِلٍ، قَالَتْ: لَمَّا حَجَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَجَّةَ الْوَدَاعِ، وَكَانَ لَنَا جَمَلٌ، فَجَعَلَهُ أَبُو مَعْقِلٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَأَصَابَنَا مَرَضٌ، وَهَلَكَ أَبُو مَعْقِلٍ، وَخَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ حَجِّهِ جِئْتُهُ فَقَالَ:

(يَا أُمَّ مَعْقِلٍ، مَا مَنَعَكِ أَنْ تَخْرُجِي مَعَنَا؟). قَالَتْ: لَقَدْ تَهَيَّأْنَا فَهَلَكَ أَبُو مَعْقِلٍ، وَكَانَ لَنَا جَمَلٌ هُوَ الَّذِي نَحُجُّ عَلَيْهِ، فَأَوْصَى بِهِ أَبُو مَعْقِلٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، قَالَ: (فَهَلاَّ خَرَجْتِ عَلَيْهِ فَإِنَّ الْحَجَّ فِي سَبِيلِ اللَّهِ! فَأَمَّا إِذْ فَاتَتْكِ هَذِهِ الْحَجَّةُ مَعَنَا فَاعْتَمِرِي فِي رَمَضَانَ فَإِنَّهَا كَحَجَّةٍ). فَكَانَتْ تَقُولُ: الْحَجُّ حَجَّةٌ، وَالْعُمْرَةُ عُمْرَةٌ، وَقَدْ قَالَ هَذَا لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا أَدْرِي أَلِيَ خَاصَّةً؟.

واتە: ئوممو مەعقيل دەڵێت: كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم حەجی ماڵ ئاوایی كرد، وشترێكمان هەبوو ئەبو مەعقیل تەرخانی كردبو بۆ جیهاد لەڕێی خوادا، ئێمە توشی نەخۆشی بووین و، ئەبو مەعقیل مرد - دوای ئەوەی لە حەج هاتەوە - ، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم رۆشت بۆ حەج كاتێ كە گەڕایەوە لە حەجەكەی چوومە خزمەتی، فەرمووی: (ئەی ئوممو مەعقیل چی رێگر بوو لەوەی لەگەڵمانا بێیت بۆ حەج؟)، وتی: بەڕاستی خۆمان ئامادەكرد لەوكاتەدا ئەبو مەعقیل مرد، ئێمەش وشترێكمان هەبوو سواری بین بۆ حەج، ئەبو مەعقیل وەسیەتی كرد بەكاربهێنرێت لەڕێی خوادا، فەرمووی: (دەی بۆ بەسواری ئەو وشترە نەهاتیت بۆ حەج چونكە بەڕاستی حەج لەڕێی خوادایە، مادەم ئەو حەجەت لەگەڵ ئێمەدا لەدەست چوو لە مانگی رەمەزاندا عومرە بكە وەك حەج وایە). جا ئوممو مەعقیل دەیوت: حەج حەجەو، عومرەش عومرە، جا نازانم پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەمەی بەمن فەرموو بە تایبەتی یان بۆ هەموو ئوممەتە.

١٩٩٠ - (حسن صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: أَرَادَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْحَجَّ، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ لِزَوْجِهَا: أَحِجَّنِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى جَمَلِكَ، فَقَالَ: مَا عِنْدِي مَا أُحِجُّكِ عَلَيْهِ، قَالَتْ: أَحِجَّنِي عَلَى جَمَلِكَ فُلاَنٍ. قَالَ ذَاكَ حَبِيسٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنَّ امْرَأَتِي تَقْرَأُ عَلَيْكَ السَّلاَمَ وَرَحْمَةَ اللَّهِ، وَإِنَّهَا سَأَلَتْنِي الْحَجَّ مَعَكَ، قَالَتْ: أَحِجَّنِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْتُ: مَا عِنْدِي مَا أُحِجُّكِ عَلَيْهِ، فَقَالَتْ: أَحِجَّنِي عَلَى جَمَلِكَ فُلاَنٍ، فَقُلْتُ: ذَاكَ حَبِيسٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَقَالَ: (أَمَا إِنَّكَ لَوْ أَحْجَجْتَهَا عَلَيْهِ كَانَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ). قَالَ: وَإِنَّهَا أَمَرَتْنِي أَنْ أَسْأَلَكَ مَا يَعْدِلُ حَجَّةً مَعَكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَقْرِئْهَا السَّلاَمَ وَرَحْمَةَ اللَّهِ وَبَرَكَاتِهِ، وَأَخْبِرْهَا أَنَّهَا تَعْدِلُ حَجَّةً مَعِي). يَعْنِي عُمْرَةً فِي رَمَضَانَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نیازی حەجی هەبوو، ژنێ بە مێردەکەی وت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم حەجم پێ بکە بەسواری وشترەکەتەوە، وتی: وشترم نیە هەتا سواری بیت و حەجت پێ بکەم، ژنەکە

وتی: حەجم پیّ بکه به سواری فلاّنه وشترەوە، وتی: ئەو وشترەم وەقفه تەرخانم کردوه بۆ جیهاد لەڕێی خوادا، پیاوەکه چوو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی وت: ژنەکەم سەلامی خوای گەورەت لیّ دەکات، داوای لیّ کردوم لەگەڵ تۆدا حەجی پیّ بکەم، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم حەجم پیّ بکه، وتم: وشترم نیه هەتا سواری بیت و حەجت پیّ بکەم، وتی: حەجم پیّ بکه به سواری فلاّنه وشترەوە، وتی: ئەو وشترە وەقفه تەرخانم کردوه بۆ جیهاد لەڕێی خوادا، فەرمووی: (ئەگەر تۆ به سواری ئەو وشترەوە حەجی پیّ بکەیت بێگومان ئەوەش لەڕێی خوادایه)، هەروەها ژنەکەم فەرمانی پێکردوم که پرسیارت لیّ بکەم: چ کردەوەیه پاداشتەکەی به ئەندازەی پاداشتی حەجێکه لەگەڵ تۆدا؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (سەلامی خوای گەورە بگەیەنه به ژنەکەت، پێی رابگەیەنه که عومرەیه له مانگی رەمەزاندا پاداشتەکەی به ئەندازەی پاداشتی حەجێکه لەگەڵ من).

**١٩٩١ - (صحيح لكن قوله: (فِى شَوَّالٍ) في ابتداء وإلا فهي كانت في ذي القعدة أيضا) عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اعْتَمَرَ عُمْرَتَيْنِ: عُمْرَةً فِى ذِى الْقَعْدَةِ، وَعُمْرَةً فِى شَوَّالٍ.**

واتە: له عائیشەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، که پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوو عومرەی کردوە: عومرەیه له مانگی (ذُو القَعْدَة)دا، عومرەیەکیش له مانگی (شَوَّال)دا.

١٩٩٢ - (ضعيف) عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عُمَرَ كَمِ اعْتَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ مَرَّتَيْنِ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: لَقَدْ عَلِمَ ابْنُ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدِ اعْتَمَرَ ثَلاَثًا سِوَى الَّتِي قَرَنَهَا بِحَجَّةِ الْوَدَاعِ.

واتە: لە موجاهیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە ئیبنو عومەریان ڕەزای خوایان لێ بێ پرسی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چەند عومرەی کردوە؟ وتی: دوو عومرەی کردوە، عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ وتی: بێگومان ئیبنو عومەر خۆی دەیزانی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سێ عومرەی کردوە جگە لەو عومرەیەی لەگەڵ حەجی ماڵاوایی دا پێکەوە کردی.

١٩٩٣ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: اعْتَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرْبَعَ عُمَرٍ: عُمْرَةَ الْحُدَيْبِيَةِ، وَالثَّانِيَةَ: حِينَ تَوَاطَئُوا عَلَى عُمْرَةٍ مِنْ قَابِلٍ، وَالثَّالِثَةَ: مِنَ الْجِعْرَانَةِ، وَالرَّابِعَةَ: الَّتِي قَرَنَ مَعَ حَجَّتِهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چوار عومرەی کردوە: عومرەیەکیان لەکاتی ڕێکەوتنی حودەیبیەدا کە کافرەکانی قورەیش ڕێگەیان نەدا، دووەم: عومرەی قەزاکردنەوە کە ریکەوتن لەگەڵ کافرەکانی قورەیش ساڵی داهاتوو

بیكات، سێیەم: ئەو عومرەیە بوو كە لە جیعرانەوە ئیحرامی پۆشی بۆی، چوارەم: ئەو عومرەیەی لەگەڵ حەجی ماڵاوایی دا پێكەوە كردی.

١٩٩٤ - (صحيح) عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ اعْتَمَرَ أَرْبَعَ عُمَرٍ كُلُّهُنَّ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، إِلاَّ الَّتِـي مَـعَ حَجَّتِهِ: عُمْرَةً زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ، أَوْ مِنَ الْحُدَيْبِيَةِ، وَعُمْرَةَ الْقَضَاءِ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، وَعُمْرَةً مِنَ الْجِعْرَانَـةِ، حَيْـثُ قَسَمَ غَنَائِمَ حُنَيْنٍ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، وَعُمْرَةً مَعَ حَجَّتِهِ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چوار عومرەی كردوە هەر هەموویان لە مانگی (ذي القَعْدَة) دا بوون، جگە لەو عومرەیان كە لەگەڵ حەجی ماڵاوایی دا پێكەوە كردی: عومرەیەكیان لەكاتی رێكەوتنی حودەیبیەدا، یان عومرەی حودەیبیە، عومرەی قەزاكردنەوە لە مانگی (ذي القَعْدَة) دا كردی، عومرەی جیعرانە، لەكاتێكدا كە غەنیمەتی جەنگی حونەینی دابەش كرد لە مانگی (ذي القَعْدَة)دا، هەروەها ئەو عومرەیەی لەگەڵ حەجی ماڵاوایی دا پێكەوە كردی.

## باسی ئافرەتیٚ ئیحرامی عومره بپۆشیٚت و بكەویٚته حاڵەتی بیٚ نویٚژیەوه كاتی حەج بیٚته پیٚشەوه واز لە عومرەكەی بیٚنیٚ و ئیحرامی حەج بپۆشیٚ: ئایا عومرەكەی قەزا بكاتەوه یان نا؟

## ٨١ - باب الْمُهِلَّةِ بِالْعُمْرَةِ تَحِيضُ فَيُدْرِكُهَا الْحَجُّ فَتَنْقُضُ عُمْرَتَهَا وَتُهِلُّ بِالْحَجِّ، هَلْ تَقْضِي عُمْرَتَهَا؟

١٩٩٥ - (صحيح) عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ أَبِيهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ: (يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ، أَرْدِفْ أُخْتَكَ عَائِشَةَ فَأَعْمِرْهَا مِنَ التَّنْعِيمِ، فَإِذَا هَبَطْتَ بِهَا مِنَ الأَكَمَةِ فَلْتُحْرِمْ فَإِنَّهَا عُمْرَةٌ مُتَقَبَّلَةٌ).

واته: لە حەفصەی كچی (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی ئەبو بەكرەوه، لە باوكیەوه رەزای خوای لیٚ بیٚ دەگیٚڕنەوه، كە پیٚغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی فەرموو: (ئەی (عَبْدُ الرَّحْمَن)، عائیشەی خوشكت بخەره پاشكۆی خۆتەوه ببیه بۆ تەنعیم بۆ ئەوەی لەویٚ بە نیەتی عومره ئیحرام دابەستیٚت، كاتیٚ لە ئەكمە داتبەزاند كە شویٚنیٚكه لە تەنعیم با ئیحرام دابەستیٚت چونكه بەڕاستی ئەوه عومرەی راست و دروست و وەرگیراوه).

١٩٩٦ - (صحيح دون قوله: (فجَاءَ إِلى المَسجِدِ فركَعَ مَا شَاءَ اللَّهُ) فانه منكر) عَنْ مُحَرِّشٍ الْكَعْبِيِّ، قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْجِعْرَانَةَ فَجَاءَ إِلَى الْمَسْجِدِ فَرَكَعَ مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ أَحْرَمَ، ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى رَاحِلَتِهِ، فَاسْتَقْبَلَ بَطْنَ سَرِفَ حَتَّى لَقِيَ طَرِيقَ الْمَدِينَةِ، فَأَصْبَحَ بِمَكَّةَ كَبَائِتٍ.

واته: له موحەریشی كەعبییەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چووە ناو جعرانەوە كە شوێنێكە له نزیك مەككەوە چووە مزگەوتەوە ئەوەندەی خوا حەز بكات نوێژی كرد، لەپاشدا ئیحرامی دابەست بۆ عومرە شەو چوو بۆ مەككە تەواڤی كردو هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروەی كردو هەر ئەو شەوە گەڕایەوە بۆ جیعرانەو لەوێ مایەوە، ئینجا كاتێ كە خۆر لایدا سواری وڵاخەكەی بوو، رووی كردە ناو شیوەكەی سەریف هەتا گەیشتە سەر رێگای مەدینە لەوێوە گەڕایەوە بۆ مەدینە.

## باسی مانەوە لە مەککە لەدوای ئەنجامدانی عومرە.

## ٨٢ - باب الْمَقَامِ فِي الْعُمْرَةِ.

١٩٩٧ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقَامَ فِي عُمْرَةِ الْقَضَاءِ ثَلاَثًا.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سێ رۆژ لە مەککە مایەوە لەدوای قەزاکردنەوەی عومرەکەی کە ساڵی پێشتر کافرەکانی قورەیش رێگەیان نەدا بچێتە مەککەوە ئەنجامی بدات.

## باسی تەوافی ماڵی خوا لە حەجدا.

## ٨٣ - باب الإِفَاضَةِ فِي الْحَجِّ.

١٩٩٨ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَفَاضَ يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ صَلَّى الظُّهْرَ بِمِنًى يَعْنِي رَاجِعًا.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رۆژی جەژن تەوافی ماڵی خوای کرد، لەپاشدا گەڕایەوە بۆ میناو لەوێ نوێژی نیوەڕۆی کرد.

١٩٩٩ - (حسن صحيح) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، قَالَتْ: كَانَتْ لَيْلَتِي الَّتِي يَصِيرُ إِلَيَّ فِيهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَسَاءَ يَوْمِ النَّحْرِ، فَصَارَ إِلَيَّ وَدَخَلَ عَلَيَّ وَهْبُ بْنُ زَمْعَةَ وَمَعَهُ رَجُلٌ مِنْ آلِ أَبِي أُمَيَّةَ مُتَقَمِّصَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِوَهْبٍ: (هَلْ أَفَضْتَ أَبَا عَبْدِ اللَّهِ؟). قَالَ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (انْزِعْ عَنْكَ الْقَمِيصَ). قَالَ: فَنَزَعَهُ مِنْ رَأْسِهِ، وَنَزَعَ صَاحِبُهُ قَمِيصَهُ مِنْ رَأْسِهِ، ثُمَّ قَالَ: وَلِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: ( إِنَّ هَذَا يَوْمٌ رُخِّصَ لَكُمْ إِذَا أَنْتُمْ رَمَيْتُمُ الْجَمْرَةَ أَنْ تَحِلُّوا). يَعْنِي: مِنْ كُلِّ مَا حُرِمْتُمْ مِنْهُ إِلاَّ النِّسَاءَ، (فَإِذَا أَمْسَيْتُمْ قَبْلَ أَنْ تَطُوفُوا هَذَا الْبَيْتَ صِرْتُمْ حُرُمًا كَهَيْئَتِكُمْ قَبْلَ أَنْ تَرْمُوا الْجَمْرَةَ حَتَّى تَطُوفُوا بِهِ).

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: شەوی یانزەی مانگی (ذو الحجة) سەرە شەوی من بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئێوارەی رۆژی جەژن گەڕایەوە بۆلام، وەهەبی كوڕی زەمعە هات بۆ ماڵمان پیاوێكی هۆزی ئەبو ئومەییەی لەگەڵدا بوو هەدووكیان كراسیان لەبەردا بوو، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە وەهەبی فەرموو: (ئەی باوكی (عبدُ الله) تەواف ماڵی خودات كردوە؟ واتە تەواف (الإفاضة)، وتی:

نەخێر سوێند بێ بە خوا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (کراسەکەت لەبەر داکەنە). ئەویش کراسەکەی داکەند، هاوڕێکەشی بە هەمان شێوە، ئینجا وتی: لەبەرچی ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانت پێ کردین بەوە؟ فەرمووی: (ئەمڕۆ روخسەتە بۆتان ئەی حاجیەکان ئیحرام بشکێنن ئەگەر رەجمی شەیتانتان کردوە)، واتە لە هەموو ئەو شتانەی کە حەرام کراوە لێتان لە ئیحرامدا حەڵاڵە بۆتان جگە لە ژنەکانتان، (یەکەم رۆژی جەژن کاتێ کە ئێوارە هات پێش ئەوەی تەواڤی ئەمماڵە بکەن واتە تەواڤی (الإفاضة) ئەوا لە ئیحرامدا دەبن وەك چۆن لە ئیحرامدا بوون پێش ئەوەی رەجمی شەیتان بکەن هەتا تەواڤی (الإفاضة) دەکەن).

**٢٠٠٠ - (ضعيف) عَنْ عَائِشَةَ وَابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَّرَ طَوَافَ يَوْمِ النَّحْرِ إِلَى اللَّيْلِ.**

واتە: لە عائیشەو ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تەواڤی (الإفاضة)ی رۆژی جەژنی دواخست بۆ شەو – ئەمەش پێچەوانەی فەرمودەکانی رابردووە کە لە رۆژدا تەواڤی کردوە - .

## باسی تەواڤی مالاوایی.

## ٨٤ – باب الْوَدَاعِ.

٢٠٠٢ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: كَانَ النَّاسُ يَنْصَرِفُونَ فِي كُلِّ وَجْهٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ يَنْفِرَنَّ أَحَدٌ حَتَّى يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِ الطَّوَافَ بِالْبَيْتِ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: خەڵك کە حەج و عومرەیان تەواو دەکرد بە هەر چوار لادا بلاوەیان لێ دەکردو دەگەڕانەوە بۆ ولات و شوێنی خۆیان، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (با کەس لە مەککە دەرنەچێت و بلاوەی لێ نەکات هەتا تەواڤ ماڵی خوا نەکات واتە تەواڤی مالاوایی).

## باسی دەرچوونی ئافرەتی بێ نوێژ لە دوای تەوافی (الإفاضة).

## ٨٥ – باب الْحَائِضِ تَخْرُجُ بَعْدَ الإِفَاضَةِ.

٢٠٠٣ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَكَرَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ، فَقِيلَ: إِنَّهَا قَدْ حَاضَتْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَعَلَّهَا حَابِسَتُنَا). فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا قَدْ أَفَاضَتْ، فَقَالَ: (فَلاَ إِذًا).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم باسی صەفیەی كچی حویەی كرد، وترا: كەوتۆتە حاڵەتی بێ نوێژیەوە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (گیری داین لە گەڕانەوە بۆ مەدینە). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تەوافی (الإفاضة)ی كردوە، فەرمووی: (كەواتە نابێت – واتە مادەم تەواڤ (الإفاضة)ی كردوە كەواتە تەواڤ ماڵاوایی لەسەر نیە و نابێتە ڕێگر لە گەڕانەوەمان بۆ شاری مەدینە - ).

٢٠٠١ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَرْمُلْ فِي السَّبْعِ الَّذِي أَفَاضَ فِيهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە حەوت سوڕانەوەكەی بەدەوری كەعبەدا واتە لە تەوافی (الإفاضة)دا بە لۆقە نەڕۆیشت بەڵكو بە رۆشتنی ئاسایی سوڕایەوە بە دەوری كەعبەدا.

٢٠٠٤ - (صحيح ولكنه منسوخ بما قبله) عَنِ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَوْسٍ، قَالَ: أَتَيْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ فَسَأَلْتُهُ عَنِ الْمَرْأَةِ تَطُوفُ بِالْبَيْتِ يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ تَحِيضُ، قَالَ: لِيَكُنْ آخِرُ عَهْدِهَا بِالْبَيْتِ، قَالَ: فَقَالَ الْحَارِثُ: كَذَلِكَ أَفْتَانِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ: أَرِبْتَ عَنْ يَدَيْكَ، سَأَلْتَنِي عَنْ شَيْءٍ سَأَلْتَ عَنْهُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِكَيْمَا أُخَالِفَ!!.

واتە: لە (حارث)ی كوڕی (عبد الله)ی كوڕی ئەوس دەڵێت: چومە خزمەت پێشەوا عومەری كوڕی (خطاب) رەزای خوای لێ بێ لێم پرسی: ئەگەر ئافرەتێ رۆژی جەژن تەوافی (الإفاضة) بكات، لەپاشدا بكەوێتە حاڵەتی بێ نوێژیەوە ئایا بگەڕێتەوە بۆ لاتی خۆی پێش ئەوەی تەوافی ماڵاوایی بكات یان نا؟ ئەویش وتی: دەبێ تەوافی ماڵاوایی بكات، راوی وتی: (حارث) وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەم شێوەیە وەڵامی هەمان پرسیاری داوەمەتەوە و فەتوای بۆ داوم، راوی وتی: عومەر دوعای لێ كردو وتی: پرسیاری شتێكم لێ دەكەی كە پێشتر لە پێغەمبەری خودات صلی الله علیه وسلم پرسیوە بۆ ئەوەی بە شێوەیە وەڵامت بدەمەوە پێچەوانەی وەڵامەكەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بێت!!.

## باسی چۆنیەتی تەوافی مالاوایی.

## ٨٦ – باب طَوَافِ الْوَدَاعِ.

٢٠٠٥ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: أَحْرَمْتُ مِنَ التَّنْعِيمِ بِعُمْرَةٍ، فَدَخَلْتُ فَقَضَيْتُ عُمْرَتِي، وَانْتَظَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالأَبْطَحِ حَتَّى فَرَغْتُ، وَأَمَرَ النَّاسَ بِالرَّحِيلِ، قَالَتْ: وَأَتَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْبَيْتَ فَطَافَ بِهِ، ثُمَّ خَرَجَ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لە تەنعیم ئیحرامم دابەست بۆ عومرە، جا چوم بۆ كەعبەو عومرەكەم ئەنجامدا، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە (أبطح) كە شوێنێكە لە نێوان مەككەو مینادا چاوەڕێی دەكردم هەتا تەواوم كرد، فەرمانی كرد بە خەڵكەكە بڕۆن، عائیشە وتی: جا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خۆی چوو بۆ ماڵی خوا تەوافی مالاوایی كرد، لەپاشدا دەرچوو بەرەو مەدینە.

٢٠٠٦ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: خَرَجْتُ مَعَهُ - تَعْنِي مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- فِي النَّفْرِ الآخِرِ، فَنَزَلَ الْمُحَصَّبَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَلَمْ يَذْكُرِ ابْنُ بَشَّارٍ قِصَّةَ *بَعْثِهَا إِلَى التَّنْعِيمِ فِي هَذَا الْحَدِيثِ قَالَتْ: ثُمَّ جِئْتُهُ*

بِسَحَرٍ، فَأَذَّنَ فِـى أَصْـحَابِهِ بِالرَّحِيـلِ، فَارْتَحَـلَ فَمَـرَّ بِالْبَيْتِ قَبْلَ صَلاَةِ الصُّبْحِ، فَطَافَ بِهِ حِـينَ خَـرَجَ، ثُـمَّ انْصَرَفَ مُتَوَجِّهًا إِلَى الْمَدِينَةِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنـەوە، کـە وتویـەتی: لـە ڕۆژی سیانزەی مانگی (ذو الحجة)دا لەکاتی گەڕانەوە لە مینا لەخزمـەت پێغەمبـەردا صـلی الله علیـە وسـلم دەرچـووم، لـە (مُحَصَّـب) دابـەزی کـە شـیوێکە لـەنێوان مەککـەو مینـادا لێیـەوە دەردەچـێت بـۆ (أبنطـح)، ئـەبو داود دەڵێـت: ڕاوی فەرمودەکـە ئیبنـو بەششـار باسـی بەسـەرهاتی نـاردنی عائیشـەی بـۆ تـەنعیم نـەکرد، عائیشـە وتـی: لەپاشـدا کـە عومرەکـەم تـەواو کـرد هاتمـەوە بـۆ لای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لـە سـەحەردا، بـە هاوەڵانی ڕاگەیانـد کـە دەرچن بەرەو مەدینە، خۆشی ڕۆیشت بەرەو مەدینە پێش نوێـژی بـەیانی دای بەلای ماڵی خوادا، لەکاتی دەرچوون بەرەو مەدینە تەاڤ ماڵاوایی کـرد، لـەدوای ئەنجامدانی تەوافەکەی بەرەو مەدینە کەوتەڕێ.

٢٠٠٧ - (ضعيف) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنَ طَارِقٍ، عَنْ أُمِّـهِ، أَنَّ رَسُـولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا جَازَ مَكَانًا مِنْ دَارِ يَعْلَى - نَسِيَهُ عُبَيْدُ اللَّهِ - اسْتَقْبَلَ الْبَيْتَ فَدَعَا.

واتە: لە (عَبدُ الـرَّحمَن)ی کـوڕی (طـارِق)ەوە، لـە دایکیـەوە دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم کـاتێ کـە دەگەیشـتە جێگایـە لـە مـاڵی یـەعلی ڕووی دەکـردە مـاڵی خـواو دەپاڕایـەوە –ڕاوی فەرمودەکـە(عُبَیـدُ اللّـه) جێگاکەی لەیاد کرد - .

## باسی دابەزین لە (مُحَصَّب)[١].

## ٨٧ – باب التَّحْصِيبِ.

٢٠٠٨ - (صحيح) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: إِنَّمَا نَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمُحَصَّبَ لِيَكُونَ أَسْمَحَ لِخُرُوجِهِ، وَلَيْسَ بِسُنَّةٍ، فَمَنْ شَاءَ نَزَلَهُ، وَمَنْ شَاءَ لَمْ يَنْزِلْهُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بێگومان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆیە لە (مُحَصَّب) دادەبەزی بۆ ئەوەی لەوێوە بە ئاسانی بگەڕێتەوە بۆ مەدینە، جا دابەزین لە (مُحصَب) سوننەتێ نیە لە سوننەتەکانی حەج، ئەوەی دەیەوێ دابەزێت با دابەزێت، ئەوەی دەیەوێ دانەبەزێت با دانەبەزێت.

٢٠٠٩ - (صحيح) عَنْ سُلَيْمَان بْنِ يَسَارٍ، قَالَ: قَالَ أَبُو رَافِعٍ: لَمْ يَأْمُرْنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أَنْزِلَهُ، وَلَكِنْ ضَرَبْتُ قُبَّتَهُ فَنَزَلَهُ، قَالَ مُسَدَّدٌ: وَكَانَ عَلَى ثَقَلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَقَالَ عُثْمَانُ: يَعْنِي فِي الأَبْطَحِ.

---

[١]- (مُحَصَب) و (ابطح) و (خيف) هەر یەکێکن.

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە دەگێڕنـەوە، کە وتویـەتی: ئـەبو رافیـع وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فـەرمانی پـێ نـەکردم لـە (مُحَصَّب) دابـەزم، بـەڵام مـن خـۆم لـەوێ دابـەزیم و خێمـە بچکۆلەکەیم بـۆ هەڵـدا کـە گەیشتە ئەوێ خۆشـی دابـەزی، راوی فەرمودەکە موسـەددەد وتـی: ئـەبو رافیـع سەروکاری کەل و پەلی سەفەرەکەی پێغەمبـەری صـلی الله علیـە وسـلم دەکـرد، راوی فەرمودەکە (عُثمَان) وتی: واتە لە (أبنطح).

٢٠١٠ - (صحيح) عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، قَـالَ: قُلْـتُ: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَيْنَ تَنْزِلُ غَدًا؟ - فِي حَجَّتِهِ — قَالَ: (هَلْ تَرَكَ لَنَا عَقِيلٌ مَنْزِلاً؟). ثُـمَّ قَـالَ: (نَحْـنُ نَازِلُونَ بِخَيْفِ بَنِي كِنَانَةَ حَيْثُ قَاسَـمَتْ قُـرَيْشٌ عَلَـى الْكُفْـرِ). يَعْنِـي الْمُحَصَّـبَ، وَذَلِـكَ أَنَّ بَنِـي كِنَانَـةَ، حَالَفَتْ قُرَيْشًا عَلَى بَنِي هَاشِمٍ أَنْ لاَ يُنَـاكِحُوهُمْ، وَلاَ يُئْوُوهُمْ، وَلاَ يُبَايِعُوهُمْ. قَالَ الزُّهْرِيُّ وَالْخَيْفُ: الْوَادِي.

واتـە: لـە ئوسـامەی کـوڕی زەیـدەوە دەگێڕنـەوە، کـە وتویـەتی: لـە حـەجی ماڵاوایی دا وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسـلم سـبەینێ لـەکوێ دادەبـەزی؟ فـەرمووی: (ئایـا عـەقیلی کـوڕی ئـەبو (طالـب)ی مـامم لـە مەککـە ماڵێکی بۆ دانـەناوین — لـەو ماڵانـەی کـە بـە مـیرات لـە ئـەبو (طالـب)ەوە بـۆی ماوەتەوە؟). لەپاشدا فەرمووی: (ئێمە لە خـەیفی بـەنی کینانـە دادەبـەزین کـە هاوپەیمانی قورەیش بـوون لەسـەر کوفر و بـێ بـاوەڕی). واتـە لـە (مُحَصَّب) ، چونکە بەنی کینانە هاوپەیمانی قورەیش بوون لە دژایەتی کردنی بەنی هاشم

دا کە ژنیان نەدەنێ و داڵدەیان نەدەن و کڕین و فرۆشتنیان لەگەڵ نەکەن، راوی فەرموودەکە زوهری دەڵێت: (خیف): واتە شیو.

٢٠١١ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ حِينَ أَرَادَ أَنْ يَنْفِرَ مِنْ مِنًى: (نَحْنُ نَازِلُونَ غَدًا). فَذَكَرَ نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ أَوَّلَهُ، وَلاَ ذَكَرَ: الْخَيْفُ: الْوَادِي.

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ کە ویستی لە مینا بگەڕێتەوە فەرموویەتی: (ئێمە سبەینێ لە خەیفی بەنی کینانە دادەبەزین). راوی فەرموودەی پێشوی بە هەمان شێوە گێڕایەوە، بەڵام سەرەتای فەرموودەکەی باس نەکرد، هەروەها باسی ئەوەشی نەکرد کە (خیف): واتە شیو.

٢٠١٢ - (صحيح) عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ يَهْجَعُ هَجْعَةً بِالْبَطْحَاءِ، ثُمَّ يَدْخُلُ مَكَّةَ، وَيَزْعُمُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ.

واتە: نافیع دەڵێت: کاتێ کە ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ لە مینا گەڕایەوە لە (بطحاء) لە سەرەتای شەوەوە سەرخەوێکی بۆ شکاند، لەپاشدا چووە ناو شاری مەککەو تەواف مالاوایی کرد، ئیبنو عومەر پێی وابوو کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە هەمان شێوە ئەو کارەی کردوە.

٢٠١٣ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ صَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ، وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَـاءَ بِالْبَطْحَـاءِ، ثُمَّ هَجَعَ هَجْعَةً، ثُمَّ دَخَلَ مَكَّةَ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَفْعَلُهُ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنـەوە، کە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم لـە (بَطحَـاء) نوێـژی نیـوەڕۆ و عەسـر و شـێوان و خـەوتنانی کـرد، لەپاشـدا سـەرخەوێکی بـۆ شـکاند، ئینجـا چـووە نـاو شـاری مەککەوە تەواف مالآوایی کـرد، ئیبنـو عومـەریش بـە هـەمان شێوە ئـەو کـارەی کرد.

## باسی کەسێ لە حەجەکەیدا کارێك پێش کارێکی تر بکات.

## ٨٨ - باب فِيمَنْ قَدَّمَ شَيْئًا قَبْلَ شَيْءٍ فِي حَجِّهِ.

٢٠١٤ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَـاص، قَـالَ: وَقَـفَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ فِـي حَجَّـةِ الْـوَدَاعِ بِمِنًى يَسْأَلُونَهُ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّـهِ إِنِّـي لَمْ أَشْعُرْ فَحَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اذْبَحْ وَلاَ حَرَجَ ). وَجَـاءَ رَجُـلٌ آخَـرُ

فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَمْ أَشْعُرْ فَنَحَرْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِىَ؟ قَالَ: (ارْمِ وَلاَ حَرَجَ). قَالَ فَمَا سُئِلَ يَوْمَئِذٍ عَنْ شَىْءٍ قُدِّمَ أَوْ أُخِّرَ إِلاَّ قَالَ: (اصْنَعْ وَلاَ حَرَجَ).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە حەجی مالآوایی دا لە مینا راوەستا بوو پرسیاریان لێ دەکرد، پیاوێ هات لێی پرسی وتی: من نەمزانی سەرم تاشی پێش ئەوەی قوربانی بکەم، فەرمووی: (سەری ببڕە هیچی تێدا نیەو قەیناکات)، پیاوێکی تر هات لێی پرسی وتی: من نەمزانی قوربانیەکەم سەربڕی پێش ئەوەی شەیتان رەجم بکەم؟ فەرمووی: (برۆ رەجمی بکە هیچی تێدا نیەو قەیناکات). راوی وتی: ئەو رۆژە سەبارەت بە پاش و پێشی هەر کارێکی رۆژی جەژن پرسیاریان لێ بکردایە دەیفەرموو: (برۆ بیکە هیچی تێدا نیەو قەیناکات).

٢٠١٥ - (صحيح ولكن قوله: (سَعَيتُ قَبلَ أن أطوفَ) شاذ). عَنْ أُسَامَةَ بْنِ شَرِيكٍ، قَالَ خَرَجْتُ مَعَ النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَاجًّا، فَكَانَ النَّاسُ يَأْتُونَهُ، فَمَنْ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ سَعَيْتُ قَبْلَ أَنْ أَطُوفَ، أَوْ قَدَّمْتُ شَيْئًا، أَوْ أَخَّرْتُ شَيْئًا، فَكَانَ يَقُولُ: (لاَ حَرَجَ لاَ حَرَجَ إِلاَّ عَلَى رَجُلٍ اقْتَرَضَ عِرْضَ رَجُلٍ مُسْلِمٍ وَهُوَ ظَالِمٌ فَذَلِكَ الَّذِى حَرِجَ وَهَلَكَ).

واتە: ئوسامەی کوڕی عەمری کوڕی شەریك دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم دەرچووم بۆ حەج، خەڵکی هاتن پرسیاریان لێ دەکرد، ئەوەی بیوتایە: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رۆشتنی نێوان صەفاو مەروەم ئەنجامداوە پێش ئەوەی تەواف بکەم، یان کارێکم پێش خستوە، یا کارێکم دواخستوە لەکارەکانی رۆژی جەژن لە مینا، لە وەڵامدا ئەو هەر دەیفەرموو: (هیچی تێدا نیەو گوناهت ناگات، هیچی تێدا نیەو گوناهت ناگات، ئیللا بۆ کەسێ نەبێت کە باسی شەرەف و ناموسی موسوڵمانێ بکات کە ئەو کەسەش ستەمکار و زاڵمە ئا ئەوە گوناهی دەگات و تیاچووە).

## باسی ئایا لە مەککە شتێ رەوایە لەشوێنێکی تر رەوا نەبێت.

## ٨٩ – باب فِي مَكَّةَ.

٢٠١٦ - (ضعيف) عن كَثِيرِ بْنُ كَثِيرِ بْنِ الْمُطَّلِبِ بْنِ أَبِي وَدَاعَةَ، عَنْ بَعْضِ أَهْلِهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي مِمَّا يَلِي بَابَ بَنِي سَهْمٍ وَالنَّاسُ يَمُرُّونَ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَلَيْسَ بَيْنَهُمَا سُتْرَةٌ - قَالَ سُفْيَانُ: لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْكَعْبَةِ سُتْرَةٌ.

واتە: لە (کَثیر)ی کوڕی (کَثیر)ی کوڕی (مُطلِب)ی کوڕی ئەبو وەداعەوە، لە هەندێ لە خزمانیەوە، لە باپیریەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوام صلی الله

عليه وسلم بینیوه لەم لای دەرگای بەنی سەهمەوە واتە لە روویە لە رووەكانی كەعبەوە نوێژی كردوە خەڵك بە بەردەمیدا رۆیشتون و سوترەی دانەناوە، سوفیان وتی: لەنێوان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و كەعبەدا سوترە نەبووە.

## باسی حەرامی كوشتار لە حەرەمی مەككەداو رێزشكاندنی.

## ٩٠ – باب تحريم مَكَّةَ.

٢٠١٧ – (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: لَمَّا فَتَحَ اللَّهُ تَعَالَى عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَكَّةَ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيهِمْ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: (إِنَّ اللَّهَ حَبَسَ عَنْ مَكَّةَ الْفِيلَ وَسَلَّطَ عَلَيْهَا رَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ، وَإِنَّمَا أُحِلَّتْ لِي سَاعَةً مِنَ النَّهَارِ، ثُمَّ هِيَ حَرَامٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ: لاَ يُعْضَدُ شَجَرُهَا، وَلاَ يُنَفَّرُ صَيْدُهَا، وَلاَ تَحِلُّ لُقَطَتُهَا إِلاَّ لِمُنْشِدٍ). فَقَامَ عَبَّاسٌ - أَوْ قَالَ: قَالَ الْعَبَّاسُ - : يَا رَسُولَ اللَّهِ إِلاَّ الإِذْخِرَ فَإِنَّهُ لِقُبُورِنَا وَبُيُوتِنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِلاَّ الإِذْخِرَ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَزَادَنَا

فِيهِ ابْنُ الْمُصَفَّى عَنِ الْوَلِيدِ: فَقَامَ أَبُـو شَـاهٍ - رَجُـلٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ – فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّـهِ اكْتُبُـوا لِـى، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اكْتُبُوا لأَبِـى شَاهٍ). قُلْتُ لِلأَوْزَاعِيِّ: مَا قَوْلُهُ: (اكْتُبُوا لأَبِى شَـاهٍ ). قَالَ: هَذِهِ الْخُطْبَةَ الَّتِى سَمِعَهَا مِنْ رَسُولِ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دوای ئەوەی کە خوای گەورە لەسەر دەستی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم مەککەی رزگار کرد پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەستا وتاری بۆدان، سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد، لەپاشدا فەرمووی: (خوای گەورە مەککەی پاراست لە دەستدرێژی خاوەن فیلەکان واتە ئەبرەهەو لەشکرەکەی کە هاتن کەعبە بڕوخێنن، خوای گەورە پێغەمبەرەکەی و باوەڕدارانی سەرخست و دەستیان گرت بەسەر شاری مەککەدا و رزگاریان کرد، ئاگاداربن تەنانەت بۆ منیش بۆ ماوەیەکی کەم لەو رۆژەدا کوشتاری تێدا حەڵاڵ بوو، لەپاشدا لەدوای ئەم کاتەوە مەککە هەتا رۆژی قیامەت رێزشکاندن و کوشتاری تێدا حەرامە بۆ هەموو کەسێ، نابێ دارودرەختی ببڕێت و داپاچڕێت، نابێت نێچری بتارێنرێت، نابێ هیچ شتێکی کەوتوی هەڵگیرێتەوە، مەگەر ئەوەی کە بانگەوازی بۆ بکات). عەباس هەستا - یان راوی وتی: عەباس وتی - : ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم جگە لە گیای (الإذخِر) کە گیایەکی بۆن خۆشە ئەویش بۆ گۆڕەکانمان و ماڵەکانمان و بەکاری دێنین، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (باشە جگە لە گیای (الإذخِر) ). ئەبو داود دەڵێت: (ابنُ المُصَفَّى) لە وەلیدەوە ئەمەی بۆ زیاد کردین: ئەبو شاە کە

پیاوێکی یەمەنی بوو هەستا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمان بدە کە ئەم وتارەم بۆ بنوسنەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بینوسنەوە بۆ ئەبو شاە). وەلید وتی: بە ئەوزاعیم وت: ئەبو شاە چ پرسیارێکی کرد هەتا بۆی بنوسنەوە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (بینوسنەوە بۆ ئەبو شاە). وتی: ئەو وتارە بوو کە بیستی لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم.

**٢٠١٨ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، فِي هَذِهِ الْقِصَّةِ، قَالَ: (وَلاَ يُخْتَلَى خَلاَهَا).**

واتە: بەسەرهاتی حەرامی کوشتار لە حەرەمی مەککەداو رێزشکاندنی لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (نابێت گژوگیای تەڕی ببڕرێت).

**٢٠١٩ - عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلاَ نَبْنِي لَكَ بِمِنًى بَيْتًا - أَوْ بِنَاءً - يُظِلُّكَ مِنَ الشَّمْسِ؟ فَقَالَ (لاَ، إِنَّمَا هُوَ مُنَاخُ مَنْ سَبَقَ إِلَيْهِ).**

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە مینا خانویەکت بۆ دروست نەکەین بۆ ئەوەی لە گەرمای خۆر بتپارێزێت؟ فەرمووی: (نەخێر نابێ خانووی تێدا دروست بکرێت، چونکە بێگومان مینا جێگەی بارگە خستنی کەسێکە زوتر

بگاتە ئەوێ ئەو كەسە شایانترە بەو شوێنە - مینا شوێنی سەربڕینی قوربانی و شەیتان ڕەجم و سەرتاشین یان كورتكردنەوەیە، تایبەت نیە بە كەسێكەوە ).

٢٠٢٠ - (ضعيف) عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ، قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (احْتِكَارُ الطَّعَامِ فِي الْحَرَمِ إِلْحَادٌ فِيهِ).

واتە: لە یەعلای كوڕی ئومەییەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (شاردنەوەی خواردەمەنی لە حەرەمدا سەرپێچی و لەهەق لادان و ستەم كردنە تێیدا - شاردنەوەی خۆراك و قوتی خەڵك بۆ ئەوەی كەم ببێتەوە و گران بێت لە هەموو شوێنێك حەرامە ج جای لەحەرەمی مەككە كە زیاتر حەرامەو سزاكەی توندترە - ).

## باسی فەزڵی خۆشاودان بە خەڵك.

## ٩١ – باب فِي نَبِيذِ السِّقَايَةِ.

٢٠٢١ - (صحيح) عَنْ بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لابْنِ عَبَّاسٍ: مَا بَالُ أَهْلِ هَذَا الْبَيْتِ يَسْقُونَ النَّبِيذَ وَبَنُو عَمِّهِمْ يَسْقُونَ اللَّبَنَ وَالْعَسَلَ وَالسَّوِيقَ؟ أَبُخْلٌ بِهِمْ أَمْ حَاجَةٌ؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: مَا بِنَا مِنْ بُخْلٍ وَلاَ بِنَا مِنْ

حَاجَةٍ، وَلَكِنْ دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى رَاحِلَتِهِ وَخَلْفَهُ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِشَرَابٍ، فَأُتِيَ بِنَبِيذٍ، فَشَرِبَ مِنْهُ، وَدَفَعَ فَضْلَهُ إِلَى أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ فَشَرِبَ مِنْهُ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَحْسَنْتُمْ، وَأَجْمَلْتُمْ، كَذَلِكَ فَافْعَلُوا). فَنَحْنُ هَكَذَا لاَ نُرِيدُ أَنْ نُغَيِّرَ مَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە بەكری كوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پیاوێ بە ئیبنو عەباسی ڕەزای خوایان لێ بێ وت: ئەوە بۆچی خاوەنی ئەمماڵە واتە ماڵی عەباسی كوڕی (عبدالمطلب) خۆشاو دەدەن بە خەڵك كەچی ئامۆزاكانیان شیر و هەنگوین و قاوت دەدەن بە خەڵك؟ ئایا ئەمە لەبەر نەبوونیتانە یان لەبەر پیسكەیی و ڕەزیلیتانە؟ ئیبنو عەباس وتی: نە نەبووین و نە پیسكەو ڕەزیلین، بەڵام پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە سواری وڵاخەكەیەوە هات، ئوسامەی كوڕی زەیدی لەپاشكۆدا بوو، داوای خواردنەوەی كرد، ئێمەش خۆشاومان بۆ هێنا، خۆی لێی خواردەوەو ئەوەی لێی مایەوە دای بە ئوسامە خواردیەوە، جا فەرمووی: (كارێكی باش و جوان دەكەن، هەروا بكەن). بۆیە ئێمەش نامەنەوێ ئەوەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی و بە باشی زانیوە بیگۆڕین.

## باسی مانەوە لە مەككە لەدوای حەج.

## ٩٢ – باب الإِقَامَةِ بِمَكَّةَ.

٢٠٢٢ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حُمَيْدٍ، أَنَّهُ سَمِعَ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ يَسْأَلُ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ: هَلْ سَمِعْتَ فِي الإِقَامَةِ بِمَكَّةَ شَيْئًا؟ قَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ الْحَضْرَمِيِّ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لِلْمُهَاجِرِينَ إِقَامَةٌ بَعْدَ الصَّدَرِ ثَلاَثًا).

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی حومەیدەوە هاتووە، كە لە عومەری كوڕی (عبدالعزيز)ی بیستووە، لە سائیبی پرسی: ئایا سەبارەت بە مانەوە لە مەككە لەدوای حەج هیچ شتێكت بیستووە؟ وتی: ئیبنو (حَضْرَمِیَ) بۆی گێرامەوە، كە لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بیستووە دەیفەرموو: (ئەوانەی لە مەككەوە كۆچیان كردوە بۆ مەدینە لەدوای تەواو كردنی حەج واتە لەدوای گەڕانەوە لە مینا بۆیان نیە لە سێ رۆژ زیاتر بمێننەوە لە مەككە).

## باسی نوێژكردن لەناو كەعبەدا.

## ٩٣ - باب الصَّلَاةُ فِي الْكَعْبَةِ.

٢٠٢٣ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ الْكَعْبَةَ هُوَ وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ وَعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ الْحَجَبِيُّ وَبِلَالٌ، فَأَغْلَقَهَا عَلَيْهِ، فَمَكَثَ فِيهَا، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: فَسَأَلْتُ بِلَالاً حِينَ خَرَجَ مَاذَا صَنَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ: جَعَلَ عَمُودًا عَنْ يَسَارِهِ، وَعَمُودَيْنِ عَنْ يَمِينِهِ، وَثَلَاثَةَ أَعْمِدَةٍ وَرَاءَهُ - وَكَانَ الْبَيْتُ يَوْمَئِذٍ عَلَى سِتَّةِ أَعْمِدَةٍ - ثُمَّ صَلَّى.

واتە: لە (عَبْدُ الله)ی كوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و ئوسامەی كوڕی زەید و (عُثمَان)ی كوڕی (طلحَة الحَجَبيَ) و بیلال چوونە ناو كەعبەوە، (عُثمَان) دەرگاكەی لەسەر داخست بۆ ئەوەی كەس نەچێتە ژوورەوە قەرەباڵغی دروست نەبێ، تێیدا مایەوە، (عَبْدُ الله)ی كوڕی عومەر وتی: كاتێ كە هاتەدەرەوە لە بیلالم پرسی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەو ماوەیە مایەوە لە ناو كەعبەدا چی كرد؟ بیلال وتی: كۆڵەكەیەكی خستە لای چەپیەوە، دوو كۆڵەكەی خستە لای ڕاستیەوە، سێ كۆڵەكەشی خستە پشت خۆیەوە - ئەو سەردەمەش كەعبە لەسەر شەش كۆڵەكە بوو - لەپاشدا نوێژی كرد.

٢٠٢٤ - (صحيح) عَنْ مَالِكٍ، بِهَذَا الْحَدِيثِ، لَمْ يَذْكُرِ السَّوَارِيَ، قَالَ: ثُمَّ صَلَّى وَبَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ ثَلاثَةُ أَذْرُعٍ.

واتە: لە مالیکەوە فەرموودەی پێشو هاتووە، بەڵام راوی باسی کۆڵەکەکانی نەکرد، راوی وتی: لەپاشدا نوێژی کرد نێوان دیواری قیبلەو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و سێ باڵ دەبوو.

٢٠٢٥ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِمَعْنَى حَدِيثِ الْقَعْنَبِيِّ. قَالَ: وَنَسِيتُ أَنْ أَسْأَلَهُ كَمْ صَلَّى.

واتە: ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ، لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم فەرموودەکەی پێشوتری گێڕایەوە، بە هەمان مانا کە قەعنەبی ریوایەتی کردوە، وتی: لە یادم چوو لێی بپرسم چەند رکات نوێژی کرد.

٢٠٢٦ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ صَفْوَانَ، قَالَ: قُلْتُ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: كَيْفَ صَنَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ دَخَلَ الْكَعْبَةَ؟ قَالَ: صَلَّى رَكْعَتَيْنِ.

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی صەفوانەوە (عَبْدُ الرَّحْمَن)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتم بە پێشەوا عومەری کوڕی (خَطَّاب) رەزای خوای لێ بێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ کە چووە ناو کەعبەوە چی کرد؟ وتی: دوو رکات نوێژی کرد.

٢٠٢٧ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا قَدِمَ مَكَّةَ أَبَى أَنْ يَدْخُلَ الْبَيْتَ وَفِيهِ الآلِهَةُ، فَأَمَرَ بِهَا فَأُخْرِجَتْ، قَالَ: فَأَخْرَجَ صُورَةَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَفِي أَيْدِيهِمَا الأَزْلاَمُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ( قَاتَلَهُمُ اللَّهُ! وَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمُوا مَا اسْتَقْسَمَا بِهَا قَطُّ). قَالَ: ثُمَّ دَخَلَ الْبَيْتَ، فَكَبَّرَ فِي نَوَاحِيهِ، وَفِي زَوَايَاهُ، ثُمَّ خَرَجَ وَلَمْ يُصَلِّ فِيهِ.

واتە: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: لەساڵی رزگارکردنی شاری مەککەدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ کە گەیشتە ئەوێ رێگری لێ کرا کە بچێتە ناو کەعبەوە چونکە (بت)خواکانی بت پەرستانی تێدا بوو، فەرمانی پێ کرا بتەکان بهێننە دەرەوە ئەوانیش بتەکانیان لە کەعبە هێنایە دەرەوە، راوی وتی: وێنەی ئیبراهیم و ئیسماعیلیان هێنایە دەرەوە (أزلامُ)یان بە دەستەوە بوو – (أزلامُ) چەند دارێك بوون یەكێكیان لێی نوسرا بوو ئەو كارە بكە، یەكێكی تریان لێی نوسرا بوو ئەو كارە مەكە، یەكێكیان هیچی لێ نەنوسراوە، جا كاتێ كەسێ بیویستایە كارێك بكات یان سەفەرێك بكات دەیان خستنە ناو دەفرێكەوە دەستیان پێدا دەكرد یەكێكیانیان دەردەهێنا جا كامیان دەرچوایە بۆی ئەوەی دەكرد، بۆ نمونە ئەگەر ئەوەی بۆ دەرچوایە كە لێی نوسرا بوو ئەو كارە مەكە ئەوا ئەو كارەی نەدەكرد-، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (خوای گەورە لەناویان بەرێت سوێند بە خوا كافرەكانی قورەیش خۆیان چاك دەزانن كە ئیبراهیم و ئیسماعیل هەرگیز كاری وایان نەكردوە). ئیبنو عەباس وتی: لەپاشدا چووە ناو كەعبەوە، لە هەموو لایەكی و لەهەموو سوچێكیدا (الله أكبر)ی كرد، ئینجا هاتەدەرەوەو نوێژی تێدا نەكرد.

## باسی چوونە ناو حیجرەوە.

## ٩٤ – باب فِی الْحِجْرِ.

٢٠٢٨ - (حسن صحيح) عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: كُنْتُ أُحِبُّ أَنْ أَدْخُلَ الْبَيْتَ فَأُصَلِّيَ فِيهِ، فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدِي فَأَدْخَلَنِي فِي الْحِجْرِ، فَقَالَ: (صَلِّي فِي الْحِجْرِ إِذَا أَرَدْتِ دُخُولَ الْبَيْتِ، فَإِنَّمَا هُوَ قِطْعَةٌ مِنَ الْبَيْتِ، فَإِنَّ قَوْمَكِ اقْتَصَرُوا حِينَ بَنَوُا الْكَعْبَةَ فَأَخْرَجُوهُ مِنَ الْبَيْتِ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: مـن پـێم خۆش بوو بچمە ناو بەیتەوەو نوێژی تێدا بكەم، جا پێغەمبەری خـوا صـلی الله علیه وسلم دەستی گرتم و بردمیە ناو حیجـرەوەو فـەرمووی: (ئەگـەر دەتـەوێ بچیتە ناو بەیتەوە لە حیجری ئیسماعیلدا نوێژ بكە چونكە بەشێكە لە بـەیت، هۆزەكەت كاتێ كە بەیتیان دروستكرد بە شێكیان لە كەعبە بەجێهێشت).

## باسی چوونە ناو کەعبەوە.

## ٩٥ - باب فِي دُخُولِ الْكَعْبَةِ.

٢٠٢٩ - (ضعيف) عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ مِنْ عِنْدِهَا وَهُوَ مَسْرُورٌ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَيَّ وَهُوَ كَئِيبٌ، فَقَالَ (إِنِّي دَخَلْتُ الْكَعْبَةَ وَلَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا دَخَلْتُهَا، إِنِّي أَخَافُ أَنْ أَكُونَ قَدْ شَقَقْتُ عَلَى أُمَّتِي).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ کە دەرچوو لەلای زۆر دڵخۆش و شادومان بوو، لەپاشدا کاتێ کە گەڕایەوە زۆر دلگران و بێ تاقەت بوو، فەرمووی: (من چوومە ناو کەعبەوە ئەوەی کە ئێستا دەیزانم لەسەرتاوە بمزانیایە نەدەچوومە ناویەوە، چونکە دەترسم بووبم بە هۆی زەحمەت و بارگرانی بۆ ئوممەتەکەم بە هۆی چوونە ژوورەوەیانەوە بۆ ناو کەعبە).

٢٠٣٠ - (صحيح) عَنْ مَنْصُورٍ الْحَجَبِيِّ، حَدَّثَنِي خَالِي عَنْ أُمِّي عَنْ أُمِّي صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةَ، قَالَتْ: سَمِعْتُ الأَسْلَمِيَّةَ تَقُولُ: قُلْتُ لِعُثْمَانَ: مَا قَالَ لَكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ دَعَاكَ؟ قَالَ: (إِنِّي نَسِيتُ أَنْ آمُرَكَ أَنْ

تُخَمِّرَ الْقَرْنَيْنِ فَإِنَّهُ لَيْسَ يَنْبَغِي أَنْ يَكُونَ فِي الْبَيْتِ شَيْءٌ يَشْغَلُ الْمُصَلِّيَ).

واتە: مەنصوری حەجەبی دەڵێت: خالم – موسافیعی کوڕی شەیبە - لە دایکمەوە صەفیەی کچی شەیبە بۆی گێڕامەوە وتی: گوێم لە ئەسلەمییە بوو دەیوت: وتم بە (عثمَان) - ی کوڕی (طلحَة) - : پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چی پێ فەرموویت کاتێ کە بانگی کردیت؟ ئەویش وتی: فەرمووی: (من لەیادم چوو فەرمانت پێ بکەم هەردوو شاخەکە داپۆشیت – کە دوو شاخی ئەو بەرانە بوون کە ئیبراهیم سەلامی خوای لەسەر بێ لە جیاتی ئیسماعیل سەریبڕی و کردیە قوربانی - چونکە پیویست ناکات شتێ لەناو بەیتدا بێت نوێژخوێن سەرقاڵ بکات).

## باسی ئەو ماڵ و شمەکەی لەناو کەعبەدایە.

## ٩٦ – باب فِي مَالِ الْكَعْبَةِ.

٢٠٣١ - (صحيح) عَنْ شَقِيقٍ، عَنْ شَيْبَةَ - يَعْنِي ابْنَ عُثْمَانَ – قَالَ: قَعَدَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فِي مَقْعَدِكَ الَّذِي أَنْتَ فِيهِ، فَقَالَ: لاَ أَخْرُجُ حَتَّى أَقْسِمَ مَالَ الْكَعْبَةِ، قَالَ: قُلْتُ: مَا أَنْتَ بِفَاعِلٍ، قَالَ: بَلَى لأَفْعَلَنَّ،

قَالَ: قُلْتُ: مَا أَنْتَ بِفَاعِلٍ، قَالَ: لِمَ؟ قُلْتُ: لأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ رَأَى مَكَانَهُ وَأَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، وَهُمَا أَحْوَجُ مِنْكَ إِلَى الْمَالِ فَلَمْ يُخْرِجَاهُ، فَقَامَ فَخَرَجَ.

واتە: لە شەقیقەوە، لە شەیبەی کوڕی (عُثمَان)ەوە هاتووە: کە وتویەتی: پێشەوا عومەری کوڕی (خَطّاب) ڕەزای خوای لێ بێ لەو جێگەیەی تۆدا دانیشتبوو، وتی: ناچمەدەرەوە هەتا ماڵ و شمەکەکانی کەعبە دابەش نەکەم بەسەر هەژارە موسوڵمانەکاندا، وتی: وتم: ئەوە کاری تۆ نیەو ئەو کارە مەکە، وتی: ئەو کارە دەکەم، وتی: وتم: ئەوە کاری تۆ نیەو ئەو کارە مەکە، وتی: بۆچی وا دەڵێیت؟ وتم: چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم شوێنەکەی بەچاوی خۆی دیوە هەروەها ئەبو بەکریش ڕەزای خوای لێ بێ لە تۆش زیاتر پێویستیان پێی بووەو دەریان نەهێناوەو لەشوێنی خۆیدا نەیانجوڵاندوە، ئیتر پێشەوا عومەر هەستاو چووە دەرەوە.

## باسی

## ٩٧ - باب

٢٠٣٢ - (ضعيف) عَنِ الزُّبَيْرِ قَالَ: لَمَّا أَقْبَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ لِيَّةَ حَتَّى إِذَا كُنَّا عِنْدَ السِّدْرَةِ وَقَفَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي طَرَفِ الْقَرْنِ

الأَسْوَدِ حَذْوَهَا، فَاسْتَقْبَلَ نَخِبًا بِبَصَرِهِ - وَقَالَ مَرَّةً: وَادِيَهُ - وَوَقَفَ حَتَّى اتَّقَفَ النَّاسُ كُلُّهُمْ، ثُمَّ قَالَ: (إِنَّ صَيْدَ وَجٍّ وَعِضَاهَهُ حَرَامٌ مُحَرَّمٌ لِلَّهِ). وَذَلِكَ قَبْلَ نُزُولِهِ الطَّائِفَ وَحِصَارِهِ لِثَقِيفٍ.

واتە: لە زوبەیرەوە هاتووە: كە وتویەتی: كاتێ كە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم رۆشتین بۆ كێوی لیيە – كێوێكە لە نزیك (طائِف) - هەتا گەیشتینە داری سیدرە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەلایەكی (قرن الأسْوَد)ەوە راوەستا – (قرن الأسْوَد) كێوێكی بچوكە لە حیجاز لە نزیك (طائِف)ەوە - بەرامبەر بە سیدرە راوەستا ، رووی كردە (نَخِبا) – كە شیوێكە لە (طائِف) - مەڕڕە راوی وتی: (نَخِبا) شیوێكە –هەتا خەڵكەكە هەر هەموویان گەیشتنە ئەوێ و لە تەكیا راوەستان، لەپاشدا فەرمووی: (بێگومان (صَیْدَ وَجّ) – كە شیوێكە لە (طائِف) – و بڕینی درەختی (عِضَاهَه) – (عِضَاهَه) هەموو درەختێكی گەورە كە دڕكی پێوە بێت - حەرامن و خوای گەورە حەرامی كردون). ئەم روداوەش لەپێش دابەزینی بۆ (طائِف) و گەمارۆدانی هۆزی (ثقیف) بوو.

## باسی ڕۆیشتن بۆ مەدینە.

## ٩٨ – بابٌ فِي إِتْيَانِ الْمَدِينَةِ.

٢٠٣٣ - (صحيح) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ: مَسْجِدِ الْحَرَامِ، وَمَسْجِدِي هَذَا، وَالْمَسْجِدِ الأَقْصَى).

واتە: لە ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بنەو بارگە مەپێچنەوە تەنها بۆ ئەم سێ مزگەوتە نەبێ: مزگەوتی حەرام، ئەم مزگەوتەی من و، مزگەوتی ئەقصا.

## باسی حەرامکردنی مەدینە.

## ٩٩ – بابٌ فِي تَحْرِيمِ الْمَدِينَةِ.

٢٠٣٤ - (صحيح) عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: مَا كَتَبْنَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلاَّ الْقُرْآنَ، وَمَا فِي هَذِهِ الصَّحِيفَةِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ: (الْمَدِينَةُ حَرَامٌ مَا بَيْنَ عَائِرٍ إِلَى ثَوْرٍ، فَمَنْ أَحْدَثَ حَدَثًا أَوْ آوَى مُحْدِثًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ عَدْلٌ وَلاَ صَرْفٌ، وَذِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ، فَمَنْ أَخْفَرَ مُسْلِمًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ عَدْلٌ وَلاَ صَرْفٌ، وَمَنْ وَالَى قَوْمًا بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ مِنْهُ عَدْلٌ وَلاَ صَرْفٌ).

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أبی طالب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە تەنیا قورئانمان لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم دەنوسیەوە، ئەمەی لێ دەرچێ کە لەم تۆمارەدایە، پێشەوا عەلی وتی: ئەویش ئەمەیە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (مەدینە حەرامە لە کێوی عەیرەوە هاتا کێوی (ثور) - کێوی عەیر کەوتۆتە خوارووی مەدینەوە، کێوی (ثور)یش کێوێکی بچوکە دەکەوێتە سەروی کێوی ئوحودەوە - جا هەرکەسێ کارێکی (بیدعە) یان کارێکی ناڕەوای تێدا بکات، یان کەسێکی ئەهلی بیدعەی تێدا پەنا بدات و سەری بخات ئەوە نەفرینی خوداو مەلائیکەکان و ئەو خەڵکە هەر هەمووی لەسەربێ، لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە نەفەرزو نەسوننەتی لێ قبوڵ ناکات، موسوڵمانان بۆ پەیمانی ئامان دان بە کافران هەموویان چوون یەکن، هەرە خوارینەکەیان ماف ئامان دانی هەیە بەهەر کافرێ کە دەیەوێ، هەرکەسێ پەیمانی ئامانی موسوڵمانێ تێك بدات، نەفرینی خوداو مەلائیکەکان و ئەو خەڵکە هەر هەمووی لەسەربێ، لەڕۆژی قیامەتدا

خوای گەورە نەفەرز و نەسوننەتی لێ قبوڵ ناکات، بەندەیە یان کەنیزەیە گەورەکەی ئازادی کردبێ کەچی حاشا بکات لە گەورەکەی خۆی و یەکێکی تر بکات بە گەورەی خۆی ئەوە نەفرینی خوداو مەلائیکەکان و ئەو خەڵکە هەر هەمووی لەسەربێ، لەرۆژی قیامەتدا خوای گەورە نەفەرز و نەسوننەتی لێ قبوڵ ناکات.

**٢٠٣٥ - (صحيح) عَنْ عَلِيّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، فِي هَـذِهِ الْقِصَّـةِ، عَـنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ( لاَ يُخْتَلَى خَلاَهَا، وَلاَ يُنَفَّرُ صَيْدُهَا، وَلاَ تُلْتَقَطُ لُقَطَتُهَـا إِلاَّ لِمَـنْ أَشَـادَ بِهَا، وَلاَ يَصْلُحُ لِرَجُلٍ أَنْ يَحْمِلَ فِيهَا السِّـلاَحَ لِقِتَـالٍ، وَلاَ يَصْلُحُ أَنْ يُقْطَعَ مِنْهَا شَـجَرَةٌ، إِلاَّ أَنْ يَعْلِـفَ رَجُـلٌ بَعِيرَهُ).**

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أبی طالب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ ئەم بەسەرهاتە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (نابێت گژوگیاو لەوەڕی تەڕی ببڕێت، نابێت نێچیری بتارێنرێت، نابێ هیچ شتێکی کەوتوی هەڵگیرێتەوە، مەگەر بۆ کەسێ کە بانگەوازی بۆ بکات، بۆ کەس نیە چەکی تێدا هەڵگرێت مەگەر لەبەر حاڵەتی زەروری، بۆ کەس نیە دارودرەختی ببڕێت، مەگەر کەسێ گەڵاکەی لێ بکاتەوە بۆ ئالیکی وشترەکەی لەبەر حاڵەتی زەروری).

٢٠٣٦ - (صحيح) عَنْ عَدِيِّ بْنِ زَيْدٍ قَالَ: حَمَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كُلَّ نَاحِيَةٍ مِنَ الْمَدِينَةِ بَرِيدًا بَرِيدًا: لاَ يُخْبَطُ شَجَرُهُ وَلاَ يُعْضَدُ، إِلاَّ مَا يُسَاقُ بِهِ الْجَمَلُ.

واتە: لە عەدی كوڕی زەیدەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە هەموو لایەكی مەدینەوە دوانزە میل دوانزە میل پاوەنی كرد: نابێت دارودرەختەتی ببڕدرێت و گەڵاكانی هەڵوەرێنرێت، مەگەر كەسێ لەبەر حاڵەتی زەروری بە داردەستەكەی گەڵا هەڵوەرێنێ بۆ ئالیك.

## باسی سەردانی گۆڕستان.

## ١٠٠ - باب زِيَارَةِ الْقُبُورِ.

٢٠٤١ - (حسن) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ( مَا مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ إِلاَّ رَدَّ اللَّهُ عَلَيَّ رُوحِي حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (هەر كەسێ سڵاوێكم لەسەر بدات ئیلا خوای گەورە رۆحەكەم دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە).

٢٠٤٢ - (صحيح) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قُبُورًا، وَلاَ تَجْعَلُوا قَبْرِى عِيدًا، وَصَلُّوا عَلَىَّ فَإِنَّ صَلاَتَكُمْ تَبْلُغُنِى حَيْثُ كُنْتُمْ).

واتە: لە ئەبو هورەیرە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان پەرستش و نوێژیان تێدا ئەنجام نەدەن، سەردانی گۆڕەکەم مەکەن بە جەژن، سڵاواتم لەسەر بدەن چونکە سڵاواتەکانتانم پێ دەگات لەهەرکوێ بن).

٢٠٤٣ - (صحيح) عَنْ رَبِيعَةَ - يَعْنِى ابْنَ الْهُدَيْرِ – قَالَ: مَا سَمِعْتُ طَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللَّهِ يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَدِيثًا قَطُّ غَيْرَ حَدِيثٍ وَاحِدٍ، قَالَ: قُلْتُ: وَمَا هُوَ؟ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُرِيدُ قُبُورَ الشُّهَدَاءِ، حَتَّى إِذَا أَشْرَفْنَا عَلَى حَرَّةِ وَاقِمٍ، فَلَمَّا تَدَلَّيْنَا مِنْهَا وَإِذَا قُبُورٌ بِمَحْنِيَّةٍ، قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَقُبُورُ إِخْوَانِنَا هَذِهِ؟ قَالَ: (قُبُورُ أَصْحَابِنَا). فَلَمَّا جِئْنَا قُبُورَ الشُّهَدَاءِ قَالَ: (هَذِهِ قُبُورُ إِخْوَانِنَا).

واتــە: لــە رەبیعــەی كــوڕی هــودەیرەوە دەگێڕنــەوە، كــە وتویــەتی: هــەرگیز نەمبیســتوە لــە (طلحــة)ی كــوڕی (عُبَیْــدِ اللّــه) كــە فــەرموودەی لــە پێغەمبــەری خــواوە صلی الله علیــه وسـلم گێڕابێتــەوە جگــه لەیــەك فــەرموودە نــەبێت، راوی وتی: وتم: ئەو فەرموودە كامەیە؟ وتی: لە خزمەت پێغەمبــەری خــوادا صلی الله علیه وسلم لە مەدینە دەرچووین دەیویست سـەردانی گۆڕستانی شـەهیدەكانی ئوحــود بكــات حــەمزەی مــامی و ئەوانــەی تــر، هــەتا ســەركەوتین و گەیشــتینە حــەرڕەی واقــیم، كــاتێ كــه دابــەزین كەوانــەی شــیوەكه گۆڕســتانێكی لــێ بــوو، (طلحة) وتی: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەمە گۆڕستانی براكانمانە؟ فەرمووی: (ئەمە گۆڕستانی هاوەڵانمانــە - مەبەســتی ئــەوە بــوو كــە ئەمانە شەهید نەبوون - )، كاتێ كه گەیشتینە گۆڕستانی شەهیدەكان ئەوانــەی كە لەڕێی خوادا شەهید بوون، فەرمووی: (ئەمە گۆڕستانی براكانمانە).

**٢٠٤٤ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَاخَ بِالْبَطْحَاءِ الَّتِي بِذِي الْحُلَيْفَةِ فَصَلَّى بِهَا، فَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ يَفْعَلُ ذَلِكَ.**

واتە: لە (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی عومــەرەوە رەزای خوایــان لــێ بــێ دەگێڕنــەوە، كاتێ كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە مەككە گەڕایەوە لــە (بَطحَاءِ) لە (ذِي الحُلَيفَة) دابەزی وشترەكەی یخ داو بارگەی خست و شــەو لــەوێ مایــەوە و نوێژی تێدا كرد، (عَبْدُ اللّه)ی كوڕی عومەریش وەهای دەكرد.

٢٠٤٥ - (صحيح مقطوع) عن الْقَعْنَبِيّ قَالَ: قَالَ مَالِـكٌ: لاَ يَنْبَغِـي لأَحَدٍ أَنْ يُجَاوِزَ الْمُعَرَّسَ إِذَا قَفَلَ رَاجِعًا إِلَى الْمَدِينَـةِ، حَتَّى يُصَلِّيَ فِيهَا مَا بَدَا لَهُ، لأَنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَرَّسَ بِهِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: سَـمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ إِسْحَاقَ الْمَدَنِيَّ قَالَ: الْمُعَـرَّسُ عَلَـى سِـتَّةِ أَمْيَالٍ مِنَ الْمَدِينَةِ.

واته: قەعنەبی دەڵێت: مالیك وتی: بۆ كەس نیه له موعەڕس تێپەڕ بكات كاتێ كه گەڕایەوه بۆ مەدینه، هەتا نوێژی تێدا نـەكات ئەگەر كاتی نوێـژ بـوو ئەگەر كاتی نوێژیش نەبوو بمێنێتەوه هەتا كاتی نوێـژ دێتـه پێشەوه، چونكه پـێم گەیشـتوه كـه پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم لـەوێ لایـداوەو ئیسراحەتی تێدا كـردوه. ئـەبو داود دەڵێـت: لـه موحەممـەدی كـوڕی ئیسحاقی مەدەنیم بیستوه دەیوت: موعەرەس شەش میل له مەدینەوه دووره.

٢٠٤٥ – (م) (صحيح) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ رَسُولَ الله صلى الله عليـه وسلم كَانَ إِذَا قَدِمَ بَاتَ بِالْمُعرسِ حَتَّى يَغْتَدِيَ.

واتـه: لـه ئیبنـو عومـەرەوه ڕەزای خوایـان لـێ بـێ دەگێڕنـەوه، كـاتێ كـه پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـه وسـلم دەگەڕایـەوه بـۆ مەدینـه شـەو لـه موعەریس دەمایەوه هەتا بەیانی.

كۆتایی پەرتوكی مەناسكی حەج

# پێڕستەکانی بەرگی دووەم

**بە پشتیوانی خوای گەورە لێرەدا بەرگی دووەم**

**تەواو بوو چاوەڕێی بەرگەکانی تربن.**